دوکتور مارف خەزنەدار

# مێژووی ئەدەبی کوردی

ئەم بەرهەمە هێنانەدی پرۆژەی نووسینەوەی
مێژووی ئەدەبی کوردی‌یە لە سەرەتاوە
تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم

**بەرگی پێنجەم**

نێوانی هەردوو جەنگی
یەکەم و دووەمی سەدەی بیستەم
١٩١٤ - ١٩٤٥



# مێژووی ئەدەبی کوردی

ئەم بەرهەمە هێنانەدی پرۆژەی نووسینەوەی
مێژووی ئەدەبی کوردییە لە سەرەتاوە
تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم

**بەرگی پێنجەم**

## نێوان هەردوو جەنگی
## یەکەم و دووەمی سەدەی بیستەم
## ١٩١٤ - ١٩٤٥


**دوکتۆر مارف خەزنەدار**





کتێب: مێژووی ئەدەبی کوردی – بەرگی پێنجەم
دانانی: د. مارف خەزنەدار
بڵاوکراوەی ئاراس– ژمارە: ٣٦٥
دەرهێنانی هونەریی ناوەوە و بەرگ: ئاراس ئەکرەم
پیت لێدان: تریسکە ئەحمەد حەمید
سەرپەرشتیی چاپ: ئاوڕەحمانی حاجی مەحموود
چاپی یەکەم، هەولێر– ٢٠٠٥



لە کتێبخانەی بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی ڕۆشنبیری و هونەر لە هەولێر ژمارە (٢٠٩)ی ساڵی ٢٠٠٥ی دراوەتێ

# پێشەکی

ئەم بەرگی پێنجەمەی «مێژووی ئەدەبی کوردی»یە گێڕانەوەی بەسەرهاتی ئەدەبی نەتەوەییە لە نێوان هەردوو جەنگی گێتیی سەدەی بیستەم (١٩١٤ - ١٩٤٥). بەزۆری بەرهەمی ئەدەبی لە ناو کورد و نەتەوەکانی رۆژهەلاتی ناوەڕاستدا لە سەردەمی پەیدابوونییەوە شیعر بووە، بەو پێیە ئەدەبی کوردیش لە سەرەتای سەرهەڵدانییەوە تا دوا سالانی سەدەی نۆزدەم بریتی بووە لە شیعر. کە وتراوە «مێژووی ئەدەبی کوردی» تا ئەو سەردەمە مێژووی شیعری کوردی بووە. ئەو چوار بەرگەی مێژووی ئەدەبی کوردی بەگشتی بریتی بوو لە مێژووی شیعری کوردی. لەم بەرگە و بەرگی دوای ئەو جگە لە شیعر باس لە بەسەرهاتی پەخشانیش دەکرێ. ئەم شێوە تازەیە لە ئەدەبی کوردیدا پەرەی سەند، گەلێ بابەتی ئەدەبی بەپەخشان پەیدا بوون، وەکو وتار و چیرۆک و رۆمان و شانۆگەری و پەخشانە شیعر و گەلێ هونەری دیکە. لەگەڵ ئەوەی پەخشان لەم قۆناغەدا جێگەی دیاری بۆ خۆی پەیدا کردبوو کەچی هێشتا شیعر بەسەریدا زاڵ بوو، بۆیە بەرهەمی ئەدەبی لەو رۆژگارانەدا زیاتری شیعر و کەمتری پەخشان بوو.

لە مێژووی رۆشنبیری کوردیدا نەریتێکی نابەجێ هەیە لە چوارچێوەی بیری دواکەوتوو دەسووڕێتەوە بریتییە لە شاردنەوەی خوو و رەوشت و کرداری ناوچەیی لە دیاریکردنی چاکە و خراپەی ئادەمزاد. بەم جۆرە چاکە دەخرێتە روو و خراپە دادەپۆشرێ. ئەم نەریتە تایبەتی نییە بەکورد بەڵکو لە ناو نەتەوە هاوسێکانی کوردیشدا باوە.

رەوشتە خراپ و ناشیرینەکانی ناو کوردەواری دەکرێن بەدوو بەشەوە: یەکەمیان ئەو کردارانەی لە کۆمەڵدا بەخەوش و تاوان دەژمێررێن، وەکو دزی و ئازاردان و کوشتنی خەڵکی و سەرخۆشی و بەدمەستی و قومارکردن و هەتیوبازی و موبالەغەکردن لە مێبازی و هی دیکە، دووەمیان بیروباوەڕی سیاسی و هەڵوێست بەرامبەر بەداگیرکەرانی ولاتی کورد لە لایەن دەوڵەتە ئەمپریالیست و کۆلۆنیالیستەکانی ئەوروپا یا هاوسێیانی کورد خۆیەوە. لەم هەڵسوکەوتەدا سانسۆری دەسەلاتی بێگانە یا خۆیی راستی دەشارێتەوە، لەباتی راستی زانیاریی ناراست لە مێژوودا دروست دەبێ، بەم رەنگە مێژوو دەشێوێنرێ ناراستی دەبێتە سەرچاوە.

بۆ بەڵگە لە مێژووی گشتیی نەتەوەی کورد، بەتایبەتی لە مێژووی ئەدەبیدا شاعیر و نووسەرانمان هەموویان پیاوی باشن، خراپەیان نەکردووە، ئازا و جەسوورن، چاوتێر و



میوانپەروەرن. لە رووی بیروباوەڕی سیاسیشەوە راستی دەشێوێنرێ. شاعیرێک ستایشی مەلیکی عێراقی کردووە، لە هەڵوێستێکدا لەگەڵ میری بووە، ئەم کردەوانە چاکەی کوردیان تێدا نەبووە. ئەو بەرهەمانە شارراونەتەوە. شاعیرێکی دیکە ئینگلیزخوا بووە، ستایشی ئەم بێگانەیەی شارراوەتەوە، هەروەها لە دژی رووسی نووسیوە، واتە ستایش ئینگلیز و داشۆرینی رووسی بووە، هەردوو بەرهەمیان شاردۆتەوە چونکە رای گشتی ئەو سەردەمە ئەمەی خواستووە، ئەمە چی ساختەییێکە لە مێژوودا دەکرێ!

لەم کتێبەدا هەوڵ دراوە تا رادەییێک ئەم زانیارییە شارراوانە ئاشکرا بکرێن، ئەمە لە پلە و پایەی هیچ شاعیر و نووسەرێکمان کەم ناکاتەوە، چونکە مەبەس نرخی ئیستێتیکی بەرهەمەکەیە نابینی بەحسێب هەندێ شیعری شێخ رەزا جنێوێکی بازارییە کەچی ئاسۆییێکی هونەراوی وای داوەتە جنێوەکە کردوویەتی بەبەرهەمێکی بەرز، زیانی بۆ خۆی نییە ئەگەر بەجنێوفرۆش بژمێررێ، زیانی بۆ جنێو پێدراویش نییە چونکە بەرهەمی بەرزی لە جنێو دروست کردووە.

لەم ماوەیەدا پێویستە هەندێ لایەنی هەڵسوکەوتی ئەم کتێبە روون بکرێتەوە لە بابەت چوار بەرگەکەی پێشووەوە:

١- لە تێکستی بەڵگە و نموونە شیعرییەکانی ئەم کتێبە هەندێ وشە و زاراوەی فەرهەنگی هەیە لەوانەیە پێویستییان بەلێکدانەوە و روونکردنەوە هەبێ، کەچی ئەم کارە پشت کوێ خراوە بۆ ئەوەی خوێنەر بەهۆی سەرچاوەی دیکەوە بتوانێ بگاتە مانای وشە و زاراوەکان، بەگشتی هەوڵ دراوە بەو شێوەیەی لە دەم دێنە دەرەوە وەکو خۆیان بلاو بکرێنەوە.

٢- لە تێکستی هەموو ئەو شیعرانەی بۆ بەڵگە لەم کتێبەدا تۆمار کراون دەستووری خاڵبەندی بەکار نەهێنراوە، چونکە لەبەر کێش و ئاواز و ڕیتمی شیعرەکە نابێ هۆشی خوێنەری بۆ هیچ لایێکی دیکەدا بچێ، ئەم دیاردەیە لە شیعری کلاسیکی هەموو نەتەوە هاوسێکانمان وەکو عەرەب و عەجەم و تورکی عوسمانی رەچاو کراوە.

٣- کۆمەڵێک وشە و زاراوە لە تێکستی شیعرەکاندا لە رووی راست نووسینەوە بەجۆرێک هاتوون، لە زمانی کتێبەکەدا بەشێوەییێکی دیکە نووسراونەتەوە. هەندێ جاریش هەردوو بابەتەکە لە تێکستی شیعر و نووسینی کتێبەکەدا تێکەڵ بەیەکترین، لە رووی زانستییەوە ئەم دیاردەیە هیچ گیروگرفتێک نانێتەوە.

هەندێ لەو وشانە لەم ماوەیەدا دەخرێنە بەرچاو: «(بولبول - بلبل)، (زولف - زلف)،

(حـووری – حـۆری)، (بوت – بت)، (دونیـا – دنیـا)، (ڕووح – ڕۆح)، (خـەڵق – خەڵک)، (زولەیخا – زلێخا)، (موژدە – مژدە)، (موفتی – مفتی)، (مورید – مرید)، (دائیم – داییم – دایم)، (عـەشـیـرەت – عـەشـرەت)، (داغ – داخ)، (کـەسـێـتی – کەسایەتی)، (کاریکاتۆر – کاریکاتێر)، (عاشیق – عاشق)، (عیشق – عەشق – عشق)، (بیستان – بێستان)».

٤– بەگشتی لەم کتێبەدا بۆ دیارکردنی ساڵی هەموو ڕووداوەکان ڕۆژژمێری ڕۆژئاوایی بەکارهێنراوە و ڕەمزی (م)ی بۆ دانراوە بەمانای (مەسیحی) نەک (میلادی)، دیارە ئەگەر ڕۆژژمێری هیجریش بەکار هاتبێ (هـ)ی بۆ دانراوە.

چوار بەرگی پێشووی ئەم کتێبە لە هەندێ هەڵە بەدوور نین، لەوانە:

١– هەڵەی چاپ لەم کتێبەدا زۆر کەمە، بەڵام نەدەبوو هەبێ لە چاپی داهاتوو پێویستە ڕاست بکرێنەوە.

٢– لە لاپەڕەی (٣٦)ی بەرگی چوارەم ئەوە هاتووە گۆیا کە کەیفی لە کۆیەوە چووە بۆ ئەستەمووڵ نالی و حاجی لەوێ بوون. کەیفی بەهۆی حاجییەوە ناسیاوی لەگەڵ نالیدا پەیدا کردووە. بێ گومان ئەمە ڕاست نییە، چونکە کە کەیفی گەیشتۆتە ئەستەمووڵ نالی لە ژیاندا نەبووە و کۆچی دوایی کردووە.

٣– برێک ناوی کەسان و جوگرافی بەرگی چوارەم لەبەر هەندێ هەڵەی هونەرییەوە نەکەوتوونەتە ناو لیستەکانی ئەم دوو بابەتەوە. هەر لەم لایەنەوە لە بەرگەکانی دیکەشدا بەشێکی زۆر کەم لەم ناوانە نەچوونەتە ناو لیستەکانیانەوە.

٤– لە بارەی وێنەی هێڵکاریی شاعیرانەوە ئەو هونەرمەندەی وێنەی شاعیرانی بەرگی چوارەمی کێشاوە بۆ تاقیکردنەوە بۆ هەر شاعیرێک چەند دیزاینێکی دروست کردووە. ئیتر بەهەڵە یەکێ لە دیزاینەکانی وێنەی سانی (ل ٥٥)ی بۆ حاجی داناوە. بەم ڕەنگە وێنەی حاجی لە ناو کتێبەکەدا ناکەوێتە بەرچاو. لە چاپێکی دیکەی ئەم کتێبەدا هەڵەکە ڕاست دەکرێتەوە.

ئەم بەرگە و ئەوانەی پێشوو دیارییێکن هەرچۆنێ بێ و بەهەموو جۆرە پێوانەیێک کەڵکیان هەیە.

خوێنەر و خوێندەواری کوردی ئازیز چاوەنۆڕی بەرگی داهاتوو بن.

*هەولێر: مەڵبەندی ڕووناکی – مارف خەزنەدار*



# بەشی یەکەم

## کورد لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا

## سیاسی – کۆمەڵایەتی

کوردستانی خاکی کوردەواری بۆ جاری یەکەم لە کۆتایی جەنگی چاڵدیران (١٥١٤) لە باکوورەوە بۆ باشوور کرا بەدوو کەرتەوە، لای ڕۆژهەڵاتی کەوتە ژێر دەستی فەرمانڕەوایی عەجەم، لە ڕۆژگارانی دەسەڵاتی سەفەوییەکانەوە تا ئێستا؛ لای ڕۆژئاوای کەوتە ژێر فەرمانڕەوایی عوسمانییەوە تا جەنگی یەکەمی گێتی. بەم پێیە کوردستانی ئێران لە ماوەی شەش سەدەدا گۆڕانێکی سنووری ئەوتۆی بەسەردا نەهات شایانی باس بێ. سنوورەکەی لە پێشانا لەگەڵ دەوڵەتی عوسمانی و لە پاشانا لەگەڵ عیراق هەر ئەوەیە کە لە دوای جەنگی چاڵدیران دیاری کراوە.

لە دوای جەنگی یەکەمی گێتی و ڕووخانی سەڵتەنەتی عوسمانی هەموو هەرێم و ناوچە کوردنشینەکانی ئەو ئیمپیراتۆرییەتە بەسەر ئەو دەوڵەتانەدا دابەش کران کە بەپێی بڕیاری دەوڵەتە سوێندخۆرە سەرکەوتووەکانی جەنگ دروست بوون. بەم جۆرە خاکی کوردەواری تەنیا بۆ چاکە و بەرژەوەندی دەوڵەتە ئەمپریالیستەکان بەتایبەتی بەریتانیا و فەرەنسا، هەروەها بۆ چاکەی نەتەوەکانی تورک و عەجەم و عەرەب خاکی کوردەواری سەردەمی عوسمانی پارچە پارچە کرا و هەر بەشێکی کەوتە ناو ئەو دەوڵەتانەی لە دوای جەنگ پەیدابوون. بەم ڕەنگە چەند کوردستانێک کەوتە ناوەوە لە تورکیا و عیراق و سووریا، بێ گومان کوردستانەکەی ئێرانیش بەشێکی گرنگە لەم خاکە نەتەوەیییە و هەموویان پێکەوە کوردستانی گەورە دروست دەکەن.

### کوردستانی تورکیا

کوردی ئەو کوردستانەی کەوتە ژێر دەستی تورکەوە دەستەوئەژنۆ نەوەستا. میللەت چووە مەیدانی خەباتەوە لە پێناوی مافی نەتەوایەتی. هەڵسان و ڕاپەڕین و شۆڕشەکانی دوای جەنگی یەکەمی گێتی بەردەوام بوون تا نزیک هەڵگیرسانی ئاگری جەنگی دووەم. خەباتی چەکداری کورد لە پێناوی مافی نەتەوایەتی وەستانی بۆ نەبوو. بەفەرماندەی هەندێ لە سەردارانی ڕاپەڕینی کورد وەکو شێخ سەعیدی پیران (١٩٢٥)، ڕاپەڕینی

ناوچەی ئارارات (١٩٢٧ - ١٩٣١) ئیحسان نووری پاشا فەرماندەی لەشکر بوو، شۆڕشی سەید ڕەزا لە دەرسیم (١٩٣٦ - ١٩٣٧)، ئەم شۆڕشانە هیوا و ئامانجی کورد بوون، سەرنەکەوتن و خرانە گۆڕەوە. گیروگرفت و دووبەرەکی ناوەوەی کورد خۆی و سیاسەتی دەرەوەی هێزە ئەمپریالیستەکان بەچاکەی خۆیان و تورک گەڕایەوە.

ئەو کارەساتانەی بەسەر ئەم کوردەدا هات بوون، لە مێژوودا بەدەگمەن وێنەیان تۆمار کراوە. سووتاندنی دێهاتی کورد و ئاوارەکردنی خەڵک بۆ هەرێمە دوورەکانی ڕۆژئاوای تورکیا، کوشتنی ژن و منداڵ و پیری کورد کارەساتێک بوو زمان لاڵە و بۆی باس ناکرێ و قەڵەم بێ نووکە و بۆی نانووسرێ. سەرەڕای ئەم هەموو مەینەتییە سیاسەتی بەتورک کردن کەوتە پراکتیکەوە. لە دەستووری دەوڵەتی تورکیای ئێستا ئەوە هاتووە «هەر کەسێکی لە تورکیا دەژی تورکە. تورکیا هی تورکانە». بەم جۆرە لە دوای جەنگی یەکەمەوە تا جەنگی دووەم مەسەلەی زمان و ئەدەب و ڕۆشنبیری کوردی لە تورکیادا لە گۆڕی نییە. زمانەکە وەکو دیاردەیێکی کۆمەڵایەتی لە ناو خەڵکی کورددا مایەوە بەتایبەتی لە دێهات و ناوچە کشتوکاڵییەکاندا. بەپێی ئەم هەڵوێستەی فەرمانڕەوایانی تورک بەرامبەر بەکورد کۆمەڵی کوردەواری ئەوێ لە گۆڕان و پەرەسەندن و پێشکەوتن وەستا. دوا هەناسەی مردنی بوو ئەگەر زمانی ڕۆژانەی قسەکردن لە ناو خەڵکی کورددا نەمابایەوە و گیانی نەتەوایەتی (کوردایەتی) نەدەمایەوە، لەبەر ئەوە مانەوەی زمانی کوردی لە ناو خەڵکی کوردی تورکیا و هەستکردن بەگیانی نەتەوایەتی بووە هۆی ئەوەی ئەم میللەتە چارە ڕەشە نەمرێ و هیوای باب و باپیرانی بهێنێتە دی و ئامانجی ئەوان و نەوەی ئێستا بداتە دەست نەوەکانی داهاتووی کورد بۆ ئەوەی بەسەربەستی بژین.

## کوردستانی عیراق

مەسەلەی ئەو کوردەی کەوتنە ناو دەوڵەتی عیراقەوە بەجۆرێکی دیکە کەوتەوە. لە دوای جەنگی یەکەم کوردی ناوچەکانی باشووری کوردستان بەتایبەتی لە سلێمانی هەوڵی دامەزراندنی دەوڵەتی قەومییان دەدا. هەڵسانەکانی شێخ مەحموود بەڵگەی ئارەزووی میللەتی کورد بوون. جەنگەکانی شێخ مەحموود ئەگەرچی هەندێ جار سەری دەگرت و سێ جار حوکوومەتی کوردستانی باشووری دانا و خۆی بوو بەمەلیک بەڵام ئەنجام کوژاندنەوەی هەموو ڕاپەڕین و شۆڕشەکان بوو، لەگەڵ ئەوەشدا وەنەبێ مەیدانی خەبات تەنیا لە ناوچەی سلێمانی بووبێ، بەڵکو لە پاش دامرکاندنەوەی هەڵسانەکانی شێخ مەحموود



ڕاپەڕین لە ناوچەی بارزان تەقییەوە. ڕیشەی ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆژگارێکی پێشتر لەو کاتەی شێخ عەبدولسەلام بارزانی لە ڕووی دەسەڵاتی عوسمانیدا وەستا، ئینجا شێخ ئەحمەدی بارزانی (١٩٣٠) ئەوجا مەلا مستەفای بارزانی لە دەوروبەری جەنگی دووەم ڕاپەڕینی بارزانییان بەردەوام بوو، پێوەندی لە نێوان ئەمانە و فەرمانڕەوایی قازی محەمەد لە کوردستانی ئێران لە ناوەوە بوو تا ئاوارەبوونیان لە ڕووسیا (١٩٤٧).

لە دوای جەنگی یەکەم و سەرنەکەوتنی جەنگەکانی شێخ مەحموود و دروستبوونی دەوڵەتی عیراق چارەنووسی ئەم بەشەی کوردەوارییە بەجۆرێکی دیکە کەوتەوە. ئەنجامی هەموو هەوڵ و تەقەلا و کۆششی نیشتمانپەروەرانی کورد لەسەر ئەوە نیشتەوە سوود لە قانوونی زمانانی ناوچەیی (قانون اللغات المحلیة) وەربگرێ. ئەمە بووە سەرچاوەیێک برێک مافی مرۆڤایەتی و خوێندەواری بۆ کورد دابین کرد، لە قسەکردن بەکوردی، جلوبەرگی قەومی لەبەرکردن، زمانی خوێندنی قوتابخانەکان کوردی بێ، بڵاوکردنەوەی گۆوار و کتێبی کوردی، دامەزراندنی کۆمەڵە و یانەی ڕۆشنبیری، بەشی کوردی لە ئێسگەی ڕادیۆی بەغدا هەبێ، هەندێ شتی دیکەش.

بەڕاستی ئەم بەشە کەمە لە مافی نەتەوایەتی بووە هۆی ئەوەی ماڵی کوردی عیراق لە ماڵی کوردی هەموو ئەو وڵاتانەی کوردیان بەسەر دابەش کرا جیا ببێتەوە. لەبەر ئەوە ڕاستە ئەگەر بووترێ کوردستانی عیراق تا ڕادەیێک بوو بەتاکە مەڵبەندێک بۆ پاراستنی هەموو ئەدگارە نەتەوەیییەکانی کورد، لە دوا جاردا بەگشتی پاراستنی کورد خۆی لە نەمان. ئەم دیاردەیەی کوردستانی عیراق ڕیشەی مێژوویی هەیە، زیاتر لە سەدساڵێک پێش جەنگی یەکەمی گیتی، سامانێکی نەتەوایەتی لە ئەدەبی کوردی لە ناوچەی سلێمانی دروست بوو، ئەم دیاردەیە یارمەتییێکی زۆری دا بۆ ئەو چۆرە ئازادییەی لە کوردستانی عیراق لە ناوەوە بوو ئەدەبی کوردی بەردەوام بێ و زیاتر پەرە بستێنێ و ببێتە ڕەمز بۆ هەموو نەتەوەی کوردی دیکەی پارچەکانی کوردستان.

## کوردستانی سووریا

کوردستانی سووریا ڕەنگدانەوەی کوردستانی باکوورە چونکە پارچەیێکە لە خاکی جزیرەی کە بەشی زۆری کەوتۆتە ناو تورکیای ئێستاوە، لەیەک نەچوونیان تەنیا ئەوەیە سووریا وڵاتێکی عەرەبییە و تورکیا تورکییە. لە هەموو ڕوویێکەوە جیاوازییێکی ئەوتۆ لە نێوان کوردی کوردستانی تورکیا و کوردی سووریادا نییە. بەچاوێکی نزم تەماشای کورد دەکەن،

سیاسەتی نەتەوەیی شۆڤێنییەتی عەرەب بەرامبەر بەکورد بەکار دەهێنرێ. نایانەوێ ڕەگەزنامەی هاووڵاتی سووریا بدەن بەکورد، ناوی کوردی بۆ کوڕ و کچ لە سووریا قەدەغەیە. تەنیا ئەوە هەیە لە ماوەی پێش جەنگی دووەم و لە ڕۆژانی جەنگدا حاڵی کورد باشتر بوو، بۆرە سەربەستییێک لە ناوەوە بوو چونکە لەو سەردەمەدا سووریا لە لایەن فرەنساوە داگیر کرا بوو تا ساڵی ١٩٤٧ لەوێ کشایەوە. لەو کاتەدا کورد هەندێ مافی هەبوو، بزووتنەوەییێکی خوێندەواری لە ناوەوە بوو، شاعیر و نووسەریان لێ هەڵکەوت، کۆمەڵێک کتێب و کۆواریان بەزمانی کوردی و ئەلفوبێی لاتینی بڵاو کردەوە. بەدرخانییەکان و شاعیر و نووسەر و ڕۆشنبیرانی کورد دەوری گرنگیان هەبوو لەو بزووتنەوەیەدا.

### کوردستانی ئێران

بەڕاستی کوردستانی ئێران بارودۆخێکی تایبەتی هەبوو، ئەگەر بووترێ گۆڕانێکی ئەوتۆ بەسەر کوردی ئەوێدا نەهاتووە لە سەردەمی فەرمانڕەوایی سەفەوی و قاجار و پەهلەوی و خومەینییەوە، ئەم قسەیە لە ڕاستی دوور ناکەوێتەوە. لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم بەپلەی یەکەم بزووتنەوەی ئەدەبی و ڕۆشنبیری و بەپلەی دووەم هەستی نەتەوەیی کوردی لە ناوچەی موکریاندا هەبوو. ناوچەکانی دیکەی دەوروبەری شاری سنە (لە ئێران ئوستانی کوردستانی پێ دەڵێن) و کرماشان و ئیلام و لوڕ تا کەنداو لەو سەردەمەدا کپ بوو، جموجۆڵی ڕۆشنبیری زۆر کەم بوو، ئەدەبی میللیی سەرزار زۆر پێشکەوتوو بوو. شاعیر و نووسەر بەپەنجەی دەست دەژمێران.

هەرچۆنێ بێ دەتوانرێ ناوچەی موکریان بەنوێنەری هەموو کوردی ئێران دابنرێ. موکریان نێوەندێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری بوو، ڕێکخراوێکی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری لێ دروست بوو. کۆمارێکی کوردی سەربەخۆی تەمەن کورتی یەک ساڵەی لێ دامەزرا (١٩٤٦)، هەندێ ڕۆژنامە و کۆوار و کتێب و چاپەمەنی کوردی لێ چاپ کرا و شاعیر و نووسەری گەورەی تێدا هەڵکەوت.

لێرەدا ڕاستییێکی مێژوویی دەست دەکەوێ، ئەویش ئەوەیە لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم لە دوای جەنگی یەکەمی گێتی بەهێزترین و بەرچاوترین بزووتنەوەی ئەدەبی کوردی لە کوردستانی عێراقدا بووە. ئەم کوردستانە بوو بەڕەمز و نوێنەری کوردستانی گەورە. لە دوای ئەم تا پلەییێکی ئاسایی کوردستانی ئێران بەشداری لەو بزووتنەوەیە



کردووە. جگە لەمە لەو ڕۆژگارەدا هەندێ نێوەندی دیکە لە ناوەوە بوون هی وەکو بزووتنەوەی ئەدەبی کوردی لە سووریای لە دەوروبەری جەنگی دووەمی گێتی، هەروەها بزووتنەوەی ئەدەبی و ڕۆشنبیری لە ناو کوردی قەفقاسی ڕووسیا. لە بەرگێکی دیکەی ئەم کتێبە باس لەو بزووتنەوانەش دەکرێ.

# بەشی دووەم

# میهرەجانی شیعری نوێ

# و

# پەرەسەندنی پەخشان

## میهرەجانی شیعری نوێ

دوای دابەشکردنی خاکی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی لە ئەنجامی جەنگی یەکەمی گێتی، کوردستان بوو بەچوار پارچە، هەر پارچەییێکی لەو ناو قەوارەی وڵاتێکەوە: تورکیا و ئێران و عیراق و سووریا. دیارە ئەمە کارێکی ڕەشبینی کردە سەر خەباتی ڕزگاری نەتەوەیی کورد. هەروەها زیاتر گیانی نەتەوەیی کوردی جووڵاندەوە و کاری کردە سەر گۆڕان و پەرەسەندنی بەرهەمی ئەدەبی کوردی لە ڕووی سیاسەت و کۆمەڵایەتییەوە. دابەشکردن و دابڕانی بەشەکانی خاکی کورد کاری کردە سەر ئەو بەشە کوردەی لەگەڵ تورک و فارس و عەرەب دەژیا. بەم جۆرە زمان و ئەدەبی کوردی لەو وڵاتانەدا بوو بەدووەم یا بەیەکجاری قەدەغە کرا.

ئەم هەموو گۆڕانکارییە بوو بەهۆی ئەوەی هەندێ خاسیەتی هەرێمی لە ئەدەبی کوردی ئەم جێگە جیاوازانەدا پەیدا ببێ، واتە ئەدەبی هەر لایێک شێوە و ناوەرۆکێکی تایبەتی خۆی پەیدا کرد و لە ئەوانی دیکە جیا بووەوە، ئەگەرچی لە بنجیشدا بێ گومان هەمووی هەر یەک ئەدەب بوو.

لە بیستەکانی سەدەی بیستەمەوە کە خەباتی ڕزگاری نەتەوەی کورد زیاتر پەرەی سەند و بیروڕای کۆمەڵایەتی نوێ سەری هەڵدا، لە ئەدەبدا ناوەرۆک و بابەتی نیشتمانپەروەری پەیدا بوو. وەک ئاشکرایە ئەم بیروڕایانە لە سەدەی هەژدەم لەسەر دەستی ئەحمەدی خانی و لە سەدەی نۆزدەم لەسەر دەستی حاجی قادری کۆیی وەک پێشبینییێک لە شیعری کوردیدا کەوتنە ناوەوە. بەڵام لەو دوو سەردەمەدا ئەو بیروڕایانە ماکی بەردەوامییان لەگەڵ خۆیاندا هەڵنەگرتبوو، چونکە بنج و بناوانێکی ئابووری و کۆمەڵایەتی و مێژوویی بتەو بۆ هێنانە دی ویست و ئارەزووی ئەم دوو شاعیرە لە کۆمەڵی کوردەواریدا لە ناوەوە نەبوو، بۆیە هیوا و ئامانجی ئەو بەرهەمانە لە ڕووی پراکتیکی سیاسییەوە نەگەیشتنە ئەنجام و



لە دواییدا بەرهەمەکان بوون بەبەشێک لە سامانی نەتەوەیی. لە دوای جەنگی یەکەمی گێتی بیروڕاکانی خانی و حاجی جارێکی تر لە دایک بوونەوە و پەرەیان سەند و پەروەردەبوون، چونکە ئەم جارەیان لە سەردەمی سروشتی خۆیدا پەیدابوونەوە.

مێژوونووسانی ئەدەبی کوردی لە ماوەی نێوان هەردوو جەنگی سەدەی بیستەمیان بەتەواوی نەکۆڵیوەتەوە، هەروەها وەکو قۆناغێکی ژیانەوە و ڕاپەڕین تەماشایان نەکردووە. چونکە بەڕاستی ئەمە گرنگترین قۆناغە لە پەرەسەندن و گۆڕانی ئەدەبی نەتەوەیی کورد. ئەو سەرچاوەیەی لە ناوەوە هەبێ لەم لایەنەوە ئەوەیە باس لە هەندێ شاعیری گەورەی ئەم قۆناغە کراوە. ئەو سەرچاوەیەی لە بەردەست دایە لەم لایەنەوە زۆر کەمە بەگشتی بۆ زانین و ناسینی ئەدەبی کوردی. ئەوەی لە هەمووی نالەبارتر بێ ئەوەیە باس لە ئاشنایەتی ئەدەبی کوردی لەگەڵ ئەدەبی نەتەوەکانی ئەوروپا و عوسمانی و تورکی پێشکەوتوخواز نەکراوە. بێ گومان کاریگەری ئەمانە لەسەر بەرهەمی نووسەرانی کورد بەهێز بووە، بەهۆی وەرگێڕانی هەندێ لە بەرهەمەکانیان بۆ زمانی کوردی. لە ڕۆژنامە و کۆواری کوردی ماوەی نێوان هەردوو جەنگ، بەتایبەتی لە کۆواری «گەلاوێژ» بەڕێکوپێکی هەندێ لە بەرهەمەکانی پووشکین و شیللەر و لامارتین و گۆتێ و بایرون و هی دیکە وەرگێڕاونەتە سەر زمانی کوردی و بڵاو کراونەتەوە. ئاشنایەتی پەیداکردن لەگەڵ ئەدەبی نەتەوەکانی ئەوروپا زیاتر لە ڕێگەی ئەدەبی تورکییەوە بووە، دیارە ئەم ئەدەبە پێش ئەدەبی کوردی لە سەدەی نۆزدەمدا ناسیاوی لەگەڵ ئەدەبی ئەوروپادا پەیدا کردووە. ئەدەبی کوردی زۆری لەم ئەدەبە بەرز و ڕەنگاوڕەنگانە وەرگرت، بەم جۆرە ڕەسەنایەتی و سەربەخۆیی خۆی بەهێزتر کرد و بەرهەمی قووڵتر و هونەروەرتریشی هێنایە ناوەوە.

بەگشتی ئەدەبی کوردی ماوەی هەردوو جەنگی گێتی زیاتر چووە ناو ژیانەوە و وێنەی ڕاستەقینەی ڕەنگڕێژ کرد. هەروەها کەوتە گەڕان بەشوێن هەستی دەروونی ناوەوەی ئادەمزاد. لە ئەدەبی کوردی ئەو ڕۆژگارەدا دوو ڕێباز پەیدا بوو، یەکەمیان گۆرانی نیشتمانی (شیعری سیاسی)؛ دووەمیان شیعری ڕۆمانتیکی کە لە ژێر کاریگەری ڕۆمانتیزمی ئەوروپاوە سەری هەڵدا.

ئەدەبی کوردی نوێ لە ماوەی گۆڕڕانیدا بەدوو پلەی دیار تێپەڕ بوو: یەکەمیان قۆناغی گۆڕڕانی ناوەرۆک بوو، شێوە و قاڵبی کلاسیکی وەکو خۆی مایەوە، وەکو ئەوەی کە ڕستەی کۆن بەکار دەهێنرا، بەڵام ئەوەی تازە بوو لەو شیعرەدا ئەوە بوو ناوەرۆکی نوێ کەوتە ناوەوە، واتە قاڵبە کۆنەکە بۆ ناوەرۆکی نوێ بەکار دەهێنرا. جوانترین و بەرزترین

نموونەی ئەم جۆرە شیعرە نوێیە بەرهەمی نوێنەرانی نەوەی کۆنی شاعیرانی کوردی هاوچەرخ بوو؛ هی وەکو: ئەحمەد حەمدی ساحێبقڕان و ئەحمەد موختار جاف و عەلی کەمالی باپیر و هی دیکە.

پلەی دووەمی گۆڕانی شیعری کوردی لە بینای بنچینەیی شیعردا بوو: لە ڕوخسار و ناوەرۆک، لە هەموو کەرەستەکانی شیعر، لە زمانی کوردی پەتی و ڕەوانبێژی و کێشی سیلابی خۆماڵی و قافیەی ڕەنگاوڕەنگ. شیعری نەوەی شاعیرانی تازەی کورد وەکو: نووری شێخ ساڵح و عەبدوڵڵا گۆران و ڕەشید نەجیب و بێکەس و دڵدار و هی دیکە نموونەی ئەدگاری شیعری کوردی نوێی ئەم قۆناغە بوون. کەچی بەرهەمی نوێ لە شاعیرانی دیکەی کورد گەلێک تێکەڵاوە، یاخود لە چەند پلە و قۆناغێکی جیاواز پێکهاتووە، ڕەنگدانەوەی کۆمەڵێک قوتابخانە و بیروباوەڕ و ئیدیۆلۆجییەتی جیاوازە، ئەمە لە شاعیرێکی وەکو پیرەمێرد و هی تر دەردەکەوێ.

لە سەدەی هەڤدەمدا دەتوانرێ لە بەرهەمی ئەدەبی شاعیری کلاسیکی ئەحمەدی خانی شیعری بەرز بدۆزرێتەوە وەک نموونەی نیشتمانپەروەری. ئەحمەدی خانی وێنەی ئامانجی کورد دەکێشێ لە پێناوی ڕزگاربوون لە داگیرکردن و زۆرداری دەسەڵاتی تورک و عەجەم. ئەم بیروباوەڕانە جارێکی دیکە زیندووبوونەوە لە بەشێک لە بەرهەمەکانی حاجی قادری کۆیی لە نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەمدا.

### گەیشتن بەئامانج

بابەت و ناوەرۆکی نیشتمانپەروەری لەم قۆناغەی لێرەدا باسی لێوە دەکرێ ڕەنگدانەوەی ڕاستەوخۆی ڕووداوە سیاسییە گرنگەکانە لە ناو کۆمەڵی کورددا.

سوپای ڕزگاری شێخ مەحموود لە ساڵی ١٩٢٢ هاتە ناو شاری سلێمانی و سەربەخۆیی وڵاتی جاڕ دا. ئەمە کارێکی گەورەی کردە سەر هەموو چینەکانی کۆمەڵی کورد. شاعیران بەسەر ئەو ڕۆژە پیرۆزەیان هەڵ وت. شاعیری ڕەند عەلی کەمال باپیر هەست و نەستی خۆشیی خۆی لەم بابەتەوە بەم جۆرە دەربڕیوە:

وا موبەددەل بوو بەخۆشی دەوری ئیزمیحلالی کورد
خاتیمەی هات و نەما ئەییامی ئیستیزلالی کورد
بۆ گەیشتن بەم دەمە بەم ڕۆژە بۆ ئامالی کورد
حەمدی بێ حەد بۆ خودا دیم ڕۆژی ئیستیقلالی کورد



لە شیعری ماوەی هەردوو جەنگ هەست و خەیاڵی شاعیران بەڕووداوی سیاسی و مێژوویی و کۆمەڵایەتییەوە بەسترابووەوە، بۆیە ئەم قۆناغە بوو بە لە دایک بوون و پەرەسەندنی غەزەلی نیشتمانی (لیریکی نیشتمانی) و پەیدابوونی شیعری سیاسی.

هەڵسانی شێخ مەحموود و دامەزراندنی دەسەڵاتی کورد کارێکی گەورەی کردە سەر ئەدەبی کوردی. لە سەرانسەری مێژووی کورد هیچ ڕووداوێکی لەم بابەتە ئەم کارەیان نەبووە. بێ گومان ئەمە زیاتر ڕەنگدانەوەی ئەوەیە سلێمانی لەو سەردەمەدا و تا ئێستاش بەنێوەندێکی گرنگی ئەدەبی و خوێندەواری و ڕۆشنبیری کوردی حسێب دەکرێ. شیعرێکی زۆر لەم بابەتەوە وتراوە، لەوانە دەبێ پەنجە بۆ شیعرە هەرە بەناوبانگەکەی شوکری فەزلی درێژ بکرێ «سەرەتای ئیش هەموو یەکبوونە...». ئەم بەرهەمە نیشانەی ژیری و هوشیاری شاعیرە بەرامبەر تێگەیشتنی سیاسەتی ڕۆژانەی ئەو سەردەمە. شاعیر ڕوو دەکاتە شێخ مەحموود و پێی دەڵێ: دروستکردنی دەسەڵات لە پاراستنی ئاسانترە، مەلیک پێویستە لە ژێر باڵی دەستوور و قانوون فەرمانڕەوایی بکا چونکە وەکو شای شەترەنج وایە. (لە لاپەڕەییێکی دیکەی ئەم کتێبە تێکستی شیعرەکەی شوکری فەزلی بڵاو کراوەتەوە). هەر چۆنێ بێ دامودەسگای شێخ مەحموود هەڵوەشێنرایەوە و ئاواتەکانی نەهاتنە دی.

### ونبوون

پەژارە و دەردی ونبوون و ڕەشبینی لە شیعری ناریدا هەناسە دەکێشی، وەکو سەر لێ شێواو بیر دەکاتەوە و بەلای ئەوەوە ئەو دەردەی کورد تووشی بووە دەرمانی نییە:

من ئەدیبی کوردم و ناوم نییە
کوردم و غافل لە ناوی بێ خەبەر
کوردە! تۆ مەحکوومی بۆ تورک و عەجەم
کوردە! بێ فیکر و خەیاڵ و بێ ئەسەر

شاعیرێکی دیکەی کورد هەر بەچاوی شاعیری پێشوو تەماشای مەسەلەکە دەکا، محەمەد حەسەن بەرزۆ لە شیعرێکیدا دەڵێ:

کی دییەن یاران! یاران کی دییەن
کەس لەی دنیایە بژی بێ وەتەن
بژی وەبێ کەس دەلویەتی و برسی
بێکەس و هامبار و بێ هەوال پرسی

کی دیەن برال لەی زامی سەختە
لە ڕۆژی ئەزەل تا وە ئەی وەختە
لە ناو میللەتان سەراسەر دنیا
کورد وەبێ وولات دەربچوو تەنیا

شاعیرێکی دیکەی کورد ساڵح یووسفی ڕۆشنبیر و سیاسی بەلایەوە هێز و دەسەلاتی بێگانە تەگەرەییێکی یەکجار قورس بوو لە نەگەیشتنی کورد بەچارەنووسی خۆی، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا هەرگیز کۆڵ نادا و نایەوێ دان بەم واقیعە نالەبارەدا بهێنێ، لە شیعری «کەلا هەبلێرێ»دا دەڵێ:

چەندە ناخۆشە خیسی و بن دەستی
سەرشۆری و ژاری بێ هش و مەستی
سستی و بێ کاری و پرسا فەرەستی
بێ مالی و وولات بێ ووچ ئو پەستی

***

کەلا هەبلێرێ پر ئاخ و ئۆیی
بیانی مێرن ڕەزیل بوون خۆیی
کانی هەوارێت قادرێ کۆیی
هونەر بەرزە بوون مێرانیا چوویی

لێرەدا شاعیر نالەباری کورد لە قەڵای هەولێری غەمگین دەبینێ و خەڵکی هوشیار دەکاتەوە بۆ ئەوەی داواکانی حاجی قادری کۆیی جێبەجێ بکەن.

### کارەسات

لە ساڵی ١٩٢٥ کورد بەسەرۆکایەتی شێخ سەعید جارێکی تر هەڵسایەوە، لە دژی دەسەڵاتی تورک. سوپای حوکوومەتی تورکیا بەزەبری چەک و سیلاح و جبەخانەی زۆر و پێشکەوتوو خەڵکی شۆڕشگێڕیان لە هێز خست. گوندی کورد سووتێنرا و ڕووخێنرا، خەڵکی کورد ئاوارە کران. سەرنەکەوتنی ئەم هەڵسانە شاعیرانی کوردی جووڵاند و دڵی سووتاندن، ئەو هەلەی بۆیان هەڵکەوتبوو وایان دەزانی پێی دەگەنە مەبەس و ئامانجی خۆیان جارێکی تریش بزر بووەوە، ئەم جارەیان بۆ ماوەییێکی درێژ.



گەلێ لە شاعیرانی کورد تەنیا لایەنی شیوەن و گریان و فرمێسکیان گرت، وێنەی نالەباری ئەو نەگبەتییەیان دەگرت ئەوەی جەندرمەی تورک لە کوردستانا لاشەی کوردی لە ناو گۆمی خوێناودا نوقوم دەکرد.

نووری شێخ ساڵح لە ساڵی ١٩٢٦ لە شیعری «ساڵی گوزەشتە» لەسەر مردوو و کوژراوانی ڕۆڵەکانی کوردستان فرمێسک دەبارێنێ، ئەم شیعرەی پڕ لە ناسۆر و دەرد و ئازاری ژیانە، شاعیر بەو ساڵی ڕابردووە دەڵێ کە ساڵی ١٩٢٥ە:

سەیری کە چەن لاشەیی لاوی وەنت دی
خۆت وورد بەرەوە چەن سەری چیا و چەن دەوەنت دی
چەن خانەیی وێران و دڵی پڕ میحەنت دی
چەن نالەیی ژن لاشەیی بێ کەفەنت دی
برسی و ڕەش و ڕووت غەم زەدە چەن شۆخ و شەنت دی
ئەی ساڵی گوزەشتە! جیگەرت لەت لەتی غەم بێ
نەتبینمەوە مەسکەنەکەت شاری عەدەم بێ

لەم ماوە سەخت و دژوارەدا، ڕەشبینی باڵی بەسەر خوێندەواری کورددا کێشا بوو شیعری پڕ لە هیوا و ئامانجی شۆڕشگێڕیش بەدی دەکرا. بۆ بەڵگە مامەند کەرکووکی لە شیعرێکیدا وەرامی شیعرەکەی پێشووی نووری شێخ ساڵحدا ڕوو دەکاتە شاعیر و پێی دەڵێ گریان پێویست ناکا بۆ مردنی قارەمانان، بەڵکو پێویستە خۆت ئامادە بکەی بۆ هێرش و هەڵمەتێکی دیکە بۆ سەر دوژمن. مردن لە ڕێگەی ئازادی و سەربەستی نیشتمان شەرەفێکی گەورەیە. ئامادەبوون بۆ خەبات ڕێگای تاک و تەنیایە بۆ سەربەستی، چونکە ئاڵای ئازادی بەخوێن ڕەنگ نەکرێ هەڵناکرێ، مامەند کەرکووکیش وەکو نووری شێخ ساڵح ڕوو دەکاتە ساڵی ڕابردوو و دەڵێ:

ئەم کەللە بەنرخ و بەدڵە لاو و شەهیدان
تۆوێکە کە چینراوە لە بۆ ژین و نەجاتە
ئەو خوێنە ڕژاوانە و فرمێسکی هەتیوان
یارا لە بۆ شین بوونی وەکو ئاوی حەیاتە
ئەم ساڵەیە ساڵی فەرەح و شادیی و خەندان
ئەم ساڵەیە دەشکێنێ هەموو بەند و کەمەندان

## کوردایەتی

شیعری نیشتمانی و سیاسی کوردی لە بیستەکان - چلەکانی سەدەی بیستەمدا دەنگدانەوەییێکی گەورەی سیاسی - کۆمەڵایەتی بوو، کارێکی زۆری کردە سەر بەهێزبوونی بیری کوردایەتی لە ناو زۆرینەی خەڵکی کوردستان.

شاعیرانی کورد شیعریان بۆ پڕوپاگەندە دەهۆنییەوە لە دژی تۆرانیزم (پان تورکیزم) و پان ئێرانیزم و بیروباوەڕی دواکەوتوو بەناوی ئاینەوە بۆ چەوساندنەوەی میللەتی کورد، بەبەڵگەی ئەوەی «نەتەوایەتی» لە ئایندا نییە. لە ساڵی ١٩٢٩ شێخ سەلام بانگ و هاوارێکی نیشتمانپەروەری گەیاندە دایکی هەموو تاکێکی کورد:

خەریتەی هەموو خاکی کوردستان
دایک بەدەرزی و دەزوو و دروومان
بنووسێ لەسەر سەر بێشکەی مناڵ
هەر بەکوردستان بێتە گڕوگاڵ
لە بێشکەی وادا چاو هەڵنەهێنێ
درۆیە هەڵسێ تۆڵە بسێنێ

بەختیار زێوەر لە شیعری «دیارییێک بۆ نیشتمان» ئەوە دێنێتەوە یاد، یەکەمین وشەی مامۆستا لە قوتابخانە فێری کردووە «من سەری خۆم دەکەم بەقوربانی لە پێناوی تۆ، ئەی کوردستان!». ئەم شیعرە و بەرهەمی ئەدەبی دیکەی بەختیار زێوەر کە بۆ منداڵ و مێردمنداڵی کورد وتراون بوون بەهەوێنی هوشیارکردنەوە و بەهێزکردنی گیانی خەبات لە پێناوی خاک لە لای ئەو منداڵانەی هیوای دوارۆژ بوون:

لە بیرمە وەک شتی مەعلووم
مناڵ بووم عاشقی تۆ بووم
کە مامۆستام
لە ڕێز داینام
ووتی ئەی خام
بنووسە جوان
فیدات بم خاکی کوردستان



لە غەزەلی نیشتمانیی ئەم ماوەیەدا ناوەرۆکی ئەڤین و دڵداری بەرامبەر سامانی نەتەوایەتی و ڕۆشنبیری میللی ئاشکرا و دیارە. عەبدوڵڵا گۆران لە شیعری «دەروێش عەبدوڵڵا»دا بەهەناسە و هەواییێکی ڕۆمانتیکییانە گفتوگۆ لەگەڵ شمشاڵژەنی میللیی ناوداری کورد دەروێش عەبدوڵڵادا دەکا، پێی دەڵێ ئادەی بەگۆرانی و ئاوازی کوردی گیانم بێنە جۆش و خرۆش:

ئەوەندەم بیست لە مۆسیقا خرۆشی ڕووحی بێگانە
میزاجی کوردەواریم تێک چووە دەروێش عەبدوڵڵا
دەخیلت بم دەسا بەو لاوک و ئای ئای و حەیرانە
شەپۆلی زەوقی میللی پڕ دەروونی مات و چۆڵم کە
لە بیتهۆڤن گەلێ زیاتر بە رووحم ئاشنای وەڵڵا
دە ئەی دەروێش! سکاڵاییێک لەگەڵ رووحی کلۆڵم کە

شاعیرێکی دیکەی موکریانی کوردستانی ئێران شیعرێکی داناوە بەگیانێکی شۆڕشگێڕی و چوونە مەیدانەوە تیژ کراوە. لەو شیعرەدا هێمن سوێند دەخوا هەتا هەتایە بیروباوەڕی ئازادیی نیشتمانی لە یاد ناکا و کۆشش و خەبات دەکا بۆ هێنانە دی ئەو ئازادییە:

گەرچی تووشی ڕەنجەڕۆیی و حەسرەت و دەردم ئەمن
قەت لە دەس ئەم چەرخە سپڵە نابەزم مەردم ئەمن
عاشقی چاوی کەژاڵ و گەردەنی پڕ خاڵ نیم
عاشقی کێو و تەلان و بەندەن و بەردم ئەمن
من لە لۆمە و تانە و زنجیر و دار باکم نییە
لەت لەتم کەن بمکوژن هێشتا دەڵێم کوردم ئەمن
گەر لە برسان و لەبەر بێ جلکی ئەمرۆ ڕەق هەڵێم
نۆکەری بێگانە ناکەم تا لەسەر هەردم ئەمن

## ئامۆژگاری

هەندێ لە شاعیرانی کورد هەوڵیان داوە هۆی بەدبەختی میللەت و سەرنەکەوتنی لە خەباتیدا دیاری بکەن. شاعیران هۆی دواکەوتنی کوردیان لەوەوە دەدی، زۆربەی هەرە زۆری خەڵکی کورد ڕێک نەخراون و ئاراستەی زانین و زانیاریی ڕاست نەکراون و هەر وا بەبێ سەواد و نەخوێندەوار ماونەتەوە، لەبەرئەوە کاری هەرە بنچینەیی بۆ ڕزگاری خوێندن و خوێندەوارییە. ئەم بیروڕایە تەنویرییە لە شیعری شێخ سەلام ڕەنگی داوەتەوە. لە ساڵی ١٩٣٨ لە شیعرێکیدا بەڕوخسار کلاسیکی و بەشێوەی جووت قافیە (مەسنەوی) لەگەڵ کورددا دەدوێ و دەڵێ:

بخوێنن پێ بگەن کۆمەڵ بدەن ساز
هەزاران ڕووحی کاوە دێتە پەرواز
بەبەریا بۆ بچم با زۆر نەچم دوور
کەریم خان و سەلاحەددینی مەشهوور
بەڵێ دوو شێری خاکی کوردەوارین
لە ناو شاهانی دنیادا دیارین
ئەڵێن دوو پڵنگی خاکی پاکی کوردن
بەڵام بۆ خزمەتی بێگانە مردن

شیعری تەنویری لە بەرهەمی مەلا محەمەدی کۆییدا دەورێکی دیاری هەبوو لە ئەدەبی کوردیدا لە پاش جەنگی یەکەمی گیتی. لە شیعریدا هانی ئەوەی دەدا خەڵکی منداڵیان بنێرنە قوتابخانە بۆ ئەوەی ببن بەخوێندەوار. ئەمەی تەنیا بۆ کوڕان نەبوو بەڵکو بۆ کچانیش بەشتێکی پێویستی دەزانی. لەو کاتەی کە لە کۆیە یەکەمین قوتابخانە کرایەوە لە سەردەمی دەسەڵاتی مەلیکی عیراق مەلا محەمەد لەو کەسانە بوو بۆ یەکەمین جار کچی خۆی بردە قوتابخانە بۆ خوێندن.

مەلا محەمەدی کۆیی لە هاوشارەکەی خۆی شاعیری ناودار حاجی قادری کۆیی بیروڕای سیاسی وەرگرتبوو، لە شیعردا لە ناو حاجی تواوبووەوە و نوێنەری شیعرە نیشتمانییەکانی بوو لە ڕووی ڕوخسار و ناوەرۆکەوە. مەلا محەمەد لاسایی مامۆستای خۆی دەکردەوە، شیعری بەشێواز ئاسان بوو بەمانا پێوەندییان بەهیوا و ئامانجی میللەتەوە هەبوو، لەبەرئەوە خەڵکی تێیان دەگەیشت.



دەوڵەتە ئەمپریالیستە گەورەکانی ئەوروپا تەنیا دەستیان لە دابەشکردنی وڵاتی کورد نەبوو بەڵکو پشتگیری دەوڵەتە کۆنەپەرستەکانی تورکیا و ئێران و عیراقیان دەکرد لە بەربەرەکانی نەتەوەی کورد و چەوساندنەوەی لە هەموو ڕوویێکی ژیاندا. مەلا محەمەد لە شیعرێکیدا بەتیژی هێرش دەباتە سەر ئەمپریالیستی بێگانە و ڕوو دەکاتە میللەتی خۆی و بانگیان دەکا بێگانە دەربکەن:

ئەم خاکە دایکی تۆیە کەوتە دەستی ئەجنەبی
ئەی کوردی ساحیب غیرەت تۆ چلۆن ڕازی دەبی
بۆ خۆت ئەوا دەبینی دوژمن ئەرزت دەکێڵێ
پاش چەند ساڵێکی تر هیچت بە دەست ناهێڵێ

شاعیر مەبەسی لە ئەجنەبی کۆڵۆنیالیستی داگیرکەرە ئەوەی چاوچنۆکانە و بێ بەختانە خاکی دەوڵەمەند و بەپیت و بەرەکەت تالان دەکا. لە ئەنجامی ئەمە خاوەنی ئەم سامان و دەوڵەمەندییە کە میللەتی کوردە لە کۆلیتی هەژاریدا دەژی و ڕەنج دەکێشێ بۆ لەتێ نان. خاوەن شیعر دەڵێ ئەرکی پیرۆزی هەموو کوردێک ئەوەیە خەباتێکی بێ وچان بکا لە پێناوی یەکسانیدا.

خۆشەویستی بێ پایان بەرامبەر بەنیشتمان، ئارەزووی بەکوڵ بۆ ڕزگارکردنی نەتەوە شیعری شۆڕشگێڕی دروست کردووە. بەشێک لە بەرهەمی شیعری عەبدوڵڵا گۆران لە ماوەی بیستەکان - چلەکاندا وەکو سروودێکی شۆڕشگێڕی خۆیان دەنوێنن، بۆ بەڵگە شیعری «دەمی ڕاپەڕینە» یەکێکە لەم سروودانە:

دەمی ڕاپەڕینە، دەمی ڕاپەڕین
هەتا کەی بەسستی و بەپەستی بژین
پەلامارێ ئەی کورد! ئارەق ڕشتنێ
لە دڵ کرمی ناکۆکی دەرکردنێ
بەیەک بوونە گشت
پتەو ئەبێ پشت

لەو ماوەیەدا شیعری شۆڕشگێڕی دەبێتە مەبەسێکی گرنگ لە ئەدەبی کوردیدا. بۆ بەڵگە مەلا مارفی کۆکەیی (١٨٧٣ - ١٩٤٦) لە شیعرێکیدا دەڵێ:

گەر موتتەفیقەن دەس بدەنێ نەیکەنە قەڵبی
یەک قووەتی پێ لازمە ئەم بەند و کەمەندە

***

ئەو سەدد و تەلیسمانە بە گورزان بشکێنن
لەت لەت بکەن ئەم قەیدە بەشمشێری بڕندە
ئەو لەززەتی ئازادیی و حووریەتی نەفسی
سەد مەرتەبە شیرینترە لەو شەکر و قەندە

## ڕەخنەی کۆمەڵایەتی

ماوەی نێوان هەردوو جەنگی گێتی ڕۆژگارێکی گرنگ بوو بۆ بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی پێشکەوتووی هاوچەرخ، بەشێکی زۆری ئەمە کەوتبووە سەر شانی شیعری کوردی. نرخی ئادەمزاد لە کۆمەڵدا، لە بەرهەمە کلاسیکییە کۆنەکاندا لە دەوڵەمەندی و نەژادی بنەماڵەدا دەبینرا، بەڵام لە شیعری نوێدا پێوانە ئەوەیە تاک لە کۆمەڵدا چی سوودێک بەنەتەوەی خۆی دەگەیەنێ. ئەم بیروڕا پێشکەوتووانە بەڕوونی ڕەنگیان لە بەشێک لە شیعری کوردی داوەتەوە. شاعیرانی کوردی ئەم قۆناغە لەم بابەتەوە شیعریان هەیە. لێرەدا کارێکی بەجێیە ئەگەر بەرهەمی شاعیرێکی نەناسراوی کورد بۆ بەڵگە بخرێتە ڕوو: (لە کۆواری «هاواری کورد»، (مەهاباد)، ١٣٢٤هـ/١٩٤٥م بڵاوکراوەتەوە).

بەس خۆت هەڵکێشە بەباوانتەوە
بەس بێ بنازی بەخزمانتەوە
وەرە بەر دیوان قەومی هەژارت
بۆیان بژمێرە کردەوە و کارت
چەن تێکۆشاوی چیت بۆ کردوون
چەن جار تەنگانە دەستت گرتوون
ئەوسا تەرازووی تاسەی هەژاران
پیشانتی ئەدا سووکی یا گران

لە ئەدەبی چلەکانی سەدەی بیستەم مەسەلەی یەکسانی و بەچاوێکی دیمۆکراتییانە تەماشای ژن کردن جێگەیێکی دیاری هەبوو لە کۆمەڵی کوردیدا. ئەمە کێشەیێکی گشتی



هەموو ڕۆژهەڵات بوو. دەبوو ژن پێش هەموو شتێک عەبا و پەچە فڕێ بدا چونکە یەکەمین هەنگاو بوو بۆ وەرگرتنی مافی مرۆڤایەتیی خۆی. ئەم مەبەسە لە ناوەرۆکی شاعیرانی کورد ڕەنگی دابووەوە، فایەق بێکەس لە ساڵی ١٩٤١ «نەسرین»ی کردووە بەدروشمی ژنی کورد و پێی دەڵێ:

نەسرین! دەمێکە داخت لە دڵمە
گیروودەی بەندی ژیانت زوڵمە
وا من پێت ئەڵێم چونکە لەسەرمە
هەڵسە تێکۆشە تا خوێنت گەرمە
سەرپۆش فڕێ دە چی وەعدەی شەرمە

لە چلەکاندا بەشێوەیێکی دیار شیعری کۆمەڵایەتی بەهێز بوو و هاتە ناو میللەتەوە، هەوڵی دەدا هەندێ مەسەلەی کەموکوڕی کۆمەڵایەتی و ئابووری چارەسەر بکا. بازرگانانی بازاڕی عیراق ماوەی جەنگی دووەمی گێتییان بەهەلێکی باش زانیبوو بۆ گیرفان پڕکردن. چەوساندنەوەی خەڵکی هەژار و دەستکورت گەیشتبووە لووتکە، بەتایبەتی دەسەڵاتی میری پشتی دەوڵەمەندی چاوچنۆکی دەگرت و هەژاری بێ چارەی دەچەوساندەوە. هەژاری گەیشتبووە پلەی خوارەوە، ئەم دیاردەیە کارێکی گەورەی کردبووە سەر شاعیر و ڕۆشنبیرانی کورد.

موخلیسی شاعیر (مەلا خەلیلی دووسەرەیی هەولێر) لە تەموینی ڕۆژگارانی جەنگ دەدوێ چۆن دەوڵەمەند و خاوەن پارە جەنگیان بەهەل زانیبوو بۆ ئەوەی لە دابەشکردنی ئازووقە بەیەکسانی نەگاتە دەستی خەڵکی، بەم کارە دەوڵەمەندەکان دەوڵەمەندتر دەبوون و شتی پێویستی ژیانیش نەدەگەیشتە دەستی هەژاران. شاعیر ڕاستەوخۆ پەنجە بۆ مەلیک یا ئەمیری وڵات (ئەو کاتە عەبدولئیلاه بوو) درێژ دەکا و بەبەرپرسیاریدا دەڵێ:

تۆ کەوا سوڵتانی شاهم! مەیلی زوڵمت گەر نەبێ
دەفعەیێ پسیار دەکەی ڕەعیەت کەوا حاڵی کووە
سەیری ئەم گورگانە کە ئەم عاشقانە چۆن دەخۆن
بێ خەبەر ماوە ئەمیرم مەستە یاخۆ نوستووە
شاری تۆیە عاسیمە بۆ شاری مەعشووقانی تر
عاسیمە جێی عەدلەجانا زوڵمی کەی تێدا بووە!

***

مەسئەلەی تەمەوینی عەشقت غەدری زۆر تێدا هەیە
چەن کەسی وەک (موخلیس)ی حەقداری مەحرووم کردووە

لە ناوەڕاستی چلەکاندا لە شیعری کوردی ڕێبازی دیموکراتی و نیشتمانپەروەری بەدی دەکرێ. ئەمە بووە هۆی ئەوەی چوارچێوەی بیری کوردایەتی و نیشتمانپەروەری فراوانتر بێ. شیعر هاتە دەنگ و کەوتە ئەوەی لەسەر مافی هەژار و بۆرەپیاوان بکاتەوە. ناوەرۆکی دژی ئەمپریالیزم و چوونە ناو ژیانی کۆمەڵایەتیی نالەبار زیاتر شیعریان بۆ پێشەوە برد و گیانێکی جەنگاوەری و شۆڕشگێڕییان خستە ناویەوە.

لە بابەت لایەنی هونەرییەوە بڕێک لە شیعری کوردی ئەو قۆناغەی باسی لێوە کرا بەهێز نەبوو، سادە و بێ ڕەوانبێژی بوو، چونکە ناوەرۆکیان بەرەو رووی نەخوێندەوار و کەم خوێندەوار دەکرا. ئەم جۆرە شیعرە لە ئەدەبی نەتەوەکانی دیکەی گێتیشدا هەر بەم جۆرەیە، لەبەرئەوەیە دەکرێ ئەم بابەتە شیعرانە بخرێنە خانەی شیعر پەروەردەیی (دیداکتیکی)یەوە، بابەتێکە لە هونەری نەزمی (النظم) عەرەبییەوە نزیکە.

## شیعری ڕۆمانتیکی

لە ماوەی بیستەکان – چلەکانی سەدەی بیستەم لیریکی تازەی ڕۆمانتیکی کوردی پەیدا بوو. ناوەرۆکە کۆنەکانی دڵداری و نائومێدی و غەم و پەژارەی ژیان و جوانی سروشت بەردەوام بوون، بازاڕیان هێشتا گەرم بوو و شاعیری باش لەم لایەنەوە لە ناوەوە بوون. بەڵام بەگشتی خەڵکی کورد و بەتایبەتی نەوە تازەکان لە شاعیرانی کورد لە قاڵبی ئامادەکراوی کلاسیکی دوور دەکەوتنەوە، بەلای ئەمانەوە ڕاستی و ڕووداو ماکی ئەدەبی نوێیە. بۆ بەڵگە سروشت وەکو ڕووداوێک لە پێناوی ڕوونکردنەوەی بیری بەرهەم و دەرخستنی هەستی ناوەوەی قارەمان بەکار دەهێنرێ.

پیرەمێرد لە بابەت ڕووداوەکانی ڕاپەڕینی ١٩٢٥ی باکووری کوردستان دەڵێ:

ئەستێرە بەرزەکان ئەدرەوشێنەوە بەشەو
وەک من بەداخەوەن نە سرەوتیان هەیە نە خەو

***

بام ڕاسپارد بڵێ کە خەفەت بۆچ ئەخۆن ئەوان
وەک ئێمە نین نزیکتری لای بارەگای خوان

***



ڕاسپێرییان نووسی بوو بەشەونم لەسەر گیا
تا ئاسمان پریشکی بەدی ئێوە هەڵپڕژا
هاواری کوردەکانی سەروو گەییە ئاسمان
بەو دووکەڵی هەناسەیە ئاو دێ لە دیدەمان

وێنەیێکی دیکەی نموونەی شیعری بەرزی ڕۆمانتیکی نوێ، دیسانەوە لە بابەت ڕووداوەکانی باکووری کوردستانەوە «ئەم ئاسمانە شینە»یە دراوەتە پاڵ پیرەمێرد، ڕاستییەکەی ئەوەیە ئەم بەرهەمە کۆپییە یا نموونەیێکی دیکەی هەیە بەناوی شێخ ئەحمەدی سەر بل ئاوایی بڵاو کراوەتەوە (دیاری کۆمەڵەی ژ. ک. بۆ لاوانی کورد، مەهاباد، ١٣٢٢ھ/١٩٤٣م).

گومان لەوەدا نییە هەر یەکێک لەم دوو شاعیرە ئەگەر پێشی ئەوی دیکە شیعری دانابێ، شاعیرەکەی تر بەدەسکارییەوە دایڕشتۆتەوە. هەردوو شیعرەکە لە ڕووی هونەرییەوە بەرزن، بەڵام ناوەڕۆک یەکێکە. هەریەکە لە شیعرەکان شەقڵی ناوچەیی دیالێکتی کرمانجیی باشووری موکریانی و سلێمانی پێوەیە.

هەندێ دێڕە شیعری قەسیدەکەی شێخ ئەحمەد بەم جۆرەیە:

ئەم ئاسمانە شینە کەوا بەرگی ماتەمە
ئیجادی وا کراوە کە قوببەی هەموو غەمە
بارانی مەرگە بەفرە کفن ڕەعدە نەفخی سوور
ئەوڕۆ کرانی قابیزی ئەرواحی عالەمە

***

هاوارە قەومی کورد وەرن ڕۆژی غیرەتە
نیسبەت بەئێمە زوڵم و تەعەددی چها کرا
غوسسەم ئەوەندە زۆرە دڵم هێندە پڕ غەمە
مەجالی ناتیقم لە غەما لاڵ و ئەبکەمە

هەندێ دێڕە شیعری پیرەمێردیش بەم شێوەیە هاتووە:

ئەم ئاسمانە شینە کەوا بەرگی ماتەمە
تەحلیلی وا کراوە قوببەی غەمە، تەمە

چەرخێکی کۆنە ماکینەی ژەنگی گرتووە
چەوری نەکا بەخوێن پەکی سووڕانی کەوتووە

***

بۆ ئێمە لازمە هەموو ساڵێک هەتا دەژین
ئەم ڕۆژی بیست و چواری ئەیارە بکەین بەشین
ڕۆژێکە کە ڕۆژی مردن و ژینە برادەران
فەرزە غەزا مەقلووبە نەقدی دڵ و زمان

بێکەس یەکێکە لەو شاعیرانەی ئەم شێوازە نوێیەی بەکارهێناوە لە شیعرە بەرزەکانیدا «ئەی مانگ» ، «ئەی مەلا» ، «دڵ» و هی دیکە. قارەمانی بێکەس تەنیا و بێکەسە ، لە بیری کەسدا نییە ، ئاوارەیە لەسەر ڕووی زەوی، وێڵ و سەرگەردان دەسووڕێتەوە. شێوەی تایبەتی ژیانی خۆی لەگەڵ مانگدا بەراوورد دەکا ، ئەوەی وەکو کۆچەر لە ئاسمانا دەسووڕێتەوە. ئەو لە جێگەییێکی بەرز دایە لە ئاسمانا ، چاوی لە زۆرداری و ناهەمواری سەر ڕووی زەوییە:

ئەی مانگ! من و تۆ هەردوو هاودەردین
هەردوو گرفتار یەک ئاهی سەردین
تۆ وێڵ و ڕەنگ زەرد بەئاسمانەوە
منیش دەربەدەر بەشارانەوە

***

ئەی مانگ! ئەوەندە سەیری دونیات کرد
سەیری نیفاق و زوڵم و ڕیات کرد
تا وا بەم ڕەنگە کاری لێ کردی
ڕەنگ و شوعووری بەجارێ بردی

یەکێ لە ئەدگارە هەرە گرنگەکانی شیعری کوردی ئەم سالانە ئەوە بوو هەندێکیان کەوتبوونە ژێر کاریگەری پارچە شیعری لیریکی ڕۆمانتیکی ئەوروپایی. لەمانە پێویستە پەنجە بۆ شیعری «عیشقی بێ هوودە»ی ڕەشید نەجیب درێژ بکرێ. لەو شیعرەدا خەیاڵی تازە دەکەوێتە بەرچاو و دوور لە خاسیەتەکانی شێوە شیعری ڕۆژهەڵات، بەڵام لە مەقامێکی هونەری بەرز دایە:



دڵەی پەشێواو دەمێ بوو وون بووی
لە مەیدانی عیشق، ئالام و غەمدا
لە ناو ئەحلام و سەمای پڕ تەمدا
سەد شوکور دیسان بە تیرێ کون بووی

***

عەقل و دووربینی خەوە سەرابە
مەنتیق پرشنگی دوو چاوی کاڵە
حیکمەت پریشکی کوڵمێکی ئاڵە
خوێناوی جێگەر مەیە کەبابە

لە دایک بوونی ناوەرۆکی وێنە و شێوازی نوێ لەو ڕۆژگارەدا ڕووداوێکی سروشتی بوو جێی بەشیعری کلاسیکی کۆن لەق بکا ، چونکە کاتی ئەوە هاتبوو دەوری ئەم شیعرە کۆنە بەسەر بچی، لەبەرئەوەی تاقیکردنەوەییێکی سەدان ساڵی بەسەردا تێپەڕ بووبوو ، دەبوو نوێکردنەوە و گۆڕانی بەسەردا بێ، لە دواییدا هەردوو ، ڕێچکەی شیعری کوردی پێکەوە بژین.

دیاردەی نوێکردنەوەی شیعری کوردی لەم خاڵانەدا دەبینرێ:

١- لەگەڵ بەردەوامی بەحری عەرووز کێشی «پەنجە، کەرت، بڕگە، سیلاب» لە شیعری کوردیدا پەیدا بوو.

٢- یەکێتی قافیە لە شیعری کوردیدا شاعیری بەدەستوورێکی سەخت بەند کردبوو. دیاردەییێک بوو پێویستی بەوە دەکرد شاعیر تواناییێکی تەکنیکی بەهێزی هەبێ لە شیعر دانان و شارەزاییییێکی تەواوی لە شیعری کلاسیکی کۆندا هەبێ. لە شیعری نوێدا یەکێتیی قافیە ڕووخێنرا و کەوتە ئازادییەوە.

٣- لە شیعری نوێدا خەیاڵ و هەست و دەرک کردن یەکێتییێکە پێوەندیی لۆجیکی لە نێوان دێڕە شیعرەکاندا بەهێز دەکا ، لە لاییێکی دیکەشەوە هەموو دێڕە شیعرێک بەردەوام و ڕوونکەرەوە و تەواوکەرەوەی مانای دێڕی پێشتر دەبێ.

٤- زمانی شیعر لە وشەی بێگانە دوور دەخرێتەوە، وشەی تازەی کوردی دروست دەکرێ، یا دەدۆزرێتەوە، بەشێوەییێکی فراوان لێکسیکۆنی کوردی و تەعبیری کوردی خۆماڵی لە شیعری کوردیدا بەکار دەهێنرێ.

نموونەی ئەو شیعرە نوێیە، زیاتر لە بەرهەمی عەبدوڵڵا گۆراندا خۆی دەنوێنێ، لەبەرئەوەی زۆربەی هەرە زۆری شیعری لەم بابەتەیە، هەتا شیعرە لاساییە عوسمانییەکانیشی کە لە نێوان شیعری کۆن و نوێ دەوەستن زۆرتر بەلای شیعری نوێی کوردی دەشکێنەوە، هەرچی شیعرە عەرووزییە کلاسیکییە کۆنەکانیشن ئەمەیان یەکجار کەمە.

گۆران بەهۆی بەکارهێنانی چەند کێشێک و قافیەیێکی هەمەجۆر و ڕەنگاوڕەنگ بەتەواوی پشتی لە بەحری عەرووز و یەکێتیی قافیە کردووە و لە شیعریدا بەکاری نەهێناون. نموونەیێکی جوان بۆ ئەم جۆرە شیعرەی گۆران لیریکی «ئاواتی دووری»یە. لێرەدا کووپلەیێکی دەخرێتە بەرچاو:

ئەی خاتیرانی عومری گوزەشتەم، دەخیلی تۆم
خنکاوی بەحری دووری نەکەی عەشقی ڕەنجەڕۆم
جیلوەت لە چاوم وون نەبێ
هەرگیز لای تۆ نوستن نەبێ
چەشنی ئاوێنە
دایم بنوێنە
عەشقی قەدیمی یار
تا وەختی ئیحتیزار

گۆران ئەم شیعرەی لەسەر کێشی سیلاب ڕێکخستووە، چوار جۆرە کێشی بەکارهێناوە (١٤) و (٨) و (٥) و (٦) کەرتی، لە بارەی قافیەشەوە جووت قافیەیە (مەسنەوی).

ڕەنگە بۆ نموونەی لیریکی تازە وێنە جوانەکەی «پەپوولە»ی نووری شێخ ساڵح شتێکی نایاب و بەجێ بێ:

بەڕۆژ جێت ناو گوڵانە
بەشەو ئەبیە پەروانە
لە کوێ بەشوعلەت زانی
خۆت ئەکەی بەقوربانی
پەپوولەی ناسک و نازدار
عاشقی دڵ بریندار



خۆزگە ئەمزانی بۆ تۆ
وا خۆت ئەکەی ڕەنجەڕۆ

ڕەفیق حیلمی کە بەرهەمی نووری شێخ ساڵح هەڵدەسەنگێنێ ژیرانە و بەڕاستی ئەوە ڕوون دەکاتەوە ئەم شیعرە لە بابەت ناوەڕۆک و شێواز و قاڵبی داڕشتن و ئاواز و مۆسیقاوە هیچ پێوەندییێکی لەگەڵ شیعری کلاسیکی کۆندا نییە.

ئەو دەستوورانەی بۆ شیعری کلاسیکی دانرابوون لە لایەن شاعیرە نوێخوازەکانەوە پشتگوێ خرابوون. لە لایێکی دیکەوە خوێنەر بایەخی بەم شیعرە نوێیانە نەدەدا و بەشیعری بەرزیان دانەدەنان بەتایبەتی ئەو شاعیرە گەورانەی سەر بەشێوازی کلاسیکی بوون و توانای ئەوەیان نەبوو لە شیعری کلاسیکییەوە بگوازرێنەوە بۆ شیعری نوێ.

تاقیکردنەوەی شیعری نوێ لە ئەدەبی کوردیدا لە ماوەیێکی درێژدا بوو، تا ناوەڕاستی نیوەی دووەمی سەدەی بیستەمی خایاند. لەو دەمەدا نەوەیێکی تازە لە شاعیرانی شیعری نوێی کوردی نێوان هەردوو جەنگەکە پەیدابوون، ئەمانە نوێنەری قۆناغی دووەمی نوێکردنەوە یەکەمەکە بوون.

لە بیستەکان – چلەکانی سەدەی بیستەمدا لە بابەت ناوەڕۆکەوە جۆرە شیعرێک پەیدا بوو دەکرێ بەناوی لیریکی داستانی یا پۆیێم لە شێوەی درامادا پێناسە بکرێ. هەروەها لەو ڕۆژگارەدا بوو شیعری دراماتیکی و کۆمیدیش پەیدابوون و لە دواڕۆژێکی نزیکدا پەرەیان سەند و پێشکەوتن.

لە بەرهەمی شیعری دراماتیکیدا شاعیر لە پارچە شیعرێکی بچووک ڕووداوێکی گەورە دروست دەکا، وێنەی ڕاستییێکی مەزن دەگرێ. شێوەی دراما دەتوانی ڕوونتر و قووڵتر خەباتی خەڵک لە پێناوی چاککردنی باری ژیان و ڕزگاری نەتەوایەتی میللەت بکاتە بەرهەمی ئەدەبی بەرز، بۆیە لەو ڕۆژگارە پەیدابوونی ئەم جۆرە شیعرە کارێکی پێویست بوو لە ڕێڕەوی گۆڕانی ئەدەبی کوردیدا.

ناوەڕۆکی بنچینەیی درامای ئەو سەردەمە لە ناو بازنەی خەباتی دوو چین و بەرەی کۆمەڵی کوردەواری دەسووڕایەوە. دەرەبەگ و ڕەنجبەر. ماک و سەرچاوەی دراما لەو کاتەدا وەکو شتێکی ئاسایی شەڕوشۆڕ و ناتەبایی بوو لەسەر خۆشەویستی و دڵداری. یەکێ لە بەناوبانگترین بەرهەمی شیعری ئەم جۆرە دراماکانی گۆران بوون، وەکو «بووکێکی ناکام» و «گوڵی خوێناوی».

ناوەرۆکی «بووکێکی ناکام» هێرش و هەڵمەتێکە لە دژی ناگزووری کۆمەڵایەتی، خەباتە لە پێناوی ڕزگارکردنی دڵداری لە کۆت و پێوەندی دەستووری کۆمەڵایەتی ناهەموار. قارەمانی ئەم بەرهەمە کوڕە شوانە. بەڕاستی و بەدڵ و بەگیان و بەقووڵی کچێکی گوندەکەی خۆیانی خۆش دەوێ. بەڵام بادەی ناسکی دڵداری هەژاران وەکو شاعیر دەڵێ هەمیشە بەدەستی دەوڵەمەندی زۆردار و خوێنڕێژی جانەوەر دەشکێ. ئەم جوانییە بەپێی دەستووری ئەوان دەبێ تەنیا بۆ دەوڵەمەندان بێ. ژنە قارەمانی دراماکە کوڕە شوانەکەی خۆش دەوێ، بەڵام ئاغای دەوڵەمەند و زەبر بەدەست بۆ خۆی ڕایدەکێشێ. کەچی قارەمانی دراما واز لە خۆشەویستەکەی ناهێنێ. ئەمە دەبێتە هۆی چوونە مەیدان و تۆڵە سەندنەوەیێکی خوێناوی. لەگەڵ ئەوەی خەبات و شەڕی نێوان شوانی ڕەنجبەر و ئاغای دەرەبەگ بەسەرکەوتنی ئاغای کۆتایی پێ دێ، بەڵام گیانی کچەکە ناگۆڕێ، بۆیە گۆران بەم دێڕانە کۆتایی بەشیعرەکەی دێنێ:

ئێستا ئەوا هەرچی ئەڵێی نیعمەت و نازە
هەمووی ئەدا بەیەک دڵۆپ فرمێسکی تازە
لە بەردەرگای چاوی ڕەشا بلەرزێ و بلێ
دەستی زۆردار سەد سەر ئەکا ناگاتە دڵێ

درامای دووەمی گۆران «گوڵی خوێناوی» لاپەڕەی لایەنێکی دیکەی دڵدارییە تراجیدییانەیە. ڕاستە ئەم بەرهەمە ڕاستەوخۆ ناچێتە ناو تراجیدیای کۆمەڵایەتی یا تاکە کەسییەوە، بەڵام هەتا لێرەشدا دڵدار دەبێتە قوربانی نایەکسانی ڕەوشتی ژیان و یاسای نالەباری گێتی.

پیەسی «گوڵی خوێناوی» وەکو بەرهەمێکی بەرز لە ئەدەبی کوردیدا خۆی دەنوێنێ. ئەگەر لە بارەی ئەم شیعرەوە ئەوە هەبێ گۆیا وەرگیراوە یا کاریگەری ئەدەبی ئەوروپاییانی بەسەرەوەیە، بەتایبەتی ئەدەبی ئینگلیزی، ئەمە لە نرخی کەم ناکاتەوە وەکو بەرهەمێکی هونەری سەرکەوتوو لە ئەدەبی کوردیدا.



## پەرەسەندنی پەخشان

تارمایی پەخشانی هونەری لە ئەدەبی کوردی سەدەی نۆزدەمدا بەرچاو دەکەوێ، بەڵام ئەو نموونانە نەبوون بەسەرچاوە بۆ چەسپاندنی لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا. چەسپاندن و پەرەسەندن کەوتنە ماوەی نێوان هەردوو جەنگی گێتی، لەو کاتەوە گۆڕانی ئەم بابەتە لە ئەدەبدا دەستی پێ کرد.

بابەتی بنچینەیی پەخشانی کوردی وتاری چیرۆک ئامێز بوو، یاخود چیرۆکێک لە شێوەی وتاردا بێ، واتە هەر بەرهەمێک لە نێوان وتار و چیرۆک بکەوێتە بەرچاو. بەشێوەیێکی گشتی ئەم چەشنە بەرهەمە بەناوەرۆکێکی قارەمانەتی - مێژوویی یا پەروەردەیی و فێرکردن (دیداکتیکی) میللی خۆی دەنواند.

مەبەسی سەرەکی پەخشان، هەروەها شیعریش، لەم ساڵانەدا ڕێ پیشاندان بوو لە بابەت هەڵسوکەوتی خەباتی ڕزگاریی نەتەوەی کورد و پێشکەوتنی باری کۆمەڵایەتی و تەنویری لاوان. لەم قۆناغەدا مەبەسی سەرەکی هەرە گرنگی کورد لە بابەت زمانەوە هەوڵدان بوو لە پێناوی دروستکردنی زمانێکی ستانداردی نووسینی کوردی پەتی و بەپێی توانا نەهێشتنی وشەی بێگانە لە ناو زمانەکەدا.

نووسەرانی پەخشانی کوردی لەو ڕۆژگارەدا کۆمەڵێک ڕۆژنامەنووسی ناودار و لێهاتوو و کەسێتی کۆمەڵایەتی و شاعیری بەدیمەن بوون، لەوانە تۆفیق وەهبی و ڕەفیق حیلمی و حوسێن حوزنی موکریانی و ئیبراهیم ئەحمەد و عەلائەدین سەجادی و شاکر فەتاح و پیرەمێرد و دڵدار و سەلام و بێکەس و هی دیکە. ئەمانە لە دەوری گۆوارەکانی زاری کرمانجی و ڕۆناکی و گەلاوێژ و ژین و دەنگی گێتیی تازە و هی دیکە کۆ بووبوونەوە.

لەو ساڵانەدا گۆڕەپانی بابەتی پەخشان پان و فراوانتر بوو، وەکو مەبەسێکی ئەدەبی پێویست خۆی گرت و بڵاو بووەوە و خەڵکی پێی ڕاهاتن. هەروەها جەوهەر و ناوەرۆکی چیرۆکی هونەری لەو پەخشانە هەندێ جار خۆیان دەنواند. لە کۆتایی ئەو قۆناغەی باسی لێوە دەکرێ وتاری - چیرۆکی لە ئەدەبی کوردیدا پەیدا بوو. بەرهەمی ئەم جۆرە هونەرە بەشێوەیێکی گشتی ڕووکەش بوو، واتە نووسەر بایەخی بەڕوخسار دەدا، زمانی سفت و تەعبیری بەرز بوو، هەرچی ناوەرۆکیش بوو هەندێ کز و چۆڕێ بێ هێز بوو.

نموونەی جوانی وتاری - چیرۆکی بەرهەمی «ئەی خاک»ی (١٩٣٥) حوسێن حوزنیی موکریانییە. لەم پارچە پەخشانەدا هەست بەوە دەکرێ کە خاک بتێکە و دەپەرسترێ،

شتێکە ئەبستراکت وەکو ئەوەی پێوەندی بەئادەمزادەوە (قارەمانەوە) نەبێ، یاخود شتێک بێ میتافیزیکی لە سەرووی سروشت و ژیانەوە. حوزنی وتارێکی دیکەی لەم بابەتەوە هەیە بەناوی «گوندی کاول بوو» (١٩٤٤). لەمەدا وێنەی گوندێکی کورد دەکێشێ لە لایەن دوژمنانەوە وێران کراوە. ڕاستە گوندەکە مردووە بەڵام چاوەنۆڕی ئەوەیە دانیشتوانی بگەڕێنەوە بۆ ئەوەی لەگەڵ خەڵکەکە دەست بکاتەوە بەژیان و زیندوو بێتەوە. لەگەڵ ئەوەی گیانی سیمبۆلی هەندێ لە ناوەرۆکی بەڕێوە دەبا، کەچی مەبەسی نووسەر ئاشکرایە و بەگشتی شەقڵی ناگزووری ژیانی کۆمەڵایەتی تیایدا ئاشکرا و دیارە.

وتارە چیرۆکییەکانی پیرەمێرد لەو ڕۆژانەدا دەنگیان دابووەوە. لە «موناجاتی ئەرواح»دا (١٩٤٢) دەست بۆ مەسەلەیێکی هەرە گرنگی ناو کۆمەڵی ئادەمزاد دەبا کە یەکسانییە: لەبەرچی هەموو شتی چاک بۆ دەوڵەمەندە! جوانی سروشت و ڕووناکیی مانگیش بۆ دەوڵەمەندە. چارەنووس هیچی بۆ هەژار بەجێ نەهێشتووە، تەنیا مافی ئەوەی هەیە بەهەژاری بژی! نووسەر دەیەوێ ئەوە پیشان بدا پێویستە دەسکەوتی ڕەنج و کۆششی ئادەمزاد بەیەکسانی بەسەر هەموو تاکێکی کۆمەڵدا دابەش بکرێ.

وتاری هونەری ئەم ماوەیە شێوەی ڕەخنەی کۆمەڵایەتی پێوە دیار بوو. بۆ بەڵگە وتاری نامەیێکی کراوەی یوونس ڕەووف دڵدار بۆ «نەسرین»ی برازای لە کۆواری گەلاوێژ (١٩٤٢) بڵاو کراوەتەوە. نامەیێکە بەهۆی نەسرینەوە ئاراستەی هەموو کیژێکی کورد کراوە. دڵدار بەشێوازێکی ڕوون و ئاشکرا و ساکار دەوری ژن لە کۆمەڵی کورددا پیشان دەدا وەکو چۆن خۆی گەڕەکییەتی، بەلای ئەوەوە دەوری ژن یەکجار گرنگە بۆ پێشخستنی کۆمەڵی کوردەواری.

وتارەکانی شاکر فەتاح نموونەیێکی ئاشکرای هەندێ مەسەلەی کۆمەڵایەتیی ناسک و تیژی ناو کۆمەڵن. نووسەر شارەزای ژیانی نالەباری هەژارانە. بیروباوەڕی سەرەکی ئەم نووسەرە وێنە گرتنی نایەکسانی کۆمەڵی پڕ لە تەنگوچەڵەمەی کوردییە. لە وتاری «ئاوازی هەژاری» (١٩٤٧) نووسەر سەری سوڕ دەمێنێ لەوەی خەڵکی هەموویان بەپێی زانستیی بیۆلۆجی دروستبوونی لەش و مێشک و هۆشیان وەکو یەکن، کەچی ژیانیان وەک یەک نییە. یەکێک لە ناو خۆشیدا نوقوم بووە، یەکێکی دیکە لە ناو هەژاریدا دەتلێتەوە. بەڵام لەو کاتەی نووسەر بەڕاستی وێنەی تەنگوچەڵەمە و گیروگرفتی کۆمەڵ دەکێشێ باس لەو هۆیە مێژوویی و کۆمەڵایەتییانە ناکا کە بوون بەسەرچاوەی



دروستبوونی جیاوازی لە ناو کۆمەڵدا. نووسەر ڕوو دەکاتە ئاسمان و داوای یارمەتی دەکا و باوەڕی بەعەدالەتی خودا هەیە. لە لایێکی دیکەوە بەڕاستی شاعیر کە جەوهەری دیاردەی دەردی کۆمەڵایەتی دەدۆزێتەوە و تەنیا وەسفی دەکا ئەمە خۆی لە خۆیدا چارەسەریشە، واتە دەرمانە، بۆیە ئەگەر ڕوو نەکاتە ئاسمانیش بۆ دۆزینەوەی دەرمان گلەیی لێ ناکرێ.

ناکۆکی نێوان بیروباوەڕی سنوور کێشراو و ئاسۆی داهێنانی ئەدەبی و گێڕانەوەی هەموو ڕووداوێکی کۆمەڵ بۆ میتافیزیکی ئەودیو سروشت و کردەوەی کردگار وەکو لای ئەم نووسەرە هەستی پێ دەکرێ، دیاردەیێکی گشتی بوو زۆربەی نووسەرانی کوردی ئەو ڕۆژگارە پێڕەویان دەکرد و لەسەری دەڕۆیشتن.

لە بیستەکانی سەدەی بیستەم چیرۆک وەکو بابەتێکی سەربەخۆ لە ئەدەبی کوردیدا سەری هەڵدا. لەساڵی ١٩٢٥دا جەمیل سائیب چیرۆکێکی درێژی ڕۆمان ئاسایی نووسییەوە بەناوی «لە خەوما». ئەم چیرۆکە لە بابەت ناوەرۆکەوە لاوازە. نووسەر هەندێ بیروڕای جیاوازی ناپێویستی ئاخنیوەتە ناو چیرۆکەکەیەوە. هەرچەندە شێوازی سیمبۆلی بەکارهێناوە بەڵام ئاشکرایە ڕەخنە لە دەسەڵاتی شێخ مەحموود دەگرێ لەو ساڵانەی دەوری هەبوو لە دامەزراندنی حوکوومەتی کوردستانی باشوور (١٩١٨ - ١٩٢٤). نووسەر تەنیا لایەنەکانی ڕەش و تاریکی ئەو دەسەڵاتە بەچاوێکی ڕەشبینییانە بەزمانی کوردی تۆمار دەکا. هەرچەند بیروڕاکانی نووسەر ڕاستییان تێدا هەیە بەڵام بەهەناسەیێکی پڕ لە ڕق و کین لە شێخ مەحموود چیرۆکەکەی نووسیوەتەوە. بێ گومان ڕەنگە هەق بەلای نووسەرەوە بێ چونکە دوو خزمی نزیکی جەمیل سائیب لە لایەن خزمانی شێخ مەحموود و لە ماوەی فەرمانڕەوایی ئەودا کوژراون.

بەرهەمی ئەدەبی پێویستە دوور بێ لە سۆزی ناوەوەی نووسەر، لەبەرئەوە ئەگەرچی چیرۆکەکە لە سنووری جێگە و کات چۆتە دەرەوە و بووە بەموتڵەق بەتایبەتی کە بەشێوازی سیمبۆلی نووسراوەتەوە، بەڵام ئەگەر نووسەر ئاوڕی لە لایەنە گەشبینییەکانیش بدابایەوە لە چیرۆکەکەدا سەردەکەوت، چونکە کاری چاک و جوان و بەجێ لە ڕۆژگارانی کوردستانی باشوور هەبوو، هەمووی کاری خراپ نەبوو، لەوانە ناوی حوکوومەت و پایتەخت سلێمانی و پوولی پۆستە و مەلیک و وەزارەت خەونێک بوو بۆ کورد لە پاشانا هاتە دی و شانازی پێوە دەکرد.

ئەحمەد موختار جافی شاعیر خاوەنی چیرۆکی «مەسەلەی ویژدان»ە (١٩٢٧ – ١٩٢٨). ئەم چیرۆکە لە هەموو ڕوویێکەوە جیاوازە لە بەرهەمە ئەدەبییەکەی پێشوو. ناوی چیرۆکەکە هەندێ لە ناوەرۆکی ئاشکرا دەکا. ڕووداوەکانی ڕاستەوخۆ پێوەندییان بەڕەوشتی ئادەمزادەوە هەیە. دەوری فێڵبازان دەخاتە ڕوو لە هەڵخەڵەتاندنی خەڵکی لە پێناوی چاکەی خۆیان.

لە دوای ئەم هەوڵە سەرەتاییانە لە نووسینی چیرۆکی کوردی پیرەمێرد لە ساڵی ١٩٣٥ چیرۆکی «دوازدە سوارەی مەریوان»ی بڵاو کردەوە. سەرچاوەی ئەم کارە ئەدەبییە حیکایەتی میللی ئەدەبی نەنووسراو (فۆلکلۆر) بوو. چیرۆکێکی جوان و سەرکەوتووە لە ڕووی هونەرییەوە باس لە قارەمانیەتی جەنگاوەر و چەکمە ڕەقەکانی کورد دەکا، کە وەرگێڕانی ئەم چیرۆکە بەزمانی ڕووسی بڵاوکراوەتەوە پێشوازییێکی باش کراوە.

لەو ساڵانەدا شاکر فەتاح هاتە ناو گۆڕەپانی چیرۆکنووسانی کوردەوە وەک یەکێک لە نووسەرە بەراییەکانی ئەم چەشنە هونەرە نوێیە لە ئەدەبی کوردیدا. بەزۆری چیرۆکەکانی لەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامە و گۆوارە کوردییەکان بڵاو دەکرانەوە. ئەم چیرۆکانە بەڕوونی سیمایێکی کۆمەڵایەتییان پێوە دیار بوو، ڕاستەوخۆ لە دژی نایەکسانی لە کۆمەڵ و چەوساندنەوەی میللەت بوون.

چیرۆکی «مودیر بەگ» نموونەییێکی ڕاست و ڕەوانی چیرۆکەکانی شاکر فەتاحە. لەم چیرۆکەدا باس لە چاوچنۆکی بەڕێوەبەر و مووچەخۆرانی ناو شارەکان دەکا. نووسەر نەترسانە خۆفرۆشی و چاوچنۆکی و ڕیشوەتخۆری دامودەسگای نیو دەرەبەگی وڵات دەخاتە ڕوو، چونکە هەموو مووچەخۆرێکی دەوڵەت، لە هەرە بچووکەوە تا هەرە گەورەیان هەوڵ دەدەن هەر چۆنێ بێ و بەهەر ڕێگەیێ بێ هەژار و بێ دەسەڵات بڕووتێننەوە.

ڕەخنە گرتن لە خەوش و کەموکووڕی کۆمەڵایەتی لە چیرۆکێکی دیکەی شاکر فەتاح «مام شێخ» دەردەکەوێ. چیرۆکێکی ڕیالیزمیانەیە، بەشێوازێکی کۆمیدی نووسراوە. لە شێخێکی تەریقەت دەدوێ، دووڕوو و چاوچنۆک دەیەوێ هەموو شتێک بۆ خۆی بێ، لە ژێر پەردەی تەریقەتی دەروێشی خۆی شاردۆتەوە. فێڵ لە هەموو ئەو خەڵکە دەکا کە باوەڕیان پێی هەیە و دەیانڕووتێنێتەوە. نووسەر دەوری ناشیرینی ئەو پیاو خراپانە دیاری دەکا کە بەناوی ئاینەوە خەڵکی هەڵدەخەڵەتێنن، لە زیانی بیروباوەڕی دواکەوتوو دەدوێ کە دەبێتە هۆی دواخستنی کۆمەڵ. لە چیرۆکی «مامۆستا بێژەن» شاکر فەتاح ئەوە پیشان



دەدا مرۆڤ چۆن دەبێ بژی! لە کۆمەڵدا پێویستە هەموو کەس وەک یەک بژین. واتە دەبێ کۆمەڵێکی یەکسانییانە بێ و تەماشای هیچ بەڵگەیێکی دیکە نەکرێ بۆ تێکدانی ئەو یاسایە. ئەمەیە بیروباوەڕی بنچینەیی چیرۆکەکە.

هەر بەم شێوەیە و بۆ ئامانجی لەسەرکردنەوەی «بۆرەپیاو» و هێرش بردنە سەر سیاسەتی ڕووتاندنەوەی میللەت و ڕەخنە گرتن لە یاسای دەرەبەگی لە کۆمەڵدا و ڕیسواکردنی لایەنی تاریکی تەریقەتی دەروێشی هەندێ لە نووسەرانی کورد بەرهەمی بەرزیان داهێناوە لە وتاری هونەری و چیرۆکدا، لەوانە پیرەمێرد و سەلام و هی دیکە.

پیرەمێرد چیرۆکی «مل شکان مل شکانی لە دوایە»ی (١٩٤٢) نووسیوەتەوە. ناوی چیرۆکەکە لە قسەیێکی نەستەقی کوردی وەرگیراوە. ئەو کەسەی خراپە بکا خراپە دێتە ڕێی، کاری ناهەموار شیرازەی کۆمەڵ تێک دەدا و تەنگوچەڵەمە لە ناو خەڵکیدا دەخولقێنێ. ئەم بەرهەمە یەکێکە لەوانەی خوێنەر لە ناوەکەیەوە لە ناوەرۆکی دەگا و ئاگاداری کردەوەی تاوانبار و دەستدرێژ و دز و جەردەی ناو کۆمەڵ دەبێ.

بەپشوویێکی کۆمیدییانە شێخ سەلام چیرۆکی «نە مەنە نە حۆقە»ی (١٩٤٤) نووسیوەتەوە. نووسەر باس لە درۆزنی و جەربەزەیی مەلاییێک دەکا گۆیا «خوێندەوارترین» کەسی گوندە، بۆ یەکەمین جار دەچێتە شار. کۆمەڵێک هەڵە و هەڵوێستی مەلا لە شاردا دەبێتە بەڵگەی ئەوەی کابرایێکی گێل و ساکارە و بەتەواوی هیچ نەزانە. بەم جۆرە نووسەر مەبەسی خۆی دەخاتە ڕوو کە «خوێندەواری» گوند ئەوەی منداڵان فێری خوێندن و نووسین دەکا خۆی دەبەنگ و هیچ نەزان و نەخوێندەوارە.

لە سەرەتای چلەکانی سەدەی بیستەمەوە چیرۆک دەورێکی باڵا و گرنگی هەبوو لە ئەدەبی نوێی کوردیدا. هەنگاوی تیژی هاوێشت بەرەو پێشکەوتن و تەواوکردنی کەرەستەی هونەریی پێویست و کارێکی گەورەی کردە سەر بیروباوەڕی خوێندەواری کوردی ئەو سەردەمە.

لە ساڵانی جەنگی دووەمی گێتیدا ڕێبازی نەتەوەیی – دیمۆکراتی لە پەخشانی کوردیدا پەیدا بوو. نووسەرە پێشکەوتنخوازەکان بەتایبەتی مەحموود ئەحمەد و ئیبراهیم ئەحمەد کۆمەڵێک چیرۆکی کۆمەڵایەتی ناسک و دڵگیریان نووسی. کە کۆمەڵە چیرۆکی «ئادەمزاد لە سایەی دەرەبەگدا» لە لایەن مەحموود ئەحمەدەوە لە ساڵی ١٩٤٥ چاپ کرا، سانسۆری عیراق پەشوکا، لە هوشیاری و هەڵسانی کۆمەڵ ترسا، زوو بەزوو دەستی بەسەر هەموو

دانە چاپکراوەکانی ئەم کۆمەڵە چیرۆکە داگرت. بەپێی ئەو چیرۆکەی بەناوی «شەرم و هەژاری»یەوە لە دواییدا لە ڕۆژنامەی ژین (١٩٦٠) بڵاوکرایەوە، پیاو بەئاسانی لە هەموو ئەو مەسەلە سیاسییە تیژانە دەگا کە مەحموود ئەحمەد بەشێوەییێکی ڕاست و هونەری دەستی بۆ درێژ کردبوو. نووسەر هۆی هەژاری دەگەڕێنێتەوە بۆ بنج و بناوانی دامەزراندنی کۆمەڵ کە تیایدا کۆمەڵە خەڵکێکی کەم بەسەر کۆمەڵە خەڵکێکی زۆر زاڵ دەبن.

چیرۆکەکانی ئیبراهیم ئەحمەد بەزمانێکی بەرز و ئاسان نووسراون. بەگشتی نووسەر لەسەر ئەو باوەڕەیە مەسەلەی نەتەوەیی کورد (کوردایەتی) بەسیستیمی سیاسی دەوڵەتی عیراقەوە بەستراوە. قارەمانانی چیرۆکی ئیبراهیم ئەحمەد لە لایێک ئەمیریالیست و کاپیتالیست و ئەو کەسانەی خۆیان بەدەسەڵاتەوە بەستووە لە عیراقدا، وە لە لایێکی دیکەشەوە هەژار و جووتیار و پاڵە و ڕەنجبەر و چینەکانی خوارەوەی خەڵکی شار و دێهاتن.

***

ئەو قۆناغەی باسی لێوە کرا (١٩١٤ - ١٩٤٥) ماوەییێکی یەکجار گرنگە لە مێژووی گۆڕران و پەرەسەندنی ئەدەبی هونەری کوردی. لەم ساڵانەدا ڕێبازی شۆڕشگێری - دیمۆکراتی لە دایک بوو. ئەمە بووە هۆی ئەوەی ئەدەب لە چوارچێوەی تەسکی ناوەرۆک و پێویستییە هونەرییەکانی کلاسیکی ئاسایی بێنێتە دەرەوە و ڕێگەییێکی تازەی فراوانی لە ڕوو بکاتەوە.

بێ گومان بەرهەمی ئەدەبی ئەوروپایی بەتایبەتی ئینگلیزی و ڕووسی ئەوانەی وەردەگێڕدرانە سەر زمانی کوردی کارێکی گەورەیان کردبووە سەر بتەوبوون و لەسەر پێ وەستانی پەخشانی کوردی. تا پلەییێک ئەدەبی کوردی لە ناو کوردانی قەفقاسی ڕووسیا لەم لایەنەوە پێشکەوتوو بوو و کاری کردبووە سەر ئەدەبی کوردی بەگشتی.

# بەشی سێیەم

## ڕەنگدانەوەی کەسێتی شێخ مەحموود و ڕاپەڕینەکانی

## بۆ سەربەخۆیی لە ئەدەبی کوردیدا

دوو هۆی سەرەکی هەستێکی پیرۆز و بەسۆزیان لە ناو دڵ و دەروونی خەڵکی کورد چاندبوو بەرامبەر بەشێخ مەحموود بەتایبەتی لە کوردستانی باشوور. یەکەمیان مەقامی ئایینی و جێگەی بەرزی شێخ مەحموود لە ڕێکخراوی دەروێشیزمی تەریقەتی قادریدا؛ دووەمیان خەبات و ڕاپەڕینەکانی لە پێناوی وەدەست خستنی ئازادی و سەربەستی بۆ کوردستان. ئەمە بووە هۆی ئەوەی بەشێکی زۆر لە ناو کۆمەڵی کوردەواریدا بەچاوێکی بەرز تەماشای شێخ بکەن، هەروەها وەک دیاردەیێکی کۆمەڵایەتی بووە مایەی ئەوەی شاعیران هەستی دەروونیان و خەیاڵی شاعیرییان بەرامبەر بەو لە قاڵبی شیعریدا بهێنن.

ئەو شاعیرانەی دۆستایەتییان لەگەڵ شێخ مەحموود و بنەماڵەی حەفید یا بەرزنجییەوە هەیە یەکجار زۆرن. بێ گومان هۆی ئەم زۆرییە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی لەو ڕۆژگارەدا و تا ئێستاش شاری سلێمانی مەڵبەند و نێوەندی بزووتنەوەی ئەدەب و پەرەسەندنی ڕۆشنبیری کوردی بووە. شاعیران لە نزیکەوە شێخ مەحموودیان ناسیوە و زۆربەیان هاوڕێی منداڵی شێخ یا مامۆستای بوون. ئەمانە تەنیا بەشان و باهووی شێخیان هەڵنەداوە، تەنیا ستایشیان نەکردووە، هەندێ جار ڕەخنەشیان لێ گرتووە. شیعری لەم بابەتەی شاعیران زیاتر لە کاتی گێڕانەوەی بەسەرهاتی ژیان و لێکۆڵینەوە لە شیعریان دەکەوێتە گۆڕێ و باسیان لێوە دەکرێ. ئەو بەرهەمانەی لەم ماوەیەدا دەکەونە بەرچاو دەبنە تەواوکەری ئەو بەرهەمانەی لە ژیانی شاعیراندا دەخرێنە ڕوو لە بابەت شێخ مەحموودەوە.

بەشێ لەو شیعرانەی بۆ شێخ مەحموود وتراون.



١

### ئەحمەد فەوزی

ئەحمەد کوڕی حاجی شێخ غەنی و نازناوی «فەوزی»یە، خەڵکی سلێمانییە، ژیانی بەمووچەخۆری بردۆتە سەر. لە شێخ مەحموودەوە نزیک بووە. لە ساڵی **١٩٣٩** لە سەنگاوەوە وەکو مووچەخۆرێک بۆ ناحیەی سوورچی گوێزراوەتەوە.

لە پاش جەنگی یەکەمی گێتی فەرمانڕەوایی لە ناوچەی سلێمانی بەشێخ مەحموود سپێررا. زۆری نەخایاند شێخ لەگەڵ دەسەڵاتی ئینگلیز تێکچوو. لە شەڕی بازیانی لای بەردەقارەمان شێخ بریندار بوو، بەدیلی گیرا، لە بەغدا دادگا کرا، فەرمانی خنکاندنی بۆ دەرچوو، بەڵام لە سێدارە نەدرا و ئاوارەی کوێت کرا، لەوێوە بۆ هیندستان. لە دوای ئازادبوونی لە بەندیخانە بەهۆی گەڕانەوەی شێخ بۆ سلێمانی ئەحمەد فەوزی بەم شیعرە پێشوازی کردووە:

شوکور لیللا موژدە بێ وا نووری ئیمان هاتەوە
ئەرشەدی ئەولادی حەیدەر شێری یەزدان هاتەوە
هەروەکو یووسف لە زیندانی ئەسارەت هاتەوە
شاهی میسرە سەد شوکور وا ڕوو بەکەنعان هاتەوە
سەف بەسەف زومرەی مەلایک دێن بەئیستیقبالەوە
بانگ ئەکەن وا مەزهەری ئیلتافی ڕەحمان هاتەوە
عەرزی تەبریکات ئەکەن جنن و مەلایک یەک بەیەک
زەمزەمەی خەیرولقودوومە شاهی دەوران هاتەوە
شەمشەمەکوێرە لە داخا خۆی لە قوڕ نێ حەقیەتی
شەو نەما زوڵمەت بەسەرچوو میهری ڕەخشان هاتەوە
خاتەمی حوکمی لە دەس حیلەیی شەیتان دەرنەهات
تا جەنابی ئاسەفی مولکی سلێمان هاتەوە
جامێ مەی سا بێنە گەردوش ساقیا تووبی خودا
موددەتێکە دڵ حەزینم جانی جانان هاتەوە
موتریبی خۆش لەهجە کوا دەنگی ڕەباب و عوود و نەی
وەختی وەسڵە قاتیلی عومری ڕەقیبان هاتەوە

جەژنی کوردستانە قوربان مەوقیعی قوربانییە
چۆن بەقوربانی نەبم وا فەخری کوردان هاتەوە
ئیددیعایی قەومییەت ئەمڕۆ ڕەوایە (فەوزی)!
رافیعی ئەعلام و ئیستیقلالی کوردان هاتەوە

وەک لەم شیعرەدا دەردەکەوێ لە سەرەتادا شاعیر بەهەوایێکی ئایینی سۆفیزمیانە دەنوارێتە شێخ مەحموود، بەشێوەییێک دەیگەیێنێتە پلەی پێغەمبەرانی وەکوو یووسف پێغەمبەر و سلێمان پێغەمبەر. ئینس و جین و مەلایەکەت لە پێشوازی دان، وێنەکە لە دیمەنی میعراج دەکا کە پێغەمبەر بەڕێبەری جبریل ڕووی لە بارەگای خودا کردووە. شاعیر لە تەمومژی سیمبۆلیزمیانەی ئایین و سۆفیزم خۆی ڕزگار دەکا و ڕوو لە مەیگێڕ دەکا شەرابی بۆ بێنێ، بۆ بەزمی ڕەندان لە دەنگخۆش دەخوازێ ڕەباب و عوود و نەی بێنی، چونکە دەمێک بوو دڵتەنگ و غەمبار بوو، بەهاتنەوەی جانی جانان (شێخ مەحموود) بەزمی ڕەندان دەست پێ دەکا. جەژنی کوردستانە، ئەگەر ئەو جەژنە قوربانی بوێ ئەوا شاعیر دەبێتە قوربانی چونکە ڕەمزی کوردان لە ئاوارەیی گەڕاوەتەوە. دوا قسەی شاعیر ئەوەیە باوەڕکردن بەخەباتی قەومی کارێکی ڕەوایە هەڵگری ئاڵای ئەو خەباتە و سەربەخۆیی کوردان لە دیلیەتی ڕزگاری بووە و هاتۆتەوە.

لە شیعرێکی دیکەیدا ئەحمەد فەوزی هەستی ناو دەروونی دەردەبڕی بەهۆی دامەزراندنی حوکوومەتی کوردستانی باشوور و بوونی شێخ مەحموود بەمەلیک:

خودفرۆشی بەسیە ئیزهاری نەزاکەت تابەکەی
بەزمی ئیستیقلالە ساقی تێکە توخودا جامی مەی
دەنگی زنجیری ئەسارەت نایەتە گوێم فرسەتە
قولقولەی مینا وو نەغمەی موتریب و ئاوازی نەی
دەورەیی نەگبەت بەسەرچوو فەسڵی عوشرەت پێ گەیی
کوا زڕەی فینجان و عیشوەی ساقیی و کوا لەنجەکەی
نەوبەهاری موڵکی کوردستانە فەسڵی دەی نەما
سا بەکوێری چاوی دوژمن ساقی ئەمجا بێنە مەی
دەفعەیەتر ئیستیلا نابێ بەسەر ئەم موڵکەدا
عەهدی شاهی نەوجەوانە و شاه سەلاحەددینە دەی



وا لە سایەی ئاسەفی دەورانەوە ئیقبالی کورد
عالییە پرتەو فشانە قادیرە بۆ کوللی شەیئ
بێ وەلی عەهدت تەماشاکە و مەلیک ئەم شاهە بێ
زوبدەیی ئالی حوسێن و نوتفەیی مەحبووبی حەی
گەر کەسێ بێتو خەیاڵی بەد بەدڵیا تێپەڕێ
وەک ئەبووجەهلی ئەزانم جێگەیی ئەو وێڵە وەی
تا ئەبەد یا ڕەب بمێنێ ئەم جەلال و حیشمەتە
ئایەتی ئیننا فەتەحنا بێ موعینی شاهی کەی

لە شیعری یەکەمدا هەستی شاعیر زۆر گەرم بوو بەرامبەر بەرزگاربوونی شێخ مەحموود لە دیلی و گەڕانەوەی بۆ نیشتمان. لەم شیعرەدا ئەو هەستە گەرمترە. مەسەلە بەلای شاعیرەوە چارەنووسی میللەتی کورد و گەیشتن بەئامانجە، شێخ ڕێگەیە بۆ گەیشتن بەئامانج. دەمێک بوو کورد چاوەنۆڕی بوو، لەو ڕۆژگارەدا بەهۆی شێخ مەحموود دەستی خست. شاعیر و هەموو کوردێک هەڵوێستیان چۆن دەبێ بەرامبەر ئەم ڕووداوە! تەنیا یەک شت دەبێ ئەویش جێگیربوونی دەسکەوتەکە. ئەمەیان ڕۆژگار بڕیاری لەسەر دەدا. شاعیری دڵسۆز گومانی لەودا نەبوو کە ئەو دەسکەوتە هەتا هەتایەیە و ناڕووخێ، کەچی ڕووخا. بەڵام شیعرەکە لە جوانی خۆی نەکەوت.

٢

## بێخود

کاتی شێخ مەحموود لە دیلی و دەستبەسەری لە هیندستانەوە هێنایانە کوێت و ماوەیێک لەوێ مایەوە ئینجا گەڕاندیانەوە بەغدا. بێخود لە ساڵی ١٩٢٢ شیعرێکی بۆ شێخ نووسیوە بەم دێڕانە دەست پێ دەکا:

عومرێکە سیەهـ ڕۆژ و پەرێشانی کووەیتم
ئاشوفتە وەکو تورڕەیی خووبانی کووەیتم
عومرێکە کە ڕۆژم بەمەسەل وەک شەوەزەنگە
حەسرەت زەدەیی شامی غەریبانی کووەیتم
عومرێکە لە زیندانی جونوونا کە وەکو شێت
پابەندی غەزالانی ئەسیرانی کووەیتم
عومرێکە لە کونجی قەفەسی فیرقەتی گوڵ دا
وەک بولبولی دڵ خەستە غەزەلخوانی کووەیتم
عومرێکە لە دووی مەحمەلی لەیلا وەکو مەجنوون
خۆم لێرە وو دڵ وێڵی بیابانی کووەیتم
عومرێکە لە بۆ کوشتنی دەججالی حەسوودان
هەر مونتەزیری عیسەیی دەورانی کووەیتم
عومرێکە دەناڵم بەغەمی تۆوە لە کەرکووک
دایم وەکو نەی سینە پڕ ئەفغانی کووەیتم

لەم بڕە شیعرەدا بێخود کوێتی کردووە بەکابەی موسوڵمانان و بتخانەی کافران، هەموو هیوا و ئامانجێکی لەوێ کۆبۆتەوە. هەرچی دڵ گەرەکیەتی و هەرچی گیان ئارەزوویەتی هەمووی لە کوێتە. لە بیابانی کوێت لە لەیلا دەگەڕێ، دەمێکە سۆراغی عیسا پێغەمبەر دەکا لە کوێت بۆ لەناوبردنی دەجالی حەسوودان. مەبەس لە لەیلا و عیسا شێخ مەحموودە، چونکە وا لە کوێتە لە ڕێگەی گەڕانەوەیدا بۆ نیشتمان.

ئینجا بێخود بەم دێڕانە دوایی بەشیعرەکەی دێنێ:



ئیشم هەموو گریانە وەکو هەوری بەهاری
بێ سەرفی زەمی غونچەیی خەندانی کووەیتم
پێویستە وەکو قومریی ئاوارە لە گوڵشەن
سەر گەشتە دڵی سەروی خەرامانی کووەیتم
پەروانە سیفەت موزتەریبم کوللی شەو ئاخۆ
کەی پرتەو ئەدا شەمعی شەبوستانی کووەیتم
کەی بێ کە لە ئوفقی عەرەبستانەوە ڕۆژێ
هەڵبێ گوڵی خورشیدی درەخشانی کووەیتم
وا تێمەگە دوورم لە تۆ ئەی ساحیبی خاتەم
هەر هودهودەکەی بەزمی سلێمانی کووەیتم
خەڵقینە لەبەر گەوهەری تاجی سەری کوردە
قوربانی موحیتی عەرەبستانی کووەیتم
هەرچەندە لە زیندانی فیراقا وەکو بێژەن
بیللا بەتەمای ڕۆستەمی داستانی کووەیتم
عاجز مەبە (بێخود) کە ئیشەڵڵا وەکو یەعقووب
نەزدیکە ویسالی مەهی کەنعانی کووەیتم

لەم دێڕانەدا بێخود گوشادە بەوەی ئامانجی هاتۆتە دی، یا نزیکە بەم زووانە دەیگاتێ چونکە غونچەی خەندان لە کوێتە، خەرامان لە کوێتە، مۆمی شەوستان لە کوێتە. خورشیدی درەخشان و سلێمان پێغەمبەر هەموویان شێخ مەحموودن. شاعیر بەم زووانە دەست لە ملی ڕۆستەمی داستان دەکا و چاوی مانگی کەنعان (یووسف پێغەمبەر) ماچ دەکا وەکو یەعقووب، چونکە شێخ مەحموود لە زیندان ڕزگاری بووە.

لە چوارینێکیدا بێخود دەڵێ:

عەزل و حەپسی تۆ لەسەر شانم ئەگەرچی روتبەیە
چونکە ئەمری تۆیە لای من عەینی شاڵی تورمەیە
گەردی پێت تاکەی لە (بێخود) مەنع ئەکەی ئەی شاهی میسر
چاوی ئەم یەعقووبە موحتاجی جەواهیر سورمەیە

بێخود لەگەڵ شێخ مەحموود گفتوگۆ دەکا، پێی دەڵێ ئەگەر خراپەشی لەگەڵدا بکا، نەک تەنیا چاکەیە، بەڵکو میدالیە و نیشانەیە، پێی دەڵێ، ئەی شای میسر (یووسف پێغەمبەر) بۆچ نایەڵی بەشم لە تۆزی پێتدا هەبێ! ئایا نازانی من یەعقووبم ئاتاجی دەرمانی چاو و کل و کلتوورم!.



## ٣

## ناری

ناری کۆمەڵێک شیعری بۆ شێخ مەحموود وتووە، لە پارچە غەزەلێکی هەناسە ڕۆژهەڵاتییانە بەشێخ دەڵێ:

ئەی ئەساسی عیززەتی من لوتفی بێ پایانی تۆ  
سورمەیی چاوم سەوادی خەتتی موشک ئەفشانی تۆ  
گەر دەمێ پرسی لە حاڵی من لە ڕێگەی لوتفەوە  
موشکیلە تەشریحی حاڵی غەمزەدەی هیجرانی تۆ  
دیدە لە بڕێزە قەدەح ئاسا لە بادی ئەشکی ئاڵ  
دڵ وەکو سازە نەفەس وەک تارە بۆ دیوانی تۆ  
دەستی من داوێنی تۆ هەڵکە داوێنی کەوات  
تا شەپۆلی ئەشکی چاوم تەڕ نەکا دامانی تۆ  
نایەتە مەیدانی دیوانت ئەبەد دیوانی من  
پیرە ئەسپی تەبعی (ناری) دائیرە جەولانی تۆ

لەم شیعرەدا هەست بەوە دەکرێ لەو کاتەی ناری شیعرەکەی هۆنیوەتەوە شێخ لێی دوور بووە. هەندێ جار پەنای بۆ شاخ بردووە، هەندێ جاری دیکە دادگا و ئاوارەکردن و دەستبەسەری و بەندیخانە لە هەندەراندا یا لە مەیدانی جەنگدا لە پێشەوە لە هێرش و هەڵمەتدا بووە، جەنگاوەران لە دوایەوە چونکە شێخ مەحموود تەنیا سەرعەسکەر نەبوو بەڵکو سەربازێکی ئازا و جەسوور بوو. هەرچۆنێ بێ دووری شێخ لە شاعیر لە پلەی هیجرانی یار بووە، بۆیە ئەگەر چەند ئاماژەیێک بۆ دیوەخانەی شێخ لە شیعرەکەدا نەهاتایە، پارچە لیریکەکە دەبووە غەزەلێکی دڵداری ئاسایی. ئەمە بەڵگەی ڕاستگۆیی شاعیرە لە خۆشەویستیدا کە شێخ دەگەیەنێتە ڕادەی ئەو نازەنینە جوانەی ناری بەبێ ئەو نابێ بەشاعیر.

## زێوەر

لەبەرئەوەی زێوەر زۆر نزیکی شێخ مەحمود بووە و مامۆستای بووە گەلێ شیعری ستایشی بۆ وتووە. لەو سەردەمەی شێخ مەلیک بووە لە سلێمانی ئەم چوارینەی بۆ نووسیوە:

بۆ ڕەواجی ئەم سیغارە قەلبی خۆشنوودم ئەوێ
ڕەسمی شیرین ئیسمی شێخم مەحموودم ئەوێ
کاغەزێکی ساف و بێ غەش خالیس و خاس و تەمیز
موشتەری ناسک تەبیعەت ساحیبی جوودم ئەوێ

لەو کاتەی شێخ مەحموود وەک مەلیکێک فەرمانڕەوایی کردووە لە سلێمانی پێشنیازێک لە ناوەوە بووە وێنەی مەلیک بەسەر کاغەزی جیگەرەوە بێ، بۆ ئەم مەبەسە زێوەر ئەم چوارینەی هۆنیوەتەوە.





## قانیع

قانیع لە سەردەمێکی کپی و بێ دەنگیدا، لە ڕۆژگارێکی نەهاتی شێخ مەحموودا، لە ئانێکدا دەستەوئەژنۆ بەکەساسی دانیشتووە بیری لە شێخ کردۆتەوە و شیعری بۆ وتووە:

کەس نەڵێ ئەم بێشە چۆڵە و ئەم زەعیمە مردووە
قارەمانی بێچووە شێری کوردستانە نوستووە
پێت بڵێم چی کردووە بۆ خزمەتی کوردی هەژار
لاپەڕەی مێژووی بەخوێنی ئاڵی خۆی نەخشاندووە
یادی ئاوباریک و وەیسە و دەربەن و تاریدەرت
شاهیدە بۆ کورد لەگەڵ کورد چەندە ڕەنجت بردووە
ئێستەکەش ئاواتی تۆیە پەیڕەوی کوردی هەژار
نامرێ هەرگیز لە دڵدا فیکرەکەت هەر زیندووە
پەیکەری ژینت سەراسەر شۆڕشە و کوردایەتی
تاکە سەرمەشقی ژیانی گەرچی کۆچت کردووە
بەم تەقەللا و شۆڕش و ئازایەتی و مەردانەیەت
تۆ پەیامی مەردنت بۆ دوژمنی کورد ناردووە

لە ماوەیێکی دڵتەنگیدا قانیع نەیویستووە سەر بۆ ڕەشبینی شۆڕ بکا، وای زانیوە کورد ئەگەر شۆڕەسواری وەک شێخی هەبێ لە دوای هەموو مردنێک زیندوو دەبێتەوە. بەمردنی شێخ نە ئەو دەمرێ و نە کورد. شاعیر پەنای بۆ مێژوو بردووە، باس لە هێرشەکانی کورد دەکا بۆ سەر دوژمن، لە هەوڵ و کۆشش و خەباتی شێخ دەدوێ بۆ کورد. ئەم شیعرەی ماتەمنامەییێکە بۆ کۆچی دوایی شێخ. لە شیعرەکەدا شاعیر ئەوە دەردەبڕێ کە بیری کوردایەتی ئەوەی شێخ ڕەنجی بۆ داوە نامرێ و ڕۆژێ لە ڕۆژان خەون دەبێ بەڕاستی و کورد دەگاتە سەربەستی خۆی.

## فایز

مەلا ئەحمەد کوڕی حاجی مەلا ڕەسووڵی دێلێژە، نازناوی «فایز»ە. لە ساڵی ١٨٩٢ لە سلێمانی لە دایک بووە و لە ساڵی ١٩٧٠ لە خانەقین کۆچی دوایی کردووە و تەرمەکەی براوەتەوە سلێمانی و لە گۆڕستانی گردی سەیوان نێژراوە.

لەو کاتەی شێخ مەحموود بووە بەمەلیکی کوردستان فایز ئەم پارچە شیعرەی بۆ وتووە:

ئەرشەدی ئەولادی حەیدەر شێری یەزدانە مەلیک
زومرەیی ساداتە نەجم و ماهی تابانە مەلیک
سەفحەیی تەئریخی قەومی کورد دەبێ ڕەنگین ببێ
چونکە ئەمڕۆ وەک سەلاحەددین حوکمڕانە مەلیک
تاجی کەیخوسرەو چ بوو یا ئەفسەری قەیسەر چییە
تاجی فەخری عیززەتە ئەمڕۆ لە کەیوانە مەلیک

وەک لەم شیعرەدا دەردەکەوێ شاعیر لە ڕووی ئایینییەوە بایەخی بەشێخ مەحموود داوە وەک نەوەیێکی شێخ مارفی نۆدێ و کاک ئەحمەدی شێخ دەبوو ببێ بەگەورەی کورد، کوردیش بچووک نییە بەڵکو گەورەیە، لەبەرئەوەیە دەبێ گەورەی کورد لە گەورەپیاوانی مێژووی وەکو کەیخوسرەوی ساسانی و قەیسەری ڕۆمانیش گەورەتر بێ.





## خالیسی

محەمەد کوڕی شێخ ڕەزای تاڵەبانی «خالیسی» وەک نازناوی شیعر بۆ خۆی داناوە. لە ساڵی ١٨٧٥ لە دایک بووە. بۆ ماوەیێک لە ساڵی ١٩٢٤ بووە بەقایمەقامی کفری، لە ساڵی ١٩٢٨ کۆچی دوایی کردووە.

خالیسی قەسیدەیێکی بەناوبانگی هەیە وەک نامەیێکی شیعری بۆ شێخ مەحموودی نووسیوە. بەڕاستی شیعرەکە دەچێتە ناو شیعری ستایش و پێداهەڵدان و ئامۆژگارییەوە، وردە گلەیییێکیشی تێدایە. شاعیر بەم جۆرە دەست بەشیعرەکە دەکا:

لە پاش دامان و پا ماچ کردن و عەرزی دوعاخوانی
وەرین دەست پێ دەکا بەچکەی گەماڵی پیری گەیلانی
دەڵێ بۆچی دەرت کردم ئەگەر پاست نەکەم بەخودا
هەموو چەڵتووکەکەت دەخوا بەرازی قوتبی ڕەببانی
یەکانە و پەلخ و مالۆسی قەوی قۆڵی گەلێ زۆرە
بەری ملیان لە کوێ دەگرێ پشیلەی کانی ئاسکانی
لە پاش تالان و عەزل و لانەواز و خانە وێرانی
حەواڵەی خۆت دەکەم قوربان چلۆن بێم بۆ سلێمانی

ئەوەی گومانی تێدا نییە بنەماڵەی تاڵەبانی وەک دەروێشی تەریقەتی قادری پێوەندی گیانی بەهێزیان هەیە لەگەڵ بنەماڵەی بەرزنجی یا حەفید یا شێخ مارفی نۆدێ کە دامەزرێنەری تەریقەتەکەیە لە سلێمانی، ئەم پێوەندییە سخەش تا ئێستا بەردەوامە. بەلای شێخانی تاڵەبانییەوە کاک ئەحمەدی شێخ لە پلەی شێخ عەبدولقادری گەیلانی کە لە سەرووی هەموویانەوەیە. هەر گیروگرفتێک لە نێوان بەرزنجی و تاڵەبانییەوە ڕووی دابێ هێندەی سەرە موویێک لەو پێوەندییە گیانییە بەهێزەی کەم نەکردۆتەوە. ئەوە ئاشکرایە لەو سەردەمانەدا ناخۆشییێک کەوتبووە نێوان ئەم دوو بنەماڵەیە لەسەر زەویوزار و دێراو لەو ناوچانەی هاوسێی یەکترین. بەڵام وەکو لەم شیعرەدا بەرز و جوانەدا دەردەکەوێ خالیسی گلەیییەکەشی بەشێوازێک نووسیوە لەوە دەرچووە گلەیی بێ، بووە بەلووتکەی سۆز و خۆشەویستی بەرامبەر بەشێخ مەحموود.

خالیسی شیعرەکەی بەسلاوێک دەست پێ دەکا بریتییە لە کڕنووش بردن و پێ ماچ کردن و دەستەودوعا وەستان. ئینجا بەشێخ نالێ قسەی بۆ دەکا، بەڵکو دەوەڕێ وەکو بەچکە سەگێکی پیری گەیلانی، واتە شێخ ڕەزای باوکی دەکا بەسەگی بارەگای شێخ عەبدولقادر، ئەوجا بەشێخ مەحموود دەڵێ: بۆ دەرت کردم، من پاست دەکەم، ئەگەر من نەبم بەڕازی قوتبی ڕەببانی هەموو چەڵتووکەکەت دەخوا، چونکە یەکانە و پەلخ و مالۆسی گەلێ زۆرە، بنەماڵەی بەڕاز هەموویان بەگەورە و بچووکەوە هاتوون، دیارە پشیلەی کانی ئاسکان ئەو گەڕەکەی شێخ مەحموودی لێ دەژی دەرەقەتی ئەم جارنەوەرانە نایەن. شاعیر دەڵێ لە دوای ئەم مەینەتییە چۆن ڕوو بکەمە سلێمانی!

خالیسی لە شیعرەکەیدا هەندێ ناوی بەشێوەییەکی نهێنی و داپۆشراو هێناوە وەکو «قوتبی ڕەببانی». لە دێڕەکانی داهاتووشدا ئاماژەی سیمبۆلییانەی لەم بابەتە بەرچاو دەکەوێ، لێرەدا ئەو ڕەمزانە بکرێنەوە یا نەکرێنەوە هیچ لە بابەتەکە ناگۆڕێ، ئەو کەسانە بناسرێن یا نەناسرێن پێوەندییان بەشیعرەکەوە نییە. ئەمانە نەیار و گێرەشێوێن و چاوچنۆکن لە کۆمەڵدا بۆ بەرژەوەندی خۆیان هەموو جۆرە خراپەیێک دەکەن. لەو سەردەمەدا لە سلێمانی و هەموو جێگەیێکی دیکەدا هەبوون. لە وەتەی ئادەمزاد لەسەر ڕووی ئەم زەوییەدا دەژی بەرچاو دەکەون، لە دوارۆژیشدا هەر دەمێنن.

لێرەدا پێویستە ئەوە ڕوون بکرێتەوە لە هەندێ جێگەی ئەم کتێبەدا سیمبۆلییانە ناوی چەند کەسێک لە تێکستی شیعردا بەڕەمز هاتووە و ئاشکرا نییە، نووسەری کتێب ئاشکرای کردووە. ئێستاش ئەگەر ئەو ناوە نهێنییانەی لەم شیعرەدا هاتوون ئاشکرا نەکرێن نرخی زانیارییەکان کەم نابێتەوە چونکە ئەدەب لە ڕەوشت دەدوێ پێویستی بەم ناوانە نییە، بەڵام مێژوو لە ڕاستی دەگەڕێ لەبەرئەوە بۆ مێژوو نرخی خۆیان هەیە.

خالیسی لە قەسیدەکەیدا بەردەوامە:

لە بەرچاوت وەکو یەک وایە بێ فەرقن لە خزمەت تۆ
شەهێن و حاجی لەقلەق شێر و ڕێوی مورشید و جانی
کەر و گا خەرجی بار و جووتە ئێستر ماڵی کاروانە
ئەمانە نابنە کوێخا و ڕەئیس و میری دیوانی
بەیار کێلان و گای لەڕ پیر و کچ خواستن ژن و تەدبیر
سەگ و جۆ ئەسپ و ئێسک بۆق و سەردار جرج و ناوکانی



عەبا و کەر فێست و ڕێوی وورچ و شەبقە مێزەر و مەیموون
حەیا و کوێر شەرم و دۆم قەحبە و وەفا نامووس و سۆزانی
لە کوێت دۆزینەوە ئەم کوێر و قۆڕانەی لە خوا عاسی
چلۆنت کەوتە خاتر مشکە کوێرە و وورچی کویستانی
هەموو شێر و پڵنگن وەختی نان خواردن لە ئەترافت
سمێل بابڕ کفن دڕ کەللە خڕ پەرچەم مەریوانی
دوعات با بۆ بکەن ئەمما بەتەدبیریان نەکەی زینهار
مەلا و دەروێش و سۆفی و شێخەکانی لوقمە باتمانی
لە ڕۆژی وا پیاوێ چاترە بۆ تۆ لە دوو سەد کەس
هەزاری لیرەیێک ناکا دە پارە و پوول و تارانی

شاعیر لەم دێڕە شیعرانەدا کۆمەڵێک کردەوە و دیاردە و ڕووداوی پێچەوانەی یەکتری کۆ دەکاتەوە و لە بەردەم شێخیان دادەنێ. ئەو کەسانەی بۆ بەڕێوەبردنی کاروباری حوکوومەتی کوردستانی باشوور دانرابوون شایانی ئەو کورسییانە نەبوون کە لەسەری دانیشتبوون. وێنە شیعرییەکانی خالیسی دۆزینەوەییەکی جوانکارین کە مووچەخۆرانی ئەو حوکوومەتە و کارەکانیان لەگەڵ سەگ و جۆ، ئەسپ و ئێسک، بۆق و سەردار، جرج و ناو کانی و وێنەی دیکە بەراورد دەکا. ئەوەی شاعیر بەشێخی دەڵێ ڕاستی تێدا هەیە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا زوو پەشیمان دەبێتەوە و ئەم قسانە بەدەم درێژی لە قەڵەم دەدا بەرامبەر بەشێخ مەحموود و لەسەر شیعرەکەی دەڕوا:

لەسەر ئەم مەسرەعە لادەم بچم بۆ مەسرەعی سانی
بڵێم ئەی پاسەوانی میللەت و ڕێگەی موسوڵمانی
ووجووت فەخرە بۆ من چونکە لای من فەخری کوردانی
نەوەی کاکە ئەحمەد و نوتفەی حوسێن و شێری یەزدانی

شاعیر بابەت دەگۆڕێ، لە گلەییەوە دەچێ بۆ ستایش و دەیگەیێنێتە پلەی پێغەمبەری، بەڵگەی بەدەستەوەیە چونکە شێخ لە نەوەی پێغەمبەرە. لە پاشانا بەم دێڕانە کۆتایی بەشیعرەکەی دێنێ:

هەتیو چیت ووت زمانت وەرگەڕێ غەڵەتێکی گەورەت کرد
لە لای خۆت شاعیری هێشتا قسەی پیاوانە نازانی

خـــراپی چاکـــەیە زامی شـــیـــفـــایە حـــیـــددەتی حـــیلمـــە
جنێـــوی فـــەخـــرە تالآنی عـــەتایە عـــەفـــوە عـــینوانی
کـــەرەم کـــار و وەفـــادار و وەلی خـــولق و عـــەلی کـــردار
تەبیـــعـــەت چاک و تینەت پاک دڵ پڕ نوور و نـوورانی
فەلەک مل شۆڕ ئەکا ئەمڕۆ لە ژێر پێی ئەسپی شێخ مەحموود
مـەلەک مـەجبـووره ئەمـڕۆ بۆ ئیـتـاعـە و حـوکم و فـەرمـانی
ئەوەندەی باری تەعنەت کـەوت بەمل دا (خـالیـسی) ئەمـڕۆ
ئەهاتە خـــزمـــەتت قـــوربان وەلێ زامـــداره ســـەر شـــانی

ئەم دێڕانەی شیعرەکە ڕەنگدانەوەی سۆزی ڕاستەقینەی شاعیرە بەرامبەر بەشێخ مەحموود لە ڕێکخراوە دەروێشییەکەوە چەکەرەی کردووە کە تەریقەتی قادرییە. لە دوای ئەو مەسەلەی کوردایەتی دێتە گۆڕێ، واتە هەستی قەومی. بەهەمـوو جۆرێک یەکێکی وەکو خالیسی لە ڕووی کوردایەتییەوە ئەگەر دەنگ بدا بۆ هەڵبژاردنی سەرداری کوردستان ئەو دەنگە بەر شێخ مەحموود دەکەوێ چونکە ڕێکخراوی تەریقەتی قادری کە خۆی و باب و باپیـرانی پێـڕەوییان کردووە ئەوە دەخـوازێ و دەبێ ئەو شـێخ مـەحمـوودەی نەوەی کـاک ئەحمەدە بەگەورەی خۆیانی دابنێن.

خالیسی جگە لەم شیعرە چوارینێکی ڕەنگینی هەیە بۆ شێخ مەحموودی وتووە:

سەر کە بێ مشکی و کڵاو بێ سەرفرازیم بۆ چییە
دڵ وەکـو شووشـەی شکاو بێ دڵنەوازیم بۆ چییـە
پێت عـەتا کـردم بەڕاسـتی حـەققـی خـۆم و باوکم
تۆ کـە مـەحـموودێکی وا بی من ئەیازم بۆ چییـە

لەم چوارینەدا خالیـسی وێنەی هونەری شاعیـرانە دەکێشی کە بەراورد لە نێوان شـێخ مەحموود و سوڵتان مەحموودی غەزنەوی دەکا. بەشێخ دەڵێ سەر بێ مشکی و کڵاو بێ سـەربەسـتی و ئازادی پێـویست نیـیـە، هەروەها ئەگـەر دڵ شکا بێ، دڵدانەوە پارە ناکـا، ئەوەی پێویست بوو بۆ خۆم و باوکمت کرد، ئیتر تۆ کە مەحموود بی من ئەیازی تۆم و نابم بەمـەحـمود لەبەرئەوە پێـویسـتیم بەئەیاز نییە. ئەیاز یار و یاوەری سوڵتـان مـەحـموودی غەزنەوی بوو، لە ناو کوردەواریدا بەناوی «هەیاسی خاس» ناوبانگی دەرکردووە.

***



هیچ کـەسێک لە ناو کوردان و هیـچ ڕووداوێک لە مـێـژووی کـوردسـتان هێندەی شـێخ مـەحـمـوود و کـردەوەکـانی ڕەنگیـان لە بەرهەمی ئەدەبی کـوردیدا نەداوەتەوە. دوو هۆی سەرەکی پێـوەندیی بەمەوە هەیە، یەکەمیان زۆربەی شاعیر و نووسەرانی کوردی سەدەی بیـسـتەم لە مەڵبەندی شـێخ مـەحـمـوود لە سلێـمـانی ژیاون و لە شـێـخەوە نزیک بوون. دووەمیان لە دوولاوە هۆی گەورەیی بۆ دروست بـوو، لە لایێک وەک نەوەی کاک ئەحمەدی شـێخ، لە لایێکی دیکەوە وەک نیشتمانپەروەرێک لە خەباتدا بوو لە مەیدانی بزووتنەوەی نەتەوەیی بۆ هێنانە دی هیوا و ئامانجی کورد کە دامەزراندنی دەوڵەتی نەتەوەیی بوو.

لەم باســەدا بەشــێکی ئەو ڕەنگدانەوەیە خــراوەتە بەرچاو، لە باسی ژیان و ئەدەبی شاعیرانیشدا بەشێکی دیکە پیشان دراوە. ئەوەی ماوە زۆر زیاترە لەوەی باس کراوە.

# بەشی چوارەم

## ڕەنگدانەوەی هەردوو جەنگی گێتیی

## سەدەی بیستەم لە ئەدەبی کوردیدا

### جەنگی یەکەمی گێتی

**١٩١٤ – ١٩١٨**

جەنگی یەکەمی گێتی لە ٢٨ی تەمووزی ساڵی ١٩١٤ لە ناو دوو کۆمەڵە لە دەوڵەتانی ئەو سەردەمە هەڵگیرسا، لایێکیان ئەڵمانیا و نەمسا و مەجەر و دەوڵەتی عوسمانی بوون، ئەوی دیکەیان فرەنسا و بەریتانیا و ڕووسیا و بەلچیکا و یابان و لە دواییدا وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بوون. جەنگی یەکەم تا کۆتایی جەنگی دووەمی گێتی بە«جەنگی گشتی» ناسرا بوو. هۆی هەڵگیرسانی جەنگ ئەوە بوو ئەڵمانیا تووشی تەنگوچەڵەمەی سیاسی قورس بووبوو، جگە لەوەی ڕەوشی ئابووری لە ناو گیروگرفتدا نوقوم بووبوو، بۆ دەربازبوون لەم هەڵسوکەوتە سەختە پێویست بوو لایەنی سوپایی بەهێز بکا بۆ ئەوەی بتوانێ دەست بەسەر وڵاتانی دەرەوەدا بگرێ.

هۆی ڕاستەوخۆی هەڵگیرسانی جەنگەکە ئەوە بوو ئەرشیدۆک فرانسوا فیردیناند میری جێگری قەیسەری نەمسا لە شاری سەراییڤۆ بەدەستی نیشتمانپەروەرێکی سیربی کوژرا. نەمسا بڕیاریدا ڕیشەی «بیری نەتەوەیی» لە ناو میللەتە بچووکەکاندا هەڵکەنێ و لە ناوی ببا. بۆ ئەم مەبەسە جاڕی جەنگی دا، لە پاشانا لایەنەکانی دیکە بەشدارییان تێدا کرد و بەم جۆرە هەموو ئەوروپای گرتەوە و گەیشتە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست، گەورەترین دەوڵەتێکی ئەو ناوچەیە وڵاتی عوسمانی بوو بەشداری تێدا کرد. ئەنجامی جەنگ ئەوە بوو ئەڵمانیا شکا، وڵاتە داگیرکراوەکانی ئەفەریقای لە دەست چوو، ئیمپراتۆرییەتی نەمسا – مەجەر کۆتایی هات و دەوڵەتی عوسمانی تەفروتوونا بوو.

کارەساتی ئەو جەنگە لە سەرشانی مرۆڤایەتیدا گەلێ قورس بوو. نزیکەی ٦٥ میلیۆن سەرباز بەشدارییان تێدا کرد، لەوانە ٩ میلیۆن کوژران. بەشی ئەڵمان لە کوژراوان نزیکەی دوو میلیۆن بوو، بەشی ڕووس زیاتر لە میلیۆن و نیوێک بوو، بەشی فرەنسییەکان زیاتر لە میلیۆن و چارەکێک بوو. جگە لەمانە دە میلیۆن شارستانی بێ



چەک لە ئەنجامی ئەم جەنگە کۆتاییییان هات. لە دوای جەنگ گۆڕانێکی گەورە لە سیاسەتی نێودەوڵەتان و نەخشەی جوگرافی وڵاتان ڕووی دا. جەنگی یەکەم لە ڕۆژی ١١ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩١٨ کۆتایی هات.

ئەو جەنگە ڕووداوێکی یەکجار گرنگ بوو لە مێژووی میللەتی کورد. لەگەڵ ڕووخانی دەوڵەتی عوسمانی ئەو بەشە گەورە و فراوانەی کە لە دوای دابەشکردنی یەکەم لە ئەنجامی جەنگی چاڵدیران (١٥١٤) لە ژێر دەسەڵاتی عوسمانی بوو کرا بە سێ پارچە، هەر پارچەی کەوتە ناو دەوڵەتێک لەوانەی لە دوای ڕووخانی عوسمانی پەیدا بوون. بەشی هەرە زۆری کەوتە ناو تورکیاوە، بەشێکی لەو کەمتر کەوتە عیراق و بەشێکی بچووک لە باشووری بۆتان (جزیرە) کەوتە سووریا. ئەو سێ پارچە کوردستانە لە ماوەی جەنگی یەکەمدا بەشێک بوون لە خاکی عوسمانی لە نالەبارترین و سەختترین ڕەوشی ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری دەژیان. شەڕ لە ناوماڵی کوردا بوو. لە لایێکی دیکەوە ئەمە هەلێک بوو بۆ کورد هەڵکەوتبوو بکەوێتە خۆ بۆ داواکردنی مافی مرۆڤایەتی خۆی و چارەنووسی دواڕۆژی، بەڵام گیروگرفتی گەورە کە بووە بەرپەرچی نەهاتنە دی بیری ڕزگاری کورد ئەوە بوو پلەی بیری سیاسی و دانایی و دیپلۆماسی سەرانی کورد لە پلەی دوژمنەکانیدا نەبوو، ئەم دوژمنانە دەوڵەتی عوسمانی و دەوڵەتە شەڕکەرەکانی ئەوروپا بوون.

شاعیرانی کوردی ئەو سەردەمە دەوری دیاریان بووە لە وێنە گرتن و باسکردنی کارەساتی جەنگ بۆ هەموو مرۆڤایەتی بەگشتی و بۆ سەر کۆمەڵی کوردەواری بەتایبەتی.

لەم ماوەیەدا پێویستە گەشتێک ساز بکرێ بەناو ئەو بەرهەمە شیعرییانەی لەم بابەتەوە وتراوون.

**١**

یەکێ لە شیعرە بەناوبانگ و جوانەکانی بەتایبەتی بۆ جەنگی یەکەمی گێتی ڕێک خرابن، ئەو قەسیدەیەیە کە مەلا حەمدوون (١٨٥٣ – ١٩١٧) بۆ جەنگی یەکەمی هۆنیوەتەوە. شاعیر قەسیدەکەی بەم دێڕانە دەست پێ دەکا:

ئەم ڕۆژە چ ڕۆژێکە کە عالەم شڵەژاوە
هەر کەس بە چ خارێ جیگەری قیمە کراوە

دونیا پڕی ئاشووبە خەلایق بەعموومی
ئاسایشی لێ مەنعە ئەڵێی جونبوشی ئاوە
وەک تەرزە ئەبارێ بەهەموو دەم ئەسەف و غەم
هەوری غەزەبی قەهری خودا توند و بەتاوە
گیرۆدەیە ئەم عالەمە هەر کەس بەسیاقێ
کەوتوونە کەشاکەش بەقوماندە و ئومەراوە
بۆ گرتن و بۆ کوشتنی ئەم عالەمە یەکسەر
ئەم عەرسەیی ئافاقە ئەڵێی حەلقەیی داوە
ئەم وەزعە کە ناوی ئەبەن ئەمڕۆ بەسەفەربەر
فەرمانی بەخوێن ڕشتنی ئەم عالەمە داوە
ئەم زاڵمی خوێنڕێژی سەفەربەرلگە ئەمڕۆ
نامەی فەرەحی داوە بەدەم بادی سەباوە

حەمدوون بەگشتی باس لەو جەنگە دەکا ئەوەی تەنیا گۆشەیێک یا ناوچەیێکی ئەم گێتییەی نەگرتۆتەوە، بەڵکو باڵی ڕەشی بەسەر هەموو ئاوەدانی سەر ڕووی زەویدا کێشاوە. جەنگی یەکەم کارەسات و هەرەس و بوومەلەرزەیێک بوو تووشی هەموو مرۆڤایەتی بوو، ئارامی لە خەڵکی بڕی بوو. لە لای ئێمە و وڵاتی عوسمانی کۆن ئەم جەنگە بە«سەفەربەر، سەفەربەرلک» ناسرا بوو.

حەمدوون لەسەر شیعرەکەی دەڕوا:

پەژموردەیە گوڵزاری ئیرەم بولبولی شادی
ڕووحی لە عەزابایە بەسەر خاری جەفاوە
فەوتاوە لەبەر سوخرە کەر و قاتر و یابوو
حوشتر سەقەت و شەل بووە گا پشتی شکاوە
جەندرمە ئەسووڕێتەوە وەک واشەیی برسی
بۆ لاشەیی میللەت بە فڕوفێڵی غەزاوە
کەر زەوقی زەڕینی نییە حەتتا لە بەهارا
ترسی هەیە نەک بیخەنە ژێر باری قەزاوە



تەییارە بەئەسبابی شەڕ و فیتنەوە دایم
جەولانی ئەڵێی هەورە بەسەر مەرکەبی باوە
ئەم جووتە بەلازادەیە باڵندەیە ئەمڕۆ
سەییارەیی فیرقەن بەئەلەتریکی چراوە
باڵۆنی هەڵۆ شێوە لەگەڵ دێتە تەحەرروک
عالەم لە نەزریا بەمەسەل پوڕی خوراوە
شەو ڕۆژە لەبەر بەرقی قلیج و ڕم و سونگی
لەمعەی قەسەتۆرەش بەدەلی عەکسی هەتاوە

لەم دێڕانەدا ئەوە دەردەکەوێ جەنگ هەموو شتێکی شێواندووە. گوڵزاری سروشت سیس بووە، بولبول لە ماتەم دایە، ئاژەڵی بەرزە وەکو کەر و ئێستر و وشتر و گا ئەوانەی لە جەنگدا بەکار دەهێنران سەقەت و شەل بوون، جەندرمەی برسی بەناوی غەزاوە خەڵکی دەڕووتێننەوە، کەر شەوقی زەڕینی نییە بۆ ئەوەی کەس هەست بەبوونی نەکا نەوەکو بیبرێ بۆ شەڕ. هەروەها شاعیر ئاماژە بەفڕۆکە و باڵۆن دەکا وەک چەکێک لەو جەنگە جیهانگیرییە بەکار دەهێنران.

ئینجا شاعیر لەگەڵ قەسیدەکەیدا دەژی و بەم دێڕانە کۆتایی پێ دێنێ:

هەر شەش جیهەتی گرتووە ئاشووب و موسیبەت
مێشوولە مەجالی نییە دەرچێ لە هەواوە
عالەم لە شریخەی شەرەری دومدومی بۆمبا
حەیران و سەراسیمە وو عەقلی خرەفاوە
واپۆڕ و سەفینە و بەلەم و کەشتیی و قایەغ
ئامادەیی حەربن بەهەموو مەسلەحی ئاوە
ڕووسی غەم و ئینگلیزی خەفەت هەردوو بەجارێ
هاتوونەتە سەر موئمینی عەشرەت بەسوپاوە
هەر لەحزەیە سەد لەک چ لە موئمین چ لە موشریک
واسیل بەدوجیمن بەعەتا وو بەخەتاوە
ئەم دینە لە پێشا وەکو سەرچەشمەیی زەمزەم
بێ غەش بوو ئەمێستاکە ئەڵێی عەینی قوڕاوە

یارەببی لەبەر حورمەت و ئیکرامی موحەممەد
ڕوحمێ بکە بەم باقیی ئیسلامە کە ماوە
کەم یا وەکو زۆر نەسرەتی حەق ڕاهنوما بێ
بێ نەسرەتی حەق لەشکری دارا سەرەواوە
(حەمدی) دڵی یەخسیری فەرەنگی غەمە ئەمڕۆ
بەربوونی بەفەتحی فەرەحی بەسرە وو فاوە

ئەم جەنگە ئەدگاری تایبەتیی خۆی بووە، لە جەنگی سەدەکانی پێشووی نەکردووە. ئەو کاتە تەنیا جەنگی سەر ڕووی زەوی هەبوو، جەنگاوەران بەرامبەر بەیەکتری دەوەستان، بەجووتە زۆرانبازییان دەکرد. ئەوەی ئێستا شەڕی قورسە لە ئاسمانا بەهۆی فڕۆکەوە، لە ناو زەریا بەهۆی کەشتییەوە، لەسەر زەوی بەهۆی تانک و زرێلەوە جەنگ کۆتایی پێ دێ.

جەنگی یەکەم خەڵکی سەر ڕووی زەوی خستبووە ئاشووب و کارەساتەوە. شاعیر تەنیا ئەوەی بۆ دەکرا لە خودا بپاڕێتەوە ئەو ئیسلامەی کە ماوە زیاتر ئازار نەچێژێ. شاعیر بۆ ئەم ڕووداوانە غەمبارە و ئارەزوو دەکا لەشکری هەق سەربکەوێ. بەلای شاعیرەوە ڕزگاربوونی بەسرە و فاو گرنگە. لێرەدا ئەوە ئاشکرایە هێشتا جەنگ کۆتایی نەهاتبوو کە ئینگلیز بەسرە و فاوی داگیر کرد. ئەوە ماقووڵ نییە حەمدوون گرتنی بەسرە و فاو لە لایەن ئینگلیزەوە بەڕزگاربوون حسێب بکا. لەوانەیە مەبەسی شاعیر ئەوە بێ سوپای عوسمانی ئەگەر ئەم دوو جێگە ستراتیجییە لە دەست ئینگلیز ڕزگار بکا دەبێتە مایەی کەیف و شادی.

## ۲

عارف سائیب (۱۸۸۹ – ۱۹۲۳) شاعیرێکی سەردەمی جەنگی یەکەم بووە. لە لایێکی دیکەوە دەنواڕێتە کارەساتەکانی جەنگ، ئاوارەیی کارێکی قووڵ و دژواری لێ کردووە. زانیویەتی دوورکەوتنەوە لە وڵات و ئەندێشەی ژیانی تایبەتیی خۆی لە ئەنجامی زوڵم و زۆری دەوڵەتی عوسمانی بووە. کردەوەی دەسەڵات بۆ پاراستنی دامودەسگاییێکی کۆنەپەرستی دواکەوتوو بوو. شاعیر بەشێوەییێکی جوان و ڕاستگۆیانە کۆمەڵە شڵەژاوەکەی ناو سوپای عوسمانی پیشان دەدا. لە شیعرێکیدا دەڵێ:

ئاوارەیی خاکی وەتەن و سەیر و سەفا خۆم
پامالّی غەم و غوربەت و سەد دەرد و بەلا خۆم



بێ یار و دیار وەحشیی و مەجنوونی بیابان
مەهجووری سەفای مەجلیسی ئەربابی وەفا خۆم
سەرگەشتەیی سەحرایی خۆیی و ساحەیی سەلماس
ڕیسوایی عەجەم مەسخەرەیی شاه و گەدا خۆم
ئەم تالعە نەحسە منی خستۆتە فەلاکەت
ئاشوفتەیی دەستی ستەمی بەختی سیا خۆم
کەوتوومەتە ناو تاقمی ژاندرمە خودا مەرگ
دووچاری هەزار دەردی سەر و قەهر و سزا خۆم
سووڕ دانە عەرەق خواردنە کۆڕێکە مەپرسە
سەرسامی هەزار هەلهەلە وو ڕەقس و سەما خۆم

وەک لە ناوەرۆکی ئەم شیعرەدا دەردەکەوێ شاعیر لە ناوچەی خۆی و سەلماس لە کوردستان و ئازربێجانی ئێران لە نزیک قەفقاس سەرباز بووە لە نێوەندێکی ئوردووگای عوسمانی ژیاوە لە هەرێمێکدا لە ناو خاکی ئێران و هێڵێکی گەرمی جەنگی یەکەم بووە. لێرەدا شاعیر باس لە هەستی ڕووخاوی ناوەوەی دەروونی خۆی دەکا. ئینجا لە شیعرەکەیدا بەردەوام دەبێ:

ڕۆژێ کە سەفەر بێ وەکو سەگ غەرقی قوڕاوم
ڕۆژی حەزەریش تووشی هەزار دەردی وەها خۆم
ڕۆژێ خەبەری حەرب و دەمێ مۆژدەیی سوڵحە
ئوفتادە لە ناو دەغدەغەیی خەوف و ڕەجا خۆم
بێ مەسکەن و بێ چادر و یاغمورلغ و یاتاغ
عوریان و پەرێشان بەمەسەل گورگی چیا خۆم
باران و قوڕ و دەهشەت و سەرمایە بەهەر جا
پامالّی دەسی شیددەتی بەفر و ڕەشەبا خۆم
خۆ بەگسمەد و خەپلەیی جۆ و ساوەر و گۆشت گا
ئاوساندی زگم عەینی وەکو ڕشکەیی کا خۆم
دوو مانگ ئەبێ نەمدیوە سەفای بەزمی پلاولغ
دەرناچێ لە دڵ هەر بەئومێد و بەتەما خۆم

بڕسی و ڕەش و ڕووت چڵکن و بێ پارە وو تووتن
حەسرەت کەشی دوو قوم جیگەرە و پیاڵەیە چا خۆم

لەم دێڕانەدا شاعیر باس لە ناخۆشی ژیانی عەسکەری دەکا لە ئۆردووگا. هەموو دەمێکی ناخۆشە شەڕ هەبێ یا نەبێ. سەربازی عوسمانی برسی و ڕووت و ڕەجاڵە، بەمانگ پلاو ناخۆن، لە تووتن و جیگەرە و چایە هەر مەپرسە.

شاعیر بەم دێڕانە کۆتایی بەقەسیدەکەی دێنێ:

وا دامدرووە پینە لەسەر چاکەت و شەڵوار
گۆڕاوە سەر و سوورەتی من وەک جلەگا خۆم
نابینی تەڕاوەت لە ڕەگی عومر و حەیاتم
ئەلحەق وەکو تووی قۆجە بەبێ بەرگ و نەوا خۆم
تووکی سەر و ڕیشم لە غەما بۆز و درێژ بوو
بەم وەزعیەتی ڕیشەوە وەک خواجە حەنا خۆم
کافر بەزەیی دێتەوە بەم حاڵە پەشێوە
وا دەربەدەر و قوڕ بەسەر و تووشی سزا خۆم
بۆ شاری سلێمانییە فەریاد و فیغانم
دایم لە خەیاڵ و غەمی تەبدیلی هەوا خۆم
بێ شوبهە لەبەر دەرد و غەم و قەهر و مەرارەت
مەحروومی سەوابی شەرەف و خێر و دوعا خۆم
بێ تاقەت و بێ ویسعەت و حەیران و پەرێشان
هەر مونتەزیری لوتفی نەبی و فەیزی خودا خۆم
شیعرم وەکو تەبعم کە پەرێشان و خراپە
مەحجووب سەرەفگەندەیی جەمعی شوعەرا خۆم
(عارف) ئەسەری مەرحەمەت و لوتفی خودایە
بۆ مەنفەعەتی دین و وەتەن جان بەفیدا خۆم

لەم دێڕانەدا شاعیر لە ڕووتوقووتی خۆی دەدوێ، باس لە چاکەت و شەڵواری پیناوی دەکا، خۆی لەگەڵ تووی قۆجەی قەراغ شاری سلێمانی نزیک سابوونکەران بەراورد دەکا.



ئەو تووە پەرپووت و بێ لق و پۆ بووە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەو جێگەیە لە کاتی خۆیدا جێی سەیرانی خەڵکی شار بووە. دیسانەوە خۆی بەخواجە حەنای جوولەکەی خەڵکی سلێمانی دەچوێنێ، دیارە ئەو کابرایە ڕیشی هەبووە، بێ گومان شاعیریش لە بێ دەرامەتی نەیتوانیوە ڕدێنی بتراشێ. شاعیر بەکوڵ بۆ خۆی دەلاوێنێتەوە، بیر لە یادگارە کۆنەکانی دەکاتەوە کە لە سلێمانی بەجێی هێشتوون.

## ٣

ناتیق (١٨٨٦ – ١٩٦٧) مەلا کەریم کوڕی عوسمان ئاغا شاعیرێکی دیکەی خەڵکی سلێمانییە لە جەنگی یەکەمی گێتی سەربازی سوپای عوسمانی بووە، زۆربەی ماوەی عەسکەری لە وڵاتی شام بردۆتە سەر. لەسەر کێش و قافیەی قەسیدەکەی عارف سائیب قەسیدەیێکی درێژی وتووە، دوور نییە پێش ئەویش دایانبێ. هەستی ئاوارەیی و دوور وڵاتی لەو شیعرەدا دەردەبڕێ و لە ئەرکی سەرشانی ژیانی ڕۆژانەی سەربازی عوسمانی دەدوێ. سەرەتا بەم دێڕانە دەست پێ دەکا:

سەرگەشتەیی چەرخی فەلەکی بێ سەر و پا خۆم
ئاوارەیی شام و حەلەب و حومس و حەما خۆم
پامالّی هەموو غوربەت و هیجرانی زەمانە
موستەغرەقی دەریایی غەم و جەور و جەفا خۆم
دوورکەوتەیی زێد و وەتەن و بەستەیی غوربەت
بێ ساقیی و بێ موتریب و بێ بەزم و نەوا خۆم
پەیوەستە جیگەر خەستە لە ناو ماڵی پەڕۆدا
بێ زەمزەمە وو عیشرەت و بێ شەمع و چرا خۆم

وەک لەم پێشەکییەدا دەردەکەوێ ئەم شیعرە لەگەڵ شیعرەکەی پێشوو لە هەموو جەوهەرەکانی شیعردا یەکتری دەگرنەوە. ئەگەر هەردوو شیعر تێکەڵ بەیەکتری بکرێن هەست بەوە ناکرێ لە دوو بەرهەمی شیعری پێک هاتبن. هەروەها نازانرێ کامە شیعر پێش ئەوی دیکە دانراوە. جیاوازی لە نێوان هەردوو شیعر لەوەوە هاتووە عارف سائیب لە هێڵی باکووری ئێران و نزیک قەفقاس بووە، ناتیقیش لە وڵاتی سووریا بووە، چونکە خۆی باس لە شام (دیمەشق) و حەلەب و حیمس و حەما دەکا و لە دەوروبەری وێنە و

ماناکانی شیعری پێشوو دەسوورێتەوە. ئینجا باس لە ژیانی ڕۆژانەی ناو ئۆردووی سوپا دەکا و هەندێ وشە و زاراوە و تەعبیری تورکی بەکار دێنێ، بەتایبەتی ئەوانەی پێوەندییان بەسوپاوە هەیە. ئینجا شیعرەکەی بەم دێڕانە دوایی پێ دێنێ:

بەم بەرگە لەبەرما کە دەڵێی گورگی زەهاوم
دایم لە شەڕی سەگ سیفەتان کووفتە پا خۆم
لەم حەسرەت و لەم عەسرەتە کەوتوومە هەلاکەت
ئەی وایی درێغا کە بەبێ بانگ و سەلا خۆم
وا چاکە بەخوڕ ئەشکی تەحەسسور کە بڕێژم
بەم دەردی دڵ ئەفگارییە مەحروومی دەوا خۆم
سێ مانگ دەبێ نەمدیوە هەرای بەزمی پلاولغ
حەسرەت کەشی دوو قوم جیگەرە و پیالەیە چا خۆم
ئەشجاری ووجوودم لە خەزانی غەمی هیجران
زەرد بوو وەرقی پەڕەیی بێ نەشئونەما خۆم
ئەوسا بەهەوای شەوقی دڵی زەوقی گوڵ ئەمووت
سەد شوکری خودا بولبولەکەی گوڵشەنی شا خۆم
ئێستەش لە شەقی چەرخی فەلەک وێڵی وولاتان
ئوفتادەیی بەردەرگەهی وەستایی جۆلا خۆم

لەم شیعرەدا ناتیق برێک لە وێنەکانی شیعرەکەی پێشوو دووبارە دەکاتەوە، لە شیعری یەکەمدا عارف سائیب دەڵێ دوو مانگە پلاوی نەخواردووە کەچی ناتیق لە شیعرەکەی خۆیدا دەڵێ سێ مانگە بەزمی پلاولغی نەدیوە. بۆ جیگەرە و چایە نیوە دێڕێک لای هەردووکیان دووبارە بۆتەوە. شاعیری پێشوو خۆی بەگورگی چیا دەچوێنێ، بەڵام ئەمەیان بەگورگی زەهاو. لە هەردوو شیعردا هەندێ وشە و وێنە و مانا دووبارە بوونەتەوە، ئەمە بەهیچ جۆرێ ئەوە ناگەیەنی ئاگاداری شیعری یەکتری نەبووبن، هەرچۆنێ بێ بەشیعرێکی ڕەوان هەردوو شاعیر لە کەساسی ژیانی سەربازی عوسمانی دەدوێن.



## ٤

عەلی بەگ سالار سەعید حەیدەری ناوی تایبەتی خۆی «عەلی»ی وەک نازناو لە شیعریدا بەکاری هێناوە. کوردی ناوچەی موکریانی کوردستانی ئێرانە، برای ئەدەب (عەبدوڵڵا بەگی میسباح - ددیوان)ە. لە سەردەمی خۆیدا بەجۆرێک کوردایەتی کردووە لەگەڵ سیاسەتی ڕەسمی دەسەڵاتی پەهلەوی و بۆرجوازییەتی فارس بگونجێ. ماوەیێک نوێنەری ناوچەی موکریان بووە لە مەجلیسی شوورای میللی (پەرلەمانی) ئێران.

لە ماوەی جەنگی یەکەمدا گەلێ ناوچە و هەرێمی کوردستان ڕزگارییان لە هێرش و تالانی لێشاوی سوپای کازاکی ڕووس نەبوو. ناوچەی موکریان بەتایبەتی شاری سابلاغ (مەهاباد) شانۆی نواندنی ئەم کارەساتە بوو. ئەم ڕووداوە کاری لە عەلی کردووە و هەست و نەستی بەشیعر دەربڕیوە:

لەو دەمەی تاقم لە دیداری عەزیزانی وەتەن
دائیما جووتم لەگەڵ غەم هەمدەمی حوزن و میحەن
تۆزی خاکی هەرملێ سوورمەیی چاوی دڵە
ئاوی سەرچاوەی زولاڵی شەربەتی ڕووح و بەدەن
حوببی تۆ دینی من ئایینی من ئیمانی من
یاد و فیکری ئاو و خاکت ویرد و زیکری من وەتەن
گوڵبونی گوڵزارەکەی تۆ بوو کە جێی قومری و هەزار
ئاشیانەی جوغدە ئێستا بۆتە جێی زاغ و زەغەن
شار و بازاڕت دەڵێن سەرپاکی وێران و خەراب
موڵک و ئاسارت هەموو پاماڵ و خالی یو سسەکەن
کووچە وو شارت کە پڕ ئاهووی خوتەن بوو بێ خەتا
جوملە وێران و خەرابن پڕ لە سەگباب و لە سەن
جێی مەلاکان و ئیمام و مەدرەسە و نەشری عولووم
پاکی جێی دەستەی قشوونە بۆتە جێی وەعزی قەشەن
مینبەر و مزگەوت لە دەردی حوجرەکان و حەوشەکەی
بوو بەمەیخانە و تەویلە مەعبەدی عەبدی وەسەن

دلبەرانت بوونە یەخسیر چوونە قەفقاس و سیبیر
نەوجەوانانت هەموو کوژران و نێژران بێ کەفەن
حەشرە واوەیلایە ئەمڕۆ کەربەلایە شارمان
کوشتن و تالآن و یەخسیرە کەوا دێن و دەبەن
ئەی خودا هەر کوردە یەخسیری هەموو میللەت بوون
دەی (عەلی) تا چاک نەفەوتاوە بڵێ فیکرێ بکەن

شاعیر لەم لیریکەیدا سۆزی بەرامبەر بەنیشتمان هەڵدەڕێژێ. ناوچە و ئاوایی هەرملێ دەکاتە ڕەمز بۆ هەموو خاکی نیشتمان، بۆ ئەو مەبەسە تۆزی خاکی هەرملێ دەبێ بەکلی چاوان و ئاوی پاکی دەبێتە شەربەتی لەش و گیان. ئەم کوردستانە جوانە وێران و تالآن کراوە، خەڵکی ئەوێیان ئاوارەی قەفقاس و سیبیریا کردووە، چونکە داگیرکەر قەیسەری ڕووس بوو. ئەوەی لە ئەنجامی هێرشی ڕووس بۆ سەر وڵاتی موکریان بەسەر کورد هاتووە وەک شاعیر دەڵێ لەو ڕووداوانە دەکا کە لە سەدەی یەکەمی هیجری (سەدەی حەوتەمی مەسیحی) لە نێوان هاشمی و ئومەوی یا حوسێنی کوڕی عەلی و یەزیدی کوڕی معاوییە کەوتنە ناوەوە.

## ٥

فایەق تاپۆ یەکێکە لەو شاعیرانەی خەڵکی سلێمانی لە سەردەمی جەنگی یەکەم ژیاون و ئاگاداری ڕووداوەکانی جەنگ بوون. فایەق گەلێ سەرا و دەراوی دیوە. چاوی لێڵ بووە هێندەی بیتروکێنێ بۆ بینینی کردەوە تیرۆریستییەکانی دەسەڵاتی عوسمانی لە شاری سلێمانی. بۆ ئەم مەبەسە قەسیدەیێکی هۆنیوەتەوە لە بەرهەمە ڕەند و جوانەکانی ئەدەبی کوردی دەژمێررێ:

بەمەعمووری کە مەشهووری جیهان بوو خاکی کوردستان
هەموو وێرانەیە ئێستا لە زوڵم و وەحشەتی تورکان
لەبەر لاشەی بەنی ئادەم چ مومکین هاتوچۆ کردن
لە نەعرەی برسێتی قابیل نییە ئینسان نەبێ گریان
چییە ئەم زوڵمە ئەمڕۆ تورک کە ئەیکا لەم عیبادەی تۆ!
فەقیر و دەوڵەمەند شاهو گەدا شەو تا سەحەر ناڵان



لە ئاه و ئۆفی عالەم سینە وا کونکون بوو وەک بێژنگ
دەوای زەخمی دڵم ناکا حەکیمی حەزرەتی لوقمان
بەکافرمان ئەزانن هەمشەری ئەم قەومە بێ عەقڵە
هەتا کەی حیزی! سا دەی وەرنە غیرەت قەومی گەل کوردان
کە کەچ بوو تاقی دینمان بۆچی چاکە زیندەگی و عیشرەت
مەساجید هەموو ڕووخا ئەهلی سوننەت بووبوو سەرگەردان
لەبەر داری مەمەد عالەم هەموو هاتوونە ترس و لەرز
چ فەرقمان ما لەگەڵ قەحبە بەدینتان عەشرەتی گۆران

شاعیر هەناسەی خۆشی هەڵدەکێشێ بۆ ژیانی ناو کوردەواری پێش جەنگی یەکەمی گێتی. ئەو ڕۆژگارە خەڵکی ئاسوودە بوون، ژیانیان سادە و خۆش بوو، کەچی بەهۆی زوڵم و زۆری تورکی عوسمانی و لە ئەنجامی جەنگ وڵات بوو بەوێرانە، کار لە کار ترازا، برینی ئەو خەڵکە ئەوەندە دژوار و کوشندە بوو حەکیمی لوقمان نەیدەتوانی تیماری بکا. ئەم زۆرداریيە گەیشتبووە پلەیێک شاعیر سیفەتی ناشیرین و جنێوی بازاڕی بەکار بێنێ. بەلای ئەوەوە سەرشۆڕی لە ڕادەیێکدا بوو لە وزەی کەسدا نەبوو پێی ڕازی بێ، بۆیە شاعیر هانی خەڵکی دەدا هەڵسن، ڕاپەڕن بەرهەڵستی ئەو مەمەدانە بکەن. شاعیر مەمەد وەک ڕەمزێک بۆ تورک بەکار دێنێ. تورک ناوی محەمەد دەکەن بەمەمەد یا مەمەت.

شاعیر کە هاوار بۆ گۆران دەبا مەبەسی میللەتی کوردە، چونکە گۆران یەکێکە لەو تیرە و هۆزانەی کوردیان لێ دروست بووە (گۆران، کرمانج، لوڕ، کەلهوڕ).

شاعیر بەردەوامە لە قەسیدەکەی:

کە ئینسان ئەفزەلی مەخلووقە هیچ فەرقی نییە ئەمڕۆ
لەگەڵ حەیوانی ناهیق هەردوو بووینە مەئکەلی گورگان
تەماشای ئەهلی لادێ کەن هەموویان بوونە سلّقی ڕووت
لە دەست یەغماگەری ژاندرمە وو مەئمووری بێ ئیمان
بەزیندوو ئیکتیفا نەکرا تەعەرروز کرایە شەخس و پیر
نە شێخی نۆدێ مەحفووز ما نە قەبری حاکمی بابان
ئەمە ساڵێکە وا ئەگری و ئەناڵێنی لەبەر ڕووتی
ئەڵێ بێ غیرەتی شەکوای نەپرسیم گردەکەی سەیوان

بەسەوزی هەر وەکو زمرووت بەناز و عیشوە وەک کچ بووم
بەڕەونەق هەر وەکو گەوهەر بەخۆشی ڕەوزەیی ڕیزوان
عەجەب زیب و فەڕێکم بوو هەتا بیکرم هەبوو یاران
هەموو ئەولادی من بوون سونبول و گولّ لالە وو ڕەیحان
بەنووری سینە تەنویری ئەم تورڕەم ئەکرد دوێنێ
کەچی خۆم ئەمڕۆ موحتاجم بەنووری سەنعەتی ئینسان
هەموو جەستەم برینداری قولّنگی جەیشی تورکانە
سروشکی زار زاریمە بەبیللا شێوی سەرقەبران

لە کن خوێنخوارانی عوسمانی وەکو شاعیر دەڵێ ئادەمزاد جیاوازی لەگەڵ ئاژەڵدا نەبووە، ڕەچاوی گەورەیی و بچووکی نەدەکرا، خەڵکی دێهات ڕووت کرابوونەوە، هەژاران لەناوبرا بوون، گۆڕی شێخ مارفی نۆدێ و فەرمانڕەوایانی بابان ڕووخێنرا بوون، شایەتی ئەم کارانەی تورکی عوسمانی گردی سەیوانە گۆڕستانی بەناوبانگی سلێمانی. ئەوجا شاعیر دەکەوێتە ئەوەی بەزمانی کوردستان یا سلێمانییەوە گلەیی لەم بارودۆخە نالەبارە بکا و دەڵێ: من جوان بووم، کیژی پاکیزە بووم، هەموو ژیانم بەهار بوو، گوشادی و بەختیاریی ژیان هاوڕێم بوون، بەڵام ئێستا ڕەنگی مردووانم لێ نیشتووە لە سایەی زۆرداری تورکانی عوسمانییەوە. ئینجا قەسیدەکەی بەم دێڕانە کۆتایی پێ دێنێ:

لە ناو کوردایەتی غیرەت نەماوە هەموومان قەحبەین
لە خیتتەی جزیرە تاکو ئەچیتە شاخی هەورامان
کە شێخ عەبدلسەلامیان کوشت ئەگەر بێ دەنگ نەبوونایە
چ تورکێ حەددی بوو دەست دا لە نەجلی سەییدی عەدنان
ئەگەر ئەم حیزییە تا سەر دەوام کا وای لە حاڵی کورد
ئەناڵێنن لە ئێشی زیللە وو شەق خائیب و خوسران
بەقوربانی شەقەی ئاوزەنگ و ناڵەی فیشنگتان بم
دەزوو بن دەس دەنە شیر و تفەنگ و خەنجەر و قەڵغان
دەهەڵسن تاکو ئێمەش دەوڵەتێکی کوردی تەشکیل کەین
وەکو قەومی یەهوود و سرب و بوڵگار ئەرمەن و یۆنان



فەلەستین و یەمەن قەتعەی حیجاز و گورجیی و ئەرمەن
هەموو بوونە قەڕاڵ و ئیمپراتۆر حاکم و سوڵتان

دەردی دەروونی داغکراوی شاعیر دیسانەوە تووڕەی دەکا و جنێوی پیس بەخۆی و هەموو کورد دەدا. ناهەقی نییە، ئەوەی بەسەر کورد هاتووە کەس ناتوانێ پێی ڕازی بێ. ئەم بێ دەنگییە تەنیا بۆ مەینەتی و کارە جەرگبڕەکانی جەنگی یەکەم نییە، بۆ گەلێ لە کارەساتەکانی دیکەشە. شاعیر دەڵێ لە ئەوسەر تا ئەم سەری کوردستان لە جزیرەوە تا هەورامان هەموو کورد هەڵسابایە سەر پێ لە دژی تورکی عوسمانی ئەوانەی شێخ عەبدولسەلام بارزانییان لە سێدارە دا، ئەو کاتە کەس بۆی نەدەکرا کورد بچەوسێنێتەوە.

لە دوای جنێودان شاعیر دەگەڕێتەوە بۆ لای هێز و توانای کورد، لێرەدا گومانی لەوەدا نییە کە ئەو میللەتە خاوەن غیرەتە، لەبەرئەوە هانیان دەدا هەموو پێکەوە لە خەو هەڵسن و دەست بدەنە چەک و تۆڵەی خۆیان بکەنەوە. مەسەلەی ژێردەستی و دواکەوتوویی کورد بەدروستکردنی دەوڵەتی نەتەوایەتی خۆی نەبێ کۆتایی نایە. خۆ ئێمە لە میللەتە بچووکە دواکەوتووەکانی بن دەسەڵاتی عوسمانی کەمتر نین! وەکو جوولەکە و سیرب و بولگار و ئەرمەن و یۆنان و فەلەستین و یەمەن و حیجاز و گورج. وەک ئاشکرایە لە دەوروبەری جەنگی یەکەمی گێتی ئەم میللەتانە هەڵسابوون و داوای مافی نەتەوەیی خۆیانیان دەکرد.

# جەنگی دووەمی گێتی

## ١٩٣٩ - ١٩٤٥

ئاگری جەنگی دووەمی گێتی لە ڕۆژی ١ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٣٩ هەڵگیرسا. جەنگ لە نێوان دوو بەرەی دەوڵەتانی ئەوروپا و ئاسیادا بوو، بەرەی هەڵگیرساندن و دەستدرێژی ئەڵمانیا و ئیتاڵیا و یابان بوو. ئەمانە بەدەوڵەتانی میحوەر ناسرا بوون. بەرەی بەرامبەر فەرەنسا و بەریتانیا و ڕووسیا و ئەمەریکا و چین بوو، ئەمانەش بەبەرەی سوێندخۆر یا هاوپەیمانان ناویان دەرکردبوو.

هۆی جەنگەکە ئەوە بوو ئەڵمانیا لە دوای شکانی لە ئەنجامی جەنگی یەکەم ژیانی ئابووری کەوتە لێژی و بەرەو ڕووخان دەچوو، ئەم دیاردەیە بووە هۆی ئەوەی بیروباوەڕی نازی وەک ئیدیۆلۆجییەتێک و دیکتاتۆرییەتی ئەدۆلف هیتلەر بکەونە ناوەوە. بۆ ئەوەی ئەڵمانیا خۆی لە خنکان و لەناوچوون قورتار بکا لەگەڵ هاوپەیمانەکانی ئیتاڵیا و یابان ئاگری شەڕی هەڵگیرساند بەئەو مەبەسەی لە لایێک لەم تەنگوچەڵەمەیە ڕزگاری ببێ و لە لایێکی دیکەوە مەڵبەندی ژیانی فراوانتر بکا بەداگیرکردنی وڵاتانی دەرەوە.

لە سییەکانی سەدەی بیستەمدا هەندێ شەڕی ناوچەیی ڕوویاندا. ئەمانە پێشەکی بوون بۆ جەنگە گەورەکە. نموونەی شەڕە بچووکەکان یابان لە ساڵی ١٩٣٢ مەنشووریای داگیر کرد. ئیتاڵیا لە ساڵی ١٩٣٥ بەسەر ئەتیووپیای (حەبەشەی) دادا. هیتلەر لە ساڵی ١٩٣٦ ڕینانیا و لە ساڵی ١٩٣٨ نەمسا و سوودیتی داگیر کرد. یابان لە ساڵی ١٩٣٧ هێرشی بردە سەر چین. هەروەها هیتلەر لە ساڵی ١٩٣٩ پێش ئەوەی جاڕی جەنگی دووەم بدا لە دژی پۆڵۆنیا هێرشی بردە سەر چیکۆسلۆڤاکیا.

زیانی جەنگی دووەم زۆر لە جەنگی یەکەم زیاتر بوو، چونکە چەک و سیلاح و کەرەستەی پێشکەوتووتر بوو. لە ئەنجامدا جەنگ بەکوژرانی هیتلەر و بەنیتۆ مۆسۆلینی سەرۆکی ئیتاڵیا و وێرانکردنی ئەڵمانیا و ئیتاڵیا و یابان کۆتایی هات.

لەم جەنگەدا ٩٢ میلیۆن سەرباز بەشدارییان کرد. ژمارەی کوژراو ٤٩ میلیۆن بوو، لەمانە ١٢ میلیۆن لە گرتووخانە و ئۆردووگای ئازاردان دوایی بەژیانیان هات. ڕووس ٢٠ میلیۆن کوژراویان هەبوو، لەمانە ٧ میلیۆن شارستانی و دێهاتیی بێ چەک و سیلاح بوون. لە پۆڵۆنیان ٦ میلیۆن کەس لەناوچوون، لە ئەڵمان ٥ میلیۆن کوژران. لە یابانییان ٣ میلیۆن شوێنەواریان بزر بوو.



لە دوای کوشتنی ئەم هەموو خەڵکە بێ تاوانە و کاولبوونی شار و دێهات و وێرانبوونی دەسکەوتی بەرزی هونەری بیناسازی و سووتانی بەشێکی زۆر لە دەسنووس و ئەرشیفی دەوڵەتە شەڕکەرەکان لە ڕۆژی ٢٢ی ئەیلوولی ١٩٣٩ جەنگ کۆتایی هات.

ئەو دەوڵەتانەی هاووڵاتی کوردیان تێدا دەژیا تورکیا و ئێران و عیراق و سووریا بوون. لەمانە تورکیا و ئێران بەڕەسمی نەچوونە ناو جەنگەوە، عیراق و سووریا بەهۆی ئەوەی ئینگلیز و فەرەنسییەکان هێشتا دەسەڵاتیان بەسەریانەوە مابوو جاڕی جەنگیان دابوو لە دژی میحوەر. لەگەڵ ئەوەشدا بەگشتی ئەم وڵاتانە ڕاستەوخۆ گۆڕەپانی جەنگ نەبوون، بەڵکو یارمەتیی سوێندخۆرانیان دەدا. لەبەرئەوە لەم جەنگەدا دانیشتوانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بەگشتی و کورد بەتایبەتی زیانێکی ئەوتۆیان لێ نەکەوت وەکو ئەوەی جەنگی یەکەمی پێشوو.

لە ڕۆژگارانی جەنگدا ئەدەبی کوردی لە کوردستانی عیراقدا پێشەنگ و نموونەی ئەدەبی کوردی هەموو میللەتی کوردی کوردستانی گەورە بوو.

بیروبۆچوونی خەڵکی کورد بەزۆری دژی ئینگلیز بوو، لە دوای جەنگی یەکەمەوە وەک داگیرکەرێک تەماشا دەکرا. هەرچی بیروباوەڕی نازی بوو ئەمەیان لە سەرەتای جەنگدا هەندێ خەڵک لەگەڵی بوون بەناوی ئەوەی ئەگەر لە جەنگدا سەربکەوێ یارمەتیی کورد دەدا. بەڵام لە نزیک کۆتایی جەنگەوە تا ماوەی ناوەڕاستی سەدەی بیستەم و ڕووخانی نازی خەڵکەکە ئەڵمانیان بەڕووس گۆڕییەوە، بەناوی ئەوەی لە سایەی کۆمۆنیزمەوە کورد مافی نەتەوەیی خۆی دەست دەخا.

لە ماوەی جەنگی دووەمی گێتیدا بەرهەمی ئەدەبی کوردی لە چاکە و بەرژەوەندی سوێندخۆرەکان بوو بەتایبەتی ئینگلیز. ئەگەر لەو کاتەدا لە ڕووی نیشتمانپەروەری و کوردایەتییەوە هەندێ کەس ئەو شیعرانەی بۆ سەرکەوتنی ئینگلیز دەهۆنرانەوە بەکارێکی ناپەسەندیان لە قەڵەم دابێ، ڕۆژگار لە دواییدا ئەو ڕاستییەی خستە ڕوو کە سەرکەوتنی سوێندخۆرەکان سوود و چاکەی هەبوو بۆ هەموو مرۆڤایەتی لەگەڵ ئەوانیشدا بۆ کورد. ئەوەی جێی گومان نییە ئەوەیە جەنگەکە هەلێکی لەبار بوو کورد لە ئەنجامیدا مافی نەتەوەیی خۆی چنگ بکەوێ، بەڵام هۆی دەرەوە و ناوەوەی کوردەواری لەبار نەبوو بۆ هێنانە دی ئەم هیوا و ئامانجە دێرینە.

لەم ماوەیەدا هەندێ نموونەی شیعری کوردی لە بارەی جەنگی دووەمی گێتییەوە دەخرێتە بەرچاو.

١

مەلا حەسەنی کوڕی مەلا قادری بیارە لە ساڵی **١٩٤٣** کە جەنگ هێشتا لە گەرمەیدا بوو هەندێ شیعری لە بابەت جەنگەوە داناوە.

لە شیعرێکیدا دەڵێ:

ساڵی چوار و سێ بەیانی بیست و پێنجی مانگی حەوت
هاتە گــوێم دەنگێ بەجـــارێ ئێش و ئازارم ســرەوت
دەنگی چی دەنگی شکانی هیـتلەر و هیـــتلەریەکـــان
وا هەمــوو بۆ پاشــەوە کـەوتوونە لۆقــە و گـورگـەرەوت
دەنگی چی دەنگی قـڕان و شێـوەنی فـاشیـســتەکـان
دەنگی چی نالەی بەنیـــتــۆ وا ڕەگی دەرهات و کـــەوت
دەنگی چی تاوی بەهێـــزی هێـــزی هاوپەیمانەکـــان
بۆ شکانی پشـتی میـحوەر هەر بەبۆمبـا و تۆپ و نەوت

شاعیر لێرەدا ئەوە دەگێڕێتەوە لە ڕۆژی **٢٥**ی مانگی تەمووزی ساڵی **١٩٤٣** دەنگی شکانی هیتلەرییەکان کەوتە بەرگوێی. دیارە شاعیر ئاگاداری لە ڕووداوی جەنگ بووە بەهۆی ڕادیۆوە ئەوەی بیستووە سوپای نازی لە هێڵێک لە هێڵەکانی جەنگدا شکاوە. ئەمە بووە بەمایەی شادی بۆ هەموو کەسێک بەڵام بۆ فاشستەکان بووە بەشین. ئەو شکانە پێوەندی بەئیتاڵیا و بەنیتۆ مۆسۆلینی سەرۆکی ئەوێوە بووە.

ئینجا شاعیر لەسەر شیعرەکەی دەڕوا:

مـــژدەیێکی کـــەم لە ڕۆژی نوێ نۆدا کـــەوتە گـــوێ
پادشـای ڕۆمـاش سـەری تەسلیـمی دانا کـەوت و خـەوت
هەر لـە ڕۆژئـاواوە هـەر تـاکـــــو دەگـــــاتە ڕۆژهەڵات
گـێتـیـیـان لێ تەنگ بووە وەک چاڵی تەنگی قـولکەجەوت
هەر لـەپڕ زۆر بـەرز فـــــــڕیـن و زوو بـەرەو ژێر بـوونـەوە
ئاخـری فـەوتانە هەر کـەس کـەوتە سـەر ڕێی لار و چەوت
هەرچی زۆری کــرد بەپیـــشـــە و مـــەردوم ئازاری بەخـــوو
زوو ئەبینێ تێی ئەچێـــژن شـــەربەت و ژەهراوی مـــەوت



دەک ژیانیـــان لێ ببـــێـــتـــە ژان و ئازار و گـــرین
خـورد و خـۆراکـیـان ببێـتـە ژەقنەمـووت و قـیـر و زەوت
هەر بژین یا خــوا دیمۆکـــراتی بەخـــۆشی ســەرکـــەون
جـێی هومــێــدی بێ هیــوان و هەق ئەپارێزن لە فــەوت

ئەو هەواڵەی شاعیر لە ڕادیۆ بیستوویەتی مژدەیێکی دیکەشی بەخەڵکی گەیاندووە، ڕۆژی **٩**ی ئەیلوولی **١٩٤٣** پاشای ڕۆما خۆی بەدەستەوە داوە. شاعیر لەسەر ئەو باوەڕەیە هەر کەسێ زۆرداری بکا دەکەوێ، ئەوەی ئازاری خەڵکی بدا ئەنجامی گومڕاییبیە. ئینجا شاعیر دوعا لە پیاو خراپان دەکا و لەناوچوونیان بۆ دەخوازێ. لە کۆتاییدا بەدەنگی بەرز سەرکەوتنی بۆ دیمۆکراتی دەوێ چونکە مافی خەڵک دەپارێزێ.

لە شیعرێکی دیکەیدا مەلا حەسەن هەر بۆ ئەم مەبەسە دەڵێ:

جەژنی میـلادی چل و سێ دووانە بۆ گشـتی بەشەر
جەژنی ڕەسمی یەک دووەمیـان جەژنە پیرۆزی زەفەر
خـوایە سا لێـتـان پیـرۆز بێ بەخـۆشی و خـوڕڕەمی
ناحـەزبشـتـان سەر بەرەو ژێر بێ هەتا ناوی سەقـەر
سـەلکی دوژمنتـان ببـێـتـە بەردەبازی دۆسـتـان
گۆشتی لەشیانیش بەچەشتەوتیکە خۆشەی جانەوەر
سەرلەنوێ بنج و بناغـەی داد و ئیـحسـان و سەفـا
دابمەزرێن بەزۆری عـەقل و شــمــشــیــر و هونەر
تەوقی زوڵم و بەندەیی لابەن لە ئەسـتـۆی عـالەمـا
تا بژی گـێـتی هەمـوو بۆ خـۆی ئەمین و بێ کـەدەر

مەلا حەسەن ئەم برە شیعرەی لە کانوونی دووەمی ساڵی **١٩٤٤** بۆ دوو جەژن وتووە. یەکەمیان تەواوبوونی ساڵی **١٩٤٣** و لە دایک بوونی ساڵی **١٩٤٤**، دووەمیان جەژنی سەرکەوتن لە جەنگی دووەمدا. هیوای شاعیر ئەوەیە جەژن پیرۆز بێ لە کەسانی باش، ناحەز و دوژمن جێگەیان دۆزەخ بێ. ئینجا مرازی ئەوەیە سەلکی دوژمن ببێتە بەردەبازی پیاوچاکان و گۆشتی لەشیانیش ببێتە خۆراکی جانەوەران. لە دوای لەناوبردنی دوژمن داد و خێرخوازی و ئاسایش باڵیان بەسەر کۆمەڵی ئادەمزاددا دەکێشن.

مەلا حەسەن لە شیعرێکی دیکەیدا بەراوورد لە نێوان ئەڵمانیا و بەریتانیا دەکا:

(ئەلەم) بنوارە سەر لەوحەی نیشانەی ناوی ئەڵمانە
دوو حەرفی (ب) و (ر)یش تورڕەی سەری ناوی بەریتانە
حرووفی پێشەوەی ئەڵمان نیشانەی ئێش و ئازارن
گەواهن حەرفەکانی ئەم کە خاوەن بیرڕ و ئیحسانە
وەکو مەشهوورە وا جەرمەن هەموو کەس پێی ئەڵێ ئەڵمان
ئەوا جورمێکی رووتن چارەیان یەک جارە فەوتانە
بەد و بەدکردەوە بەدوێژ و خوێنرێژ و شەرەنگێز
ژیانی ئەم گرۆهە بۆ جیهان ئەسبابی نەژیانە
ئەوەی هاوکاری هیتلەر بوو لە ئەوروپا و بەژی تردا
بەڕاستی گشتی سەرسامە و لە کردەی خۆی پەشیمانە
سوقووتی دەوڵەتی ڕۆما کە رووبە پێشەوەی ناوی
نیشانەی وایە بنیادی گەلی میحوەر لە رووخانە
کە بوڵگار سەر دڵی کوترا بەبۆمبا کەوتە هاوار
ئیتر ئەمجارە نۆرەی کەوتنی پێتان و ڕۆمانە
قەڵای هیتلەر لەمەولا زەحمەتە خۆی ڕاگرێ هەرگیز
لەبەر نیرۆیی ئینگلیزدا کە حامی حەققی ئینسانە
کەلی تێکەوت شەق و بەق یەک بەشوێن یەکدا هەمووی رووخا
بنای زۆر و ستەم دوایی تلیسە و بەختی وێرانە
بەڵێ میحوەر ئەگەر کلکی برا مەحوە بەیەکجاری
کەوا بوو جا بەشی هەر شێوەن و ڕۆڕۆیە گریانە

بەڕوونی لەم شیعرەدا دیار و ئاشکرایە شاعیر خەریکی گەمەیێکی جوانکاری و ڕەوانبێژییە، پەنا بۆ ئەو دەنگانە دەبا کە زاراوەکانی «ئەڵمان» و «بەریتانیا»یان لێ دروست بووە. لەم لایەنەوە ئەوە ڕوون دەکاتەوە وشەی «ئەلمان» بەتیپەکانی «ئەلەم = ألَم» دەست پێ دەکا، ئەم وشەیە عەرەبییە، مانای (ئێش و ئازار) دەگەیەنێ. بەرامبەر بەمە سەرەتای وشەی «بەریتانیا» لە (ب) و (ر)ێ پێکهاتووە، واتە (برّ)، ئەم وشەیەش عەرەبییە مانای (چاکە) دەگەیەنێ. کەوا بێ تیپەکانی وشەی «ئەڵمان» نیشانەی ئێش و ئازارن، کەچی تیپەکانی وشەی «بەریتانیا» بەڵگەی چاکە و ڕەوشتی پاکن. هەروەها



«ئەڵمان» جەرمەنیشی پێ دەوترێ، ئەم وشەیە لە وشەی (جُرم)ی عەرەبی دەکا. ئەمە مانای تاوان و ئێش و خراپەیە. ئینجا شاعیر لەسەر ئەو باوەڕەیە شکانی دەوڵەتی ئیتاڵیا بەڵگەی رووخانی هەموو دەوڵەتەکانی میحوەرە. کە بوڵگاریا کاری بەرەو ڕمان و نەمان بڕوا لە دوای ئەو ڕۆمانیا و پێتانیش دەڕووخێن.

مەبەسی شاعیر لە پێتان، هێنری فیلیپ پێتانە، لە سوپادا گەیشتە پلەی مارشاڵی. لە حوزەیرانی ساڵی ١٩٤٠ کە ئەڵمان فرەنسای داگیر کرد پێتان حوکوومەتێکی فرەنسی دامەزراند شاری ڤیشی کرد بەپایتەخت، ئەو کارگێڕییە سەر بەئەڵمان بوو دژی سوێندخۆرەکان. لە ساڵی ١٩٤٤ سوێندخۆرەکان کە فرەنسایان ڕزگار کرد پێتان ڕای کردە ئەڵمانیا.

شاعیر لەم شیعرەدا شکان و لەناوچوون بۆ میحوەر دەخوازێ. گەشەکردنی وڵات و بەختیاری میللەتی دەوێ بۆ هەموو مرۆڤایەتی، ئەمەش تەنیا لە ڕێگەی دیمۆکراتییەوە دێتە دی.

## ٢

میرزا مارفی (١٨٩٥ - ١٩٥٦) ڕۆشنبیر و شاعیری خەڵکی سلێمانی لە ساڵی ١٩٤٣ بەم شیعرە بیروڕای دەگەیەنێتە هیتلەر:

ئەی شەڕ هەڵگیرسێن هیتلەری نازی
خۆزگە ئەمزانی بەچیت ئەنازی!
بەگەنج و لاو و کچانی بەرلین
بەپیشەساز و پیاوی دەس ڕەنگین
بەفرۆکە و تۆپ و تفەنگ شەستتیر
بەلۆری و مۆتۆر تانکی قەڵاگیر
ئەمانە بۆ وا تۆی شێت و هار کرد
خوێنی جیهانی لەسەر تۆ بار کرد
دەک خوا هیتلەر هەر کوێر و کەڕ بی
لە چاکە بێ بەش هاوملی شەڕ بی

***

هیتلەر ئەزانی لاوانی بەرلین
کچە جوانەکان قژ زەرد و شیرین
کە عەرعەر وێنەی بالآیان نەبوو
گوڵ لە ناو باغا هاوتایان نەبوو
هەمووی بەتۆپ و فڕۆکە کوژران
زۆریشیان بەدیل لە بەفرا گیران
هەموو ئۆبالیان بەملی تۆیە
کەڵکت ناگرێ ئەو جوست و جۆیە
دەک هیتلەر جەرگت لەت کرێ بەشیر
مێشکت بپرژێ بەگوللەی شەستتیر

میرزا مارف کەسێکی وەکو هیتلەر بەلەخۆبایی دەناسێ. شانازی بەپێشکەوتنی ئەڵمانیا دەکا لە هەموو ڕووییێکەوە، بەتایبەتی لە پیشەسازی و توانای جەنگی بەبوونی هەموو جۆرە چەکێکی ئەرزی و ئاسمانی و زەریایی، بەڵام بێ گومان توانا و هێزی جەنگی بەرامبەر بەهێزی هەق ناتوانێ بوەستێ تەنانەت ئەو خاوەن هەقە هێزیشی لە پشتەوە بێ. لەبەرئەوە هەموو ئەو شتانەی جێگەی شانازی هیتلەر بوون تیاچوون، شوێنەواریان بزر بوو، لە کچە جوان و قژ زەردەکانی بەرلینەوە تا تۆپ و فڕۆکە و هەموو چەک و سیلاحی جەنگ. ئەو ئەنجامەی شاعیر بۆ هیتلەری خواستووە هاتە دی و خۆی و پارتی نیشتمانی سۆسیالیستی ئەڵمانی (نازی) هەتا هەتایە کۆتاییبیان هات.

## ٣

ئەحمەد شوکری برینپێچ لە شیعرێکیدا بەناوی «نەمانی نازی»یەوە مژدەی ڕووخانی هیتلەر بەخەڵک دەگەیەنێ. لە هەندێ دێڕی شیعرەکەیدا دەڵێ:

ئەمێستا هاتە دی دەرکەوت نەتیجەی
گەلی فاشیست بەجارێ سەرنوگوون بوو
بزانن کاری بەدکاری وەهایە
ئەوی بەدکارە گشت دەم ڕەنجەڕۆ بوو
نیازی بوو گەلی نازی بەجاری
جیهان بگرێ سەراپا بێ پشوو زوو



کەچی ئێستە بەفیشاڵە و گوڕەی دێ
تەریق نابێتەوە چۆن ئابڕووی چوو
خودا لێی سەندەوە تۆڵەی هەژاران
ڕەگ و ڕیشەی لە بن هات ڕیشەکەن بوو

جەنگ هێشتا کۆتایی نەهاتبوو کە ئەحمەد شوکری و شاعیرانی دیکە پێشبینی سەرکەوتنی سوێندخۆرەکان و ژێرکەوتنی نازییان کردووە وەکو لەم شیعرەدا دەردەکەوێ. شاعیر باس لە کار و کردەوەی خراپ و پڕ لە ئێش و ئازار دەکا. ئیدیۆلۆجییەتی نازی کە لەسەر بنج و بناوانی فاشیستی و دیکتاتۆری دامەزراوە چۆن بۆی دەچێتە سەر ئەگەر بیەوێ گێتی داگیر بکا! لەبەرئەوە بوو ڕەگ و ڕیشەی لە بنەڕەتدا هەڵکەندرا و تۆڵەی هەژارانی لێ سەندرایەوە.

شاعیر چاوەنۆڕی ئەوە دەکا هێزی سوێندخۆران (هاوپەیمانان) بەم زووانە پایتەختی نازی بەرلین بگرێ، ئەو کاتە شاعیر و دانیشتوانی سەر ڕووی زەوی هەناسەی خۆشی هەڵدەکێشن لە ئەنجامی تێکشکان و لەناوچوونی جەرمەن.

لە شیعرێکی دیکەیدا بەناوی «سەرکەوتنی چێرچل و تیاچوونی هیتلەر» ئەحمەد شوکری دەڵێ:

تەواوی کەوتە دەر سەرکەوتنی تیرەی بەریتانی
شکستی خستە نازی هەر بژی هێزی بەریتانی
بەجۆرێ وا شکاوە نازی هیتلەر ناکرێ باسی
هیوایان وا بوو داگیر کەن هەموو خاکی بەریتانی
هەموو سەربەرز پێش کەوتوون ئەمێستا لەشکری چێرچل
چ هێزێکە کە خۆی بگرێ لە ڕووی هێزی بەریتانی
نەوەی ئینگلیز وەکو بۆ شەڕ زرنگ و چوست و چالاکن
بەژیریش بێ ڕەفیقن ئەی ڕەفیقان خۆ بەریتانی
بەکۆمەڵ بابڵێین ئێستا بەدەنگی بەرز و بالآوە
بژی سەرلەشکری چێرچل بژی هێزی بەریتانی

ئەحمەد شوکری وەک پروپاگەندەییێک بۆ چاکەی بەریتانیا و چێرچل لە لایێک و بۆ خراپەی ئەڵمانیا و هیتلەر لە لاییێکی دیکەوە ئەم شیعرەی نووسیوە.

له ساڵانی جەنگدا زۆربەی خەڵکی کورد ئینگلیزیان خۆش نەدەویست، چونکە خراپەیان لێ دیبوو. هەروەها ئارەزووی ئەوەیان نەدەکرد ئەڵمان بڕووخێ چونکە وایان زان دەکرد ئەگەر سەربکەوێ شتێک بۆ کورد دەکا و هەندێ لە ئامانجەکانی لە مەسەلەی نیشتمانی بۆ دێتە دی. خەڵکەکە بەڕاستی سەرسام بوون و مێشکیان ئەم جۆرە پڕوپاگەندەیەی هەڵنەدەگرت. بێ گومان پێشبینییەکانی ئەحمەد شوکری و شاعیرانی دیکە لەم لایەنەوە هاتە دی. ئینگلیز و هاوپەیمانانی سەرکەوتن و ئەڵمان و لایەنگرانی ڕووخان. ئەنجامێکی باش بوو بۆ چاکەی مرۆڤایەتی گەڕایەوە.

## ٤

پیرەمێرد لە پارچە شیعرێکی جووت قافیەی خۆماڵی و چەند ڕستەیێکی هونەری پەخشانی پیرۆزبایی لە سەرکەوتنی بەریتانیا دەکا لە جەنگی دووەمدا بەسەر ئەڵمان:

«ئەم فەتحەی دیمۆکراتی و ئەم ئەسەرەی ئینقیلابی جیهانە بۆ حوکوومەتی بەریتانیا ئەسەرێکی تەئریخییە تا ئێستا هیچ جیهاندار و جیهانگیر نەیتوانیوە بیکا خوا موبارەکی کا».

***

کەرەمی خوا بوو و کەرامەتی من
کەوا بەناچار تەسلیم بوو دوژمن
ئەم نەسرە رووحە بۆ ئەم دونیایە
دیارە پێشڕەویان بەریتانیایە
لە دوای مەسینە لەگەڵمان دەست کەوت
(پیرەمێرد) شایی و لۆغانی بەرکەوت

پیرەمێرد ئەم شیعرەی لە ساڵی **١٩٤٣**دا نووسیوە بۆ پیرۆزبایی بەهۆی سەرکەوتنی بەریتانیا، یا ئارەزووی شاعیر لەو جەنگەدا سەربکەوێ، چونکە زۆری مابوو جەنگ کۆتایی بێ.

بەڕاستی هەرچەندە ئەم پارچە شیعرەی پیرەمێرد بۆنی ئەدەبی میللی (فۆلکلۆری) لێ دێ، بەڵام لە شیعرە جوانەکانی ئەدەبی نووسراوی مومتاز حسێب دەکرێ. گومان لەوەدا نییە پیرەمێرد بەدڵ و بەگیان ئامانجی ئەوە بووە بەریتانیا لەو جەنگەدا سەربکەوێ.



## ٥

بەناوی «جەژنە پیرۆزی»یەوە عەبدولڕەحمان گیوی موکریانی (**١٩٠٤ – ١٩٧٧**) شیعرێکی جووت قافیەی نووسیوە و پێشکێشی «زاتێکی بەڕێز»ی کردووە، تا ئێستا نەزانراوە ئەو زاتە بەڕێزە کێیە! هەرچۆنێ بێ ئەمەش نموونەیێکە لەو شیعرانەی بۆ سەرکەوتنی بەریتانیا وتراون لە جەنگی دووەمدا:

بەدڵێکی پاک و ڕووناک و پڕ سۆز
ئەم جەژنەیەتان لێ دەکەم پیرۆز
ئەم ساڵ خوا یار بێ دوایی نازییە
کاتی زەمزەمە و بەزم سازییە
لە نێو سوێندخۆران بەزم و خۆشی بێ
لە نێو نازییان ژەهر نۆشی بێ
هەر دیمۆکراتێک ئەتلەس بپۆشێ
نازی ڕەجاڵ بێ و نێری بدۆشێ
ماڵی سوێندخۆران هەزار جار ئاوا
وادەی بەختیاری بەهەر گەل داوە
نازی لە ژیانی خۆی خێر نەبینێ
سەربەستی بەکەس ڕەوا نابینێ
ساڵ ئەبەینە سەر بەخۆشی و شادی
هیتلەر قڕانە و ڕەنجی بەبادی

ئەم شیعرە لە سەرەتای مانگی کانوونی دووەمی ساڵی **١٩٤٤** وتراوە بەهۆی جەژنی لە دایک بوونی مەسیح و سەری ساڵ و وەک جەژنە پیرۆزەییێک بۆ ئەو کەسە نێرراوە خاوەن شیعر خۆی نەبێ کەس نازانێ کێیە! گیو جەژنە پیرۆزە لەو کەسە و هەموو خەڵکی بەریتانیا دەکا. نیازی ئەوەیە ساڵی **١٩٤٤** دوایی نازی بێ. کۆتایی جەنگ و ڕووخانی نازی دەبێتە مایەی خۆشی و شادی لە ناو بەرەی سوێندخۆران، بێ گومان ئاسوودەیی ناکەوێتە ناوەوە بە لەناوبردنی هیتلەر نەبێ.

قانیع (١٨٩٩ – ١٩٦٥) له دەوروبەری جەنگی دووەم جموجۆڵییێکی شیعری بەهێزی هەبوو بۆ پشتگرتنی بەرەی سوێندخۆران له دژی ئەڵمانیا. له شیعرێکیدا بەشێوەی دیالۆج له نێوان دوو کوردیدا بەناوی نهێنی خواستراو «کوتەک» و «خەنجەر»ەوە ئەم شیعرەی هۆنیوەتەوە:

کوتەک: خەنجەر برا گیان گێتی شێواوە
هەموو بەجارێک چاک شڵەژاوە
ئێمە چۆن بژین چی بکەین چاکە
کێ لەگەڵ ئێمە دڵی زۆر پاکە
خەنجەر: کاکە گیان ئەمڕۆ ڕۆژی شادییە
ڕۆژی دڵخۆشی و دڵ ئازادییە
بۆ ئێمە ئینگلیز هیممەت ئەنوێنێ
هەزار پێوەند و زنجیر ئەشکێنێ
بەریتانیایە پیاو ئەکا بە پیاو
بەریتانیایە بەرد ئەکا بەئاو
هەر ئەوە بێسەر ئەکا بەسەردار
تانجی سەر شاهان دائەگرێتە خوار
کوتەک: خەنجەر ڕاست ئەکەی ئەزانم وایە
سێبەری ئینگلیز هەر وەک هومایە
بەڵام ئینگلیزیش کەڵکی لێت ئەوێ
بێ کەڵک کردن هیچ دەس ناکەوێ
خەنجەر: کاکە تۆ لای خۆت دوازدەساڵی
بۆچی لە عەقڵا هێشتا منداڵی
بەریتانیا تەواو دڵسۆزە
هەمیشە خەریک بەرزبوونی هۆزە
بەبێ بەرامبەر خزمەتمان ئەکا
بۆ قولەپۆپەی ژیانمان ئەبا



ئەو هیتلەر نییە گیانمان دەربێنێ
لە ژێر بێگارا بمانخنکێنێ
کوتەک: خەنجەر تۆ ناوی هیتلەر بۆ ئەبەی
بەناوی هیتلەر دەمت پیس ئەکەی
له هەر خاکێکدا ناو هیتلەر ببرێ
نەکبەتی هیتلەر ئەو خاکەش ئەگرێ
خەنجەر: کاکە من و تۆ و سەرپاک منداڵان
با ڕێز ببەستین له دەرگای ماڵان
بڵێین هەر بژی بەریتانیا

قانیع لەم گفتوگۆیەی نێوان هەردوو کوڕیدا له بەسەرهات و ڕووداوەکانی جەنگ دەدوێ. بەزمانێکی میللیی ساکار و بەناوەرۆکێکی بیری منداڵانە لایەنی بەریتانیا دەگرێ له دژی ئەڵمانیای نازی و هیتلەری دیکتاتۆر.

قانیع له شیعرێکی دیکەیدا بەناوی «ژنی قانیع ئەمنە خان گورگانە شەوێ ئەکات بۆ وریای کوڕی» قەسیدەییێک ڕێک دەخا بەشێوەی دیالۆج له نێوان خێزانی خۆی و وریای کوڕیدا. له پێشەکی شیعرەکەدا ئەوە هاتووە: دوو ساڵ لەمەوبەر ژنی قانیع کە گورگانە شەوێی بۆ وریای کوڕی دەکرد ئەو کاتە منداڵ بوو و له ناو لانکدا بوو، بەڵام ئێستا گەورە بووە. له کاتێکدا بەگەورەیی گورگانە شەوێ له دایکی داوا دەکا، دایک بۆی دەچڕێ، ئیتر ئەم گۆرانییە دەبێ بەدیالۆج له نێوان دایک و کوڕ:

دایک: گورگانە شەوێ، گورگانە شەوێ
کوردی کوڕی کورد خەوت لێ کەوێ
ڕۆڵە دەبنوە بەخوات ئەسپێرم
زەلیلی نەکەی دەنگی دڵێرم
وریا: دایە من نانووم کەی وادەی خەوە
وادەی تێکۆشین بەنەقلە دەوە
دایە من نانووم ئەڕۆم بۆ کۆڵان
بۆ وازی کردن لەگەڵ منداڵان

منالٚ له کۆلان دەستە بەش ئەکەن
وازیی تازە تەواو خۆش ئەکەن
یەکێ نازییە و یەکێ بەریتانی
خەریکی وازین شەو تا بەیانی
بچمە ناو کامیان بۆ من زۆر چاکە
کامیان لەگەڵ من نیازی پاکە

دایک: ڕۆڵە گیان نازی یەکجار بێ دینن
لەگەڵ هەژاران دڵ پڕ لە قینن
بێ ڕەحم و کیوی زۆر کەللە ڕەقن
بێ سووچ و تاوان خوێنخۆری خەڵقن
هەر خاکێ نازی ڕێی کەوتە ناوی
فاتیحا داخەن بۆ نان و ئاوی
نازی لە برسا بوون بەسەگی هار
پەلامار ئەبەن بۆ نانی ڕێبوار
بەڵام ئینگلیز وەلی نیعمەتن
زۆر زۆر بەڕەحم بەشەفەقەتن
سایەی دەوڵەتی بەریتانیا
کەوتە هەر خاکی لە دەورەی دونیا
ئەیکا بەبەهەشت ئەو پارچە خاکە
ڕۆڵە بزانە هەر ئینگلیز چاکە
بێدەس و هەژار هەموو بەدڵشاد
بۆ خۆیان ئەژین سەربەست و ئازاد
بەڵام ئەی ڕۆڵە تۆش کەڵککار بە
کەڵککاری چاک زرنگ هوشیار بە
وەها هەڵسووڕێ کە لێت بپرسن
لە پاشەڕۆژا جەزات بنووسن



پاداشتی کەڵکت با لە بەرچاو بێ
بۆ پیاو وا چاکە کەڵکگری پیاو بێ
گورگانە شەوێ گورگانە شەوێ
شەوگار درەنگە خەوت لێ کەوێ

وریا:

دایە پێم وتی نوستن خراوە
پیاوی خەواڵوو نانی بڕاوە
تا ئێستا بۆیە ئێمە خەوخۆش بووین
هەروەکو مردوو بێ هۆش و گۆش بووین
داژیارمان نەبوو غەممان بۆ بخوا
بەدڵێکی پاک بەخێومان بکا
ئێستا دەوڵەتی بەریتانیا
بوو بەداژیارمان لە دەورەی دونیا
پێویستە ئێمەش ڕوو لە خودا بین
بەشەو و بەڕۆژ دەستەو دوعا بین
بڵێین هەر بژی یا خودا سەرکەوێ
بەیداغی بەرزی هەرگیز نەنەوێ

قانیع بەشێوازی خۆی لە سەرەتای ئەم دیالۆجەدا کوردایەتی دەکا، ئینجا بەزمانی کوڕەکەیەوە باس لە یاریی منداڵان دەکا لە ڕۆژگارانی جەنگدا چۆن دەبن بەدوو بەرە، نازی و بەریتانی. بێ گومان منداڵ نازانێ کامە کۆمەڵ لەم دووانە هەڵبژێرێ. دایک ئامۆژگاری کوڕەکەی دەکا پێویستە بچێتە ناو بەرەی ئینگلیزەوە. ئیتر هەرچی خراپە هەیە بۆ نازی دەژمێرێ و کاری چاکیش بۆ بەریتانیا دەمێنێتەوە. قانیع لەم شیعرانەدا وێنەی هەندێ لە ئەدگارەکانی شیعری میللیی سەرزار دەکێشێ بەوەی شارەزاییێکی تەواوی لە خوو و ڕەوشتی ناو کوردەواری هەیە و شیعرەکان وەک نموونەیێکی جوان شاعیرییەتی قانیع دەخەنە ڕوو.

لە شیعرێکی دیکەیدا قانیع بەناوی «مژدە هێنانی کوتەک بۆ قانیع» ئەویش دیالۆجێکە لە نێوان باوک و کوڕدا دەڵێ:

مژده بێ بابە شەربورگ گیرا
ڕۆمێل وەک ڕۆما لەوێش دەرکرا
تۆ ووتت هەر وەخت کە هاتی بۆ لام
مژدەی گرتنی شەربورگت پێ دام
لەباتی مژدە کەوات بۆ ئەکەم
پتر لە کەوا فلست پێ ئەدەم
بابە نازانی کە چی ڕووی داوە
هیتلەر بەجارێک پشتی شکاوە
هەر لە نۆڕماندی هەتاکو لاهای
مۆنتگومری کردی ئیستیلای
ڕۆڵە بەخێر بێی وا مژدەت هانی
ئەم باسە خۆشەت لە کوێوە زانی
بابە گیان ئێستگەی ڕادیۆی کوردستان
ئەخبارمان ئەگات سەرپاک ئێواران
کوڕم وا کەوات بۆ خۆت حەڵاڵ کرد
فلسیش وەربگرە زوو بەدەستوبرد
بەڵام لە دڵما مەراقێک ماوە
نەرویج و هۆڵەند فەتح نەکراوە
ئەگەر تۆ مژدەی ئەم دووانە بێنی
گوێ هونەرمەندی لە لام ئەرفێنی
بابە بزانە تا چەند مانگی تر
گێتی دائەگرێ وەک پووش و ئاگر
هەر لە دانیمارک هەتاکو بەرلین
داگیری ئەکەین بزانە یەقین
تێک ئاڵای هەموان چاک ئەبێ بێ دەنگ
نازی بەلاتی ئەگرنە ژێر سەنگ



مژدەی سەرکەوتن هاوپەیمان ئەدرێ
جەژنی پەیمانی ئەنتلانتیک ئەکرێ
ئیتر هەر بژی غەمخۆری جیهان
بەریتانیا خاوەنی ویجدان

ئەم شیعرە بەڵگەی ئەوەیە لە ڕۆژگارانی جەنگی دووەمدا شاعیر ئاگاداری هەواڵەکانی جەنگ بووە بەهۆی چاپەمەنی یا ئێستگەکانی ڕادیۆی وڵاتان. لەو هەواڵانە داگیرکردنی شاری ستراسبورگ – شاعیر بەشەربورگ ناوی دەبا – و هەڵاتنی یەکێ لە جەنراڵەکانی ئەڵمان ڕۆمێل، هەروەها مۆنتگومری جەنراڵی بەریتانی ناوچەکانی ئەورووپا لە نۆرماندییەوە تا لاهای پایتەختی هۆڵەندە لە ژێر دەستی نازی ڕزگار کردووە.

ئەم هەواڵانە لە لایەن کوتەکەوە دراوە بەباوکی. قانیع لێی دەپرسێ ئەمەی لە کوێ بیستووە! لە وەراما دەڵێ لە ئێستگەی ڕادیۆی کوردستانەوە. ئەمە ئێستگەیێک بوو ئینگلیز لە شاری یافای فەلەستین لە ڕۆژگارانی جەنگ دامەزراندبوو کەسانی وەکو عەبدوڵڵا گۆران و ڕەفیق چالاک و ڕەمزی قەزاز کاریان تێدا دەکرد. هەر لەو شیعرەدا ئاماژە بۆ ئەوە هەیە شاعیر هێشتا هیوای دیکەی ماوە، نەرویج و هۆڵەندە ڕزگار نەکراوە، بەڵام لەوە دڵنیایە ئەمانەش ڕزگارییان دەبێ. جگە لەمانە بەریتانیا لە دانیمارکەوە تا بەرلین هەمووی داگیر دەکاتەوە. شاعیر ئەم زانیارییانەی بەشێوازێکی ئەدەبی داڕشتووە. لە کاتی خۆیدا بەڵێنی بەکوتەکی کوڕی دابوو ئەگەر هەواڵی ئەم سەرکەوتنە خۆشانەی بۆ بیا کەوا و چاکەتی بۆ دەکڕێ و پارە و بەخشیشی پێشکێش دەکا.

## ٧

زێوەر یەکێکە لەو شاعیرە کوردانەی بایەخی زۆریان بەڕووداوەکانی جەنگی دووەم دابوو. لە هەموو بەرهەمەکانیدا لە بابەت جەنگەوە لایەنی بەریتانیا و سوێندخۆرەکانی دیکەی گرتووە لە دژی ئەڵمانیا.

لە شیعرێکیدا زێوەر دەڵێ:

شێتە هەر کەس وا تەماشای ئێستەیی هیتلەر ئەکا
یا بەهەڵپەی خۆترێنی ئەو کەمێ باوەڕ ئەکا
ئەو کەسەی بڕوا بەنەسری ئاخر ئەڵمان ئەکا
یا کەرە و دەرکی نییە یا تێ ئەگا و خۆی کەر ئەکا

هەڵمەتی نازی رووەو خاوەر سەراپا حیننەتە
ئاگرێ سوور بێ موحەققەق خۆی بەخاکستەر ئەکا
ئاخری ئەم هەوڵ و ئەم پێشکەوتنەی خۆ کوشتنە
کێ ئەسەلمێنێ کە پووشوو شەڕ لەگەڵ ئەخگەر ئەکا
ئاو و گڵ هێنای بەشەق بۆ ساحەیی مەوت و فەنا
زاهیرەن مەقبەر لە توێی خاک و گڵی خاوەر ئەکا
زوو ئەگەر بێتو بگاتە شەرقی ئەوسەت من ئەڵێم
سینگی نازی حەز لە نووکی سونگیی و خەنجەر ئەکا
ئەم تەم و هەور و هەڵایە یەک شەوە تێپەڕ ئەبێ
ئاخری رۆژی زەفەر رۆژێ لە کەل سەر دەرئەکا

تێبینیی گرنگ بەرامبەر ئەم شیعرەی زێوەر ئەوەیە تەنیا هێرش دەباتە سەر نازی و هیتلەر، ئەوپەڕی ئاواتی ئەوەیە ئەم رژێم و سەرکردەیە سەرنگوون بێن و دوایییان پێ بێ. بەهیچ جۆرێ باس لە بەریتانیا و سوێندخۆران ناکا.

لە شیعرێکی دیکەیدا وەکو ئەوەی پێشوو نارەزایی خۆی بەرامبەر بەهیتلەر دەردەبڕێ، بەڵام باسی هاوپەیمانەکانی تریش دەکا:

سیاسی نیم و عەسکەر نیم بەڵام دیارە بەئاساری
کە هیتلەر لەڕ بووە نەیماوە هەڵپەی پار و پێراری
لە بەر کەڵبە و بڕەی وورد کردەوە وورچێکی کوێستانی
لە ئاویشا بەجارێ دوو نەهەنگ داویە پەلاماری
ڕەفیقیشی کە مۆسۆلینە مەعلوومە لای عالەم
لە دەست یۆنان گەیشتە ئاسمان فەریاد و هاواری
ڕەفیقی حیزە خۆی بێ هێزە مانەندی کەری دێزە
بەتۆپینیش رەزایە مەرگی هاوەڵ بوو بە سەرباری
بەتوندوتیژی هاتە پێشەوە هیتلەر بەڵام دوایی
پەتی پچڕا و هیوای بڕا دەفی دڕا نەما چاری
دەخیل ئەی خێلی ئینگلیزی سیقیلیا پڕ لە ئیسلامە
ئەبێ چاودێری بکرێ چ دێهاتی و چ ناوشاری



سەداکەی فاتیکان فەتوای جیهادی دابوو بۆ سەر رووس
منیش فەتوا ئەدەم پاپا بەپاپێک بێننە یاری

لەم شیعرەدا زێوەر باس لە هەندێ لایەنەکانی دیکەی هاوپەیمانانی جەنگ دەکا. لە پێشانا شاعیر ئەوە دەگەیەنی کە نە سیاسییە و نە عەسکەریشە، بەڵام سووره لەسەر ئەوەی هیتلەر هێزی تێدا نەماوە و دەڕووخێ. لە شیعرەکەدا ئەوە دەردەبڕێ هیتلەر لە لایەن ورچی کوێستانییەوە لەناودەچێ واتە بەدەستی رووس. ئەمەیان لەسەر زەوی، بەڵام لە زەریادا بەدەستی دوو نەهەنگ دەڕووخێ، مەبەس بەریتانیا و ئەمەریکایە. شاعیر بەچاوێکی نزم تەماشای مۆسۆلینیی سەرۆکی ئیتاڵیا دەکا، چونکە نەیتوانی خۆی لەبەر یۆناندا رابگرێ. لە دواییدا شاعیر هانا دەباتە بەر ئینگلیز دورگەی سیقیلیا لە داگیرکەری ئیتاڵیا رزگار بکا، چونکە ئەم دورگەیە ئیسلامی تێدا هەیە. هەروەها شاعیر ئاگاداری ئەو فەتوایە بووە کە پاپای فاتیکان دابووی بۆ سازکردنی جەنگێک لە دژی رووس. شاعیر فەتوای پاپا ڕەت دەکاتەوە و دەڵێ منیش فەتوا دەردەکەم پاپا بێننە خوارەوە.

زێوەر شیعرێکی دیکەی هەیە بەناوی «سترانی لەشکری هەشتەمی پیرۆز» وەک لە ناوی شیعرەکە دەردەکەوێ تایبەتە بەستایشی لەشکری هەشتەم لە سوپای بەریتانیادا:

لە مەکتەبەی خۆی چێرچیل
بۆ حیفزیی وادی نیل
پیلانی ڕێک خست وەک فیل
ناردی سوپای عیزرائیل
هەر بژی سوپای هەشتەم
هەر یەکێکی وەک رۆستەم
قەڵای پۆڵای هیتلەری
ئیستیحکامی میحوەری
چێرچیل بەڕای ئەنوەری
خستییە بەرپێی عەسکەری
هەر بژی سوپای هەشتەم
هەر یەکێکی وەک رۆستەم

لینی ئەیووت بەدەوام
بەخەیاڵ و بەئەوهام
من بوومە حامی ئیسلام
موڵکی منە میسر و شام
خۆی خستە جەنگی عالەم
غافیل لە سوپای هەشتەم
هیتلەر بەلاف و فیشاڵ
ڕۆمێلی نارد بۆ قەناڵ
نەیزانی چۆن ئەبێ حاڵ
ڕۆمێل ئەشکێ بەرەو ماڵ
هەر بژی سوپای هەشتەم
هەر یەکێکی وەک ڕۆستەم
لەگەڵ هیتلەر تێکەڵ بوو
لەشکری بۆ میسر چوو
ئینگلیز چاوی تێوە بوو
لەپڕ بزواندی ئۆردوو
هەر بژی سوپای هەشتەم
هەر یەکێکی وەک ڕۆستەم
شکا فاشیست و نازی
ڕۆمێل سەرباز بوو بازی
درنە و بەرقە و بەنغازی
نەما شیو و هەورازی
هەر بژی سوپای هەشتەم
هەر یەکێکی وەک ڕۆستەم
سوپای هەشتەم زۆر وریا
وەک نەهەنگ کەوتە زەریا



هەتا گرتی سیقیلیا
تەسلیمیش بوو ئیتاڵیا
هەر بژی سوپای هەشتەم
هەر یەکێکی وەک ڕۆستەم
لەشکری موتتەفیقین
دوژمنیان ڕاونا بەقین
ئەیان ووت ئێمە بەرقین
ئیسپاتیان کرد بەیەقین
هەر بژی سوپای هەشتەم
هەر یەکێکی وەک ڕۆستەم
چێرچیل و دۆستی مەردن
هەموو شێری نەبەردن
ناحەز بەوان ڕوو زەردن
دووچاری ئاه و دەردن
خاک بەسەرن دوژمنان
تکاوە ئابروویان
میساقەکەی ئەتلانتیک
خێرە بۆ دوور و نزیک
ڕوون ئەکا شەوی تاریک
ڕزگار ئەکا سەد بەلچیک
هەر بژی سوپای هەشتەم
هەر یەکێکی وەک ڕۆستەم
لە ترسی سوپای ئەحمەر
کەوتە پەلە پەل هیتلەر
کێشایە دواوە عەسکەر
ئەی ووت ئەی قورمان بەسەر

ئەم لەشکرەی ستالین
بۆ دوایی دێنە بەرلین
جاری ڕاوەستێ ژاپۆن
لە لووتی ئەکرێ ئەسپۆن
هێندە ئەپژمێ بەبۆن
ئەبێ سەرەوژێر برۆن
لەشکری موتتەفیقین
ئەچنە ناو ژاپۆن و چین

زێوەر ئەندازیاری و بیناسازی ئەم شیعرەی لەسەر بنچینەی کووپلە (بەند) داناوە. هەر بەندی بریتییە لە شەش نیوە دێڕ شیعر، دەتوانرێ «شەشین»ی پێ بووترێ. دوو نیوە دێڕی دوایی بەندی یەکەم لە هەموو بەندەکاندا دووبارە و سێ بارە دەبێتەوە. تەنیا لە بەندی سێیەم و نۆیەم و یازدەم و دوازدەم نەبێ وەکو لە تێکستی شیعرەکەدا دەردەکەوێ.

لەم شیعرەدا زێوەر باس لە ژیری و گەورەیی چێرچیل دەکا چۆن هەموو تەکتیکە جەنگییەکانی هیتلەری لە ژێر پێی سەربازی خۆی پلیشاندەوە. مۆسۆلینی یا وەک شاعیر بۆ بەکەم زانین و نزمکردنەوەی دەڵێ «لینی» خۆی کردووە بەپارێزەری ئیسلام و داوای میسر و شام دەکا، وەک ئەوەی ئاگاداری لەشکری هەشتەمی بەریتانیا نەبێ. باس لە شکانی سوپای فاشیست و نازییەکان دەکا بەگرتنی سیقیلیا و ئیتاڵیا.

یەکێ لە پەیمان و دەستوورەکانی لە ماوەی جەنگدا دانران «دەستووری ئەتلانتیک» بوو. بەهۆی ئەم پەیمانەوە بەلچیکا ڕزگار کرا. لە پاشانا زێوەر لە ئەیلوول و تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٤٣ پێشبینی ئەوەی کردووە لەشکری ستالین (سوپای سوور) لە ئەنجامدا دەچێتە ناو بەرلینەوە، لە دوای ئەو لەشکری سوێندخۆرەکان یابان و چینیش دەگرن.



## ٨

لەگەڵ کۆتایی جەنگی دووەمی گێتی فایەق بێکەس هاتە قسەکردن. شاعیرانی کورد ئەوانەی ڕووداوەکانی جەنگ کاری لێ کردبوون وەکو لە زانیارییەکانی سەرەوە دەردەکەوێ هەموویان لایەنی ئینگلیز و سوێندخۆرەکان و دژی دەوڵەتەکانی میحوەر بوون، بەڵام بێکەس ئەم شیعرەی لە دژی بەکارهێنانی بۆمبای ئەتۆم نووسییەوە:

داخەکەم بۆ ئەو زەمانەی ڕووی زەمین
وەک بەهەشت بوو پڕ لە خۆشی و پێکەنین
بێ تەماع و بێ درۆ و خاڵی لە قین
دڵنیا و دوور بووین لە ئۆتۆمی لەعین
تف لە عیلم و سەنعەت سەد کارەبا
مەرحەبا ئەی جەهل و وەحشەت مەرحەبا
یادی تۆ ئێستا لە دڵ غەم لائەبا

***

عیلمە ئێستا بۆتە مایەی دەردی سەر
عیلمە بۆتە واسیتەی مەحوی بەشەر
عیلمە تەسخیری ئەکەن هەر بۆ زەرەر
عیلمی چی وابێ هەزار خۆزگەم بەکەر
با ووجوودی ڕادیۆ و شەمەندەفەر
وا ئەبێ پێشکەوتن و عیلم و هونەر
تف لە عیلم و سەنعەت سەد کارەبا
مەرحەبا ئەی جەهل و وەحشەت مەرحەبا
یادی تۆ ئێستا لە دڵ غەم لائەبا

ڕەنگە بەلای هەندێ کەسەوە ئەم قسانەی بێکەس دوور بن لە لۆجیک و مانای زانستی و پیشەسازی و واقیعی ژیان. بەڵام، نا شاعیرانی کورد هەموویان لایەنگری هاوپەیمانانی جەنگی دووەمی گێتی بوون، یەکێک لەوانە ئەمەریکا بوو. کە جەنگ لە کۆتاییدا بوو و یابان لە دوا هەناسەی سەرەمەرگدا بوو، لە ڕۆژی ٦ی ئاغستۆسی ساڵی ١٩٤٥ ئەمەریکا

شاری هیرۆشیمای یابانی دایە بەر بۆمبای ئەتۆم. ژمارەی دانیشتوانی ئەم شارە میلیۆن و نیوێک بوو، لەمانە هەشتا هەزاریان لەناوچوون. بەم کردەوەیە ئەمەریکا دڵی ئاوی نەخواردەوە، لە دوای سێ ڕۆژ لە ٩ی ئاغستۆسی ساڵی ١٩٤٥ شاری ناگازاکی دایە بەر بۆمبای ئەتۆم. ژمارەی دانیشتوانی نیو میلیۆن بوو، لەمانە ١٦٠ هەزار کەس لەناوچوون. بەڕاستی ئەم تاوانە گەورەیە بۆ دوایی هێنان بەجەنگ نەبوو، چونکە دەوڵەتەکانی میحوەر ئەڵمانیا و ئیتاڵیا و یابان ڕووخا بوون، بەڵکو تاقیکردنەوەییێکی موختەبەری، بۆ زانینی کاری ئەو جۆرە بۆمبایەی دەمێک بوو ئەمەریکا خەریکی دروستکردنی بوو. ئەم کارەساتە پێویستە لەسەر دەوڵەتی ئەمەریکا حسێب بکرێ بەڵام تاوانەکە دەکەوێتە سەرشانی تاوانبارێکی وەکو هاری تروومانیش لەو سەردەمەدا سەرۆکی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا بوو.

ئینجا شاعیری ئێمەی کورد بەرامبەر کارەساتێکی لەم جۆرە جگە لە هێرش بردن بۆ سەر تەکنیک و پیشەسازی چی دیکەی پێ دەکرێ! ڕاستە پیشەسازی بووە بەهۆی بەختیاری ئادەمزاد، بەڵام پیاو خراپانی ناو کۆمەڵ، خۆپەرست و چاوچنۆکەکان بۆ چاکە و بەرژەوەندی خۆیان و زیاتر چەوساندنەوەی هەژاران لە ماوەی چەند ڕۆژێکدا نزیکەی چارەکە میلیۆنێک یابانییان کوشت و زیندەبەچاڵ کرد. لەبەرئەوە هەموو کەسێک بێکەسی ئێمە ئافەرین دەکا لەم هەڵوێستەیدا کە تف لە پیشەسازی دەکا.

***

ئەو شیعرانەی بەنموونە لەم بەشەدا کەوتنە بەرچاو لە بابەت هەردوو جەنگی گێتیی سەدەی بیستەمەوە. بەزمان ئاسان و ڕەوان بوون، لە ڕووی کێش و قافیەوە لە شیعری میللییەوە نزیکن. وێنەی ڕەوانبێژییان کەم تێدایە، لە ڕووی هونەرییەوە داهێنانی سیمبۆلی و ڕۆمانتیکییان زۆر نییە. لەبەرئەوە بەهەموو جۆرێک دەچنە ناو شیعری پەروەردەیی و فێرکردن و لە مێژووی ئەدەبدا نرخی خۆیان هەیە.

# بەشی پێنجەم

## پیرەمێرد

## ١٨٦٧ - ١٩٥٠

### پێشەکی

شاعیرانی مێژووی هەزار ساڵەی ئەدەبی کوردی لە بابا تاهیرەوە تا محەمەد ساڵح دیلان هیچ یەکێکیان ئەوەندەی پیرەمێرد ماندووی نەکردم. ئەمە تەنیا لەبەرئەوە نەبوو وەک شاعیرێکی گەورە بەڕاستی مێژوونووسی ئەدەبی کوردی ماندوو دەکا، بەڵکو هۆی دیکە لە ناوەوە بوو:

١- پیرەمێرد ئەگەر لە هەموو شاعیرانی کورد زیاتر بایەخ بەژیان و بەرهەمی نەدرا بێ، یەکێکە لەو شاعیرانەی زۆرترین سەرچاوە کەوتۆتە ناوەوە لە بابەت بڵاوکردنەوەی شیعری و ڕوونکردنەوەی هەندێ کون و کەلەبەری وردی ژیانی تایبەتی. هۆی ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ کەسوکار و نزیکەکانی. لەم لایەنەوە گورجوگۆڵ بوون، بایەخێکی زۆریان بەشاعیر دەدا، شانازییان پێوە دەکرد، مەبەستیش لە پێناوی چاکەی خۆیان بوو، بۆ ئەوەی مەقامیان بەرز بێ لە ناو کۆمەڵدا. هۆی گرنگ بۆ ئەوەی پیرەمێرد هەمیشە لە یادی خەڵکی بێ ئەوە بوو بەدرێژایی سەدەی بیستەم ڕۆژنامەی «ژین» لە بڵاوکردنەوە نەوەستا و زیاتر خزمەتی پیرەمێردی دەکرد نە تەنیا بەناوەرۆک بەڵکو وێنەییێکی هێڵکاری ئەو دروشمی ڕۆژنامەکە بوو. واتە پیرەمێرد هەمیشە لە یادی میللەتی کورد بوو بەتایبەتی خەڵکی سلێمانی.

بێ گومان ئەو کەرەستە و سەرچاوە زۆرەی لە بابەت پیرەمێردەوە لە بەردەست دایە بۆ تێگەیشتن لە بەرهەمی ئەم شاعیرە کەڵکی هەیە، بەڵام هەر لەو کاتەدا لەبەر زۆری سەرچاوە هەندێ هەواڵ و ڕووداوی ناڕاست کەوتوونەتە ناو ژیانی شاعیر و بەرهەمی شیعری. لێکۆڵەرەوەکان هەوڵیان نەداوە زانیاریی ناڕاستی پێش خۆیان لە بابەت پیرەمێردەوە ڕاست بکەنەوە.

٢- دووجار شاعیر ماوەی ژیانی لە نیشتمان بردۆتە سەر، ژیانی پاش لە دایک بوون و پێش کۆچی دوایی لە سلێمانی هیچ جۆرە گیروگرفتێکی تێدا نییە، ئەوەی هەبێ لە



ماوەی ژیانی ناوەڕاستی تەمەنیەتی کە ڕۆژگارێکی زۆری لە ئەستەموڵ و وڵاتی تورکی عوسمانی بردۆتە سەر. هەندێ لەو هەواڵانە جێی متمانە نین بەتایبەتی ئەوەی پێوەندی بەڕۆژنامەگەرییەوە هەیە. لە دوای لێکۆڵینەوە دەرکەوتووە هەڵوێستی دروستکراو و ناڕاستیان تێدا هەیە، ئەم ڕووداو و شتە دروستکراوانە هیچ پێوەندییێکیان بەپلەی شاعیرییەتی بەرزی پیرەمێردەوە نییە.

٣- ئەگەر هەواڵی ناڕاست لە ژیانی هەر نووسەر و شاعیرێک زیانی ئەوتۆی نەبێ، بەڵام تێکەڵبوونی بەرهەمی ڕەسەن بەبەرهەمی وەرگیراو، یا داگیرکردنی بەرهەمی کەسێکی دیکە کارێکی نارەوایە، چونکە بەرهەمی شاعیر دەشێوێنێ، ئەمەیان مەبەسێکی گرنگە لە مێژووی ئەدەبدا.

هۆی سەرەکی ئەم شێواوییە لە بەرهەمی شاعیردا بەتایبەتی شیعرەکانی، ئەوەیە بەدرێژایی ژیانی بەشێک لە بڵاوکراوەکانی ڕۆژنامەی «ژین» لەو شیعرانەی بەبێ ناو یا بەناوی خواستراو و نهێنی بڵاوکراونەتەوە بەشیعری پیرەمێرد لە قەڵەم دراون و لە دواییدا کەوتوونەتە ناو دیوانی شیعرییەوە. جگە لەمە پیرەمێرد وەرگێڕانی زۆر بوو لە زمانانی فارسی و تورکی عوسمانی و عەرەبییەوە، هەروەها وەرگێڕانی زۆرە لە دیالێکتی گۆرانییەوە بۆ دیالێکتی کرمانجیی باشوور، بێجگە لەمانە پیرەمێرد شیعری هەیە بەدەسکاری کردن و وەرگرتن و کارتێکردن وێنەی تازەی شیعری بێگانەیان هێناوەتە ناو ئەدەبی کوردییەوە. ئەم هەموو دیاردە تێک ترنجاوە کارێکی گەورەیان کردۆتە سەر شێواندنی بەرهەمی ئەدەبی پیرەمێرد و بەرهەمە ڕەسەنەکانی لە ناو گێژاوی بەرهەمە وەرگیراوەکان شاررابوونەوە. ڕاستە ئەوانەی خەریکی بەرهەمی شاعیر بوون تا پلەییێک لەم لایەنەوە شیعری پیرەمێردیان یەکالا کردۆتەوە، بەڵام هێشتا نەگەیشتوونەتە ئەو پلەیەی بەڕوونی و ڕاستی شیعرە ڕەسەنەکانی لە ئەوانی دیکە جیا بکرێنەوە.

ئێمە بەپێی پرۆگرام و بەرنامەی نووسینەوەی مێژووی ئەدەب لە دوای وردبوونەوە و لێکۆڵینەوەییێکی زۆر لە ژیان و بەرهەمی پیرەمێرد ئەوەی بەڕاستمان زانیوە لە ژیانیدا خراوەتە ڕوو و ئەوەی ڕەسەن داهێنراویشن لە کارە ئەدەبییەکانیدا بوون بەسەرچاوە بۆ نموونەی بەرهەمی شیعری پیرەمێرد.

## ژیانی شاعیر

### قۆناغی یەکەم لە نیشتمان ١٨٦٧ - ١٨٩٨

تۆفیق کوڕی مەحموود ئاغای کوڕی هەمزە ئاغای مەسرەف لە ساڵی ١٨٦٧ لە سلێمانی لە دایک بووە. بەمنداڵی لە حوجرەی مەلا حوسێنی گۆجە خوێندوویەتی. لە پاشانا لە لای مەلا سەعیدی زەلزەلەیی لەسەر خوێندن بەردەوام بووە. دوا قۆناغی خوێندنی لە مزگەوتی هەمزە ئاغا بردۆتە سەر. لە ماوەی خوێندندا وەک دەستووری ئەو سەردەمەی خوێندنی حوجرەی مزگەوت ڕوو دەکاتە شاری بانە و ماوەیێک لەوێ دەمێنێتەوە، ئینجا دەگەڕێتەوە سلێمانی. تۆفیق بەرنامەی خوێندنی زانستییەکانی ئایینی ئیسلامی و زمانی عەرەبی تەواو ناکا و نابێ بەمەلا.

لە تەمەنی پازدە ساڵیدا هێشتا مێردمنداڵ بووە لە ساڵی ١٨٨٢ بەمووچەخۆری سەرژمێری (کاتبی نوفووس) دامەزراوە، زۆری پێ نەچووە کراوە بەمووچەخۆری زەبتیەی بەڕێوەبەرایەتی عوسمانی لە سلێمانی. لە دوای ساڵێک (١٨٨٣) دەگوێزرێتەوە بۆ هەڵەبجە و لە کارگێڕی ئەملاکی هومایوونی دەبێ بەمووچەخۆر، لە پاش چوار ساڵ جارێکی دیکە لە ساڵی ١٨٨٦ دەگوێزرێتەوە بۆ شارباژێر و دەکرێ بەباشکاتبی دادگا. ماوەیێکی درێژ لەسەر ئەم کارە دەمێنێتەوە تا لە ساڵی ١٨٩٥ دەگوێزرێتەوە بۆ یەکێ لە کارگێڕییە ڕەسمییەکانی دەسەڵاتی عوسمانی لە کەربەلا. بەڵام شاعیر ئەم کارەی نەکردووە و لە ئیشوکاری میری دوورکەوتۆتەوە و بێ کار ماوەتەوە. لە دواییدا شێخ مستەفای نەقیب بەباوەڕپێکراو و وەکیلی خۆی دایمەزراندووە و کاری دارایی پێ سپاردووە.

پیرەمێرد کە بووە بەخاوەنی خۆی ژنی هێناوە، ناوی غەزالە بووە، لەو ژنە سێ کچی لە پاش بەجێماوە، مەهدییە و ئامینە و ڕەحمە. یەکەمیان بەمنداڵی مردووە.

لە ساڵی ١٨٩٨ شێخ مستەفای نەقیب و شێخ سەعیدی حەفید ڕوو دەکەنە ئەستەمووڵ و دەبن بەمیوانی سوڵتان عەبدولحەمید. تۆفیق لەگەڵیان دەبێ وەک کارگێڕ و یاوەری شێخ مستەفای نەقیب. ئەو کاتە تۆفیق لە تەمەنی ٣١ ساڵیدا بووە. لەو گەشتەدا خەڵکی دیکەش بەشدارییان کردبوو، زۆربەی ئەوانە مورید و دەروێشی شێخ سەعیدی حەفید بوون.



### قۆناغی دووەم لە هەندەران (١٨٩٨ - ١٩٢٤)

تۆفیق ماوەیێک لە ئەستەمووڵ دەمێنێتەوە وەک یاوەر و نزیکی هەردوو شێخی کە لەگەڵیاندا بوو. لە دوای ساڵێک لە ژیانی ئەستەمووڵی لە ساڵی ١٨٩٩ لەگەڵ میوانانی سوڵتان و خەڵکی دیکە ڕوو دەکەنە حەج. بەم ڕەنگە تۆفیق دەبێ بەحاجی تۆفیق. لەو حەجەدا ئاشنایەتی لەگەڵ وەفایی شاعیر و سەید ئەحمەدی خانەقا پەیدا دەکا. وەفایی لە ڕێگەی گەڕانەوەی حەج کۆچی دوایی دەکا و ئەوانی دیکە هەر کەسە دەگەڕێتەوە ماڵی خۆی. حاجی تۆفیق نەبێ ڕوو دەکاتەوە ئەستەمووڵ. ئەوی ڕاستی بێ تۆفیق بۆ ئەوە نەچووبوو لە ئەستەمووڵ بمێنێتەوە و بیکا بەمەڵبەندی ژیانی تازەی خۆی، بەڵام وا دیارە خۆشی و جوانی ڕووکەشی ئەستەمووڵ و ئارەزووی گیانی تۆفیق بۆ زیادکردنی زانستی و زانیاری سۆزی نیشتمان و کەسوکار و برادەرانی لە بیر بردبووەوە. ئەوەی زیاتر هانی داوە بۆ مانەوە لە ئەستەمووڵ ئەوە بوو هەڵسوکەوتێکی باشی بۆ ڕێک کەوتووە و گوزەرانی چاکی بۆ ڕەخساوە، لەبەرئەوە بڕیاری داوە لەوێ بمێنێتەوە.

لە سەرەتای سەدەی بیستەم بەقسەی خۆی بووە بەقوتابیی «مەکتەبی حوقووق». لێرەدا دوو پرسیاری بەجێ دروست دەبێ، یەکەمیان نەبوونی باوەڕنامەی قوتابخانەی ڕەسمی چونکە تۆفیق قوتابخانەکانی ڕوشدییەی سەرەتایی و ناوەنجی تەواو نەکردبوو، هەروەها تەمەنیشی لە دەوروبەری سی و پێنج ساڵیدا بوو، بۆ ئەو کاتە زۆر بوو، باوەڕ ناکرێ بۆ ئەم کارە پەسەند بووبێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا دەکرێ گوێ نەدرابێتە ئەو مەرجانە و لەو قوتابخانەیە وەرگیرا بێ.

حاجی تۆفیق خۆی و سەرچاوەکان ئەوە پیشان دەدەن گۆیا لە ساڵی ١٩٠٩ەوە تا گەڕانەوەی بۆ نیشتمان لە ساڵی ١٩٢٤ لە کۆمەڵێک لە شار و ئاوەدانی لە وڵاتی ئەنەدۆڵی عوسمانی قایمەقام بووە، لەوانە ئاوەدانییەکانی جۆلەمێرگ و قەرەمووسڵ و باڵاوە و بەیتولشەباب و گوموش کۆی و جزیرەی هەگبەلی ئەتە، هەروەها موتەسەریفی شاری ئەماسیە. وەک ئاشکرایە زۆربەی ئەم ئاوەدانییانە لە ناوچە کوردییەکانی وڵاتی عوسمانی نەبوون. بەتایبەتی موتەسەریفی ئەماسیە ئەوەی شەش ساڵ (١٩١٨ - ١٩٢٣) تیایدا ماوەتەوە. لە ماوەی ژیانی دەرەوەی وڵات حاجی تۆفیق ژنە تورکێکی هێناوە ناوی سامیە بووە، دوو کوڕی لەو ژنە بووە و لە پاشانا لە وڵاتی داکیاندا ماونەتەوە.

حاجی تۆفیق لە ماوەی ژیانی وڵاتی عوسمانی پێوەندی بەرۆشنبیر و سیاسییانی کوردی ئەوێ بووە، بەڵام ئەو نزیکییە لە چوارچێوەی دۆستایەتیدا بووە، چونکە گیانی شۆڕشگێڕییەتی حاجی تۆفیق لە پێناوی کوردایەتیدا لەو پلەیە نەبووە ژیانی خۆی بکا بەقوربانی، ئەم ڕەوشتە لە لای خۆڕسکە تەنیا لە پێوەندیدا لەگەڵ ڕۆشنبیر و سیاسییانی ئەوێ دەرنەکەوتووە بەڵکو لەگەڵ هەموو ڕێکخراوە ڕۆشنبیری و شۆڕشگێڕییەکانی کورد بەگشتی وا بووە. بەتایبەتی لە دوا ساڵانی ژیانی ئەوێی کە بۆ ماوەیێکی درێژ موتەسەریفی شاری ئەماسیەی نزیک زەریای ڕەشی دوور لە ناوچە کوردییەکانی وڵاتی عوسمانی بووە.

لە ژیانی دەرەوەی نیشتمانیدا حاجی تۆفیق لە گێتیی ڕۆژنامەگەری دوور نەبووە. بەزۆری لەو ڕۆژنامە و گۆوارانەی بەزمانانی تورکی و فارسی بڵاو دەکرانەوە نزیک بووە، یا ئەوانەی لە ئێران بەفارسی دەردەچوون، بەگشتی نووسینی خۆی بەو دوو زمانە بۆ ئەوانەی وڵاتی عوسمانی و ئێرانی دەنارد و بۆیان چاپ دەکرد.

ئەوەی گومانی تێدا نییە ئەوەیە حاجی تۆفیق لە ڕۆژنامەی «ژین»ی ئەستەمووڵ (١٩١٨ – ١٩١٩) جموجۆڵی نووسینی هەبوو، ئەم ڕۆژنامەیە بەدوو زمانی کوردی و تورکی بڵاو دەکرایەوە، لە ژمارەکانی بەرایی ساڵی یەکەمی کە دوازدە ژمارەی لێ دەرچووبوو شەش حەوت وتاری بەزمانی تورکی تێیدا بڵاو کردەوە، وتارەکان هەندێکیان بریتی بوون لە تێکستی شیعری کوردی وەکو قەسیدە بەناوبانگەکەی نالی «قوربانی تۆزی ڕێگەتم...» و «گوڵکۆی تازەی لەیل...»، لەگەڵ وەرگێڕانیان بۆ زمانی تورکی. هەروەها هەندێ شیعری فارسی شێخ خالیدی شارەزووری نەقشبەندی بەوەرگێڕانی تورکییەوە. جگە لەوانە نووسینەکانی دیکەی بریتی بوون لە شیعر بەزمانی تورکی و وتار بەناوی «کورد و یەکێتی تورک». ئەم نووسینانە هەموویان بەزمانی تورکی بوون و بەناوی «تۆفیق سلێمانیەلی» و «سلێمانیەلی ئیسماعیل ویداد» و «سلێمانیەلی مەحموود نەژاد» و «سلێمانیەلی م. نەژاد تۆفیق» و «پیرە کورد تۆفیق» بڵاو کراونەتەوە.

ئەو ناوانەی حاجی تۆفیق وەک نازناو یا ناوی نهێنی «نەژاد» و «ویداد» بەکاری هێناون هەردووکیان کوڕی خۆی بوون. یەکێکیان لە ساڵی ١٩٠٤ و دووەمیان لە ساڵی ١٩٠٧ لە دایک بوون. ئەو کاتەی حاجی تۆفیق ناوی منداڵەکانی کردووە بەنازناو بۆ نووسینەکانی خۆی کوڕەکانی بەتەمەن مێردمنداڵی حەڤدە هەژدە ساڵی بوون.



لە جەنگەی دابەشکردنی میراتی دەوڵەتی عوسمانی لە لایەن دەوڵەتە ئەمپریالیست و کۆلۆنیالیستە گەورەکانی ئەورووپا و دامەزراندنی دەوڵەتی تورک لە لایەن مستەفا کەمالەوە مەسەلەی نەتەوایەتی لە هەموو کوردستانی سەر بەعوسمانی کۆن لە ساڵانی ١٩٢٣ – ١٩٢٤ بووە هۆی ئەوەی حاجی تۆفیق بکەوێتە بیرکردنەوە لە چارەنووسی خۆی. لە ناو ئەم هەموو گێژاوی ئاژاوە و تێکچوونی شیرازەی سیاسی و کۆمەڵایەتی لەو ناوچەیە، حاجی تۆفیق بەرامبەر بەهەڵوێستێک بوو یا دەبوو بڕیار بدا لەو وڵاتەدا بمێنێتەوە تا دوایی ژیانی، یا دەبوو بگەڕێتەوە وڵاتی خۆی. ئەگەر بڕیاری مانەوەی بدایایە دەبوو یا بچێتە ڕیزی خەڵکان و ڕێکخراوانی کوردی شۆڕشگێڕ و چەکدارانی کوردستانی باکوور یا دەبوو ئیدیۆلۆجییەتی خۆی بگۆڕێ و ببێ بەجلخوارێکی تۆرانیی تورکچی دوژمنی کورد. وەک دیارە مەرجی پێویست لە حاجی تۆفیقدا نەبوو بتوانێ بڕیارێک بەرامبەر ئەم دوو هەڵوێستە پێچەوانەی یەکترییەدا بدا. چونکە سروشتی خەباتی پیرەمێرد ئاشتیانە بوو، لە شۆڕش و چەک و سیلاح دەترسا، لەبەرئەوە نەیدەتوانی بچێتە ڕیزی شۆڕشگێڕانەوە. هەرچی لایەکەی دیکەشە ببێ بەدوژمنی کورد و تۆرانیچییەتی بکا، ئەمەیان لەگەڵ دروستبوونی سایکۆلۆجی و گیانی ناسیۆنالی حاجی تۆفیق ڕێک نەدەکەوت چونکە لەسەر بنج و بناوانی کوردایەتی فرچکی گرتبوو. لەبەرئەوە بڕیاری دا بگەڕێتەوە نیشتمان. ئیتر لە لووتکەی ئاژاوە لە کۆمەڵی تورکیا لە نیوەی دووەمی ساڵی ١٩٢٤ ماڵ و منداڵی بەجێهێشت و بەڕێگەی ئورفە و حەلەب و مووسڵ گەڕایەوە بەغدا. ماوەیێک لەوێ مایەوە و لە سەرەتای ساڵی ١٩٢٥ گەیشتەوە سلێمانی. ڕۆژنامەی «ژیان»ی ڕۆژی ٣٠ی کانوونی دووەمی ١٩٢٥ بەهۆی گەڕانەوەی حاجی تۆفیق بۆ نیشتمان بەخێرهاتنی کردووە.

### قۆناغی سێیەم لە نیشتمان ١٩٢٤ – ١٩٥٠

حاجی تۆفیق بەکۆمەڵێک زانست و زانیاری و تاقیکردنەوەی تازە لە کاروباری بەڕێوەبردنی دەسەڵاتی میری لە کۆمەڵێکی پێشکەوتووی ئەستەمووڵ و شارانی دیکەی ئەنادۆڵ گەڕایەوە سلێمانی. ئەو کاتە کۆمەڵی سلێمانی و هەموو کۆمەڵی عێراق پێویستییان بەکەسێکی خاوەن بەهرە و تاقیکردنەوەی وەک حاجی تۆفیق هەبوو بۆ بەڕێوەبردنی چمکێکی دەوڵەت. ئەوانەی خەڵکی سلێمانی بەتایبەتی سوپاییەکان هەموویان وەزیفەی گەورەیان چنگ کەوت. بەڵام حاجی تۆفیق سوور بوو لەسەر ئەوەی

خۆی لە کاری میری دوور دەکاتەوە و هەموو ژیانی بۆ ڕۆژنامەگەری تەرخان دەکا لە پێناوی خزمەتکردنی ئەدەب و ڕۆشنبیری کوردی. هۆی خۆ دوور خستنەوە و لاتەریکی لە کاری میریدا تەنیا حاجی تۆفیق خۆی دەیزانی لەبەر چی بوو! ئەو کاتە لە تەمەنی ٥٨ ساڵیدا بوو، هێشتا بەبەریەوە هەبوو و زۆری مابوو بۆ کاتی خانەنشینی.

حاجی تۆفیق لە ساڵی ١٩٢٦ەوە هەموو ژیانی بۆ ڕۆژنامەگەری تەرخان کرد. ئەو کاتە ڕۆژنامەی «ژیان» لە سلێمانی لە لایەن شارەوانییەوە بڵاو دەکرایەوە، کارگێڕ و نووسەری حوسێن نازم بوو. حاجی تۆفیق لە کاروباری بەڕێوەبردن یارمەتی دەدا تا ساڵی ١٩٣٢. لە پاش کۆچی دوایی حوسێن نازم ڕۆژنامەکە کەوتە دەست حاجی تۆفیق. لە ماوەی پێشوودا شاعیر هەموو نووسینێکی بەناوی «حاجی تۆفیق بەگ» بڵاو دەکردەوە، بەڵام لە دوای ئەوەی ڕۆژنامەکە کەوتە دەست خۆی (١٩٣٢) بۆ یەکەم جار نازناوی کرد بە«پیرەمێرد» کە شیعری «بەیانی بوو لە خەو هەڵسام...»ی لە «ژیان»دا بڵاو کردەوە نازناوی «پیرەمێرد»ی بەکار هێنا.

واتە ئەو ناوەی کە ناوبانگی شاعیرییەتی پێ دروست بوو تەمەنی تەنیا هەژدە ساڵ بوو (١٩٣٢ تا ١٩٥٠). دوا ژمارەی ڕۆژنامەی «ژیان» لە ڕۆژی ١٠ی مارتی ساڵی ١٩٣٨ بڵاو کرایەوە. ئەو کاتە مەجید یەعقووبی تورکچی موتەسەریفی سلێمانی بوو ڕۆژنامەکەی داخست. بەڵام پیرەمێرد وازی نەهێنا، سوور بوو لەسەر ئەوەی بەبێ ڕۆژنامەگەری ناژی. ئەمجارەیان هەوڵیدا بەناوی خۆیەوە ڕۆژنامەیێکی هەفتانە دەربکا بەناوی «ژین». بێ گومان ئەم ناوەی بەیادگاری ناوی «ژین»ی ئەستەموولەوە هەڵبژارد چونکە لە کاتی خۆیدا هەندێ وتاری بەزمانی تورکی و بڕێک شیعری کوردی و فارسی تێدا بڵاو کردبووەوە. یەکەم ژمارەی ژین لە ٦ی کانوونی دووەمی ١٩٣٩ بڵاوکرایەوە. پیرەمێرد ژمارەکانی «ژین»ی لە یەکەوە دەست پێ نەکرد بەڵکو لەسەر ژمارەکانی «ژیان» بەردەوام بوو.

ئەم ڕۆژنامەیە لە ژیانی پیرەمێرددا دوازدە ساڵی خایاند. دوا ژمارەی لە ڕۆژی ١٥ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٥٠ دەرچوو، دوای ئەویش هەر بەناوی بنەماڵەی پیرەمێردەوە بەدرێژایی نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم بەردەوام بوو.

پیرەمێرد لە قۆناغی دوایی ژیانیدا کەسێکی سەربەست و ئازاد بوو. پێوەندی بەهیچ کاروبارێکی میری و ڕێکخراوێکی سیاسییەوە نەبوو. جموجۆڵیی کۆمەلایەتی هەبوو، بەتایبەتی یادکردنەوەی جەژنی نەورۆز، گەلێ بایەخی پێ دەدا، لە دوو سەرەوە، یەکێکیان



هەمیشە یادی نەورۆزی دەکردەوە بەنووسین، بەشیعر دانان. ئەویتریان هەموو ساڵێک ئاهەنگی دەگێڕا، خەڵکی کۆ دەکردەوە بۆ سەیرانی جەژنی نەورۆز. ئەو سەردەمە شادانە دەبوون بەهەنگامی سەیران و خۆشی و بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی کوردایەتی.

ماڵی پیرەمێرد جێی حەسانەوە و کار بوو، جێی چاپخانە و دیوەخان بوو، جێی پشوودان و نوستن و خەو بینین بوو. خەڵک زۆر سەردانیان دەکرد، دیوەخانی هەمیشە ئاوەدان بوو. ئەو کەمتر سەری لە خەڵکی دەدا.

پیرەمێرد ئەو ژیانە هێمنەی تا ڕۆژی ١٩ی حوزەیرانی ساڵی ١٩٥٠ بردە سەر و ماڵاوایی دوایی کرد. لەسەر وەسیەتی خۆی لە گردی مامەیارە لە سلێمانی نێژرا.

## پلەی ڕۆشنبیری پیرەمێرد و بیروباوەڕی سیاسی

پیرەمێرد پێش ئەوەی ڕوو بکاتە وڵاتی عوسمانی ئاگادارییێکی باشی بووە لە زمانی کوردی و فارسی، هەوڵیداوە مەشقی دانانی شیعر بکا، ئاگاداری شێوە و ناوەڕۆکی ڕۆشنبیری نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست بووە. شەقڵی ئایینی ئیسلامی و زمانی عەرەبی پێیەوە دیار بوو، بەڵام لە ماوەی ژیانی لە وڵاتی عوسمانی لە ڕێگەی ئەدەبی تورکییەوە هەندێ شارەزایی لە بزووتنەوە ئەدەبییەکانی ئەورووپا پەیدا کردووە، بەتایبەتی ڕێبازی ڕۆمانتیکی، کەچی ئەم کارکردنە لە بەرهەمی شیعری سەردەمی پیریدا دەردەکەوێ نەک لە زانست و زانیاریی تیۆری لە بابەت قوتابخانە ئەدەبییەکانی ئەورووپا. لەم لایەنەوە پیرەمێرد سست بوو، بۆیە وەک شارەزا و ڕەخنەگرێک نەدەکەوتە بەرچاو، بەڵکو بەزۆری لەسەر شێوازی ئەدەبی میللیی نزیک فۆلکلۆر مەشقی نووسینی دەکرد بەشیعر و پەخشان. بەڕاستی ئەمە کارێکی بەجێ بوو، چونکە ئەدەبی کوردی پێویستی بەم جۆرە بەرهەمی شیعری و پەخشانانە هەبوو کە پیرەمێرد هێنانیە ناو ئەدەبی کوردییەوە.

بیروباوەڕی سیاسی پیرەمێرد لە دەوروبەری جەنگی دووەمی گیتی تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم ملکەچی ئەو بیروڕا سیاسییانە بوو کە لەو ڕۆژگارەدا لە ناوەوە بوون. پیرەمێرد لە دژی تورکچییەتی (کەمالیزم) بوو. هەر لەبەرئەوەش بوو وڵاتی عوسمانی بەجێهێشت. هەروەها دژی ئەڵمانیای نازی و ئیتاڵیای فاشیستی و یابانی عەسکەریتاری بوو. لە هەڵسوکەوتیدا زیاتر بەلای ئینگلیز دەشکایەوە. خەڵکی بەپیاوی ئینگلیزیان حسێب دەکرد. وەکو خۆی دەڵێ ئەوانەی بەپیاوی ئینگلیزیان دانابوو، تێی

نەگەیشتبوون کە ئەو ئینگلیزی بۆ خۆی خۆش ناوێ بەڵکو لەبەرئەوەی لە ڕەوشت و ئەخلاقی ئەوان دەرسێکی ئیداری وەردەگرێ ئەگەر پێڕەوی ئادابی ئەوان بکرێ.

لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەم، سەردەمی ژیانی پیرەمێرد، لە ناو کۆمەڵی عیراق بەگشتی و لە کوردستانی عیراق بەتایبەتی دوو جۆرە ئیدیۆلۆجی بەهەڕمێن و باو بوون، یەکێکیان ئەمپریالیزمی ئەوروپا و ئەمەریکا، وێنەی ئەمە لە بەریتانیا و وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەبینرا. ئەویتریان مارکسیزم (کۆمۆنیزم) لە یەکێتیی سۆڤیەت (ڕووسیا) دەبینرا. لەبەر هەر هۆیێک بێ لەو کاتەدا یەکەمیان دروشمی دواکەوتوویی و دوژمنایەتی بوو، دووەمیان دروشمی پێشکەوتنخوازی و دۆستایەتی بوو. ئەو خەڵکەی دژی ئەمپریالیزم بوون خراپەیان لێ دی بوو، ئەو کەسانەی لەگەڵ کۆمۆنیزمیش بوون خراپەیان لێ نەدی بوو، وە لەبەرئەوەی دوژمنی ئەمپریالیزم بوو، ئومێدی ئەوەیان لێ دەکرد کورد ڕزگار بکا و ئەو میللەتە چەوساوە و ستەمدیدەیە بگاتە هیوا و ئامانجی خۆی.

خەڵکی کوردستانی عیراق نیشتمانپەروەر بوون، لە دڵسۆزی و دڵێکی پاک و نیازێکی خاوێنەوە لەگەڵ ڕووس و دژی ئینگلیز بوون، بەڵام ڕاستییەکە ئەوە نەبوو، دەبوو هەڵوێستی سیاسی بەپێی بەرژەوەندی کوردایەتی بێ. دژایەتی ئینگلیز و دۆستایەتی ڕووس ئەگەر ئەو سەردەمە کارێکی باش بووبێ لە دواییدا دەرکەوت باش نەبوو و بەچاکە نەگەڕایەوە. پیرەمێرد و خەڵکانی دیکەش ئەوانەی مەیلیان بۆ ئینگلیز هەبوو و دژی کۆمۆنیزم و ڕووسیا بوون، ئەم کارە لە نیشتمانپەروەری و کوردایەتی دووریان ناخاتەوە.

پیرەمێرد لە دژی دەوڵەتی سۆڤیەت (ڕووسیا) و بیروباوەڕی مارکسیزم بوو. بۆ ئەم مەسەلەیە نامیلکەیێکی پەخشانی هونەری نووسیوە بەناوی «ئاوە ڕەشەی ڕووسی سوور» لە ساڵی ١٩٤٠ لە سلێمانی بڵاوی کردۆتەوە، واتە پێش ئەوەی ڕووسیا تووشی جەنگی دووەمی گێتی بێ. ئەم بەرهەمە بریتییە لە پەخشانێکی ئەدەبی – سیاسی بەزمانێکی جوان و پاراو نووسراوەتەوە. سەیر لەوەدایە ئەم کارە ئەدەبییەی پیرەمێرد دێزە بەدەرخۆ نەکرا، ناوی لە هەموو ئەو زانیاری و هەواڵە زۆرانەی لە بابەت پیرەمێردەوە بڵاو کراونەتەوە نەهاتووە. جگە لەوە لە هەڵوێستێکی دیکەدا پیرەمێرد بەگلەییەوە بەرگری لە خۆی دەکا و دەڵێ: برناردشۆ لە جێیێک دەڕی خەڵکی لەسەر سەری خۆیانی دادەنێن، من لە شوێنێک دام ئەڵێن برووخی! دیارە وشەی «برووخی» دروشمی هەمیشەی



کۆمۆنیستانی کورد بوو، لە کوردستانی عیراق بۆ ڕووخانی ئەمپریالیزم و دامودەسگای میری تاکوودیتا سوپاییەکەی ١٤ی تەمووزی ساڵی ١٩٥٨ بەکار دەهێنرا.

## شیعری پیرەمێرد

هەموو ئەوانەی بەرهەمی پیرەمێردیان بڵاوکردۆتەوە یا کتێبی تایبەتییان لەسەر نووسیوە تەنیا بایەخیان بەتێکستی بەرهەم و ژیانی داوە، بەگیانێکی زانستییانەی ورد لە شیعریان نەکۆڵیوەتەوە. تا پلەیێک فەرەیدوون عەلی ئەمین لە کتێبی «چەند سەرنجێک لە پیرەمێردی شاعیر» (بەغدا ١٩٧١) و ڕەفیق حیلمی لە کتێبی «شیعر و ئەدەبیاتی کوردی» (بەغدا ١٩٤١) هەندێ بۆچوونی بەجێیان هەیە لە بابەت برێک لە شیعری پیرەمێردەوە. ئەوانی دیکەی وەکو عەلائەدین سەجادی و محەمەد ڕەسووڵ هاوار و مەحموود ئەحمەد محەمەد و مستەفا ساڵح کەریم و محەمەد نووری تۆفیق و ئومێد ئاشنا تەنیا بایەخیان بەبڵاوکردنەوەی شیعری داوە، هەندێ جاریش زێدەڕۆییان لە مێژووی ژیانی شاعیر کردووە و باوەڕیان بەهەموو زانیارییێک بووە ئەوەی لە بابەت شاعیرەوە نووسراوە و وتراوە.

## کێش و قافیە

پیرەمێرد یەکێکە لەو شاعیرە دەگمەنانەی کورد کە سنووری لە نێوان شیعری نوێ و شیعری کلاسیکی لاسایی دانەناوە، واتە لە نێوان کێش و قافیەی عەرووزی و سیلابی میللی، ئەمانەی تێکەڵ بەیەکتری کردووە. ئەمڕۆ شیعرێکی تازە بابەتی میللی داناوە و سبەینێ لە شیعرێکی دیکەیدا پێڕەوی بەحری عەرووزی و یەکێتیی قافیەی کردووە.

شیعری عەرووزی دیوانی پیرەمێرد لە چل پارچە شیعر زیاتر پێکهاتوون. ئەمە ژمارەیێکی کەم نییە لە هەموو بەرهەمە شیعرییە ڕەسەنەکانی. بەزۆری شاعیر بەحری موزاریع و هەزەج و ڕەمەلی بەکار هێناوە. تاکەتاکە بەحرەکانی موتەقاریب و ڕەجەز و موجتەس و خەفیفیش لە شیعریدا بەرچاو دەکەون.

پیرەمێرد لە بەکارهێنانی بەحرەکانی عەرووز دەوڵەمەندە. لە بابەت قافیەشەوە دیسانەوە داهێنانی زۆرە، بەوەی دەبوو یەکێتیی قافیە لە شیعرە عەرووزییەکانیدا گەلێ زۆر بن، کەچی ئەو بەپێچەوانەوە زۆربەی شیعرە عەرووزییەکانی لە ڕووی قافیەوە جووت قافیەن (مەسنەوی) (ا ا ب ب جـ جـ...) کەچی بەڕاستی جووت قافیە بۆ شیعری میللی

کێشی خۆماڵی بەکار دێ، بەڵام پیرەمێرد ئەم ڕچەی شکاندووە. دیارە ئەو بەتەنیا داهێنەری ئەم نوێگەرییە نییە، بەڵام ئەوە هەیە شاعیرانی کلاسیکیی دیکەی کورد زۆر کەمتر قافیەی مەسنەوییان بۆ شیعری بەحری عەرووزی بەکار هێناوە.

هەرچی بەشەکەی دیکەی بەرهەمی پیرەمێردە کێشی خۆماڵی، بەشی زۆری شیعری لەم بابەتەن. شاعیر هەموو کێشە خۆماڵییە میللییەکانی کە لە دیالێکتی گۆرانی بەکار دێن لە شیعریدا بەکاری هێناون. بەزۆری کێشە سووکەکانی بەکار هێناوە وەکو حەوت و هەشت و دە بڕگەیی. زۆرترین لەم بابەتانە دە بڕگەییە، وەستانیان لە ناوەڕاست دایە (٥ + ٥). لە ڕووی قافیەشەوە دیارە هەموو ئەو شیعرانە جووت قافیە (مەسنەوی)ن.

## زمان

لە بابەت زمانی نووسینەکانی پیرەمێردەوە (شیعر و پەخشان) دەڵێی بۆ ماوەی زیاتر لە چارەکە سەدەییێک لە ناو کۆمەڵی تورکی عوسمانی نەژیاوە. هیچ جۆرە تارماییییێکی زمانی تورکی لە بەرهەمیدا بەدی ناکرێ. ئەمە کارێکی یەکجار باشە بۆ خاوێنی زمانی نووسین، بەڵام ئەگەر کاریگەرییێکی بەجێی زمانی تورکی عوسمانی لە شیعری پیرەمێرددا بەرچاو بکەوتایە ڕەنگ هەبوو هەست بەدیمەنی تازەگەرییێک لەو شیعرانەدا بکرایە.

هەر چۆنێ بێ زمانی ئەدەبی پیرەمێرد کوردییێکی پاکی ڕەسەنی میللییانەی ناو خەڵکی کوردەوارییە. ئەگەر هەندێ جار هەست بەقورسی وشەییێک بکرێ بەتایبەتی «ناو» بەحسێبی دەستووری زمان لەبەرئەوەیە خوێنەر ئاگاداری وشەکە نییە، زمانی کوردی بەتایبەتی لە دەشتودەر و گوند و دێهاتی دوور لە شار زۆر فراوانە.

## ڕەوانبێژی

ڕاستە پیرەمێرد ئاگاداری دەستوورەکانی ڕەوانبێژی زمانی عەرەبی و شیعری عەرووزی ئیسلامەوی کوردییە، بەڵام کەمتر لە شیعر و پەخشانیدا وێنەیان بەرچاو دەکەوێ. بەپێچەوانەی ئەمەوە خۆی خەریکی ڕەوانبێژی شیعری خۆماڵیی کوردی کردووە، بەتایبەتی ئەوانەی پێوەندییان بەکێشی وشە و قافیەی وشەوە هەیە. جا لێرەدا ئەوەی پێویستە بووترێ ئەوەیە لەبەر وشەی کوردی، یا بۆ لێکدانەوەی وشە کوردییەکە وشەی بێگانەش لەگەڵ وشە کوردییەکە بەکار دێنێ.



## یەکالاکردنەوەی شیعری پیرەمێرد

هەر شیعر و نووسینێکی بەبێ ناوی خاوەنیان لە ڕۆژنامەکانی «ژیان» و «ژین»ی سەردەمی پیرەمێرد بڵاوکراونەتەوە بەبەرهەمی ئەو حسێب کراون. تا ئێستا کەسانی وای شارەزایی تەواویان لە ئەدەبی فارسی و تورکی عوسمانی و دیالێکتی گۆرانیی زمانی کوردی هەبێ هەڵنەکەوتوون، بۆ ئەوەی شیعرە ڕەسەنەکانی پیرەمێرد لە بەرهەمی دیکەی جیا بکەنەوە. شیعری ئەم شاعیرە بەتوانایە لەگەڵ بەرهەمی شاعیرانی دیکە تێکەڵ بەیەکتری بوون.

شیعری پیرەمێرد لەم ڕووەوە دەکرێ بە سێ بەشەوە:

١- شیعری ڕەسەنی خۆی.

٢- شیعری وەرگێڕاو لە زمانێکی دیکەی بێگانە یا دیالێکتی دیکەی زمانی کوردی.

٣- ئەو شیعرەی کەوتۆتە ژێر باری کاریگەری شیعری بێگانەوە.

١- شیعری ڕەسەنی شاعیر: ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ بەشێکی زۆری شیعری ڕەسەن و داهێنراوەکانی شاعیر لەسەر بەحری عەرووز و یەکێتیی قافیە و جووت قافیە دانراون. دۆزینەوەی ئەم جۆرە شیعرانە کارێکی قورس نییە، لە داڕشتن و زمان و خەیاڵی شیعرەکە بەدی دەکرێ. هەروەها هەموو پەخشانەکانیشی دەچنە ناو ئەم خانەیەوە و گومان لەوەدا نییە کە بەرهەمی پیرەمێردن.

٢- کاریگەری بێگانە لەسەر شیعری پیرەمێرد: لە ڕێگەی بزووتنەوەی شیعری ڕۆمانتیکی نوێی عوسمانی پیرەمێرد ئاگاداری ڕێبازی ڕۆمانتیکی ئەورووپا بووە، بەتایبەتی فەرەنسی. ئەگەر تا پلەییێک ئەم ڕێبازە کاری لێ کردبێ، کاری بزووتنەوەی شیعری نوێی عوسمانی کەمتر بووە بەتایبەتی لە ڕووی زمانی شیعرییەوە. بەشێکی زۆر لە شیعرە نیشتمانییەکانی بەحسێب دەبێ شۆڕشگێڕی بن، بەڵام پیرەمێرد خەیاڵی ڕۆمانتیکی و سیمبۆلی داوەتە ئەم جۆرە شیعرانە، ئەمەش تەنیا لەبەرئەوەیە کەسێکی جەنگاوەر و شۆڕشگێڕ نەبووە لە ڕووی پراکتیکییەوە.

٣- وەرگێڕانی شیعری دیالێکتی گۆرانی و زمانانی بێگانە: پیرەمێرد ئەوەندە هۆگری شیعری دیالێکتی گۆرانی بووە بەشێوەییێکی فراوان لە شیعریدا لاسایی کردۆتەوە، نەک تەنیا لاساییکردنەوە بەڵکو ئەوان نیوە دێڕی یەکەمی لە

هەموو شیعرێکدا کردووە بەدوو کەرت، یەک ڕستەیە و دووجار دووبارە دەبێتەوە. زۆربەی ئەو شیعرانەش ئەوانەن کە لە دیالێکتی گۆرانییەوە وەرگێڕاونەتە سەر کرمانجیی باشوور.

مەولەوی سەردەستەی ئەو شاعیرانەیە پیرەمێرد زۆربەی هەرە زۆری شیعری گۆڕیوەتە سەر دیالێکتی گۆرانی. جگە لەو شاعیرە شیعری گەلێ لە شاعیرانی تری کردووە بەکرمانجیی باشوور، وەکو: بێسارانی، وەلیی دێوانە، میرزا شەفیع، مەلا وەلەدخان، مەجزووب، مەلای جەباری، عەبدوڵڵا بەگی زەنگنە، ئەحمەد بەگی کۆماسی، حەمە ئاغای دەربەندفەقرە، میرزا یەعقووب، خانای قوبادی و شاعیری دیکە.

لە کاتی بڵاوکردنەوەی ئەم وەرگێڕانانە هەندێ جار پیرەمێرد ئاماژەی بەناوی شاعیرەکە کردووە، هەندێ جاری دیکە ئەمەی پشتگوێ خستووە و شیعرەکە بەهی خۆی حسێب کراوە. بایەخی هەرە زۆری پیرەمێرد بەر مەولەوی کەوتووە. خۆی دەڵێ لە پێشانا نالی بەگەورەترین شاعیری کوردی ژماردووە، بەڵام لە پاشانا ئەو بووە بەدووەم و مەولەوی بووە بەیەکەم، لەبەرئەوە دیوانی مەولەوی وەرگێڕاوەتە سەر دیالێکتی کرمانجیی باشوور و لە دوو بەرگدا بەناوی دیوانی مەولەوی (ئەسڵ و ڕووح) لە ساڵانی ١٩٣٥، ١٩٤٠ لە سلێمانی بەچاپی گەیاندووە.

جگە لەم کارانەی پیرەمێرد دەستێکی باڵای بووە لە وەرگێڕانی شیعری فارسی بۆ کوردی. سەردەستەی ئەو شاعیرانە شێخ خالیدی شارەزووری نەقشبەندییە، هەروەها شیعری فارسی ئەم زاتانەشی گۆڕیوەتە سەر زمانی کوردی: شێخ عومەری زیائەدینی نەقشبەندی، هەندێ بەش لە شانامەی فیردەوسی، شیعری ناسرِ خوسرەو، مەخفی، زەهیر (ظهیر)، وەحشی، سەعدی شیرازی، موحتەشەم، دە پارچە غەزەلی مەستوورەی کوردستانی (شیعرە فارسییەکانی)، سەنائی، خواجە عوبەیدوڵڵای ئەنسارِی، هەندێ لە چوارینەکانی شێخ سەعیدی ئەبولخەیر، کەلیم، خەیام. جگە لەمانە هەندێ شیعری عەرەبیشی گۆڕیوەتە سەر زمانی کوردی.

## شیعرە میللییەکانی پیرەمێرد

ئەم بابەتە شیعرەی پیرەمێرد بەهیچ جۆرێ لە ئەدەبی میللی جیا نابێتەوە، ناوەڕۆکەکانیان لە ئەدەبی میللیی سەرزار وەرگیراون، ئەوەندە هەیە پیرەمێرد هەندێکیانی لە شێوەی پەخشانەوە کردووە بەشیعر (بەیت). سەرچاوەی ئەم شیعرانە هەموویان کوردی نین، بەڵکو



لە ئەدەبی میللیی هەندێ لە نەتەوە ئێرانی و هیندوئێرانی و نەتەوە تورکە مەغۆلەکانی ئاسیای ناوەڕاست (وڵاتی تۆران)ی کۆن وەرگیراون.

ئەو بابەتە شیعرە لە ئەدەبی میللیی سەرزار و ئەدەبی کلاسیکی نەنووسراو بە بەیت و باڵۆرە و چیرۆکی کورتی میللی ناسراون. ئەم جۆرە بەرهەمە بۆ هەموو توێژەکانی ناو کۆمەڵ دەنووسرێتەوە، بەشێکی زۆریشیان دەچنە ناو ئەدەبی منداڵانەوە.

دیوانی پیرەمێرد کۆمەڵێک لەم جۆرە بەرهەمانە دەور دەکاتەوە، بۆ نموونە هەندێکیان بەم ناوانەن:

١- کیژۆڵەی خوێندەوار جەمیلە.
٢- عیزرائیلی بەهەشتی.
٣- مەلای مەزبوورە.
٤- قافیەی بەجرت.
٥- گاڵتەی بەڕاست.
٦- دەرسی مەلای هەیاس.
٧- دوێنێ شەو شەیتان.
٨- مەلا سێپارە.
٩- بەیتی مشک و پشیلە.
١٠- گوێی ئاگردان.
١١- مام چەوەندەر.
١٢- عەشقی پاک.
١٣- پەندی باڵندە.
١٤- هارِوونی ڕەشید.
١٥- گوڕنەتەڵە.
١٦- تۆڵە.
١٧- قوڵەڕەش.
١٨- چاوبرسی.
١٩- خەیاڵ پڵاو.

٢٠- بەردتاشی.

٢١- پەند و ئامۆژگاری بۆ بازرگانان.

٢٢- مەیموون و دارتاش.

## قسەی نەستەق و پەندی پێشینانی پیرەمێرد

پیرەمێرد کۆمەڵێک قسەی نەستەق و پەندی پێشینانی ئەدەبی میللیی سەرزاری کوردی بەشیعر هۆنیوەتەوە. کێشی سیلابی خۆماڵی دە برگەیی و لە قافیەدا جووت قافیە (مەسنەوی) بەکار هێناوە. ئەو پەندانە لە بنجدا بەپەخشان کەوتوونەتە سەرزاری خەڵکی، هەندێ جار ڕستەی قافیەداریان تێدا هەیە، بەزمانێکی میللیی ناو خەڵکی نەخوێندەوار پەیدا بوون. پیرەمێرد وەستایانە ئەو قسانەی داڕشتۆتەوە و گیانێکی هونەری پێ بەخشیوون، دیارە بەهیچ جۆرێ ئەم بەرهەمەی شاعیر ئەسڵەکە لەناونابا.

## شیعری پیرەمێرد لە ڕووی ڕوخسارەوە

شیعری پیرەمێرد لە بابەت هونەرەکانییەوە ئەوانەی پێوەندییان بەبەحری عەرووز و کێشی سیلابی خۆماڵییەوە هەیە ئەگەرچی هەموویان بەرچاو ناکەون، بەڵام ئەوانەی هەن دەوڵەمەندن، چونکە تازەکردنەوە و داهێنانیان تێدا هەیە.

ئەم بابەتانە لە شیعریدا دەبینرێن:

١- غەزەلی کورتی بەحری عەرووزی و یەکێتیی قافیەی هەیە، هەندێ جار جووت قافیە (مەسنەوی)ش بەکار دێنێ.

٢- تەرجیع بەند: لە تەرجیع بەندێکیدا بەناوی «بتزانیایە» دەسکارییەکی داهێنەرانەی کردووە. بەشێوەی بەند هۆنیویەتییەوە، هەر بەندی بریتییە لە چوار نیوە دێڕ شیعر، سێیانی درێژ یەکێکی کورت، لەسەر قافیەیێک، نیوە دێڕە کورتە زیادەکانی هەموو شیعرەکە لەسەر یەک قافیەیە (ا ا ا م، ب ب ب م...):

بتزانیایە گۆڕە سەرەنجامی ژینی تۆ
ئەڕزێ لە ناو گڵا قەد و باڵای سیمینی تۆ
نامێنێ خاڵ و میل و دەم و پێکەنینی تۆ
دڵت نەدەشکاندم



بتزانیایە جامەییێکی جاو لەبەر ئەکەی
تەلقینی کوێرەکانە لە جێی دەنگی نای و نەی
لەو جێگە تەنگ و تارە بەتەنیایی هەڵدەکەی
لە خۆت نەدەتەراندم

جگە لەمە پیرەمێرد تازەکردنەوەی دیکەی هەیە لە هونەری تەرجیع بەندا (هەندێ جار دەبێ بەموستەزادیش) وەکو ئەوەی پارچە شیعرەکە لەسەر بنچینەی بەند دادەڕێژێ، هەر بەندی بریتییە لە پێنج نیوە دێڕ شیعر (ا ا ا ا م، ب ب ب ب م). یا تەرجیع بەندەکە لە هەشت نیوە دێڕ شیعر پێک دێ، چوار دێڕی درێژ و چوار دێڕی کورت، لە ڕووی قافیەشەوە (درێژەکان ا ا ا ا، کورتەکان ب ب ب ب).

٣- شیعری سەربەست: پیرەمێرد خۆی شیعرێکی ناو ناوە «شیعری سەربەست». لەو شیعرەدا چەند بەحرێکی عەرووزی و چەند کێشێکی سیلابی خۆماڵی بەکار هێناوە. لە عەرووزییەکان بەحری موجتەس و خەفیف و هەزەج، لە کێشە سیلابییەکانیشدا بەزۆری دە برگەیی و هەشت برگەیی و هی دیکەی بەکار هێناوە.

برووسکەییێک کە لەپڕ دێت لە چاوتەوە تیشکی
ئەداتە چاوم و بینایی دیدەمە، دیدەم
گیانە! نەغمەی نەشیدەکەی نازت
بەندی لای لاییکە بۆ ڕووحم
لەگەڵ چشتێ بەدڵتا ڕادەبوورێ
دەمودەست وا لە دڵما بووینە یەک دڵ
کە دڵ دەنگ بێ دڵە کوتەم دەگاتێ
لە بەینی دوو دڵا ڕاستەکە ڕێیە
تەلی چراییێک لە عەشقی تۆوە
بۆ بەندی دڵم ڕاکێشراوە
ئەو دەمەی کە تۆ شەوقت کز ئەبێ
چرای دڵی من کوژاوەتەوە
لە تاریکیدا ڕەنجەڕۆ و بێکەس

له گوێی ئاگردان سەرم کز ئەکەم
تۆ بۆ من تەنیا، تۆ بۆ من هەموو
چشتێکی تۆ بۆ من
خۆشەویستی و خۆش ویستنم
زۆر پێ خۆشە بەڵام چی بکەم
ئاخ هیچ کەسی تر ناناسم کە وابوو
تەنیا بۆ من تۆی
هەر تۆی بۆ من هەر تۆ بۆ من ئەوی
خۆشم بوێ هەر تۆی
بنوارە مانگ بەنووریەوە شەو
ڕوون ئەکاتەوە
بنوارە شەو بەیانی نزیک خۆی ئەخاتەوە
سەیرکە بەیانی باوەشی بۆ ڕۆژ ئەکاتەوە
بنوارە ڕۆژ کە نووری دەخاتە وولاتەوە
هەنگوین و شیر و ژین و غەرام تێک ئەخاتەوە
با تۆیش لیقاییێک لە من ئاوڕ بداتەوە
تۆ شەو بەگوناهم بخەرە ژێر پەردەی زولفت
تۆ شەوقی بەیانی بە، جڵەوکێشی هەتاو بە
تۆ ڕۆژ بە وەرە پاکمەوە کە ببمەوە تولّفت
بۆ مەعکەسی عەشقی ئەبەدیم حۆریی تەواو بە

پیرەمێرد بەگشتی وەستایەتییەکی هونەری و داهێنەرانەی لە نوێکردنەوەی شیعری کوردیدا نواندووە. یەکێ لە کارە ئەدەبییەکانی لەم ڕووەوە لە ساڵی ١٩٤٠دا ئەم لیریکەی بڵاوکردۆتەوە. ئەو سەرچاوەی شاعیری بزواندووە ئەم شیعرە داینێ شیعرێکی هەوای ڕۆمانتیکییانەی ئەدەبی ئەورووپای سەدەی نۆزدەمە. ئەم شێوازە لە ئەدەبی کوردیدا ئاسایی و بەرچاو نەبووە.

پیرەمێرد لەو سەردەمەدا لەگەڵ شاعیرانی دیکە بەشداری لە نوێکردنەوەی شیعری کوردی کردووە. ئەم شیعرە لە ڕووی کێش و قافیە و زمانەوە کوردییە، بەڵام بەناوەرۆک



وەرگیراوە، هەناسەی شاعیرانی ئینگلیزی وەک شیللی و بایرۆن و کیتسی پێوە دیارە.

٤- شیعری بێ نوختە: یەکێ لە داهێنانەکانی پیرەمێرد ئەوەیە شیعرێکی هۆنیوەتەوە، ئەو وشانەی لە شیعرەکەدا بەکاری هێناون هەموویان لە تیپ و دەنگی بێ نوختەی ئەلفوبێی کوردی پێکهاتوون:

وا دەمی دەورەی ڕەواحە گوڵ لە سەحرا ڕەوح ئەدا
مەل لەگەڵ گوڵدا دڵ ئاگاهی لە سرری لەوح ئەدا
طووری سووری لالە ئاگری طووری مووسا هەڵدەکا
ئەو گڕە وا سرری ئەم سحری حەڵاڵە حەل دەکا
هەردە ئاڵ و سوور و مۆرە وەک کەوای سورمەی عەرووس
گوڵ گەڵای لوول کردووە وەک طورڕەیی دڵداری ڕووس
ساحەیی وادی لە وادەی ڕووی سەحەردا طاووسە
کەڵکەڵەی ئەم مۆڵکە دووسەد کاووسی لێ ئاووسە
عەکسی مهر و مەه لە ڕوودا سڵسڵەی لای سەردڵە
طالعی ئەم کوردە وەک ئەو سلسلە سەدری گوڵە
گرمە گرمی هەوری دوور دێ کێ دەڵێ دڵ دەسرەوێ
ڕووحی عولوی کورد سەمای ئامالی ساماڵی دەوێ

٥- شیعری لیریکی خۆماڵی: زۆربەی بەرهەمی شیعری پیرەمێرد پارچە شیعری لیریکی خۆماڵییە، لاسایی سیستیمی شیعری دیالێکتی گۆرانیی زمانی کوردی کردووە. ئەم جۆرە شیعرە لەسەر کێشی سیلابی خۆماڵی ڕێکخراوە، بەزۆری دە بڕگەییە، لە ڕووی قافیەشەوە جووت قافیەیە (مەسنەوی).

## شیعری پیرەمێرد لە ڕووی ناوەرۆکەوە

پیرەمێرد یەکێکە لەو شاعیرە کوردانەی زۆرترین مەبەس و بابەت و هونەرە کلاسیکییەکانیان لە ڕووی ناوەرۆکەوە لە شیعردا بەکار هێناوە، بەتایبەتی شیعری ئایینی و پێدا هەڵدان و ماتەمنامە و پیرۆزبایی و هی دیکە.

بەگشتی لەم ڕووەوە ئەم مەبەسانە لە شیعری پیرەمێرد بەرچاو دەکەون:

١- شیعری ئایینی (موناجات، ئیلاهییات): پیرەمێرد یەکێکە لەو شاعیرە کوردانەی

بەشێکی زۆر لە بەرهەمی شیعریان دەچێتە خانەی شیعری ئایینییەوە. لە دیوانیدا دەوروبەری سێ پارچە بەناوی «موناجات» و نزیکەی هەشت نۆ پارچە بەناوی «ناڵەی پیری پیران»ەوە بڵاوکراوەتەوە.

شاعیر باوەڕی بەئایینی ئیسلام بووە، هەندێ لە نەریتەکانی پراکتیک کردووە، وەکو ئەوەی لە سەرچاوەکاندا هاتووە بەدرێژایی تەمەنی لە سەرخۆشی و مەی و مەیخانە دوور بووە.

٢- وەسف و دڵداری: لای پیرەمێرد وەسف بەهێز و ڕەونەقدارە، بەڵام دڵداری سارد و کزە. بۆیە دڵداری لای پیرەمێرد نەبووە بەبابەتێکی سەربەخۆ بەڵکو لەگەڵ وەسفدا تێکەڵ بووە. شاعیر دەستێکی باڵای هەیە لە وەسفی سروشت، بەڕاستی بەچاوێکی هونەروەرانە سروشتی ڕەنگینی کوردستان دەبینێ. گەلێ هۆگری بەهارە، ئەو بەهارەش زیاتر بۆ نەورۆز پیرۆز دەکا. پیرەمێرد تەنیا خۆی بە بەهاری نیشتمان خەریک نەکردووە، جوانی سروشتی لە کەژەکانی دیکەشدا دیار کردووە.

٣- کۆمەڵایەتی: پیرەمێرد بایەخێکی تەواوی بەژیانی کۆمەڵایەتی نەداوە وەک مەبەسێکی سەرەکی، بەڵام ئاوڕدانەوەی زۆری هەیە لەم لایەنەوە، بەتایبەتی ژیانی گوند و دێهات و کۆچەری. لەمەشدا بایەخێکی زۆری بەژیانی ئێلاتی جاف داوە.

٤- نیشتمانی (کوردایەتی): پیرەمێرد زنجیرەیێک شیعری لیریکی قانگدراو بەهەناسەیێکی ڕۆمانتیزمی و سیمبۆلیزمی هەیە بۆ هەڵسان و ڕاپەڕینەکانی شێخ سەعیدی پیران (١٩٢٥) و بەردەرکی سەرای سلێمانی، ڕۆژی ڕەشی ٦ی ئەیلوول (١٩٣٠) و ڕووخانی کۆماری کوردستان (مەهابادی ١٩٤٦) و ڕێڕەوە قارەمانییەکەی بارزانییان بۆ ڕووسیا (یەکێتیی سۆڤیەتی ئەو سەردەمە) (١٩٤٧) و هی دیکە. شاعیر لەم شیعرە پڕ لە سۆزانەدا گڕ بەهەناسەی خوێنەر بەردەدا و دەیگرییێنێ، بەڵام هانی نادا سنگی دەرپەڕێنێ و هێرشی شۆڕشگێڕانە ببا.

٥- پێدا هەڵدان و شیعری موناسەبەت: پیرەمێرد شیعری لەم بابەتەی یەکجار زۆرە، بەتایبەتی شیعری کات و سەردەمی مردن و لە دایک بوون و ژنهێنان و دیاری پێشکێش کردن و نامەی شیعری و هی دیکە.

لەگەڵ ئەوەی ئەم بابەتە شیعرە لە مێژووی ئەدەبدا بەگشتی جێی پەسەندکردن نییە، بەڵام پیرەمێرد لە هەندێ شیعریدا هونەری نواندووە، لەبەرئەوە ئەم جۆرە شیعرانە جوان



دەکەونە بەرچاو و لە دیوانی شیعری نەتەوە جێگەیان دەبێتەوە.

٦- سروود و بەستە و گۆرانی: بەشێکی زۆر لە بەرهەمی شیعری پیرەمێرد لەم بابەتەن. ئەمانە هەموویان دەچنە ناو شیعری نیشتمانییەوە. شاعیر بۆ قوتابییان و منداڵ و مێردمنداڵ ئەم جۆرە شیعرانەی هۆنیوەتەوە. هەندێ جار لەسەر خواستی دەنگخۆش و گۆرانیبێژان شیعری بۆ داناون.

٧- بەیت و باڵۆرە و گاڵتە و گەپ و مەتەڵ (هەڵهێن): پیرەمێرد لەم بابەتە هونەرانەی ئەدەبی زۆری هەیە. هەموویان لە ئەدەبی میللی زار (فۆلکلۆر) وەرگیراون. هەروەها دەوروبەری سی مەتەڵ (هەڵهێن) لە ناویاندا بەرچاو دەکەون. شاعیر ئەم مەتەڵانەی لە ئەدەبی سەرزار وەرگرتووە، بەڵام لە قالبی شیعری خۆماڵی دە کەرتی و هەشت کەرتی و قافیەی مەسنەویدا داڕشتوونەتەوە. ڕەنگە هەندێکیان لە دانانی خۆی بن.

## پەخشانی پیرەمێرد

لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم پەخشان لە ئەدەبی کوردیدا جێی خۆی گرت و لەسەر پێ وەستا. پیرەمێرد یەکێک بوو لە نووسەرانی نەوەی یەکەمی ئەم بابەتە نوێیە لە ئەدەبی کوردیدا. ئەگەر لە ڕووی قەوارە و پلەی جوانکارییەوە هەموو بەرهەمی پیرەمێرد بەشیعر و پەخشان لێی بکۆڵرێتەوە ڕاستییێک ئاشکرا دەبێ ئەویش ئەوەیە پیرەمێرد پەخشانی کەم نییە و ئەوەندە ڕەوان و جوان و پڕ وێنەی قەشەنگ و مانای قووڵیان تێدایە لە شیعر نزیک دەبنەوە، کەوا بێ کە ناوی پیرەمێرد دێ نووسەر و شاعیری پێ بووترێ کارێکی بەجێیە.

پەخشانی پیرەمێرد هەموو بابەت و هونەرەکانی پەخشانی نەتەوەکانی سەر ڕووی زەوی گرتۆتەوە، بەتایبەتی ئەو بابەتانەی وتاری ئەدەبی یا هونەری و چیرۆک و چیرۆکی شانۆییان پێ دەووترێ.

لە لای پیرەمێرد ئەم بابەتە بەرهەمە پەخشانییانە دەبینرێن:

### ١- وتاری ئەدەبی

پیرەمێرد بایەخێکی زۆری بە وتاری ئەدەبی و چیرۆک داوە. ئەم دوو جۆرە هونەرە ئەگەرچی دوو بابەتی سەربەخۆ و جیاوازن لە مێژووی ڕەخنەی ئەدەبیدا کەچی لە لای

پیرەمێرد و نووسەرانی دیکەی کوردی ئەو سەردەمە تێکەڵ بەیەکتری کراون، هەندێ جار
له یەکتر جیا ناکرێنەوە. هەندێکیان مەرجەکانی وتار و هی دیکەیان مەرجی چیرۆکییان
زیاتر تێدایە، لەبەرئەوە بەرهەمی ئەم بابەتەی ئەو ڕۆژگارە دەکرێ بەچیرۆک بژمێررێ.
وتاری «موناجاتی ئەرواح»ی پیرەمێرد یەکێکە لەو وتارانەی بەوتاری ئەدەبی حسێب
دەکرێن.

## ۲- چیرۆک

پیرەمێرد کۆمەڵێک چیرۆکی کورت و ناوەنجی (نیمچە درێژ)ی بەپێزی هەیە لەوانە:

(أ) مەم و زین: چیرۆکێکە لە شێوەی شانۆنامە لە ساڵی **۱۹۳۵** لە سلێمانی
بڵاوکراوەتەوە. خاوەنی لەسەر بەرگی نووسیوە «دڵدارییێکی پڕ لە عەشقی پیرۆزی
یەزدانی، لە کوردستانا ڕوویداوە». ئەم بەرهەمە کارێکی سەرکەوتوو و جوانە.
سەرچاوەی ئیلهامی پیرەمێرد گێڕانەوەی «مەمی ئالان»ی ئەدەبی میللی (فۆلکلۆر)ی
کوردی و «مەم و زین»ی ئەحمەدی خانییە، بەڵام پیرەمێرد بەرهەمێکی ڕەندی تازەی
لێ دروست کردووە، ناوەرۆکێکی نوێیە و پێوەندیی بە«مەم و زین»ی خانییەوە نییە.
پیرەمێرد چیرۆکەکەی بەپەخشان نووسیوە تەنیا کۆتایی نەبێ بەشیعر هاتووە، بەم
دێڕانە زین بەگریان و شین و شەپۆڕ مەم دەلاوێنێتەوە:

هەی ڕۆ ئەمڕۆ ڕووی شین و ڕۆ ڕۆمە
کە مەم ڕۆیی ڕووی پەژارەی خۆمە
ئەم زولفە لوولەم بۆ مەم شانە کرد
دەک فەلەک کوێر بی بۆنێکی نەکرد
ئەم خاڵ و میلە من بۆ مەمم ڕشت
پەیمانم وایە بۆی بەرمە بەهەشت
لێوم دانابوو بۆ گفتوگۆی مەم
عەهدە تا مردن واتەی پێ نەکەم
تۆخوا مەم منت لە کوێ پەیدا کرد
گوناهم چی بوو منت شەیدا کرد
هەرکەس هاوسەرێ بۆ ژیان ئەگرێ
منت بۆیە ویست لەبەرت مرێ



هەی خەجاڵەت بی چەرخی پڕ ستەم
هیچ شەرمت نەکرد لە نەوجوانی مەم
مەم لە ژێر خاکا بەمیوانت بم
بەبرامەوە بەقوربانت بم
ناچارم بێ تۆ ژیانم نابێ
وا بڕیمەوە هەر ئەبێ وابێ
لە ناو دوخمەدا دوو جێگا ئەبێ
زاوا و بووکێنی لە خاکا ئەبێ
ئای مەم دەستی مەم نەگەیشتە تۆ
وا نووکی خەنجەر بوو بەسزای تۆ
خەنجەر بۆ دڵە گەر ڕاستت ئەوێ
ئاخ مەمی تیایە نەک بەری کەوێ
ئەی سینە بگرە خەنجەر بۆ تۆیە
هەرچی زۆر جوان بێ هەر ڕەنجەڕۆیە
بە بەرگی خوێنی شایی ڕەنگەوە
بەسۆز و ناڵەی خۆش ئاهەنگەوە
با دەس لە مل کەین مەم یەکجارییە
نە ڕای بێگانە نە بەدکارییە
ئاخ بۆ دەنگخۆشێ لە ژوورسەربنمان
بەبەیتی کوردی بدا تەلقینمان
بڵێ ئاخ دڵی دڵخواز مەشکێنن
بەزۆرەملی کچان مەمرێنن

(ب) چیرۆکی دوازدە سوارەی مەریوان: لە بنجدا حیکایەتێکی میللیی سەرزاری ناوچەی
سلێمانییە. لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەم کاتێک فەرمانڕەوایی بابان لە ناوەوە
بوو. ڕۆژێکیان دوازدە سوارەی میرنشین لە شارەزوور ڕاوە بەراز و سەیرانی بەهار
دەکەن. لە دوای سەیران بەشەو لە قەڵای مەریوان بەسەر سوپاییێکی دوازدە هەزار
سەربازی عەجەم دادەدەن. سوارەکان سوپا دەبەزێنن و بەسەربڵندی لە ڕاوە بەراز و
سەیرانی بەهار و شەڕی عەجەمان دەگەڕێنەوە سلێمانی. ئەم ڕووداوە دەبێ بەسەرچاوە

بۆ دروستبوونی حیکایەتێکی میللیی قارەمانی بەناوی «دوازدە سوارەی مەریوان»ەوە. پیرەمێرد لەم حیکایەتە میللییە چیرۆکێکی هونەری لێ دروست دەکاتەوە و دەنگێکی باشی دەبێ لە نێوەندی ڕۆشنبیری کوردی. لە پاشانا کە وەرگێڕانی عەرەبی و ڕووسی چیرۆکەکە بڵاو دەکرێتەوە بەتایبەتی تێسکتە ڕووسییەکەی پێشوازییێکی باشی لێ دەکرێ لە هەموو ئاقارێکی ڕووسیا و وڵاتی سۆڤیەتی پێشوو، هەندێ لە خوێنەر و خوێندەوارانی ئەو وڵاتە بەزمانانی جیاواز بەنووسین باسی لێوە دەکەن.

(ج) چیرۆکی مەحموود ئاغای شیوەکەل: بەسەرهاتی مەحموود ئاغای شیوەکەل وەک حیکایەتێک لە ئەدەبی سەرزاری میللی ڕەنگی داوەتەوە. پیرەمێرد لە ناوەڕۆکی ئەو حیکایەتە چیرۆکێکی هونەری تازەی داناوە.

(د) پیرەمێرد کۆمەڵێک چیرۆکی دیکەی هەیە بەشێکیانی لە کۆواری «گەلاوێژ» بڵاوکردۆتەوە، وەک «ئەنجامی پیاوێکی بەنگ کێش» (١٩٤١)؛ «زۆرەملێ مل شکانی لە دوایە» (١٩٤٢)؛ «خانزادەی قەرالیجەی سۆران» (١٩٤٢) و چیرۆکی دیکە.

جگە لەم چیرۆکە ڕەسەنانە نووسەر خۆی بەچیرۆکی درێژیش (ڕۆمان) خەریک کردووە. ڕۆمانی «کەمانجەژەن»ی نووسەری دانیمارکی هانس ئەندرسن (١٨٠٥ - ١٨٧٥)ی لە تورکییەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی و لە ساڵی ١٩٤٢ لە سلێمانی چاپی یەکەمی بڵاوکردۆتەوە.

## ٣- یادداشت و بیرەوەری

بەکورتی پیرەمێرد بەسەرهاتی خۆی بەناوی «دنیام چۆن دی؟» نووسیوە. پەخشانێکی ئەدەبی جوان و نایابە. لە هەندێ جێ ئەو ڕووداوانەی دەیانگێڕێتەوە نەیگەیاندوونەتە ئەنجام و لە هەندێ جێی دیکەشدا وتەکانی ڕوون و ئاشکرا نین و پیاو لە مەبەسی ناگا، لەگەڵ ئەوەشدا چێژی هونەری تێدایە و هەستی خوێنەر دەبزوێنێ.

لە بەرهەمێکی پەخشانی دیکەیدا باس لە برادەر و ناسیاوانی دەکا، هەڵوێستی بەرامبەریان دەردەبڕێ، کەسایەتی ئەدەبی و کۆمەڵایەتییان هەڵدەسەنگێنێ، بۆ هەر یەکێکیان لاپەڕەییێک یا زیاتری تەرخان کردووە. ئەوانەی باسیان لێوە دەکا ئەمانەن: ئەحمەد حەمدی ساحێبقڕان، مەحموود پاشای جاف، ساڵح زەکی ساحێبقڕان، محەمەدئەمین زەکی، عەبدوڵڵا گۆران، شێخ ڕەزا، زێوەر، عەلائەدین سەجادی، سەید ئەحمەد خانەقا، تۆفیق وەهبی، بەدرخانییەکان، ئەحەی جاو، مەولەوی.

## بەشی شەشەم

### نموونەی شیعری پیرەمێرد

### شیعری ئایینی (موناجات)

پیرەمێرد لە هەموو شاعیرانی دیکەی کورد زیاتر شیعری ئایینی هۆنیوەتەوە. لە شیعرێکیدا بەناوی «ناڵەی پیری پیران»ەوە دەڵێ:

تەنیا خوایەکەی زەویی و ئاسمان
لە هەموو شوێنێ پەیدایت و پەنهان
لە بەندە گیرا بەوە سەربەرزم
کە لە دیوانی تۆدا ئەلەرزم
ئامان چەند خۆشە کە ڕادەوەستم
جار جارە بۆ تۆ نوێژ دادەبەستم
ئەلحەمد ئەخوێنم ڕوو لە تۆ ئەکەم
بە غائیبانە حەمدت بۆ ئەکەم

ئەم شیعرە بابەتی ئاسایی ئایینییە، پیرەمێرد وەکو شاعیرانی دیکە لە خودا دەپاڕێتەوە، خۆشەویستی و دیلیەتی خۆی بۆ دەردەبڕێ.

لە شیعرێکی دیکەیدا لە بابەتی نەعت وەک موناجاتێک لە پێغەمبەر دەپاڕێتەوە:

پێغەمبەرەکەی خۆشەویستی خوا
خاتەمی نەبیت نەهاتووە لە دوا
زۆر پێغەمبەر هات بەر و دوا تێکڕا
خاتەمی خاتەم بەهیچ کەس نەبڕا
بەر لەوەی ئادەم کەوا سەفی بوو
تۆ مستەفا بووی بەڵام خەفی بووی
مایەی خیلقەتی ئەفلاک و لەولاکە
بە ئەلەم نەشرەح سەدری تۆ پاکە



لەم شیعرەدا پیرەمێرد وەک لە بیروباوەڕی موسوڵمانەتی داهاتووە ئەوە دەخاتە ڕوو خودا ئادەم پێغەمبەری بۆ ئەوە دروست کرد چونکە لە پاشانا محەمەد پێغەمبەری موسوڵمانان وەک سەروەری هەموو عالەم لە دوای ئەو پەیدا دەبێ.

### فرمێسکی نهێنی بۆ چارەنووسی کورد

#### بۆ هەڵسانی شێخ سەعید ۱۹۲٥

شیعری نیشتمانی پیرەمێرد زیاتر لاواندنەوە و فرمێسک ڕشتنە بۆ چارەنووسی نەتەوەی کورد. لە سەردەمی ژیانی ئەودا کارەساتی زۆر ڕوویانداوە و بوون بەمایەی غەم و پەژارە بۆ شاعیر، لە ئەنجامدا زنجیرەیێک شیعری ڕۆمانتیکی – سیمبۆلییانەی هێناوەتە بەرهەم.

لە ساڵی **۱۹۲٥** لە دوای لە سێدارە دانی شێخ سەعیدی پیران و شێخ عەبدولقادری نەقشبەندی لە دیاربەکر، پیرەمێرد ئەم شیعرەی وتووە:

هاتن شەهیدەکان بەجلی سووری خوێنەوە
دایکی وەتەن دە هەڵسە سڵاویان بسێنەوە
شێخ قادرە لە پێشەوە سەرقافڵەی ئەوان
چەن جوانە خوێن و ڕیشی سپی پیر و نەوجەوان
سەیری ئەمانە کە کە هەموو کوردی سەف شکەن
ڕووحیان فیدا ئەکرد و ئەیان ووت بژی وەتەن
قوربانی تۆن بەڕێز کە تۆ غەم لەبەر نەبی
بۆ ئێمە مردنە ئەگەر ئازادە سەر نەبی
مەگری و مەناڵە با بەخەفەت دڵ شکست نەبن
نەختێ لە لات ئەمێننەوە و بۆ بەهەشت ئەچن
تۆخوا لەباتی ئێمە بەچاوێکی ڕوونەوە
فەرموو کە خوا ئەزانێ لە بیرمان نەچوونەوە
ئاخۆ لە فرسەتێکی ترا بەختیار ئەبین
ئێمەش وەکو ئەوان لە دڵی میللەتا بژین

من وام ئەوێ کە حەشر ئەکرێم خوێن بەبەرگەوە
بەو عەشقی میللییە و بەکزەی سۆزی جەرگەوە
ئەو ئاگرەی لە دڵمەوە بەربێتە کفنەکەم
تا دوژمنم نەکا بەزوغاڵ شەرتە پف نەکەم

دیسانەوە بۆ شەهیدانی ڕاپەڕینی کورد لە کوردستانی باکوور پیرەمێرد دەڵێ:

ئەستێرە بەرزەکان ئەدرەوشێنەوە بەشەو
وەک من بەداخەوەن نە سرەوتیان هەیە نە خەو
چەند ساڵە ئاشنای شەوی بێداری یەکترین
وەک سەرسەرین شەوێ سەرێ ناکەینە سەر سەرین
من خوار و ژوور لە دەست چوەکەی بێوڵەت ئەوان
وەک خێڵی خوار و ژوورەکەی کورد وێڵی ئاسمان
شەو شەونمی ئەوانە چیمەن ئاو ئەخواتەوە
ڕۆژ هەڵمی ئاوی چاوی منە سەر یەخاتەوە
دوێ شەو بەری بەیان بوو دەگریان بەسەر منا
منیان کەساس ئەبینی لە ناو دۆست و دوژمنا
دڵسۆزی وام نەدی بوو کە بۆم بگری وەک غەشیم
فرمێسکەکەی ئەوان بوو بەئاوونگی تێگەییم
بام ڕاسپارد بڵێ کە خەفەت بۆچ ئەخۆن ئەوان
وەک ئێمە نین نزیکتری لای بارەگای خودان
ڕاسپێربیان نووسی بوو بەشەونم لەسەر گیا
تا ئاسمان پریشکی بەدی ئێوە هەڵپژا
ئاه و نزای کوردەکانی شیمال گەییە ئاسمان
بەو دووکەڵی هەناسەیە ئاو دێ لە دیدەمان

بەدڵێکی تەنگ و زامداری پڕ لە ئێش و ئازار پیرەمێرد بۆ کارەساتەکانی کوردی باکوور دەلاوێنێتەوە. بەڕوخسار و هەوەسی ڕۆژهەلاتییانە ئەم شیعرە ئەگەر بەماتەمنامە بژمێرێ، بەناوەرۆک ڕۆژئاواییانەیە.



## بۆ شەشی ئەیلوولی سلێمانی ١٩٣٠

ڕۆژی ٦ی ئەیلوولی ساڵی ١٩٣٠ کە بەڕۆژی «ڕەشی ئەیلوول» ناسراوە، لە سلێمانی کۆمەڵێک خەڵک خەریکی خۆپیشاندان دەبن، بێزاری بەرامبەر پەیمانی عیراقی – بەریتانی دەردەبڕن و داوای مافی نەتەوەیی کورد دەکەن. دەسەڵاتی حوکوومەتی عیراق تەقە لە جەماوەری بێ چەک دەکا و کوشتار دەکەوێتە ناوەوە. لە دوای ئەو ڕاپەڕینە دەسەڵات کۆمەڵێک لە مووچەخۆری گەورە و بازرگانی دەوڵەمەند و ئاغا و بەگلەرەکانی ناو شار کۆ دەکاتەوە وەک نوێنەرانی خەڵکی سلێمانی بچن بۆ بەغدا پوزشت بۆ کاربەدەستانی ئەوێ بێننەوە بەناوی ئەوەی ئەو خەڵکەی خەریکی ڕاپەڕین و لە ڕووی دەسەڵات هەڵسابوونەوە کەسانی ئاژاوەچین. پیرەمێرد لە بارەی ئەم نوێنەرانەوە دەڵێ:

وەفدی کوردستان میللەت فرۆشان
هەرزە وەکیلی شاری خامۆشان
چەپکێ لە گوڵەکەی باغەکەی سەرا
کە بەخوێناوی میللەت ئاودرا
بیبەنە بەردەم عەرشی عیراقی
بڵێن یار باقی هەم سوحبەت باقی
پەردە و تارای سوور بەرن بۆ ئەمیر
بڵێن پاش کوشتار هێشتا تۆی دڵگیر
دەک خەجاڵەت بن لە ڕووی مەحشەرا
ئێمە خاکی غەم ئەکەین بەسەرا
ئێوەش ئەو عەرشەی بەخوێن گوڵڕەنگە
سوجدەی بۆ ئەبەن هیچ نالێن نەنگە
کورد نەمردووە خەیاڵتان خاوە
بەراتی نەجات بەخوێن نووسراوە
من ڕەنگی سوورم بۆیە خۆش ئەوێ
مژدەی شەفەقی لێ دەس ئەکەوێ

ئەم شیعرە یەکێکە لە بەرهەمە جوان و بەناوبانگەکانی پیرەمێرد، بەشێوازێکی ئەدەبی

ڕۆمانتیكییانە لایەنگرانی دەسەڵاتی كۆنەپەرستی بەغدا لە كوردانی سلێمانی ڕیسوا و تاوانبار دەكا، چونكە دەبوو خۆیان لە ناو ڕیزی هەڵمەتبەرانی بەردەركی سەرا بن و دەسەڵات تاوانبار بكەن، كەچی هەڵوێستیان پێچەوانە بوو.

## بۆ بزووتنەوەی دیمۆكراتی كوردی ئێران ١٩٤٥ – ١٩٤٦

پیرەمێرد بۆ پیرۆزبایی كردن لە دامەزراندنی كۆماری كوردستان لە ناوچەی موكریان شیعرێكی وتووە، بەناوی «بورجی ڕۆژی كورد» بڵاوی كردۆتەوە:

بورجی ڕۆژی كورد كە ڕۆژهەڵات بوو
هەلمان هەڵنەكەوت بەشمان هەڵات بوو
قافیەی ئەكراد هەر بەد نیهاد بوو
بوومی شووم لە شوێن بووممان دڵشاد بوو
سەرچاوەی دیجلە لە دیاربەكرا
هێند خوێنی كوردی تێكەڵ ئەكرا
وەك ئەرخەوان سوور ئەبوو بەلافاو
پیرێژنی چەرخ ئەیكرد بەسووراو
هەتا خوا وای كرد ڕۆژ گەڕایەوە
دادی هەژاران پرسرایەوە
لە ڕۆژئاواوە ڕۆژمان بۆ هەڵات
غوولی مەغۆلی بیابان هەڵات
ئەڵێن كاتێك ڕۆژ ئەگەڕێتەوە
دەوری زۆرداری ئەبڕێتەوە
ئەبێت بەدەوری مەهدی سەر زەوی
لەسەر ئایەتی خاتەمولنەبی
پەیڕەوی نەبی دیمۆكراتییە
دیمۆكراتییە ڕوو لە هاتییە
من باوەڕم كە ئەم ئایینە
ئاوێنەیە بۆ كوردی ساف سینە



من سوێندخۆرانم بۆیە خۆش ئەوێ
ئەمجارە فریای ئێمەش ئەكەوێ
ئەگینە من خۆم لە كێ دادمە
نان و كەبابێك سەروزیادمە
مایەی ژیانی ئێمە كە با بێ
بۆ نەیگۆڕمەوە من بە كەبابێ

پیرەمێرد كەم دڵخۆشی بەخۆیەوە دیوە بەهۆی سەركەوتنی كوردەوە. ئەمجارەیان وا دەزانی خۆشییەكەی لە سایەی سوێندخۆرانی دیمۆكراتی بەردەوام دەبێ، نەیدەزانی لە دواییدا بۆی دەردەكەوێ تەنیا هەڵوێستی ڕووس بەخراپە نەگەڕایەوە بەڵكو ئینگلیزی ئەوروپا و وڵاتە یەككگرتووەكانی ئەمەریكاش هەر وەكو ڕووس بوون و بەهەموویان بەدەستی شای تاران كۆماریان ڕووخاند.

## بۆ چوار ئەفسەرەكەی كوردی عیراق

چوار ئەفسەری كوردی عیراق عیزەت عەزیز و مستەفا خۆشناو و خەیروڵڵا عەبدولكەریم و محەمەد قودسی لە ساڵی ١٩٤٧ لە بەغدا لە سێدارە دران. بەم هۆیەیەوە پیرەمێرد شیعرێكی داناوە بەناوی «كۆستی نوێ»وە:

دیسان وا كۆستی نوێمان كەوتەوە
گەڕی گەردوونە كوردی گرتەوە
ئەم دوو دار تەرمە دوو نەڕەشێرە
زنجیریان پچڕان گەینەوە ئێرە
لە ڕێی ئێمەدا گیانیان فیدا كرد
ناوی بڵندیان وا بۆ خۆیان برد
ئەو پەتەی لە ملی ئەمانە خرا
ئەوانی خنكاند بەڵام پەت پچڕا
پڵنگی ئەنگێورا و بە هەڵمەتترە
گۆم هەتا قووڵ بێ مەلەی خۆشترە
وا پێمان ئەڵێن دەم بەپێكەنین
گیانمان فیدا كرد ئێوەی پێ بژین

ئەم جووتە شێرە دلێرەی شەرزە
لە ناو مێژوودا ناویان زۆر بەرزە
هیچ پێیان ناوێ کفن و دفن و شین
شەهیدن لە ناو دڵمانا ئەژین

لەم بڕە شیعرەدا بەسۆزێکی گەرم پیرەمێرد لە قارەمانیەتی ئەو ئەفسەرانە دەدوێ. کە تەنیا ئاماژە بەدووانیان دەکا لەبەرئەوەیە چونکە تەرمی دووانیان برایەوە سلێمانی و دووانەکەی دیکە یەکێکیان بۆ هەولێر و ئەویتریان بۆ شاری ئامێدی.

ئەم چوار ئەفسەرە لە ژێر فەرمانی کارگێڕانی کۆماری کوردستانی ئێرانی قازی محەمەد و بزووتنەوەی کوردی کوردستانی عیراق بوون. لە دوای ڕووخانی کۆماری کوردستان گەڕانەوە عیراق. حوکوومەتی بەغدا بەڕەزامەندی دەسەڵاتی ئەمپریالیستی بەریتانی چوار ئەفسەرەکەی لە سێدارە دا. لەو کاتەدا کاروباری بەڕێوەبردنی عیراق ڕاستەوخۆ و ناڕاستەوخۆ لە لایەن ئینگلیزەوە بوو.

## بۆ ڕێڕەوی بارزانییان بۆ ڕووسیا ١٩٤٧

بەشێک لە جەنگاوەرانی عەشرەتی بارزان بەسەرۆکایەتی مەلا مستەفا دەستیان بەڕێڕەوە قارەمانییەکە کرد لە سێ کوچکەی سنووری تورکیا - ئێران - عیراقەوە تا سێ کوچکەی سنووری تورکیا - ئێران - ئازربێجانی سۆڤیەتی کۆن، لە ڕووباری ئاراس پەڕینەوە وەک پەنابەر هانایان بۆ دەسەڵاتی ڕووسیا برد.

پیرەمێرد لە بابەت ئەم ڕووداوەوە دەڵێ:

عەشرەت هاوارە عەشرەت هاوارە
کەوتوومە ئاراس ئاو بێ بوارە
ڕێم نییە منیش شوێن ئەوان کەوم
پیرم هەنگاوێک بنێم ئەکەوم
لێرەش وا کەوتووم بەدەم دەردەوە
لە ئێشی دووری و ئاهی سەردەوە
دوکتۆر دەوای تۆم ناوێ لێم گەڕێ
بەڵکوم بەئاهم دەوران وەرگەڕێ



یا وا وەرگەڕێ ئێلم وەرگەڕێ
یا زرمەی تۆپی زەررەی بەرکەوێ
ئەوساکە دوعای من وا گیرا بێ
لە خانەی خاکا ئاواتم نابێ
ئینجا تەلقینم بدەن بەکوردی
بڵێن ئاواتت هاتە جێ و مردی

پیرەمێرد بەگشتی باوەڕی بەدواڕۆژی کورد بووە، ئەوەی کورد دەیەوێ دەیگاتێ و لەوانەیە شاعیر ئەو ڕۆژە نەبینێ. هەر چۆنێ بێ ئەو کارەی بەسەر ئەم جەنگاوەرانەدا هاتووە پیاو دەخاتە گێتیی غەمبارییەوە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەم جەنگاوەرانە هەر دەمێنن لە دواییدا بەئاواتیان شاد دەبن، ئەو کاتە ئەگەر شاعیر لە بن گڵدا بوو بەکوردی تەلقینی بدەن و مژدەی سەرکەوتنی پێ بگەیەنن.

## شێخ مەحموود و پیرەمێرد

بەهۆی نزیکی پیرەمێرد لە بنەماڵە و باب و باپیرانی شێخ مەحموود و وەک باوەڕ پێ کراو و کارگەرێک لە لای شێخ مستەفای نەقیب لەگەڵ شێخ سەعیدی حەفید لە میوانداربیەکەی سوڵتانی عوسمانی ڕوو دەکاتە ئەستەموول. لە دوای چارەکە سەدەیێک کە گەڕاوەتەوە سلێمانی مەیلی بۆ لای شێخ مەحموود وەک سیاسی و شێخێکی تەریقەتی قادری ئەوەندە نەبووە. بەلای ئێمەوە ئەو گرژییەی پیرەمێرد بەرامبەر بەشێخ مەحموود لەوەوە هاتووە شێخ لە هەندێ هەڵوێستیدا دژی ئینگلیز بووە و بەلای تورکی عوسمانی شکاوەتەوە، بەڵام پیرەمێرد زیاتر مەیلی بۆ ئینگلیز بووە. ئەمە و لە پاشانا ئەوەی پێوەندییەکەی نێوانیانی ئاڵۆزتر کردووە کوشتنی خزمانی پیرەمێرد جەمال عیرفان و عارف سائیبی شاعیر بووە لە لایەن خزمانی شێخ مەحموودەوە.

ئیتر پیرەمێرد دەکەوێتە گلەیی و گازاندە، شیعرێک بەم هۆیەوە دادەنێ:

لە گوێم دێ دەنگی لایلایەی وەتەن دایک جیگەر سووتاو
ئەڕێژێنێ بەسەر وێرانەکەی خوێناوی یا خوێناو
ئەلاوێنێتەوە ئەگری سەری شینە لە ماتەمدا
شەو و ڕۆژ کۆتەڵی منداڵەکانیت وا لە بەردەمدا

ئەڵێ لەو گەردشەی کوردا کوڕی چاکم هەبوو کوژران
ئەوەش مابوو هەموو مردن لە برسا بێ کفن نێژران
خودا پاداشی ئەم تەنگانەیەی وا دایەوە و وام دی
بەپێی خۆی هاتە بەرپێم تاجی گەوهەردارەکەی کوردی
سەلاحەددین جەلالی وای نەبوو تاریخ لە بەرچاوە
هەموو پاشای بەبان مردن بەحەسرەت ڕۆژێکی واوە
شەوێ دەس ئەهریمەن کەوت خاتەمی مولکی سلێمانی
کەچی میر و گزیری پێ ئەکرد قەدری وەها زانی
بەدەم ئەم ناڵەوە دەستی درێژ کرد خستیە سەر شانم
ووتی تۆفیق هاتیتەوە بۆ باری میحنەت ئەیزانم
بەڵێ حاڵم پەشێواوە فڕندە باڵی سووتانووم
نەما غەیری کەلاوە شەو بناڵێنە لەوێ وە بووم
ووتم دایە کە دایکم مرد نەگریام چونکە تۆ ماوی
ئەگەر ئەولادەکانیشت بکوژرێن تۆ دەبێ چابی
قەسەم بەو عەزمی کوردەی شانی ڕیچاردی بەشیر ڕووشان
کڵاوی کورد ئەبێ قووچ بێ کە هاتو شانی خۆی جووڵان
شەوێ پیاوێک لە بەفرا ما نەمرد ئاگرێکی دووری دێ
لە لای من نائومێدی کفرە ئەم ئاگرەی دڵم بۆ کێ

ئەم شیعرە لووتکەی داهێنانێکی هونەرییە، لە ناخی دڵێکی هەڵقرچاو و دەروونێکی قانگدراوی پڕ لە سۆز و ڕاستگۆیی هەڵقوڵاوە، لە ناو قەپێلکی ڕووداو نەماوەتەوە، بووە بەموتلەق و تەجرید بووە لە ڕووداو. کەسێکی دیاریکراو خەڵک دەکوژێ، شاعیرێک دێ دژی ئەو کەسە دەنووسێ ئەوە خراپە لەگەڵ خەڵکیدا دەکا. ئەمە هەمووی نامێنێ و تەنیا شیعرەکە دەمێنێتەوە.

بەمەزەندە ئەم شیعرە نابێ کاری کردبێتە سەر شێخ مەحموود و پێی تووڕە بووبێ، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا شاعیر پەشیمان بۆتەوە و پوزشی بۆ شێخ مەحموود هێناوەتەوە وای زانیوە ناڕازییە لەم شیعرە.



پاشگەزبوونەوەی پیرەمێرد بۆتە هۆی ئەوەی شیعرێکی دیکەی زۆر جوان دابنێ بۆ ئەوەی شێخ لێی خۆش ببێ و لە دڵیدا هیچ نەمێنێ:

ئەبێ بەخشندە مل کەچ کا لە ڕاستی مووچەخۆری خۆی
سوراحی بۆ پیاڵە سەرفرۆ دێنێ کە تێکا بۆی
کە ئاوداری لەسەر سەر گرتووە ئەیزانی چی تیایە
لە لای نەنگە کە پەروەردەی نوقوم کا گەورەیی وایە
لقی شۆڕی درەخت میوەی دەخۆن بێ ئەرکی بەرد و دار
پەلی بەرد بۆ پەلی بەرزە لەقەیشە بۆ لقی بەردار
لە دووری دوورییا بێزراو و بێزراوم ئەمەند زانم
ئەجەل دێ بمکوژێ نامناسێ چ بکەم نامرم ماوم
لەبەر ئاشووبی خێڵم هیچ شەوێ خەو نایێتە چاوم
خەوی ناخۆش ئەبینم بەم پەرێشان خاویە خاوم
ئومێدی سەر لەسەر دەرکەن ئەوانەی ڕاست و ڕووناکن
قەڵەم هەر سەر قەڵەم مۆم بۆ مەقەست هەر بۆ ئەویش چاکن
ئەڵێن مورغی سلێمان ئاو لە ژێر خاکا ئەبینێ شەو
منیش حەو ساڵە ڕێ دوور بێ بەچاوی دڵ ئەبینم ئەو
چرا ڕووناکی بۆ ژێر خۆی نییە ڕەحمەت لە بابی با
ئەوی ڕووناکی کەچ بینانە گۆڕە ڕەنجی با بیبا
بەجووت پەروانە وو ماسی کە دڵداری چرا و گۆلن
نزیکی ئەم ئەسووتێنی لە دووری ئاو ئەوان حۆلن

وێنەی شیعری و هەندێ لە ناوەرۆکی ئەم لیریکە نایاب و داهێنراوە لە ئەدەبی بێگانە وەرگیراوە، بەڵام ئەوە هەیە شاعیر خەیاڵی ڕۆژهەڵاتییانەی کردووە بەماکی شیعرەکە. لە شیعر و قسەی نەستەقدا ئەوە زۆرە پیاوی گەورە و بەتوانا لە هەڵە و خراپەی خەڵکی بێ توانا خۆش دەبێ و بەخراپە وەرامی ناداتەوە، بەم کارەی گەورەتر دەبێ.

## دیمەنی بەفری سلێمانی

لە وەسفی دیمەنێکی بەفری سلێمانی پیرەمێرد دەڵێ:

بەیانی بوو لە خەو هەڵسام کە ڕوانیم بەفرە باریوە
سلێمانی ئەڵێی بەلقیسە تارای زیوی پۆشیوە
دەمێ بوو چاوەڕێی بەفرێکی وا بووم مژدە بێ باری
سەرم بەفرە کەچی هێشتا شەڕە تۆپەڵمە بۆ یاری
لە بیرمە شێرە بەفرینەم ئەکرد سواری ئەبووم بێ زین
نسێ بوو جێگەکەی ئەیبەست ئەمما تاکو دەمی هاوین
بەبەرگی سپییەوە چەن شۆخە شاخی گۆیژە بیبینە
لە ڕەنگی ئاسمان دلبەرترە ئەو سپییە ئەم شینە
ئەڵێن بەرگەی فریشتەی ئاسمانیش سپییە وەک بەفرە
فریشتەی ئێمە بالایە بەڵام ئاخ بۆچ ئەخۆین تەفرە
هەموو پێچلەکە کلۆی بەفرێک فریشتەی خوای لەگەڵدایە
فریشتە کەوتە ناومان بۆیە وا ئاشووب و هەڵڵایە
ئەوا سامالی کرد زۆر کەوتە سەر شاخی گڵەزەردە
بەسەر ئەو بەفرەدا تیشکی هەتاو ئەڵماسی خوا کردە
بەسەر گۆنای سپیدا خشڵی زێڕینە بریسکەی دێ
پەری سەر کێوی قافیش هێندە پرچی زەردی خۆی لێ دێ
لەسەر سەربان بەفر تویژاڵی بەست وێنەی چۆڕی شیرە
قەتارەی سەر لق و پۆپی درەختیش سپییە دڵگیرە
چلوورەی گوێسوانە پلپلەی زیوی کچە کوردە
سەهۆڵ ئاوێنەیە ئەم پلپلە و ئاوێنەیە ووردە
کە پیرێژن سەر و پۆیلەی بەشینی چللە تێک ئالا
بەهار یەت داری پیر ئەژێیتەوە دێتە قەد و بالا

پیرەمێرد بۆ یەکەم جار ئەم شیعرەی لە ساڵی ١٩٣٢ بڵاوکردۆتەوە، بۆ یەکەم جاریش لەم شیعرەدا نازناوی «پیرەمێرد»ی بەکار هێناوە. لەم شیعرەدا وەسفی دیمەنێکی بەفری



سلێمانی دەکا. شاعیر دیمەنی بەفری ئەستەموولی دیوە. شیعری زۆری عوسمانی لە بابەت دیمەنی بەفرەوە خوێندوویەتییەوە. ئەوەی ڕاستەوخۆ کاری لێ کردووە دوور نییە دیمەنی بەفرێکی ئەستەموول بێ لە شیعرێکی تۆفیق فیکرەتدا، ئینجا ئەم شاعیرە تورکە و شاعیرانی دیکەش کەوتوونەتە ژێر کاریگەری شاعیرانی ڕووس، بەتایبەتی ئەلێکساندر پووشکین. بەم پێیە شاعیری تورک ئیلهامی لە پووشکین و شاعیرانی دیکەی ئەورووپایی وەرگرتووە، پیرەمێردیش ئیلهامی لە شاعیرانی تورکی عوسمانی و بەتایبەتی تۆفیق فیکرەت وەرگرتووە.

لەیەکچوون لە نێوان ئەم شیعرەی پیرەمێرد و ئەوانەی تورک و ڕووس ئاشکرایە. مەسەلە بنچینەییەکە بەفرە، ئەمەیان لە هەرسێ جێگە یەکێکە، لە مۆسکۆ، لە ئەستەموول، لە سلێمانی. شەڕە بەفر و بەفرەشێرینە و دیمەنە تۆپۆگرافییەکەی دەشت و پانایی بێ یا هەرد و شاخ هەمووی وەکو یەکە. لەگەڵ ئەوەشدا هەرسێ شیعرەکەی بە سێ زمانی جیاواز نووسراون هەموویان ڕەسەن و داهێنراون و لە پلەیێکی بەرز دان. بێ گومان لە یەکتریان وەرنەگرتووە، بەڵام ئەوەی پێش هەموویان وەسفی بەفری کردووە بووە بەسەرچاوە بۆ ئەوانی دیکە، بۆیە ئەم جۆرە بەرهەمانە کەرەستەی چاکن بۆ ئەدەبی بەراووردکاری. لە کاتی خۆیدا ئەمینی حاجی عەبدوڵڵا و عەزیز گەردی بیروڕای بەجێیان لە بارەی ئەم شیعرەوە دەربڕیوە.

## جەنگی دووەم و سوێندخۆران
## بەتایبەتی ئینگلیز

پیرەمێرد تا ڕادەیێک بەشیعر و پەخشان بەشداری لە پشتگرتنی سوێندخۆران بەتایبەتی ئینگلیز کردووە لە دژی دەوڵەتانی میحوەر ئەڵمانیا و ئیتاڵیا و یابان لە جەنگی دووەمی گێتیدا (١٩٣٩ - ١٩٤٥).

لە شیعرێکیدا پیرەمێرد دەڵێ:

کردەوەی هیتلەر بێن تەماشا کەن
ئەوسا لە حیزبی نازی حاشا کەن
بزانن هەر وا چ پەنگێکی دا
بەگیان لەبەری ڕووی هەموو دونیا

دەبا من باسی ئێستای لای خۆمان
شتێکی بۆ سەیر بخەمە مەیدان
دەردی بێ بەرگی ئای کارێک ئەکا
ڕووتین وەکو سڵق بێ بەرگین وەک گا
خۆ بەرگ و خواردن ئەمەندە بوون گران
پێیان ناوێرین بوونە دێو لێمان
ئای لەو سەعاتەی دێینە شت کڕین
هێندەی ئەمێنێ باڵ بگرین بفڕین
قاچم پێلاوی پێوە نەماوە
بلۆقە و گەلێ جێی قڵیشاوە
کەچی ناوێرم خۆم قەرەی پێلاو
بخەم ئەترسم نەک بکەومە داو
ئەو کارەی کەوا شەکر و چا ئەیکەن
نەبووە و نابێ هەتا بەدەگمەن
ئەمەندە گەرمن دەم ئەسووتێنن
پشتی دارایی هەژار ئەشکێنن
کار و کاسبی هەر ناویان ماوە
ئێستە ڕۆژێکە کە معاش باوە
ئەویش بەپارەش دەس کەس ناکەوێ
خوایە بۆ هەندێک سازکەی بسرەوێ
لەبەر بێ دەستی بەهیوای معاش
گەلێ شاعیری کاسب بوون بەجاش
دەردی هیتلەرن ئەمانە هەموو
لە ناوی بەری خوایە زوو بەزوو
هێشتا گەلێکی ماوە برادەر
چاکە کۆتای کەم گرانە دەفتەر



عوسبەتولئومەم دەخیلە هاوار
فریامان کەوە جارێکە و ئەمجار

ئەم شیعرە لە ساڵی ١٩٤١ نووسراوەتەوە، شاعیر باس لە هەڵگیرسانی جەنگ دەکا چۆن بووە بەهۆی گرانی و قاتوقڕی و دەست نەکەوتنی هەموو پێویستییێکی ژیان لە خواردەمەنی و جلوبەرگ. شاعیر هانا بۆ کۆمەڵەی نەتەوەکان (عصبة الامم) دەبا بۆ ئەوەی خەڵکی لەم مەینەتییە ڕزگار بکا.

***

بەریتانیا لە ماوەی جەنگی دووەمدا لە شاری یافای فەلەستین کە ئێستاکە لەگەڵ شاری تەل ئەبیب تێکەڵ بووە ئێستگەی ڕادیۆی ڕۆژهەڵاتی نزیکی دامەزراندبوو. لە پاش ماوەیێک بەشی کوردی لەو ئێستگەیەدا کرایەوە، بەپێشنیاز و دەستنیشانکردنی تۆفیق وەهبی چەند خوێندەوارێکی وەکو عەبدوڵڵا گۆران و ڕەمزی قەزاز و ڕەفیق چالاک لەوێ دامەزران و دەستیان بەکار کرد.

پیرەمێرد لە ساڵی ١٩٤٢ شیعرێکی بۆ ئەم دەسگایە داناوە:

نازانم هەوا بۆ چ وا بەگوڵە
لەم دەنگوباسە بۆ چ نابەدڵە
ئێمە زیانمان هیچ لەو نەداوە
ئەو بۆ چ تەگەرەی لە کارمان داوە
ئەو قینی چییە وا ڕێگا ئەگرن
بەدناوی نەبێ هیچی پێ نابڕن
ئەو دەم واتە زیانە شیرینە
لە لای ئەو تاڵە هەروەک هەنگوینە
لەندەن ئەتوانێ ئەو لەرزەش ببڕێ
بەریەخەی هەوای دەروێش دادڕێ
خەیاڵە تازە بۆ کورد بەیانە
شەوی بەسەرچوو ئەم قەومە جوانە
با تەقس لاچێ ڕێگا بکا چۆڵ
بەسە لاخواری بەسە بۆڵە بۆڵ

لووتت دەشکێ هەروەکو نازی
ئاخر ئاواتی مەرگت ئەخوازی
دەنگی مامۆستا ڕەمزی با ببیێم
شیعرەکەی گۆران بابێتە بەرگوێم
بەقاسپەی چالاک هەروەک نێرە کەو
باڕامچەنێنێ شەوە گیان لە خەو
سەیرکە چەن خۆشە ناوی ئەم پێنجە
لێکی دەینەوە وەک زێڕ و گەنجە
ژین و ئیزاعەی شاری سلێمانی
وا کوردی ئێران هەموو پێی زانی
دەنگی کامیل بەگ شەوقی گەلاوێژ
بڵاو بووەوە هەزار تۆپ هاوێژ
قسە خۆشەکەی شاری فەلەستین
گورزی کاوەیە مزگێنی بۆ ژین
خۆزگە زانستی ئێمەش بمایە
بانگی (هەر بژی) لێ نەبڕایە
ئەوسا نیشتمان ئەگەییە غایە
هەموو لاوانمان ئەگەییە غایە
ئیتر هەر بژی بەریتانیا
دەنگی خستینە ناو هەموو دونیا

لەم شیعرەدا پیرەمێرد لە پەنای شانازیکردن بەبەریتانیاوە کوردایەتی خۆی دەخاتە ڕوو. باس لە بەڕێوەبەرانی ئێستگەی ڕۆژهەڵاتی نزیک عەبدوڵڵا گۆران و ڕەمزی قەزاز و ڕەفیق چالاک دەکا، ئینجا لە دەسکەوتە ڕۆشنبیرییەکانی کورد دەدوێ، وەک ڕۆژنامەی خۆی «ژین» و ئێستگەییێکی ڕادیۆی بێ تەلی ناوچەیی لە سلێمانی ئەویش ئینگلیز داینا بوو، هەروەها ئێستگەییێکی کوردی دیکە لە ئێران و دەنگی کامیل کاکەمین لە ئێستگەی ڕادیۆی بەغدا، ئینجا کۆواری «گەلاوێژ» لە دواییدا کورد بەهۆی بەریتانیاوە دەگاتە ئامانجی! بەڵام داخی گرانی پیرەمێرد و هەموو کورد، ئەم هەلەش لە دەست چوو.



بەرپرسیاری یەکەم کورد خۆی بوو ئینجا ئینگلیز و هاوسێکانی کورد لە تورک و عەرەب و عەجەم.

لە پاشانا هەر لەو ساڵەدا شیعرێکی دیکەشی نووسی بەم بۆنەیەوە:

دەنگێکی قودسی لای قودسەوە هات
ناو جەژنانی کرد بەجەژنێکی ڕاست
ئەو شەوە بەختی میحوەر وەرگەڕا
نووزەی نازیەکان لە لیبیا بڕا
ڕۆژی ڕۆمێلیش بوو بەشەو شکا
ئابڕووی فاشیست ئێجگاری تکا
ئەمەریکا هات جەزائیری گرت
ئەمیرال دارلان کەوتە جرت و فرت
ئەو شەوە بانگی ڕۆڵەی کوردستان
لە شەرقی ئەدنا گەییە ئاسمان
لە شوێن میعراجی مەسجیدولئەقسا
دەنگی گۆرانیی گۆرانمان هەڵسا
فەلەستین شوێنی سەلاحەددینە
بۆیە ئەم دەنگە هێندە شیرینە
ئافەرین ڕەمزی بەنەوای قەزاز
ڕاست میللەتەکەت پێ کرد سەرفراز
لاوکی کوردی وەک دەنگی زەبوور
دەنگی دایەوە لە نزیک و دوور
سەری گوێژمان لە سەخرەتوڵڵا
تا پایەی عەرەشی یەزدان خۆی هەڵڵا
شۆڕێک کەوتە ناو کوردستانەوە
ڕووحی نیامان پێی حەسانەوە
ڕادیۆ وەک سووڕی ئیسرافیل وا بوو

بەعسون بەعدەلمەوت لەپڕ پەیدا بوو
(بعث بعد الموت) لەپڕ پەیدا بوو
ئەمە نەزەری بەریتانیایە
مسی کرد بەزیو کە کیمیایە
ئەم ژیانەوە و ئەم زیندەگییە
تا دەمرین چرای ڕێی بەندەگییە
شێوەی عیراقیش دیمۆکراتییە
ئەمە نیشانەی ڕێگای هاتییە
یاخوا لە سایەی بەریتانیادا
پێکەوە بژین تێر لە دونیادا

لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم هەموو دەسکەوتێکی ڕۆشنبیری مژدەی نزیکبوونەوەی سەربەخۆیی بۆ کورد دەهێنا ، یەکێکی وەکو پیرەمێرد دەیتوانی هیوا و ئامانجی کەسایەتی خۆی لە بابەت کوردەوە لە عیراقێکی دیمۆکراتیدا ببینێ بەمەرجێک لە ژێر چاودێریی ئینگلیز بێ!.

لە ماوەی جەنگی دووەمدا یابانییەکان وەک لایەنگری ئەڵمانیای نازی لە دژی سوێندخۆرەکان بوون. پیرەمێرد بۆ ئەم مەبەسە لە ساڵی ١٩٤٢ شیعری وتووە:

زستانی ئەمساڵ ئێجگار سەخت و سارد و سۆڵە
پیرێژن و پیرەمێردی کرد بەگڵۆڵە
کەوتینە سووتاندنی گوێسوانە و کەمۆڵە
سەراپای جیهان ئەبریقێتەوە سەهۆڵە
چاڵە بەفرەکان هەر لەخۆوە پڕبوونەوە
چلوورە بەسەر گوێسوانەوە شۆڕبوونەوە
ئێمە زۆرتر لە بورچی پیرێژن ئەترسین
ئەویش هات و تێپەڕی کرد ڕۆی و خەلەستین
خۆشی خۆشیمان بوو دەمان ووت کە بەهارە
ئیتر دەمی بۆس و کەناری جۆبیارە



کەچی فەلەک لەناکاو لێمان بەقینا چوو
ئاوات و خۆشی بەهارمان ئاڵۆزکا و تێک چوو
چڵکە هەورێک لەوپەڕی شەرقەوە پەیدا بوو
برووسکەی دا یاجووج و ماجووج بەیەکدا چوو
سەنغافوورەی سووتان هەموو جاوە هەڵقرچان
بەڵام زۆری پێ نەچوو زرمەیان لێ هەڵسان
هەوریان پارچە پارچە کرد و ترسیان لەناوبرد
هەموو یاجووج و ماجووجیان تەفروتوونا کرد
ئێمەش لە شوێن خۆمان وەکو بەرزەکی یانان
ڕزگارمان بوو وەک نە بامان دیبێ نە باران

لەم شیعرەدا پیرەمێرد بە هەناسەیێکی ڕۆمانتیکییانە و لێکسیکۆنی میللییانەی کوردەواری چوونە ناو جەنگی یابان بەزستانی سەخت دەچوێنێ. یابانییەکان لەگەڵ یاجووج و ماجووج بەراورد دەکا ، لە دەستدرێژییان دەدوێ بۆ سەر سەنغافوورە و جاوە (ئەندونیسیای ئێستا ) ، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا شاعیر دوارۆژی نزیک دەخوێنێتەوە و نوقڵی سەرکەوتن دابەش دەکا ، بەهۆی ئەوەی یابانییەکان تەفروتوونا دەبن.

لە بارەی کۆتایی جەنگەوە لە ساڵی ١٩٤٥ پیرەمێرد وتوویەتی:

حیجازی کوردی و نەوای عیراقی
هەردوو لە کاران سادەی ئەی ساقی
ئەمڕۆ ڕۆژێکە شەڕ برایەوە
دەرگای شادیمان بۆ کرایەوە
لە سایەی خواوە پێمان کەوت پەیمان
کە هاوپەیمانمان بۆ بوون بەتەیمان
ئێستا لە شایی سوێندخۆرەکانا
دەنگی دەهۆڵ دێت لە کوردستانا
وا بەهەڵپەڕکێش نەرز ئەبێتەوە
بەپیری ئەچین بەپیر ژینەوە

هۆ هۆ ژین هەی ژین لە کوردستانا
خاوەن مژدە بێ لە سای یەزدانا
لاوکی کوردی بۆ لاوانتە
جەننەتولمەئوا نیشتمانتە
ناوێرم لەمە زیاتری بڵێم
قەتار و زەبوور وەک یەک دێتە گوێم

لەم شیعرەدا شاعیر هەست و نەستی شادی و خۆشی دەردەبڕێ و دەیکا بەئاهەنگ و ئاواز و مۆسیقا و شایلۆغان و سەما و هەڵپەڕکێ. لەو ڕۆژانەدا لە هەواڵی سەرکەوتنی سوێندخۆران بەولاوە دەبێ چی ڕووداوێکی دیکە هەبێ! شاعیر لە دڵسۆزییەوە ئەم سەرکەوتنەی پێ خۆشە بۆ هەموو مرۆڤایەتی، بەڵام لە هیوا و ئامانجی کورد نەدواوە. ئەوسا و تا ئێستاش هێنانە دی چارەنووس و ڕزگاربوونی نەتەوەییە، لە دیلیدا ئازاد بێ و ببێتە خاوەنی خۆی.

## پیرەمێرد و بنەماڵەی مەلیکی عیراق

پیرەمێرد لەبەر هەر هۆیێک بێ سۆزی بەرامبەر بەبنەماڵەی هاشمی بووە، دوور نییە لەبەرئەوە بووبێ لە نەوەی پێغەمبەرن. ئەوانەی لەو بنەماڵەیە فەرمانڕەوا و مەلیک بوون فەیسەڵی یەکەم و غازی و فەیسەڵی دووەم و عەبدولئیلاه بوون. پیرەمێرد ستایشی زۆری کردوون و ماتەمنامەی بۆ مردنیان نووسیوە. بەگشتی شاعیر تەنیا ستایشی ئەمانەی نەکردووە، بەڵکو یەکێکە لە شاعیرانی کورد کە بابەتی شیعری ستایشی زۆرە، بەتایبەتی خزم و کەس و دۆست و برادەر و کەسانی دیار و دەوڵەمەندی دیکەی گرتۆتەوە.

بۆ کۆچی دوایی فەیسەڵی یەکەم لە ساڵی **١٩٣٣** نووسیویەتی:

ئەوا پایزە گوڵستان ڕەنگی زەردە
گەڵای دار وەری بای سەحەر ئاهی سەردە
پەڕندە لە هەردە
دڵی پڕ لە دەردە
پەرێشانە سونبول چنار بەرگی لوولە
گوڵی قەهقەهە ماتە مینا مەلوولە



چ عالەم شمووڵە
ئەم ئەیلووڵە غووڵە
درەختێکی تووبای بەهەشتی عیراق بوو
لە مەتوایە مەتوای کە سایەی بەسەرچوو
درێغا لە دەست چوو
بەڵام زوو بەزوو
لقێکی بڵندی کە جێ و جێی هیوایە
وەکو ئەسڵەکەی سایەیان بێ خودایە
کە داڵدە و پەنایە
وەدیعەی تیایە
کە بەڵکو عیراق وەک عیراقی عەبباسی
بەهەشتی زەمین بێ بەلالە عەبباسی
بڵندە ئەساسی
نەبینێ کەساسی
بەعیلم و فونوون بێ دەورانی مەئموون
فەڕنسە دیسان پەیڕەوی بێت مەفتوون
هەموو شاد و مەمنوون
وەکو عەهدی هارون
کە ئێمەش نەوەی فازیلی ئەو زەمانەین
ئەبێ سەرکەوین تا بزانرێ لەوانەین
لە باپیر نیشانەین
فیدایی یەکانەین

ئەم شیعرە جۆرە موستەزادێکە لە داهێنراوەکانی پیرەمێرد. ماتەمنامەیێکە بۆ مردنی فەیسەڵی یەکەم و پیرۆزباییە بۆ دانیشتنی مەلیک غازی لە جێی باوکی.

لە دوای ماوەیێک دیسانەوە بۆ یادی کۆچی دوایی ئەو مەلیکە لە شیعرێکی دیکەیدا پیرەمێرد دەڵێ:

ده ساڵ لەمەوپێش لە بورجی بەتحا
ڕۆژهەڵات زیای خۆی دایە بەغدا
من ووتم یاران ئاخر زەمان هات
کە دەبینین ڕۆژ لە مەغریب هەڵات
ووتیان خێر ئەمە سێ جارە وایە
عێراق بەنەسلی نەبی ئاوایە
تەکەڕوڕێکە تەئریخ ئەینووسێ
کاری بوو بەدوو هەر دەبێ بەسێ
لە پاش مورتەزا نەسلی عەبباسی
مەوجوود و بانی عێراق دەناسی
ئەم جارەش هەر ئەو فەیزەیە وا هات
دەوری مەهدییە لە عێراق داهات
ڕۆژی ڕۆژی هات ڕۆژی ڕۆژئاوا
بورجی بەغدای گرت کردی بەماوا
بێ ئەبوو موسلیم ئەبوو موسلیم بوو
حوکومەتێکی وای دامەزراند زوو
هونەر ئەوە بوو کە ئەم بەغدایە
جێی باوکی نەبوو پێی بێتە کایە
بەجەوهەری خۆی وای لە ئێمە کرد
ئەم خەڵکە هەموو لەبەری ئەمرد
بەحیلم و عەقل و دڵسۆزی و ئیشفاق
نیفاقی عێراق بوو بەئیتتیفاق
بەعەزم و تەدبیر کارێکی نواند
لە پەنجەی پڵنگ سەر ئازادی ساند
لام وایە تا ڕۆژ ئەگەڕێتەوە
مەدح و ماتەمی نابڕێتەوە



تازە عێراقی کۆن ژیایەوە
دریغا خۆی تیا نەحەسایەوە
ناگا کۆچی کرد ئەولادی حوسەین
تا دەمرین ئەبێ یادی خێری کەین
خۆی حووری بەهەشت هاونشینی بێ
ڕووحی نیگەهبان جێنشینی بێ
یەکە تەئریخە و هیوام پێیەتی
مەلیک وەک مەلەک بەهەشت جێیەتی

ئەم شیعرە وێنەی سۆزێکی تێدایە بەرامبەر ئەو بنەماڵەیە. لەو کاتەی پیرەمێرد ئەم شیعرەی نووسیوە (١٩٣٣) ڕای گشتی نیشتمانپەروەرانی کورد بەجۆرێکی دیکە بووە، مەلیک و ڕژێمی مەلیکییان خۆش نەویستووە، لەبەرئەوە لەم چەشنە شیعرانەدا پیرەمێرد لە ڕێزی ڕای گشتی چۆتە دەرەوە. ئەمە وەکو مەسەلەی جەنگی دووەمی گێتی نییە، کە ڕای گشتیی ئەو کاتە لەگەڵ ئەڵمان بوو کەچی ڕاستییەکەش ئەوە بوو ژێرکەوتنی ئەڵمان لە چاکە و بەرژەوەندی هەموو مرۆڤایەتی بوو، بەڵام پیرەمێردیش ئازادە لەوەی چۆن بیر دەکاتەوە بەمەرجێ جوانکاری لە بەرهەمی ئەدەبیدا هەبێ.

پیرەمێرد چەند ئەڵقەیێکی لە زنجیرە شیعری ستایش بۆ مەلیک غازی (١٩١٢ - ١٩٣٩) هۆنیوەتەوە، لە یەکێکیاندا دەڵێ:

یاخوا عیراقمان جێی شانازی بێ
بەشمان بەغازی سەرفرازی بێ
ئەو نەسلی پاک و ئێمە نەوەی چاک
پێکەوە بژین لە عالەم بێ باک

لە شیعرێکی دیکەیدا پیرەمێرد پیرۆزبایی لە مەلیک غازی دەکا بەهۆی لە دایک بوونی فەیسەڵی دووەمی کوڕی (١٩٣٥ - ١٩٥٨) لە شیعرەکەدا دەڵێ:

چاوەڕوونی بۆ تۆ ئەی شاهی غازی
بەپێی پیرۆزی نەوەت بنازی
جێی باوکت بەتۆ ئەدرەوشێتەوە
ئینشەڵڵا جێی تۆش پڕ ئەبێتەوە

له خۆشی و ناخۆشیدا پیرەمێرد بنەماڵەی مەلیکی عیراقی لە بیر نەکردووە. لە ساڵی **١٩٣٩** لە باڵەخانەی زوهور لە بەغدا مەلیک غازی بەهۆی تامپۆنی ئۆتۆمۆبیل کۆتایی بەژیانی هاتووە. شاعیر بۆ ئەم کارەساتە وتوویەتی:

ئەمڕۆ ڕۆ ڕۆیە و شین و ماتەمە
قوببەی نیلگوون خومخانەی غەمە
بەهار ڕوو زەردە ڕەنگی وەرەمە
هەور بۆمان ئەگری هێشتا هەر کەمە
تازە نەمامان سەر لە گەڵایە
تازە نەمامان سەر لە گڵایە
دونیا گەرم بوو وادەی سێبەر هات
سێبەری ئێمە ڕووی کردە نەهات
ئەو ڕۆیی بۆ خۆی جێگای بەهەشتە
ئێمە کەوتینە شەڕی کە نیشتە
دونیا خراپ بوو تا هات ئەگۆڕا
جێی چاکان نەما مەگەر لە گۆڕا

لە دوا جاردا پیرەمێرد بەشیعر پێشوازییێکی گەرم لە عەبدولئیلاهی وەسی مەلیک فەیسەڵی دووەم دەکا. لە ساڵی ١٩٤٥ پێش جەژنی قوربان عەبدولئیلاه بەگەشتێکی ڕەسمی دەچێتە سلێمانی. پیرەمێرد بەم ڕەنگە پیرۆزبایی پێشکێش دەکا بۆ سەردانەکەی شاری سلێمانی:

جەژنی قوربانە و بەرە جەژنانە
قودوومی وەسی بوو بەجەژنانە
کە بەنووهاشم بۆ عیراق هاتن
کورد پێشیان کەوتن بۆ بەخێرهاتن
ئەم جاری دواییش بۆ مەلیک فەیسەڵ
دیسان کورد ڕووحی خۆی کردە قەبەڵ
بەسەلابەتی دینەوە ئێرە
بۆ فیداکاری سەییدان فێرە



ئەخلاقمان وەکو جێگامان بەرزە
پەیمان وەک ئیمان لە لامان فەرزە
پیشەی مەردیمان بەجێ و بەجێیە
خوا خستوینیە سەر ئەم خولق و ڕێیە

لەمەدا ڕاستییێکمان بۆ دەردەکەوێ، ئەم شیعرانەی پیرەمێرد ئەگەرچی وا هەست دەکرێ لە دەروونێکی پڕ لە سۆزەوە هەڵقوڵاون بەڵام لە ڕووی هونەرییەوە خاسیەتەکانی بەرهەمی شیعری بەرزیان تێدا نییە، بۆ شاعیرێکی گەورەی وەکو پیرەمێرد جێی شانازی نییە. ئەمە و پێویستە بۆ مێژوو ئەو ڕاستییە بخرێتە بەرچاو عەبدولئیلاه جێی ڕێز لێنان نەبوو لە لایەن زۆربەی هەرە زۆری خەڵکی عیراق بەکورد و عەرەب و هەموو توێژەکانی ناو کۆمەڵ.

## پیرەمێرد و نەورۆز

پیرەمێرد بایەخێکی زۆری بەجەژنی نەورۆز داوە بەنووسین و کردەوە، شیعر و وتاری لەم بابەتەوە کەم نییە. لە بەرەجەژنانی هەموو نەورۆزێک شیعری داناوە، وتاری نووسیوە تەنیا لە ڕۆژنامەی «ژین» بڵاوی نەکردۆتەوە، هەندێکیان کەوتوونەتە سەر لاپەڕەکانی کۆواری «گەلاوێژ»یش. بەناوبانگترین سروودی نەورۆزی ئەو شیعرەیە کە لە ساڵی ١٩٤٨ چڕیویەتی، لەو شیعرەدا پیرەمێرد دەڵێ:

ئەم ڕۆژی ساڵی تازەیە نەورۆزە هاتەوە
جەژنێکی کۆنی کوردە بەخۆشی و بەهاتەوە
چەن ساڵ گوڵی ئێمە پێ پەست بوو تاکو پار
هەر خوێنی لاوەکان بوو گوڵی ئاڵی نەوبەهار
ئەو ڕەنگە سوورە بوو کە لە ئاسۆی بڵندی کورد
مژدەی بەیانی بۆ گەلی دوور و نزیک ئەبرد
نەورۆز بوو ئاگرێکی وەهای خستە جەرگەوە
لاوان بەعەشق ئەچوون بەبەرەو پیری مەرگەوە
ئەوا ڕۆژ هەڵات لە بەندەنی بەرزی وڵاتەوە
خوێنی شەهیدە بەڕەنگی شەفەق شەوق ئەداتەوە

تا ئێستە ڕووی نەداوە لە تەئریخی میللەتا
قەڵغانی گوللە سنگی کچان بێ لە هەڵمەتا
پێی ناوێ بۆ شەهیدی وەتەن شیوەن و گرین
نامرن ئەوانە وا لە دڵی میللەتا ئەژین

وا ڕێک کەوتووە جەژنی نەورۆز لە ساڵی ١٩٤٢ لەگەڵ جەژنی مەولوودی پێغەمبەرا تێکەڵ ببێ. بۆ ئەم ڕێکەوتە پیرەمێرد دەڵێ:

ڕەبیعی عەرەب نەوبەهاری کورد
دەست لە ملانیان لە نەورۆزا کرد
جەژنی مەولوودی پێغەمبەرمانە
وا مەولوودمان کرد بەنەورۆزانە
ئەم دوو جەژنەمان کەوا یەک کەوتن
ڕێی ڕێکەوتنە خوا یەکی خستن
ئاگری نەورۆزمان کە کرایەوە
بەو ئاگرە ئاگری شەڕ کوژایەوە
ئاگری نەورۆزمان لە هیتلەر بەردا
خۆڵی مردوومان بێژا بەسەردا
کە خۆڵی مردووی کرا بەسەردا
دەستی لە یەخەی شەڕ و گەڕ بەردا
کە هیتلەر نەما غوولی یابانی
زۆری نامێنێ بۆ مل شکانی

ئەم شیعرە جوانەی پیرەمێرد لە ڕووی هونەرییەوە دوو دیاردەی کۆمەڵایەتی – سیاسی پێکاوە، یەکەمیان دۆستایەتی کورد و عەرەب لە بەیەک گەیشتنی جەژنەکانی نەورۆز و لە دایک بوونی پێغەمبەردا دەبینێ بەو مانایەی پێغەمبەر عەرەبە و ئێمە کوردین؛ دووەمیان جەنگی دووەمی گێتی لە جەنگەیدا بوو، هێشتا کۆتایی نەهاتبوو، کەچی پیرەمێرد مژدەی سەرکەوتنی سوێندخۆران و لەناوبردنی هیتلەر بەخەڵکی کورد دەگەیەنێ.

جگە لەم سروودانە پیرەمێرد لە بابەت نەورۆزەوە شیعری دیکەی نووسیوە:



١- نەشیدەی زانستی بۆ نەورۆز (١٩٣٦).
٢- بەهار و نەورۆز (١٩٤٤).
٣- نەورۆزنامەی نەسرین و پەروین.
٤- نەورۆزی ١٩٤٩ «مژدە بێ ساڵ گەڕایەوە». ئەم سرووده چەند جارێک بەدەسکارییەوە بڵاوکراوەتەوە.

## شیعری عەرووزی کلاسیکی

### پیرەمێرد

پیرەمێرد هەردوو جۆرە کێش و قافیەی شیعری عەرووزی کلاسیکی بەکار هێناوە. کێشی عەرووزی یەکێتیی قافیە، ئەمەیان لای ئەو کەمە، لەگەڵ ئەوەی مەرجی سەرەکیی شیعری کلاسیکیشە، بەڵام ئەوەی دیکەیان کێشی عەرووزی جووت قافیە (مەسنەوی) ئەم بابەتەی یەکجار زۆرە. ئەوەی پێویستە لێرەدا ڕوون بکرێتەوە ئەوەیە ئەم جۆرە سیستێمە بەزۆری لە شیعری کلاسیکیدا بۆ چیرۆکی شیعری (داستان، مەلحەمە) بەکار دەهێنرێ و لە غەزەل و قەسیدەدا باو نەبووە.

پیرەمێرد لە غەزەلێکیدا دەڵێ:

پەچەت لادە لە ڕوو بنوارە وەی حەشری حەسرەتکار
لە حەشرا ترسی ئاگر لێرە شەوقی ئاگری ڕوخسار
کە بێیتە باغەوە ئاگر دەخەیتە جەرگی گوڵ ئەوسا
پەڕەی گوڵ دەبنە پەروانە بەدەورتدا وەکو پەرگار
کە دەنگی تۆم لە گوێ بێ وەک غەرامافۆن ڕەگی ڕووحم
وەری دەگرێ و شەوی تەنیایی دیسان بۆم دەکا تیکرار
کە شانەم دا لە ڕیشم بۆنی عەتری لێ دەهات زانیم
کە شانەیش وەک خەیاڵم جارێ ڕێی کەوتبووە زولفی یار
بەبێ جیسمی جەمال ئاوێنە عەکسی ناگرێ هەر من
ئەوا ئاوێنەیی دڵ عەکسی تۆ ئەنوێنێ جاروبار
کە من تۆم بێ ئیتر بەسمە هەموو دونیا لە لام پەشمە
لە هەشت باغچەی بەهەشتم چی من و ژوورێکی چوار دیوار

هەوام ناوێ هوام دێنێ لە تەنها دوورم و تەنها
بەمە مونیس بەتەنها ئینس بەتەسحیف ئاتەشە زینهار

پیرەمێرد لەم شیعرەدا وەک شاعیرێکی کلاسیکی شارەزا خۆی دەنوێنێ. وشە و تەعبیر و وێنەی داهێنراوی هەیە، پارێزگاری مەرجە کۆنەکانی شیعری کلاسیکی کردووە، لەگەڵ ئەوەشدا تازەیی پێوە دیارە کە لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا وتراوە، بەتایبەتی کە وشەی «گرامافۆن»ی خستۆتە ناو شیعرەکەیەوە.

لە شیعرێکی رەندی دیکەیدا پیرەمێرد ماتەمنامەیێک بۆ جوانەمەرگ بوونی خوشکێکی ئەحمەد بەگی تۆفیق بەگی داناوە لە ساڵی **١٩٣٢** بەناوی «شیوەنی نەونەمامێک» لە شیعرەکەدا دەڵێ:

وا بەکوڵ ئەگریم لەگەڵ تۆ هەوری سووری بەهمەنی
من بەوەی گوڵ کەوتە ژێر گڵ تۆ بەوەی گوڵ پێکەنی
تازە گوڵ بۆ تۆ بوو ئەم چەندانە سەیرانم ئەکرد
تۆ بەجێت هێشتین گوڵستان بوو بەچاهی بێژەنی
دایکی خاک وەک دایکێ بیگرە باوەش ئازاری مەدە
جێگەکەی تاریکە وا ترسا لە خەودا راچەنی
دوێنێ نەورۆزم بەبەژنی نەوگوڵانی ئاڵ ئەکرد
دەوری دەوران دەورەمی ئەمڕۆ بەبەرگی شین تەنی
نیوە بەیتی دوایی رۆژی رۆینی ئەو دەردەخا
من ئەزانم سێبەری تووبایە بۆ ئەو نیشتەنی

لەم شیعرەدا پیرەمێرد مەرجەکانی روخساری و رووکەشییەکانی شیعری عەرووزی کلاسیکی بەکار هێناوە، لە ناوەرۆکدا وەسفی سروشت و بەهار و نەورۆزی لە بیر نەچۆتەوە وەک بەڵگەی لاویەتی، هەروەها هەوری سوور و لافاوی بەکار هێناوە بۆ ئەو ماڵاوایییە ناوەختییە. ساڵی مردنی ئەو کیژەشی بەحسێبی رۆژژمێری هیجری دیار کردووە.

لە دیوانی پیرەمێرد شیعری عەرووزی جووت قافیە (مەسنەوی) زۆرە، لە یەکێکیاندا دەڵێ:



ئەوا رووم کردە تۆ ئەی دایکی موشفیق بیست و پێنج ساڵە
لە غورووبەت دا بەیادی تۆ دەژیم خوا شاهیدی حاڵە
بەیانی دا نەسیم لای تۆوە هات بۆنی وەتەن پێوە
ئەوا نووسرایەوە پیرانەسەر عومرم لەسەر نوێوە
ئەڵێن نەفحەی حەیاتی پێوەیە بادی بەهار وایە
بەسرووەی بای وەتەن ماوم بەهار و بای لە لام بایە
ترەن جوولایەوە وا کەوتە رێ باوەڕ بەخۆم ناکەم
خەوە یاخود خەیاڵ یا راستە ئەم حاڵی فەرەحناکەم
هەوای تەختی سلێمانی هەیە بادی ترەن با بێ
بلا بابێ لە شەهبا بێ لە فەیحا بێ لە زەورا بێ
بەچاوما بێ ئەگەر تۆزێک لە تۆزی بای سلێمانی
کە نووری توورە تووریێک ناهێنێ سورمەی سلێمانی
کە با بۆنی گوڵێکی کانیبا بێنێ لە لام وایە
تەلای کەیخوسرەوی وەک گەنجی باداوەر هەمووی بایە
گزنگی خۆر ئەداتە بەفرەکەی شاخی عومەر گودروون
بریقەی خۆشترە لای من لە دوڕ و گەوهەری قاروون
بەئاواتی ئەخوازن خەڵک تەعامی مائیدەی عیسا
هەمووی حەڵوا گەزۆییێک ناهێنێ دەستم کەوێ ئێستا
شەماڵ دێنێتە گوێم دەنگی مناڵانی قوتابخانە
نەشیدی میللییان لاهووتییە قووتی دڵ و گیانە
هیوام پێیانە ئەم دەستە کوڕانە مەشخەڵێ هەڵکەن
لە تاریکی نەزانیندا بەزانستی وەتەن دەرکەن

پیرەمێرد ئەم شیعرەی لە کاتی گەڕانەوەی لە تورکیاوە بۆ نیشتمان لە ساڵی ١٩٢٤دا وتووە. شیعرەکە نوقوم بووە لە ناو یادگار و بیرەوەری پڕ لە سۆزی شاعیر بەرامبەر بەنیشتمان. وەک خۆی دەڵێ سەفەرەکەی بەهۆی «ترەن» یا «ترێن»ەوە بووە کە مانای شەمەندەفەر دەگەیەنێ. لە شیعرەکەدا یادی ئەو ئاوەدانییانە دەکاتەوە کە لە رێگەی گەڕانەوە بەناویاندا تێدەپەڕی. ناوی نازناوی مێژوویی شارەکان دەبا، وەک شەهبا

(حەڵەب) و فەیحا (دیمەشق، شام) و زەورا (بەغدا). جگە لەمانە سەردەستەی شاران بەلای شاعیرەوە سلێمانی و دەوروبەریەتی چونکە مەڵبەندی لە دایک بوونیەتی لە دوای بیست و پێنج ساڵ دوورە وڵاتی دەگەڕێتەوە ئەوێ. لە شیعرەکەدا ناوی هەندێ شوێن دەور دەکاتەوە وەک کانی بای سەیرانگای شاری سلێمانی و شاخی پیرەمەگروونی پاسەوانی هەمیشەیی شار.

لە لیریکێکی دیکەیدا پیرەمێرد ناوەرۆکی تازە دەخاتە قالبی شیعری کۆنەوە:

ئەی کچینە وەرنە مەکتەب ئێوە تەسکینی دڵن
زینەتی باغ و تەرەقین ڕەونەقی دەستەی گوڵن
تازە ئێمە تێگەیشتووین دایکی چاکی خوێندەوار
نەسلی وا دێنیتە مەیدان قەومەکەی پێ بێتە کار
ژن خەریکی ژینی پیاوە نەک خەریکی بەرد و دار
تەربییەی مێشکی مناڵی بۆ وەتەن بێ و جان نیسار
خۆزگە من ببمە درەختێ بۆ قوتابخانەی کچان
ئەو کچانەی وا دەخوێنن ببمە سێبەر بۆ ئەوان
هەر کچانی خوێندەوارە میللەتی پێ سەرکەوێ
تەربییەی منداڵ هیوایە پێشڕەومان بەرکەوێ
ڕۆژهەلاتیش ڕۆژی هەڵدێ خوێندنی کچ هاتە ناو
جەهلە تاریکەشەوی کورد خوێندنیش تیشکی هەتاو

ئەم شیعرە یەکێکە لە شیعرە زۆرەکانی پیرەمێرد هانی کچان دەدا بۆ خوێندن. بابەتەکە وەک بەرگریکردن لە مافی ژنان ناوەرۆکێکی تازەیە لە شیعری کوردیدا، بەلام پیرەمێرد لە قالبی کۆنی عەرووزی دایڕشتووە لەسەر بەحری ڕەمەلی هەشتی مەحزووف و قافیەی مەسنەوی. ئەم جۆرە شیعرە لە مودێلە تازەکانی شیعری نوێی کوردی بوو لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا.

هەر لەسەر ئەم بەحرە عەرووزییە پیرەمێرد لیریکێکی دیکەی هەیە:

بای خەزان غونچەی خزاند و دڕکی پیر هەر مایەوە
گێژە هەرچی خۆی ئەخاتە گێژی ئەم دنیایەوە



دادی ئایینمان لە دەست مەی نۆشی و ڕەشپۆشییە
هەش بەسەر ئەو جەژنە وا سەرخۆشی یا سەرخۆشییە
قژ ڕنین و پرچ بڕین بوو ماتەمی جاران کە ئێستا قژ نەما
پیرێژن ما مووی بڕووتێنێتەوە و بیدا بە با
زولف کە ڕووی داپۆشییایە بانگ و هاواریان ئەکرد
خەڵکە مانگ گیرا لە تەپڵ و دومەڵەک دەن دەست و برد
ئێستە زولف بڕڕا سفووری مانگە ڕووپۆشی نەما
داغە هێلانەی دلان شێواوە بێ بێنە بۆنی سەبا
بێتو شەو تۆ بێتە لام ڕۆژی چرام پێویست نییە
تۆ وەرە و بمناسە پێشەی من چرا وەک ژێ نییە
هەر کەسە هاواری چاوی پیس ئەکا و من چاوی جوان
بەندی جەرگی وا بڕیووم نیمە یادی نیشتمان
ئەم گڕوگالانە شێوە شیعری کۆن ئێستە کەمە
هەولێی سەربەرزی گەلت بێ زولف و ڕوو گوێی لێ مە

لەم لیریکە جوانەدا پیرەمێرد ڕەوشتی سروشت لەگەڵ خوو و کردەوەی ئادەمزاد بەراوورد دەکا بەهەناسەیێکی ڕەشبینانەی دوور لە گەشبینی. هەروەها هەوڵ دەدا شیعرەکە لە ناو بازنەی ئاسۆییێکی دانایانە و فەلسەفییانە بخاتە ڕوو.

***

حاجی تۆفیق کوڕی مەحموود ئاغای کوڕی هەمزە ئاغای مەسرەف، ناسراو بەنازناوی «پیرەمێرد» گێتییێکی پڕ لە ڕووداوی نهێنی و داهێنانی ئەدەبی بەرزە. ئەگەر تەمەنی درێژی بەسەر قۆناغەکانی ژیانیدا دابەش بکرێ، قۆناغی یەکەمی نیشتمان (سلێمانی) و قۆناغی دووەمی دەرەوەی نیشتمان لە وڵاتی سوڵتانی عوسمانی و قۆناغی سێیەمی دیسانەوە نیشتمان، هەریەکەیان دەوروبەری چارەکە سەدەیێکی بەردەکەوێ.

پیرەمێرد لە سلێمانییەوە کە چووە ئەستەمووڵ ڕۆشنبیر بوو، زمانانی کوردی و فارسی و تورکی و عەرەبی دەزانی. لە وڵاتی بێگانە وەکو خۆی دەڵێ تاقیکردنەوەی تازەی هەبوو. خوێندنی لە مەکتەبی حوقووق و بەڕێوەبردنی ئاوایییەکانی دەوروبەری ئەستەمووڵ لە دیوی ئاسیا وەک قایمەقام و موتەسەریف. هەروەها پێوەندی بەڕۆژنامەگەرییەوە هەبوو. چەند

وتارێکی بۆ ڕۆژنامەی «ژین»ی ئەستەموول نووسیوە. لە هەندێ ڕۆژنامە و کۆوارە تورکی و فارسییەکاندا وتاری بڵاوکردۆتەوە، بەڵام لە ژیانی ئەویی فێری هیچ زمانێکی ئەورووپایی نەبووە.

پیرەمێرد کە گەڕایەوە بۆ نیشتمان ئەو پسپۆڕییەی هەیبوو وەکو خۆی دەڵێ لە زانینی حوقووق و قانوون و پراکتیکی بەڕێوەبردنی شار و ئاواییبیان، هەمووی خستە پشتگوێ و هیچ سوودێکی بۆ نیشتمان نەبوو. ئەو کاتە هەموو عیراق بەگشتی و کوردستان بەتایبەتی پێویستی زۆریان بەزانست و زانیاری پیرەمێرد هەبوو وەک پسپۆڕێک لە بەڕێوەبردنی کاروباری حوکوومەت و شارەزایی لە قانوون، کەچی پیرەمێرد بەو پراکتیکە کەمەی لە ڕۆژنامەگەریدا هەیبوو بڕیاری دا لە مەیدانی چاپەمەنی کار بکا و هەموو قۆناغی دوایی ژیانی کە چارەکە سەدەییێک بوو تەرخان بکا بۆ ڕۆژنامەگەریەتی و خەریکی بڵاوکردنەوەی ڕۆژنامەکانی «ژیان» و «ژین» بێ لەگەڵ چاپکردنی کۆمەڵێک کتێب و نامیلکەی خۆی و خەڵکانی دیکە.

لەو ماوەیەدا تاقیکردنەوەی بۆ نووسینی بەرهەمە ئەدەبییەکانی لە شیعر و پەخشان هەمووی هەڵڕشت. پیرەمێردی شاعیر و نووسەری چارەکی دووەمی سەدەی بیستەم لە سەرەتای ژیانیەوە تا ساڵی ١٩٢٥ بەرهەمێکی وای نەبوو بیکا بەشاعیرێکی بەدیەن و دیار. بەڵام لە دواییدا بوو بەشاعیرێک هەموو قۆناغەکانی ئەدەبی کوردی دەور کردەوە، لە هەموو بابەتەکانی شیعری هەبوو. وەک شیعری عەرووزی و یەکێتیی قافیە و جووت قافیە (مەسنەوی) و شیعری سیلابی خۆماڵی. وەستایانە هەردوو شێوازی تێکەڵ بەیەکتری کرد. نموونەی زۆربەی بابەتە شیعرییەکانی لە ڕووی ڕوخسار و ناوەڕۆکەوە هەیە. سەرچاوەی ئەدەبی میللیی سەر زار (فۆلکلۆر) کانگای ئیلهامی شیعری پیرەمێرد بووە. هەندێ جار لەگەڵ ئەدەبی نووسراو تێکەڵ بەیەکتری کردوون.

پیرەمێرد گەمەی هونەری زۆرە لە ڕەوانبێژی شیعری عەرووزی و خۆماڵی، لە بەکارهێنانی وشەی کۆن و تازەی کوردی، وشەی فەرهەنگی شار و دێهات، وشەی بێگانەی نەتەوە دراوسێکان و زمانانی میللەتانی ئەورووپا تا گەیشتۆتە ئەوەی شیعری بێ نوختە بڵێ.

ئەم شاعیرەمان یەکێکە لەو نووسەرانەی بەشدارییان لە پەرەسەندن و پێشکەوتنی پەخشانی کوردیدا کردووە. بەرهەمی پەخشانی کەم نییە. لە نووسینیدا شێوازی شیعرییە.



بەرهەمی لە شیعر و پەخشاندا سەر بەچەند ڕێباز و بزووتنەوە و قوتابخانەیێکی ئەدەبییە، ئەگەر شاعیرانی دیکە هەریەکەیان لە خانەیێکدا دابنرێن، پیرەمێرد لە چەند خانەیێک جێی دەبێتەوە.

بڕێک لەو بەرهەمە شیعرییانەی خراونەتە پاڵ پیرەمێرد هی خۆی نییە، بەڵام بایی ئەوەندەی هەیە وەک شاعیرێکی گەورە لە ناو شاعیرانی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم بکەوێتە بەرچاو.

## بەشی حەوتەم

## مستەفا شەوقی

**١٨٦٥ – ١٩٣٢**

### ژیانی شاعیر

مستەفا کوڕی قازی لەتیف لە بنەماڵەی قازیبیانی موکریانە. لەم خێزانەدا قازی محەمەدی ناودار هەڵکەوتووە. مستەفا لە تەمەنی گەورەیی و ژیانی ئەستەموڵیدا لەقەبی «شەوقی» بۆ خۆی هەڵبژاردووە، دەسنیشانکردنی ئەم لەقەبە کاریگەری دەستووری عوسمانی پێوە دیارە. لە دواییدا لە ناو خەڵکی بەمستەفا شەوقی ناسراوە.

مستەفا بەپێی ئەو سەرچاوانەی لە بەردەستدان لە دەوروبەری ساڵی ١٨٦٥ لە سابلاغ (مەهاباد) لە دایک بووە. بەمنداڵی خوێندنی لە قوتابخانە و حوجرەی مزگەوت بردۆتە سەر. هێشتا مێردمنداڵ یا لاو بووە لە کەسوکاری تۆراوە، مەڵبەندی ژیانی بەجێ هێشتووە و ڕووی کردۆتە ئەستەموڵ و لەوێ لەقەبی «شەوقی» بۆ خۆی هەڵبژاردووە. پێشتر بەقازی ناسرا بوو، لەگەڵ ئەوەشدا وازی لە لەقەبی «قازی زادە» نەهێنا و لە بلاوکردنەوەی بەرهەمی ئەدەبی لەگەڵ «مستەفا شەوقی» هەردووکیانی بەکار دەهێنا.

ئەو ڕۆژانەی مستەفا شەوقی لە ئەستەموڵ بووە، جەوادی قازی خزمی لە ئەڵمانیا ژیاوە. لە کاتی خۆیدا کە ڕۆژهەڵاتناس و کوردناسی ئەڵمان ئۆسکارمان بۆ کۆکردنەوەی تێکستی ئەدەبی میللی چووبوو بۆ موکریان لە ڕێگەی گەڕانەوەدا بۆ ولاتی خۆی جەوادی قازی لەگەڵ خۆیدا بردبوو. لەوێ خوێندنی بەرزی تەواو کردبوو. ئینجا مستەفا شەوقی بەهۆی ئەم خزمەیەوە ڕێی بۆ خۆش دەبێ و ڕوو دەکاتە ئەڵمانیا. لەوێ خوێندنی زانستگایی لە زانستیی پزیشکیدا تەواو دەکا و دەبێ بەدوکتۆر مستەفا شەوقی و دەگەڕێتەوە ئەستەموڵ.

لە تەک کار و پیشەی خۆی کە پزیشکی بووە، لە نزیکەوە سەرقاڵی سیاسەت و پارتیایەتی بووە لە ناو بزووتنەوەی کوردایەتی ئەو سەردەمەی لاوانی کورد لە ئەستەموڵ. مستەفا شەوقی بەشداری لە زۆربەی کۆمەڵەکانی سیاسی و کۆمەڵایەتی قوتابیان و خەڵکی دیکەی کردووە، لەوانە «کۆمەڵەی هیڤی» (١٩١٢)، «کۆمەڵەی پێشکەوتنی کوردستان» (١٩١٨ – ١٩١٩)، «کۆمەڵەی خۆیبوون» (١٩٢٧). لە ساڵی ١٩٢٩ کۆمەڵەی خۆیبوون مستەفا شەوقی ناردووە بۆ سابلاغ (مەهاباد) بۆ پروپاگەندەکردن و دامەزراندنی لقی خۆیبوون لەو ولاتەدا. ماوەیێک لەوێ ماوەتەوە و خەریکی کاری سیاسی و پیشەیی خۆی پزیشکی بووە. لە دوای سێ ساڵ گەڕاوەتەوە ئەستەموڵ و لە دەوروبەری ساڵی ١٩٣٢ کۆچی دوایی کردووە.

### مستەفا شەوقیی ڕۆشنبیر و نووسەر

مستەفا شەوقی یەکەمین کوردێکی کوردستانی ئێرانە چارەنووس بردوویەتییە ناو کۆمەڵی تورکی عوسمانی. لەوێ لەگەڵ کوردانی هاونەژادی تێکەڵ بووە. بەخۆی و کۆڵێک خاسیەت و خوو و ڕەوشتی نەتەوەیی کوردانی ئێران چۆتە ناو ئەم کۆمەڵە تازەیەوە لە ئەستەموڵ. ئەگەر لە هەموو شتێکدا لە تورکە عوسمانییەکان دوور بووبێ لە کوردە عوسمانییەکانی ئەستەموڵ و ناوچە کوردییەکانی عوسمانی نزیک بووە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا جیاوازییێکی کەم هەر هەبووە. ئەمە بۆتە هۆی ئەوەی ببێ بەنموونەی کوردێک مەدەنییەتی لە هەردوو لا کوردی عوسمانی و ئێرانی هەڵێنجاوە. جگە لەوە دەوری باڵیۆزی بینیوە لە نێوان ئەم دوو بەشە کوردانەدا بەتایبەتی کە سێ ساڵ لە مەڵبەندی خۆی ماوەتەوە بۆ ئەوەی لقی کۆمەڵەی خۆیبوون لە سابلاغ (مەهاباد) بکاتەوە.

مستەفا شەوقی لە زۆربەی کۆمەڵە سیاسییەکانی کوردی عوسمانی و لە پاشانا تورکیا چالاکی نواندووە. لە کۆوارەکانیاندا شاعیر و نووسەرێکی بەرچاو بووە، شیعر و وتاری ئەدەبی و کۆمەڵایەتی بلاو کردۆتەوە، بەتایبەتی لە «ژین» (ئەستەموڵ ١٩١٨ – ١٩١٩) و «کوردستان» (ئەستەموڵ ١٩١٩).

وەک پزیشکێک شاعیر بووە بەنموونەی ڕۆشنبیری کورد بەحسێبی ئەوروپاییبیان. لەو کاتەی ئەم پزیشکە سیاسەتی کردووە لە پێناوی کوردایەتی دەستی لە داهێنانی ئەدەبی بووە بەشیعر و پەخشانەوە. بەمە وەک نووسەرێکی هاوچەرخ دەکەوێتە بەرچاو چونکە تاقیکردنەوەکانی ڕەنگدانەوەی کۆمەڵی کوردی ئێران و کوردی عوسمانی و شاری ئەستەموڵ و کۆمەڵی ئەڵمان بوون.

### شیعری مستەفا شەوقی

تا ئێستا بایی دیوانێک شیعری ئەم شاعیرەمان لە بەردەستدا نییە. ئەو شیعرە کەمەی لە ناوەوەیە لە ڕووی کێشەوە لە قالبی بەحری عەرووز نەچوونەتە دەرەوە، یەکێتیی قافیەیان تێدایە. بەپێی بابەت و هونەرەکانی شیعری کلاسیکی بەرهەمی ئەم شاعیرە لە چوارچێوەی غەزەل و قەسیدە نەچوونەتە دەرەوە، زۆربەیان قەسیدەن ژمارەی دێڕەکانیان لە دوازدە زیاترە و کەمیان غەزەلن ژمارەی دێڕەکانیان لە دوازدە کەمترە. هونەرەکانی دیکەی وەک پێنجین و موستەزاد و چوارین و هی دیکە لە شیعریدا بەرچاو ناکەون. ئەو شیعرانەی لە ڕۆژنامەکانی کوردی لە ئەستەموول لە سالانی ١٩١٨ - ١٩١٩ بڵاوکراونەتەوە تا ئێستا لە دیوانێکدا چاپ نەکراون.

شیعری مستەفا شەوقی لە ڕووی ڕوخسارەوە بەرتەسک و دیاری کراوە، هەروەها لە ڕووی ناوەرۆکیشەوە تەنیا لە دڵداری دەدوێن و بەگیانی نیشتمانپەروەری و کوردایەتی موتروبە کراون، واتە ناوەرۆکیان مەبەسی دڵداری و سیاسییە، بەڵام هەردوو مەبەسی تێک ترنجاندووە بەجۆرێک یەکێتییێکی بتەوی لە نێوانیاندا دروست کردووە، لە یەکتری جیا نابنەوە. بینین و خاسیەتەکانی شیعری ڕۆمانتیکی ئەورووپا لە شیعری مستەفا شەوقی ڕوون و ئاشکرایە. بەشێوەیێک چێژ و خەیاڵی ئەورووپایی هێناوەتە ناو ئەدەبی کوردییەوە ڕەسەنایەتی ئەو شیعرەی پاراستووە. لە مەسەلەی کێش و قافیەدا بەڕاستی ئەدگارە قەومییە کوردەوارییەکە پشتگوێ نەخراوە.

مەسەلەیێکی دیکەی گرنگ لە بەرهەمی مستەفا شەوقیدا فەرهەنگی شیعرە. وشە و تەعبیری شاعیر پێوەندییان بەزمانی شیعری و زمانی ستانداردی ناوچەی موکریان و زمانی شیعری تورکی سەردەمی ژیانی شاعیر لە ئەستەمووڵدا هەیە. بەم جۆرە شیعری ڕەنگدانەوەی فەرهەنگی زمانی شیعری ناوچەی موکریان و بزووتنەوەی شیعری نوێی عوسمانی بوو. بێ گومان ئەمەیان لە ژێر کاریگەری ڕۆمانتیکی ئەورووپا دروست بووە و کۆواری «سەروەتی فونوون = ثروت فنون» مەیدانی بڵاوکردنەوەی بەرهەمی نوێخوازانی تورک بوو. ئیتر هەندێ لە شیعری مستەفا شەوقی وەک لاسایی شیعری عوسمانی دەکەونە بەرچاو، ئەوەی شاعیرانی ماوەی هەردوو جەنگی گێتیی سەدەی بیستەم لە کوردستانی باشوور نووری شێخ ساڵح و عەبدوڵڵا گۆران ناویان نابوو «شیعری لاسایی عوسمانی».



### پەخشانی مستەفا شەوقی

شیعری مستەفا شەوقی بەقەوارە کەمە، وتاری پەخشانی ئەدەبی و سیاسی و کۆمەڵایەتی کەمترە. زۆربەیان لە «هەتاوی کورد» (ئەستەمووڵ ١٩١٣) و لە «ژین» (ئەستەمووڵ ١٩١٨ - ١٩١٩) بڵاوکراونەتەوە.

پەخشانی ئەم شاعیرە شیعرییانەیە، هەندێ وێنەی ئەم بابەتە پەخشانانەی وەک «شیعری پەخشانی» یا «پەخشانە شیعر» دەکەونە بەرچاو. بۆ بەڵگە نموونەی ئەم جۆرە پەخشانانە لەم باسەدا دەخرێنە بەرگوێی خوێنەر.

### نموونەی شیعری مستەفا شەوقی

١

بەناوی «هاواری دایکێ» مستەفا شەوقی شیعرێکی هۆنیوەتەوە، لە پێشانا پێشەکییێکی پەخشانی قانگدراو بەهەناسەی ڕۆمانتیزمی بۆ شیعرەکە نووسیوە. ئەم کردەوەیە لە هەندێ شیعری تازەی عوسمانیدا دەبینرێ. نووسەر لە پەخشانەکەیدا دەڵێ:

«سبەینێکی زوو، هەوا سارد و ڕۆژ تازە سەری هێنابووە دەرێ. گوندێکی ڕووخاو لە دوورەوە، سەحراییێکی واسیع دەنێویدا، شەقامە ڕێییێک بۆ لای ڕۆژئاوایێ دەڕۆیی. لە قەراغ ڕێگاییێکی چۆمێ بەخوڕ دەهات. ڕووی سەحرا بەگیای شین کراسێکی مەخمەری لەبەر کردبوو. لەوێ کوردێکی جوان هەیکەل بەخەواڵوویی ڕاکشا بوو. لەسەر سەری بەسیماییێکی ماتەمداری و بەجەبینی ئەسیلی دەردەدار ژنێکی کوردی پیر بە ئەو مەقامانە خەریک بوو کە لە خەوی هەڵستێنێ».

ئینجا مستەفا شەوقی لە شیعرەکەیدا دەڵێ:

لە تەئسیری فسوونی ڕۆژی تابان عالەمی شۆری
مەگەر تۆ چاوەکانم میری کوردان هێشتا مەخمووری
لە ناو بالنجی خەو ساتێ هەڵێنە سەر تەماشاکە
لە مێرگوڵان دەخوێنن بولبولی شەیدا بەڕەنجووری
بەهار هات و وەنەشئەی بای وەعدەیە عومرم تەماشاکە
لەبەر ماڵی وەسیعی موڵکی بابت دەنگی سەمتووری

سەدای هات و نەهاتە و دەنگی زەنگوڵ قۆڕی کاروانە
کە یارت کۆچی کرد و دەستەداوێن هێشتە مەهجووری
چلۆن سەبری دەکەی گەر یاری تۆ بدزن لە ماڵی تۆ
لە نێو بێگانەکان تەشهیر بکەن نێو بەندی بەر مووری
ئەگەرچی سەبری سیس وەک برایمۆکی وەبن مابووی
کرێوە بەفری زستانی تەواو عومری بەسەر بووری
وەکی باپیرە گەورەت حیفزی نامووست لەسەر شەرتە
کە دایکت پیر و خوشکت مرد و ماڵت چوو لە خاپووری
بەمسکینی مەڵێ دەستم بەزنجیری سەخت بەستراوە
کە ئەو زنجیرە وەهمە و دەیپسێنێ چونکە پڕ زووری
بەڵێ زنجیری دەستت جەهل و غەفلەت بوو ڕەقیبی تۆ
بەئەفسوون بەستی قۆڵت چونکە زانی مەست و مەسحووری
ئەویستا تا لە یێنجەی ڕۆژهەڵات تاو هەڵات ڕابە!
بەئازایی نەجات دە دەستی بەستراووت کە مەغدووری
سەڵاحی کاری تۆ سەعیە و ئەمەل بابی نیگەبانت
بەڕووناکی چرای عەزمت بڕۆ بۆ شاری شاپووری
دە ژینێ حەقی خۆت سابیت بکە بۆ یار و ئەغیاران
بەدەستر بسترە فرمێسکی (شەوقی) و چاوی بێ نووری
بەبێ تۆ کەلهوڕ و سۆران و موکری و مولکی بابان زار
لە کیژی بەختیاری چونکە مەستی ئەوڕۆ لێت تۆری

مستەفا شەوقی بەخەیاڵ دیمەنێکی کوردستانی دروست کردووە. لایێکی جوانە دیمەنی ڕاستی سروشتی ئەو وڵاتە ڕەنگینەیە، لایەکەی دیکەی وێران و ڕووخاوە لە گوندێکدا بەدی دەکرێ. لاوێک لە ناو ئەم سروشتەدا خەوی لێ کەوتووە. ئەمەیان میللەتی کوردە، لەو لاوە پیرێژنێک دەبینرێ ئەمەیان دایکی کوردستانە، بەم شیعرە پڕ لە سۆز و وێنەی ڕەوانبێژییە کە ئامۆژگارییێکی دانایانەیە شاعیر بەزمانی کوردستانەوە لە کوردی دەگەیەنێ.



٢

شاعیر لە قەسیدەیێکی درێژ بەناوی «تەحەسسوری جەوانی و تەرانەیی وەتەن» داستانێکی شیعری دروست کردووە وەکو خۆی دەڵێ ئاهی قووڵ دەکێشێ بۆ ڕۆژگارانی لاویەتی و سروود بۆ نیشتمان دەچڕێ. شیعرەکە بەم دێڕانە دەست پێ دەکا:

بەبێ تۆ عالەمی دڵ غەرقی دەریای یەئس و حیرمانە
تەماشاکە شەپۆل ئەوڕۆ چلۆن سەرڕێژی چاوانە
عەجەب تۆفان دەرە حیسسی شەبابم هەڵدەچێ دایم
لە قەلبی پڕ خرۆش ئەسرینی چاوم لەعلی ڕوممانە
دە ئافاقی ئەمەل ئەوڕۆ سەرابە وەسڵی تۆ دوورە
لە بۆیە فەلسەفەی ژینێ لە بۆ من بۆتە ئەفسانە
جەوانی و نەشئە وو شەوقی حەیاتم بێ تۆ بەربادە
بەهار ڕابرد و هاوین هات و پاییز وەختی زستانە
خولاسەی مەقسەدی من زولفی کاڵ بوو بۆیە لێم گێژە
سەراپا فیکر و حیسسم میسلی زولفی خاوی جانانە
لە شربان و وەریدی جیسمی فانی من وەکو خوێن
مەلالی چاوی مەخموورت دەکا دەوران و سەیرانە
بەڵێ حەللاجم و ئەوڕۆ ئەسیری ڕەنگی بێ ڕەنگم
بەسەودای تۆوە مەستم چونکە چاوت داویە پەیمانە
ئەسیری حوسنی تۆ چۆن موعکیسولئەنواری لاهووتە
لە تاریکی ووجوود و کونجی ناسووت ڕۆژی تابانە

شاعیر ئامۆژگارییە دانایییەکانی بۆ کەسێک دەگێڕێتەوە، ئەو کەسە یەکێک نییە، بەڵکو ڕەمزی دوو شتە، نیشتمان و دلبەر. ئەو خۆشەویستەش بەڕاستی بوونی نییە، شاعیر دروستی کردووە، هەردوو خۆشەویستی شاعیر لە ناو یەکتریدا تواونەتەوە و بوون بەیەک.

مستەفا شەوقی هەڵوێستێکی سۆفیزمیانەی دروست کردووە، خۆشەویستی گەیاندۆتە پلەی کردگار، پەنای بۆ مەنسووری هەلاج بردووە کەی دەگاتە ئەو ئامانجەی عەودالییەتی!

ئەگەر بەحسێبی رووداو بێ قەت نایگاتێ. دەبێ ڕەشبینی شاعیر گەیشتبێتە ئەو ڕادەیەی ئەویش ناگاتە کردگارەکەی خۆی کە سەربەستیی ئەو نیشتمانەیە و لە پەیکەری ئەو دلبەرە نازەنینەدا دەیبینێ!

شاعیر لە قەسیدەکەیدا بەردەوام دەبێ:

چرای فیکرم لەوێ دایم دەکاتن ئیقتیباسی نوور
میسالی پیری مەیخۆران لە جامی لەعلی مەیخانە
لە سەحرای مێرغوزاری عالەمی ئەرواحی عیللییین
شەهێن شەهـ بوو خەیاڵی فیکری سەربازم تاقانە
موحیتەی من فەلەک بوو ئەوجی قودسییەت نیشانی دڵ
مونەززەه بووم لە پابەندی فسوونی جیسم و خومخانە
کە تەقدیری ئەزەل وا هات ئەسیری چاوی جادووت بم
دە سجنی تەبعی چواران ڕووحی پاکم بەندی زیندانە
چلۆن تەبعی بەشەر مەخلووتی خاکی پاکی تینت بوو
هوبووتی کردووە فیکر و ڕوحم هاتە هێلانە
لە نێو دونیایی خاڵی هەڵبژاردەی پاشی تەدقیقە
لە جەرگەی ئاسیادا مەئمەن و مەئوایی شاهانە
چەمەن شێن و سەمەن خۆشبێن و دایم مەستی ئەزهارە
بەشاخ و داخ و چۆم و کانیەکان سەر تاقی ئێرانە

شاعیر بەلەش لە وڵاتی بێگانەیە، لە دەرەوەی نیشتمان، لە ئەستەموڵە، بەڵام بەگیان لە نیشتمانە. وەرە وردە داناییە سۆفیزمییەکانی دەمێک لەگەڵ ئەوە (دلبەر)، دەمێکی دیکە لەگەڵ ئەوێیە (کوردستان). ئەم نیشتمانە لە ئاسیایە، مەڵبەندی شاهانە، بەسروشت گوڵ و شاخ و داخ و کانی جۆگەلەکانی جوانترین بەشێکی ئێرانە. بێ گومان مەبەسی شاعیر لە ئێران زاراوەی جوگرافییە، ئێرانی کۆن، خاکێکی پان و بەرینی باشووری زەریای خەزەر و تورکستان (وڵاتی تۆران) کە ئێستاکە هەموو ئێران و ئەفغانستان و پاکستان و هەموو کوردستانی گەورە دەگرێتەوە. مەبەس لە زاراوەی ئێران فارس نییە.



مستەفا شەوقی بەم دێڕانە کۆتایی بەشیعرەکەی دێنێ:

لەوێ دایم دەنۆشی بادەیی سەودا سەبەینان زوو
بەپیاڵەی چاوی نێرگس بولبولی ئاشوفتە جەررانە
لەوێ تێراو دەبێ خولیای جوانی و ڕووحی غەمگینان
ئوفوولی ئەرغەوانی ڕۆژووی پاش مانگی تابانە
لە خاکی پاکی وی لانکە لە بۆ ئیسقانی باپیرمان
لەسەر قەبری جەوانان دیدەیی شلڵێرە گریانە
تەماشای هەر قەدی داری مەکە ئەورۆ بەگیان سەختی
کە ئەو شینایە یادگاری قەدیمی دایکی کوردانە
لەوێ ئەورۆ بەبێ تۆ دەردەدارە دایکی سەرشێنت
بەبێ تۆ دەسگیرانت فاتە چاو جوان دیدە گریانە
ئەوێ مولکی قەدیم و مەوتینی ئەجدادی پێشووتە
بەمەردی مەیرووخێنە چون حەریمی مولکی بابانە
بەعیلم و مەعریفەت تێراو بکە فیکری جەوانیت تا
دەگەڵ (شەوقی) بەجووتە موتتەفیق بن مەرد و مەردانە

لەوێ لە کوردستان گیانی غەمگینمان دەحەسێتەوە، گۆڕی باب و باپیران و لاوانمان لەوێیە، یادگاری دایکی نیشتمان لەوێیە. ئینجا شاعیر بۆ خۆی دەلاوێنێتەوە و دەڵێ: لەوێ لەبەر دووری تۆ دایک دەردەدارە، فاتە (فاتمە)ی دەسگیرانی چاو جوان فرمێسک لە چاویدا قەتیس ماوە. ئەوێ ماڵی قەدیمی تۆیە، نیشتمانی باپیرانی پێشووتە، ڕەمزی بابانە، بەزانست و زانیاری نەبێ پێش ناکەوێ.

## ۳

لە شیعرێکی دیکەیدا مستەفا شەوقی یادی نیشتمان دەکاتەوە:

خەمڵیوە لەسەر قەبری جەوانان گوڵ و لاڵە
یا سووریی خوێنە کە بەڵێ ڕەنگەکی ئاڵە
پێش تابیشی خورشیدی فەلەک وەختی بەهاران
وەک چاو لە فرمێسکی منە قەترەیی ژاڵە

ئەی بادی سەبا هەستە گوزەرکە بەوەتەندا
پەخشان بکە سەر ئەرزی وەتەن بۆنی گولاڵە
با بێت و بەتەئسیری فسوونی نەفەسی تۆ
وەک غونچە بپشکوێ دەمی ئەو کوردە کەلاڵە
با بێت و سبەینان ئەلەم دەردی شەوی هەجر
بێژی کە لەوێ پاش خەوی مە مەحزی وەباڵە
قەهری فەلەک و جەوری ڕەقیب و ستەمی دۆست
سەر ناسیەیی پڕ شکەنی کرد بە قەبالە
چارەت نییە ئەوڕۆکە ئەتۆ دەستە شکاوی
بەدمەستیی مەی بوو کە شکا جام و پیاڵە
(شەوقی) وەرە لەو غوربەتە مائیل بەوەتەن بە
بێ خاکی وەتەن عیززەتی تۆ مەحزی خەیاڵە
بەو کاکۆڵی ڕەش ڕەنگە کەوا وەزی فیراقە
با ڕام بێ لە بۆت فەزڵ و هونەر چونکە حەڵاڵە

ئەم شیعرە لە دەروونێکی هەڵقرچاوی دوور لە نیشتمان هاتۆتە دەرێ. بزووتنەوەی سروشت بۆ دڵشکاوی و غەم و پەژارەی دوور وڵاتی بەکار هاتووە. گوڵ لەسەر گۆڕی لاوان شین بووە، دڵۆپی خوناو فرمێسکی چاوە. ئەوجا شاعیر دیمەن وەردەگێڕێ، لە ڕەشبینییەوە، دەیکا بەگەشبینی. لە دواییشدا مەبەس و ئارەزووی مستەفا شەوقی لەم شیعرەدا لەوە دەردەکەوێ کە بەخۆی دەڵێ: لە ئاوارەیی خۆت ڕزگار بکە و بگەڕێوە نیشتمان، لە ئەستەموولەوە بۆ سابڵاغ (مەهاباد).

٤

لە ناو بەرهەمی ئەدەبی مستەفا شەوقی شیعری غەزەل ئاسایی بەدەگمەن بەرچاو دەکەوێ، لە یەکێکیاندا دەڵێ:

بۆچ دەناڵێنی لەسەر لێووت لە بۆچ بار کەوتووە
لەشکری زولفت کە خاو و کاڵە بۆچ ڕووی گرتووە
ئاهی تۆ وەک بای سمووم بوو هات و قەلبی دادڕیم
ئەی فەلەک گڕ پێت کەوێ ئەوجارە بۆچ وەت کردووە



چەندە مەحبووبە لەسەر ئەندامی سەرووت جلکی ڕەش
تۆ بەفرمێسکی خوێن بەو ڕەنگە ڕووت بۆ شوشتووە
ڕەنگی تۆ خۆ زەردە زولفت کاڵە قامەت مامەشی
یا لە نێو پایتەختی ڕۆمی سوێسنە و پشکووتووە
چاوەکانت کەیلی فرمێسکە لە تیژی ماتەمان
میسلی شیعرای ئەوجی ئاسمانی سیحر دەرکەوتووە
چارشەو و دەسماڵی تۆ شەرحە لە بۆ تاریکەشەو
من دە عومرم مانگ دە نێو تاریکەشەو نەمبیستووە
دەست و پەنجەت چەندە نەرمە مەرهەمی دەردی دڵە
لێم گەڕێ با ماچی کەم بەختی جەوانیم خەوتووە
لێم گەڕێ ئەوڕۆ بەدەسماڵی حەریر بێم بیسترم
دانەیی مرواری فرمێسکت هەتیو هەڵکەوتووە
دابنێ سەر قەلبی زارم ئەو سەرەی پڕ جۆشی خۆت
هەم بەلایلایەی دڵم بنوە زەمانی هاتووە
قەلبی (شەوقی) چون حەریمی عیشقە جێی دێرینەتە
بۆچ دەناڵێنی لەسەر لێووت لە بۆچ بار کەوتووە!

ئەم لیریکە وەسفێکی ڕووکەشی دلبەرە، ئەو یارە لە پایتەختی وڵاتی ڕۆم ئەستەموول دەژی. نازانرێ ئەو کچە جوانە کوردە یا تورکە، بەڵام ئەوەندە هەیە کە وەسفی بەژن و باڵای دەکا بەکەناچەی مامەشانی دەچوێنێ چونکە بەلای شاعیرەوە کچانی عەشیرەتی مامەشی دەوروبەری سابڵاغ (مەهاباد) لە باڵا بەرزیدا جوانترین کیژانی سەر ڕووی زەوین. وەک دیارە لەم غەزەلە ئاساییەدا کە تایبەتییە بەوەسفی جوانی دلبەر شاعیر یادی نیشتمانی خۆی هەمیشە لە دڵ و دەروونیدا پاراستووە و وەسفێکی جوانی لەمەڕ نەتەوەی خۆی لە شیعرێکدا دەربڕیوە هیچ پێوەندییێکی بەنەتەوەکەیەوە نییە.

## ٥

له شیعری پێشوودا نەزانراوە دلبەری شاعیر کوردە یا بێگانەیە، کەچی لەم شیعرەدا نەژادی ئاشکرا دەکا و دەڵێ تورکە:

فیدای چاوت عەزیزم ئەورۆکە حاڵم پەرێشانە
لە دووری تۆ دوو دیدەم غەرقی خوێنە بەحری عوممانە
عەجەب گریە دڵم نادا هەوا شەوگاری تەنیایی
نەباتی قەندی لێوی تۆ دەوای بێچارەی زمانە
بەناز ساتێ وەرە دەستێ بنێ سەر قەلبی مەجرووحم
خەناوی بێ بەسووری پەنجەکانت ڕەنگ وە مەرجانە
ئەگەرچی تۆ لە قەوم خوێش نیهاد و پاک و بێ باکی
بەڵام جانم لە ماڵەنگۆیە وا چەند ساڵە میهمانە
زمانت چونکە نازانی بەهێما شەرحی حاڵی کرد
کەبابە جەرگی من بیبە هەناسەم بۆنی بریانە
تەبەسسوم کە وەدەرخە موعجیزەی بۆ عالەمی ئەورۆ
لە حوقە شەکرەزارت لێو و لەعلت کانی دندانە
نیقابی ڕووت دەبینی کون کونە وەک قەلبی خوێنینم
بەڵا خۆ شاهیدی سیدقە کە مەجرای تیری موژگانە
دەڕێژن هەر وەکو زولفی سیاهت ماشا بەربووینە
کە قوببەی سینەیی سافت دوکان و باغی سێوانە
لە سەیرانگاهی گوڵخانە کە هاتی ڕۆژی پێنج شەمبە
بتی مەخمووری چاوت شەققی کرد سەد تاق و کاشانە
دڵت بەستم بەئەفسوون ئەی کچی ڕۆمی چ فەتتانی
مەگەر دایکت ئەتۆی نێونا لە بۆ تەلبیس و ئەفسانە
وەکو ئاهووی خەتا گەرچی ئەتۆ نارۆی لە پێش عاشق
خەتایی چاوی سەییادە کە بولبول نانە هێلانە
وە فیکری شار لە ژێر داری گوڵی تەر وە چەمەن ڕۆژێک
دوو لێوم بادەیی لەعلی لەبی تۆی برد نە پەیمانە



مەلاحەت خەتمە سەر تۆ گەرچی وەک نێوت لە چاو دووری
لە بۆ (شەوقی) دوو کولمی پڕ فسوونت تازە دیوانە

ئەم شیعرە موناجاتێکی ئاشقانەیە مستەفا شەوقی لەگەڵ کیژێکی دەکا، کورد نییە تورکە، لە دڵداریی سەرزەمینیدا گیانی نەتەوەیی لە گۆڕێ نابێ و سۆزی مرۆڤایەتی هەست دەبزوێنێ. شاعیر داوا لەو نیگارە نازەنینە دەکا بەزەیی بێتەوە چونکە گرفتاری بووە، پێی دەڵێ: ئەگەرچی بەنەژاد و بنەچە من لە ئێوە نیم، بەڵام گیانم لە ماڵی ئێوەیە و چەند ساڵە میوانم. ئینجا دەکەوێتە وەسفی ئەندام و بزووتنەوە و ناز و نیازی.

شاعیر ئەم دلبەرەی لە سەیرانگای گوڵخانە لە ئەستەمووڵ دیوە و دڵی بردووە، بەلای شاعیرەوە گێتیی جوانی بەم کیژە تورکە خەتم بووە و جوان لە دوای ئەودا نییە.

## ٦

لە کاتێکدا لە ساڵی ١٩١٩ مستەفا شەوقی لە شاری مووسڵ بووە یادی داگیرکردنی شاری سابڵاغ (مەهاباد)ی کردووە لە لایەن سوپای ڕووسەوە. ئەو ڕووداوە لە ناو کورداندا بە«قەتل و عامی ڕووسان لە سابڵاغێ»دا بەناوبانگە. لە بڕێکی شیعرەکەدا شاعیر دەڵێ:

وەرە تا شەرحی ئەحواڵی دڵی خۆمت لە بۆ بێژم
وەرە تا من بەفرمێسکم بشۆم بۆت پەردەیی تاری
عەلیموڵڵا لە پاش تەشریف و چوونی تۆ لە سابڵاغێ
وەتەن وێران و ماڵ سووتاوە وە کیژ بێ لاو و خوێن باری
دەنێو مێرگوڵەکاندا سووسنی زەرد و هەڵاڵەی سوور
لە باغ و باغچەکاندا بولبولی شەیدا وو پاساری
بەزوڵم و جەوری دوژمن بوو بەهاریان زەردە پاییزێک
لە بێ ڕەحمیی و دڵ سەختی بەباریان بار لە لێو باری
لە ئاغایان و ئەشراف و مەلایان کەس نەما ئەورۆ
لەسەر ئەنقازی ماڵیان خۆ دەخوێنێ کوند بەبێعاری
لەوەی پێش من کە دەمگوت ئەی براکان غەفلەتو بەس بێ
جەفات فەرموو وە تەعنەت دا کە (شەوقی) بۆچی بازاڕی

شاعیر لێرەدا زۆر بەنەرمی و ڕۆمانتیکییانە باس لە کارەساتی هێرشی ڕووس بۆ سەر

مەهاباد دەکا. خۆی کردووە بەزمانی حاڵی نیشتمان. دەڵێ لە دوای ئاوارەبوونی تۆ وڵاتی بێ تۆیی وێران بوو. لاوان کوژران و لە دەزگیرانیان دابڕان هەتا هەتایی، کچان بەبێ دڵدار مانەوە، گوڵ و گوڵاو و بولبول و پاساری بەهاریان لێ بوو بەپاییز، خەڵکی ناو شار بەگەورە و بچووک و هەژار و دەوڵەمەندەوە لەناوچوون.

## ٧

بۆ کۆمەڵی «هیڤی» لە شیعرێکیدا مستەفا شەوقی دەڵێ:

هەڵستاوون جەوانانی وەتەن دیسان بەبێ باکی
لە حەسرەت دەوری کۆنە مولکی بابیان هاتنە چالاکی
دە دڵ عەزم و لە سەرشۆڕی جەوانی و هاتوو دەخوازن
کە بڕژێنن لەسەر خاکی وەتەن خوێنیان بەسەرپاکی
بلا تێراو بێ بەو خوێنە سوورەگوڵ لە مێرگوڵان
بەشوعلەی نووری ئومێدیان وەتەن با بێتە ڕووناکی
وەتەن ئەی مولکی باپیرم لە بۆچ ئەورۆکە رووخاوی
لە بۆچ جێی مەسکەنی وەحش و تویوورە خاکەکەی پاکی
لە بۆچ ئەولادی تۆ یەعنی برازا و مام و جیرانم
غەمی باپیرە گەورە و خوشکە ڕۆ و باوکە خۆ دایکی
لە ژێر کابووسی جەهل و کۆتی یەخسیری دەناڵێنن
سەراپا پۆشەکی ڕەش جلکی ماتەم دەبەر پاکی
لە غوربەت لاوی کوردان بۆ نیگایی وەسڵی تۆ مەحزوون
شەو و ڕۆژ ناسرەوون بۆ شەهدی شیرین ژەهرە تریاکی
لەسەر شاخی بلند و مێرگی شینی تۆ بلا ڕابن
بەشۆری دڵ بخوێنن بولبولان ئەورۆ بەغەمناکی
وڵات و شاری مە خۆشە بەلا حەیفە کە وێرانە
لە بۆ چاوی بەفرمێسکی جەوانان سورمەیە خاکی
زمانی کوردی شیرینە و هەواری ئێمە ڕەنگینە
بەلا چونکە هەموومان دوژمنین زۆر سەعبە ئیدراکی



نیفاقی مە گوناهێکی عەزیمە جا ئۆبالی وی
بەگەردەن شێخ و ئاغا وو مەلا وو دەست و سیواکی
لە نێو جوانان دە پێشدا (شەوقی)ی بێچارە ویستاوە
بەنووری حوببی مەوتین دڵ فرووزە و هاتە ڕووناکی
لە ڕێگای دەوری «هیوی» یەعنی ئومێد دەست بەدەست دەگرن
بەعیلم و مەعریفەت تێراو بکەین جا خاکەکەی پاکی

شاعیر ئەوە باش دەزانێ دواکەوتوویی کورد لە گێتیی تاریکستانی نەخوێندەواری بەخوێندەواری نەبێ وەرناگەڕێتە سەر گێتیی رووناکستانی پێشکەوتوو. کۆمەڵەی هیڤی (هیوی، هیوا) ڕێکخراوێک بوو بەناوی قوتابیانەوە لە ئەستەمووڵ، بەڵام ناوەرۆکی تەنیا ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی نەبوو، بەڵکو لە بنج و بناوانا سیاسی بوو. لەبەرئەوە خزمەتێکی گەورەی بزووتنەوەی ڕزگاریی نەتەوەی کوردی کرد بەتایبەتی بایەخدان بەبڵاوکردنەوەی چاپەمەنی کە بووە هۆی فراوانکردنی ئاسۆی بیری لاوان و پێشخستنی زمانی کوردی.

***

مستەفا شەوقی کوردی کوڕی سابڵاغی موکریان پزیشک و ڕۆشنبیر و سیاسی و شاعیر و نووسەر بوو. لە سابڵاغ چاوی بەژیان ڕوون بوو، بەشێکی زیندەگانیی بەرایی لەوێ بردبووە سەر، ئینجا ئەستەمووڵ و ئەڵمانیا، لە دواییدا جارێکی دیکە گەڕایەوە ئەستەمووڵ و لەوێ نیشتەجێ بوو. باڵیۆزی کوردی ئێران بوو لە لای براکانی خۆی لە کوردانی عوسمانی و تورکیا.

ئەو شیعرە کەمەی بۆ نەتەوەکەی بەجێ هێشتووە بۆنی تایبەتیی خۆی هەیە. مستەفا شەوقی لە شیعری کلاسیکیی نالی و ڕۆمانتیکی ئەوروپایی و شیعری نوێی عوسمانی و دیالێکتی ناوچەیی (موکریانی کرمانجیی باشوور) شیعرێکی نوێی کوردی داهێناوە. ناوەرۆکی شیعری ئاساییە، وەک لیریکێکی ئەوروپاییانەی تێکەڵ بەغەزەلی شیعری ئیسلامەوی ڕۆژهەڵاتە. وێڵی دوو دیاردەی ژیانە. یەکێکیان «کچی جوانی تواوەی ناو سروشت» ئەوی دیکەیان «کوردایەتی»، هەردووکیانی تێکەڵ بەیەکتری کردووە و لیریکێکی نوێی کوردی لێ دروست کردووە. مستەفا شەوقی یەکێکە لە شاعیرە داهێنەرەکانی کورد.

## بەشی هەشتەم

## میرزا غەفوور

**۱۸۷۰ – ۱۹۳۸**

### ژیانی شاعیر

غەفوور کوڕی حاجی عومەری حاجی عەباس باپیری لە قەڵاچۆڵانەوە بەخێزانەوە باری کردووە و هاتۆتە سلێمانی و لە شاری تازە نیشتەجێ بووە. غەفوور لە ساڵی ۱۸۷۰ لە گەڕەکی سەرشەقام لە سلێمانی لە دایک بووە. خوێندنی سەرەتایی لە حوجرەی خواجە ئەفەندیی ناودار بردۆتە سەر. پیرەمێرد یەکێ بووە لەو شاگردانەی هاوڕێی خوێندنی سەرەتایی. قۆناغێکی زۆری لە خوێندنی حوجرە بڕیوە، بەڵام تەواوی نەکردووە، لەبەرئەوە لە پاشانا نەبووە بەمەلا و بەمیرزا ناوی دەرکردووە. ئەم ناوە بۆ ئەو خوێندەوارانە بەکار دەهێنرا کە بەرنامەی خوێندنی مەلایەتییان تەواو نەدەکرد. بەم جۆرە شاعیری داواڕۆژ بەمیرزا غەفوور ناوبانگی دەرکرد. لە دواییدا «میرزا»ی کرد بەنازناوی شیعری، هەندێ جاریش «خاڵە میرزا» و «میرزا غەفوور»ی بەکار هێناوە.

لە تەمەنی لاویەتیدا لە ساڵی ۱۸۹۵ کە دەوڵەتی عوسمانی تیپی سوپای حەمیدییەی دروست کرد میرزا غەفوور تێیدا بوو بەسەرباز بەپلەی باش چاوەش. بەسەربازی چوو بۆ بەغدا و ماوەیێک لەوێ مایەوە ئینجا گەڕایەوە سلێمانی و خەریکی یارمەتیدانی باوکی بوو لە کڕین و فرۆشتنی تووتن. لەم کارەدا مایەوە تا سەفەر بەرلک (جەنگی یەکەمی گێتی ۱۹۱٤). لە ڕەشبگیرییەکەی ئەو جەنگە بەناوی غەزاوە میرزا غەفووریان گرت و کردیان بەسەرباز لە سوپای عوسمانی و ڕەوانەی مەیدانی جەنگیان کرد لە قوڵی (جەبهەی) میاندواو و سابڵاغ (مەهاباد). بەشداری لە جەنگی ڕووس و عوسمانی کرد تا ڕووخانی سەڵتەنەت لەوێ مایەوە ئینجا گەڕایەوە بۆ سلێمانی.

ماوەیێکی زۆر میرزا غەفوور لە پشدەر ژیاوە. بەهۆی خوێندەواری و قەڵەمبێنی کاری مووچەخۆری و سکرتێری لە کارگێڕی دەوڵەتدا کردووە. لەو سەردەمەی بابەکری سەلیم ئاغای پشدەر لە لایەن ئینگلیزەوە کرابوو بەکارگێڕی پشدەر میرزا غەفوور بەسکرتێری تایبەتی لای ئەو دامەزرا. هەروەها کە پیرۆت ئاغای پشدەریش کرا بەکارگێڕی ناحیەی



مەرگە میرزا غەفوور بوو بەکاتبی ناحیە. ماوەیێکیش کاتبی کارگێڕی ماڵ (مودیری ماڵ) بووە، ئەوجا لە ئیشوکاری دەوڵەت دوور کەوتۆتەوە و دیسانەوە گەڕاوەتەوە سەر کارە کۆنەکەی خۆی و خەریکی ئاڵوێری تووتن بۆتەوە.

میرزا غەفوور یەکێک بووە لەوانەی زۆرینەی بەرهەمی شیعری خۆیان بۆ ستایشی بنەماڵەی شێخ مەحموود تەرخان کردووە. گومان لەوەدا نییە ئەو خۆشەویستییەی شاعیر بەرامبەر ئەم خانەوادەیە بووە بەڕەمز لە کاکە ئەحمەدی شێخەوە وەک شێخێکی گەورەی تەریقەتی قادری دەست پێ دەکا تا هەموو ڕەمزەکانی ئەو تەریقەتە لە شێخ عەبدولقادری گەیلانییەوە تا شێخ مارفی نۆدێ و منداڵەکانی تا دەگاتە شێخ مەحموود. ئەمانە هەموویان پیرۆزن لە لای شاعیر. هەرچی گیانی کوردایەتیشە لای میرزا غەفوور دیسانەوە پێوەندی بەشێخ مەحموودەوە هەیە، لە پێشانا وەک دەروێشێکی نەوەی کاکە ئەحمەد و لە دواییدا وەک سیاسییێک و بوونی بەمەلیک، واتە شێخ بوو بەسەرچاوەی خولقاندنی بیری کوردایەتی لە ناو فیکری شاعیردا.

لە ساڵی ۱۹۳٦ میرزا غەفوور بەیەکجاری لە مەرگەی پشدەرەوە گەڕاوەتەوە سلێمانی و لە ۳ی مارتی ۱۹۳۸ کۆچی دوایی کردووە و لە گۆڕستانی گردی سەیوان نێژراوە.

### شیعری میرزا غەفوور

### لە ڕووی ڕوخسارەوە

دیوانی میرزا غەفوور نموونەی شیعری کلاسیکی پاراستووە، لە ڕووی ڕوخسارەوە لە چوارچێوەی ئەو جۆرە شیعرانە نەچۆتە دەرەوە. زمان و کێش و قافیە و مەرجەکانی شیعری کۆنی تا ڕادەیێک وەکو خۆیانی هێشتۆتەوە.

#### کێشی شیعری

لە بەحرەکانی عەرووز تەنیا پێنجیانی بەکار هێناوە لە بەحرە سووکەکانی وەکو هەزەج و ڕەمەل و خەفیف و موزاریع و ڕەجەز. زۆربەی شیعری لەسەر بەحری هەزەج و ڕەمەلن، دوو سێیێکیان لەسەر بەحری خەفیف و لەویش کەمتر لەسەر بەحری ڕەجەزن.

میرزا غەفوور دەنگە سووکەکانی ئەلفوبێی کوردی بەکار هێناوە وەکو: (ب، د، ر، ل، م، ن، وو، (ە – ـە)، ی، ێ). هەرچی دەنگە تایبەتییەکانی ئەلفوبێی عەرەبییە وەکو (ث، ص، ض،...) ئەمانەی لە قافیەدا بەکار نەهێناوە.

### پاش قافیەی شیعری

لە پاش قافیەدا ئەو وشانەی بەکار هێناوە کە لە دەنگە سووکەکانی ئەلفوبێی کوردی پێکهاتوون، وەکو: کرد، دڵ، ناکەم، بووم، تۆم، من، بوو، وەرە، بووە، نابێ، من.

### بابەتەکانی شیعری

لە شیعری میرزا غەفوور ئەم هونەرانە دەکەونە بەرچاو:

١- غەزەل: زۆربەی شیعری لەم بابەتەیە، واتە لیریکێک لە حەوت دێڕ تا دوازدە دێڕ پێکهاتووە.

٢- قەسیدە: ئەمەیان لیریکێکە لە دوازدە دێڕ زیاتر پێکهاتووە. ئەم جۆرە شیعرە لای شاعیر لە ئەوەی پێشوو کەمترە.

٣- قەسیدەی چوارین: شیعرێکە لەسەر سیستێمی کووپلە (بەند) دامەزراوە، هەر کووپلەی چوار نیوە دێڕ شیعرە لەسەر قافیەی (ا ا ا م، ب ب ب م، جـ جـ جـ م...).

٤- قەسیدەی شەشین: شیعرێکە وەکو ئەوەی پێشوو هەر کووپلەی شەش نیوە دێڕ شیعرە لەسەر قافیە (ا ا ا ا م م، ب ب ب ب م م، جـ جـ جـ جـ م م...).

٥- چوارین: کۆمەڵێک چوارینی هەیە لەسەر قافیەی ئاسایی (ا ا ب ا).

٦- تاک: چەند تاکێکیش لە دیوانیدا دەبینرێن.

٧- پێنج خشتەکی: جێ پەنجەی شاعیرە گەورەکانی باشووری کوردستان وەکو نالی و کوردی لە شیعری میرزا غەفووردا دیارە، بەڵام شاعیرانی دیکەی وەکو مەحوی و حەمدی و ڕوشدی جێی تایبەتییان هەبووە لە ناو دڵی و چەند شیعرێکی ئەمانەی کردووە بەپێنج خشتەکی.





### لە ڕووی ناوەڕۆکەوە

ئەگەر میرزا غەفوور لە ڕوخساری شیعری کوردی کلاسیکی تازەکردنەوەیێکی ئەوتۆی نەبێ، بەشی نوێکردنەوەی شیعر لە ڕووی ناوەڕۆکەوە لای شاعیر زیاترە. بەشە گرنگەکانی شیعری کلاسیکی پاراستووە، تازەگەرییەکەی ڕەنگدانەوەی کۆمەڵی ئەو سەردەمەیە کە تێیدا ژیاوە. ئەمەشیان گیانی نیشتمانپەروەری و کوردایەتی دەگرێتەوە. هەروەها هەندێ لایەنی ناگزووری کۆمەڵایەتی و بیرۆکراتییەتی مووچەخۆرانی میری و هەڵوێستی تورک و ئینگلیزی داگیرکەر و کار و کردەوەی خراپی دەرەبەگ و دەوڵەمەند و کاربەدەستان پیشان دەدا.

بابەت و هونەرەکانی بەرهەمی میرزا غەفوور لە ڕووی ناوەڕۆکەوە ئەمانەن:

١- دڵداری و وەسف: زۆرینەی شیعری میرزا غەفوور لە بابەت ئەڤینی و دڵداری شێوەی کلاسیکییە. دلبەرێکی دیاریکراوی نییە، بووکی شیعری بۆ خۆی دروست نەکردووە. دلبەری ئەو هەر ئەو کچە جوانەیە بێجگە لە خۆی کەس نازانێ کێیە! لەبەرئەوە وەسفی بۆ هەموو جوانێک دەشێ.

٢- ستایش و پێداهەڵدان: شیعری لەم بابەتەی لە دەوروبەری شێخ عەبدولقادری گەیلانی و بنەماڵەی کاک ئەحمەدی شێخ دەسووڕێتەوە تا دەگاتە شێخ مەحموود وەکو شێخ و دەروێشێکی تەریقەتی قادری و سیاسی و مەلیکی کوردستان ڕێزی لێ دەنێ.

٣- شێوەن و ماتەم: لەم جۆرە شیعرەی کەمە. شاعیر بۆ کەسانی شایانی ئەوە بن لە پاش مردن شیعری شێوەنی بۆ نووسیوون. لە بەرهەمیدا شیعری شێوەنی بەڕاداندراو بەرچاو ناکەوێ. ئەوەی هەیەتی لە گیانێکی پڕ لە سۆزەوە هەڵقوڵاوە بۆ دۆست و برادەرێکی خۆشەویست.

٤- داشۆرین: ئەم شێوە شیعرەی بۆ کاربەدەستانی دەوڵەت و مووچەخۆرانی میری بەکار هێناوە. هەندێ جار سێکس بووە بەسەرچاوە بۆ مەبەسی داشۆرین و شیعرێکی دروست کردووە ئەدگاری داشۆرین و شیعری کراوەی (ئیرۆتیکی) تێدا بووە.

٥- نیشتمانپەروەری و کوردایەتی و سیاسەت: ئەم جۆرە شیعرە لە سەرانسەری دیوانی شاعیر لە بەرچاوە. ڕاستە پارچە شیعری تایبەتی هەیە بۆ ئەم مەبەسە، بەڵام لە

زۆربەی بابەتەکانی شیعری دیکەشیدا تارمایی ئەم مەبەسە تازانە دەبینرێ.

٦- دانایی و پەند و ئامۆژگاری: میرزا غەفوور وەکو هەندێ لە شاعیرانی دیکەی کلاسیکی کورد خەریکی ئەو پەند و ئامۆژگارییانە بووە کە پێوەندییان بەبیری میتافیزیکی و فەلسەفەی کۆن و پەندی ئایینەکانی ئاسمانی و ئەوانی دیکەوە بووە. شاعیر توانیویەتی ئەو بیروبۆچوونانە بخاتە قاڵبی شیعرەوە و وێنەییێکی تری شیعری شاعیرانی پێشوو بخاتە ڕوو. بەتایبەتی لەم بابەتە شیعرەیدا شێخ عەبدولقادری گەیلانی و بنەماڵەی شێخ مەحموود قارەمانی سەرەکین.

## نموونەی شیعری میرزا غەفوور

### ١

لە شیعرێکیدا دەڵێ:

سەیری کە چ پڕ شۆڕش و ئەفغانە دڵی من
وەک توررەیی دڵدارە پەرێشانە دڵی من
عالەم هەموو مەسروورە لە سەیران و لە سەحرا
جەژنی منە شادیمە کە قوربانە دڵی من
نەورۆزە بەهارە فەرەح و شادییە عالەم
بەزمی منە قوربانی کەریمانە دڵی من
بولبول بەنەوا هات و دەڵێ گوڵشەنە جێگەم
بڕوانە لە ناو لالە وو ڕەیحانە دڵی من
ڕەنجی عەبەسە هەر کەسێ مایل بەچەمەن بێ
موشتاقی گوڵی عاریزی گەیلانە دڵی من
با خۆم بکوژم هەر وەکو فەرهاد بەتێشە
چەند خۆشە بڵێن کوشتەیی جانانە دڵی من
وا مەستە بەبادە و مەیی گوڵڕەنگی ڕوخی دۆست
تا ڕۆژی جەزا ساحیبی عینوانە دڵی من
مەخمووری شەراب و مەیی جام و قەدەحێکە
بەو نەشئە لەسەر تەختی سلێمانە دڵی من



پێم خۆشە ئەگەر دڵ وەکو پەروانە بسووتێ
چونکە لە ئەزەل ئەمری بەسووتانە دڵی من
وا خەرمەنی عومرم لە هەناسەی دڵ ئەسووتێ
تێفکرە بناغەی کە چ وێرانە دڵی من
مەجنوون چییە بێ باکە لە سەحرا وو بیابان
ئەو چونکە ئەزەل قیسمەتی کێوانە دڵی من
هەرچەند لە ئەزەل قیسمەتی من جەور و جەفایە
بەو حاڵەوە ئومێدی بەغوفرانە دڵی من
سائیل لە دەری بارەگەهی ئەحمەدە (میرزا)
لەو ساوە شوکور هەر وەکو سوڵتانە دڵی من

لەم شیعرە ڕەوان و پڕ لە زەمزەمەیەدا شاعیر هەندێ ڕەمز کۆ دەکاتەوە لەوانەیە نزیکایەتییان لەگەڵ مانای شیعرەکەدا نەبێ، بەڵام گیانێکی تازەیان لەبەر دەکا و لەگەڵ یەکترییان دەگونجێنێ. ئەو دەیەوێ بڵێ هەموو کەس شاد و گوشادن ئەو نەبێ، کەچی هەندێ جار لێی تێک دەچێ، بەڵام ڕیتم دەگاتە فریای و گوێی پێش بیر کاری خۆی دەکا.

لە شیعرێکی دیکەیدا دەڵێ:

ئەی موسوڵمانان عیلاجێکم بکەن شەیدایە دڵ
کوشتەیی خاڵی سیاه و پەرچەمی تاتایە دڵ
والەوو سەرگەشتەوو حەیرانم وەکو مەجنوون لە چۆڵ
عاشقی خاڵ و خەت و ڕوخساری مەه سیمایە دڵ
عیززەتی نەفس و حەیاتم بۆ نەماوە زەررەیێ
مەست و مەدهۆش و زەدەی تیری موژەی لەیلایە دڵ
چی لە گوڵشەن داوە هەر کەس فیکر و هۆشێکی ببێ
مایلی گوڵدەستەیی شاهی جیهان ئارایە دڵ
گەشت و گوڵزاری جیهان بێ سوودە عەیش و لەززەتی
بەستەیی بەند و کەمەندی موشفیقی مەولایە دڵ
ئارەزوو ناکەم مەتاع و ماڵی دونیای دوون پەرست
مایلی بادە و سوراحی و بادەیی سەهبایە دڵ

شێن و فەریادی سبەینانی هەدەر چوو عەندەلیب
خاڵە (میرزا)ش جانفیدایی کۆی شەهی بەغدایە دڵ

لە شیعری یەکەمدا میرزا غەفوور دوودڵ بوو، ڕستەی «دڵی من»ی کردبووە بەپاش قافیە و قارەمانی لیریکەکەی، بەڵام لەم شیعرەدا ئارەزووی ئەوەی کردووە خۆی وەکو دەروێشێک پیشان بدا لەوانەی تەریقەت لە خزمەت شەریعەت دادەنێن، لەبەرئەوە خەریکی کردگار و شەرابی یەزدانییە و هەمیشە شای بەغدا (شێخ عەبدولقادری گەیلانی) لە دڵ و دەروونی دایە لە بیری ناچێتەوە.

میرزا غەفوور شیعرێکی تایبەتی هەیە لەوەسفی بەهار، تێیدا دەڵێ:

بە بولبول مژدە بێ فەسڵی بەهارە
بە سەییادان کە وەختی کەو بووارە
بە قومریش هەم بەشارەت بێ لەمەولا
لە پای سەروا سەدای شینی هەزارە
ئەسەف بۆ حاڵەتی عاشق لەبەرچی
بەهار و پاییز و زستان خومارە
بەعوششاقان بڵێن با بەس بناڵن
زەمانەی عیشرەت و بۆس و کەنارە
لە سایەی ڕەحمەت و لوتفی ئیلاهی
کەژ و کێو دەشت و سەحرا لالە زارە
لە سۆزی ناتەبایی هۆز ئەگەرچی
دەروونم وەک تەنووری پڕ لە نارە
لە خۆشی فەسڵ و خۆشی وەسڵی یاران
کەلامی خاڵە (میرزا) زەڕنیگارە

لەم شیعرە بەهارییەدا لە پێشانا شاعیر قەشەنگی لە باڵندە دەنگخۆش و جوانەکاندا دیوە، وەک بولبول و کەو و قومری و هەزار (هەزار ڕاستە و «هوزار» هەڵەیە، ناوی بولبولێکە بەهەزار ئاواز دەخوێنێ)، ئینجا گوڵ و گوڵاڵە. بەهەناسەیێکی ئایینیانە لە دڵداری سەرزەمینی یا عیشقی مەجازی دەدوێ.



میرزا غەفوور شیعرێکی ڕوشدی کردووە بەپێنج خشتەکی، تیایدا دەڵێ:

ئەی شاعیری سەحرکار لە عالەم بەنیهانی
تۆی مەرهەمی ڕێشی جیگەر و ئافەتی جانی
خۆش لەهجە وو شیرین سوخەن و غونچە دەهانی
(مایەی فەرەحی ڕووح و دڵ و باعیسی مانی
غیلمانی بەهەشتی گوڵی گوڵزاری جینانی)
وەک کۆتری یاهوو دەگەڕێی بێ سەر و سامان
قومری سیفەت و سایەهوما کەبکی خەرامان
(نووری) لە فیراقت هەموو دەم زار و غەزەلخوان
(مومتاز و جەلابەخشی لە ناو کۆمەڵی خووبان
ساحیب هونەر و جەوهەری وەک تیغی دەبانی)
وەک نافەیی تاتار لەگەڵ بادی سەبا دێت
یا عەتری هەناسەی نەفەسی یارە لە کوێ دێت
ئاهوو ڕەووشی بەسیە هەتاکەی چ قەدەر بێت
(وەختی کە لە من سڵ دەکەی و غەمزە بەری دێت
بیعەینی دەڵێی ئاسکەکەی دەشتی مەقانی)
سەرمایەیی جان و دڵی بێواری منی تۆ
بۆ نەقدی حەیاتم کە خەریداری منی تۆ
سەرکردەیی خووبانیی و سالاری منی تۆ
(لوقمانی دڵی خەستە وو بیماری منی تۆ
دەرمانی هەموو دەردی عەسای پیر و جەوانی)
بێچارە کەسێکم نییە کەس بێ بەدەلیلم
میحنەت زەدە وو خەستە پەرێشان و عەلیلم
هاتوومە دەخالەت لە دەسی تۆوە دەخیلم
(خاکی قەدەمت سورمەیە بۆ چاری زەلیلم
بۆ ئاگری عەشقی دڵی من ئاوی ڕەوانی)

ئاشفتە دڵی شور و خەیاڵی نەفەسی تۆم
تۆ مەعدەنی شەهد و شەکری من مەگەسی تۆم
تۆ گوڵبونی بیستانیی و منی خار و خەسی تۆم
(کوژراوی دەمی خەنجەری بۆرانی دەمی تۆم
قوربان ئەوە مەعلوومە چ حاجەت بەبەیانی)

بێ بەرگ و نەوا مامەوە ئاخر چ دەقەومێ
بێ روویی دڵ ئارامەوە ئاخر چ دەقەومێ
عەیشێکی کە دیم دامەوە ئاخر چ دەقەومێ
(بێ نەشئە ئەوا مامەوە ئاخر چ دەقەومێ
ساقی قەدەحێ بێنە لەگەڵ ماچی لە بانی)

مژدەم بدەنێ وەعدەیی دیداری قەریبە
دڵ لەتلەتە ئاوارە وو موحتاجی تەبیبە
هەرچەندە کە عاشق غەم و هیجرانی نەسیبە
(ڕەحمێ بکە بەم عاشقە بێ چارە غەریبە
کەڵکی نییە ڕەحمت کە نەما وەخت و زمانی)

بۆ دەفعی شەرەر سینە لەبەر بادی سەبا دەی
دوگمەت بترازێنە کە عومرم بەفەنا دەی
ئەجرێکی عەزیمە گەر ئەتۆ لەم ڕقە لادەی
(مەڕوانەرە دووری ئەگەر ئەو پەرچەمە لادەی
کوڵم و ڕوخی تۆ ڕۆژە ئەکا شوعلە فشانی)

مووددێکە ئەمن مونتەزیری ڕەهگوزەری تۆم
ئاوارە جەلایی وەتەن و دەربەدەری تۆم
زوننار و کەمەر بەستەیی حەلقەی کەمەری تۆم
(لەو ڕۆژەوە مەحروومی فەزای خاکی دەری تۆم
پێم خۆش نییە گەر بمخەنە سەر تەختی کەیانی)



بەینێکە لە ئیقلیمی غەما وەک کەیە ڕوشدی
بێ عەیش و تەرەب بەربەت و نەی بێ مەیە ڕوشدی
مەعلوومە هەوایێکی لەسەردا هەیە ڕوشدی
(حەیران و پەرێشانە سەراسیمەیە «ڕوشدی»
ئێستەش لە خەیاڵی نەچووە بەزمی لەبانی)

ڕوشدی یەکێکە لە شاعیرە گومناوەکان یا کەم ناسراوەکان. ناوی محەمەد کوڕی قادر ئاغای عەدلە خانە. هاوچەرخی میرزا غەفوور و نووری شێخ ساڵح بووە. لە تەمەنی لاویدا کۆچی دوایی کردووە. لە شیعرە پێنج خشتەکییەکەدا شاعیر ناوی نووری شێخ ساڵحی هێناوە. کارێکی ئاساییە شاعیران لە سەردەمی ژیانیاندا هەواڵی یەکتری بزانن و هەندێکیان لە یەکترییەوە نزیک و هاوڕێی یەکتری بن.

غەزەلەکەی ڕوشدی موناجاتێکە لەگەڵ دلبەری خۆشەویستەکەیدا لە هەستێکەوە هەڵقوڵاوە گەرم و بزێوە لە کاتێکدا دیاردەیێکی جوان دەبینێ، هەڵوێست دەگۆڕێ لە «وەستانەوە» دەیکا بە«بزووتنەوە». شاعیر هەموو کەرەستە ئاساییەکانی بەکار هێناوە بۆ داتاشینی پەیکەری ئەم غەزەلە. هونەر هی ڕوشدییە ئیلهامی داوەتە میرزا غەفوور، بێ گومان ئەویش لە نیوە دێڕە زیادەکانی خۆیدا لە ڕووی هونەرییەوە گەیشتۆتە ڕادەی غەزەلەکەی ڕوشدی.

## ٢

لە شیعرێکی ستایش و پێدا هەڵداندا شاعیر دەڵێ:

ڕەفیقان ئێوە نازانن لەبەرچی شاد و خۆشنوودم
بیحەمدیللا کە مەحسووب و غولامی شێخ مەحموودم
ئەگەرچی خۆ لە سایەی لوتفی باری و جەددی کاک ئەحمەد
ئەمن نیمە لە دونیادا بەکەس ئومێد و مەقسوودم
بەسووئی زەن مەڵێن بۆ خاتری جیفە و تەمەع وایە
بەقوربانی دەکەم سەر جوملە ماڵ و جوود و مەوجوودم
زەمانێکە بەجیددی بوومە پابۆسی سەگی گەیلان
ئەویش لەو نەسلەیی زاتێکە حوببی ڕەببی مەعبوودم

بەشارەت کوا لەوە خۆشتر لە زومرەی ڕێزە خوارانم
لە خۆشیدا چلۆن نەمرم لە مەحسووبانی مەعدوودم
وەرن ئێوەش لە دڵ دەرکەن خەیاڵی پووچی دونیایی
نیهایەت بێ سەمەر دەڕوا بەزایع عومری مەفقوودم
چ خۆشە فرسەتم بێ بۆ زیارەت بچمە خزمەتیان
جەنابی غەوسی گەیلانی و مەلیک مەحموود ئەوە سوودم

شێخ مەحموود و باب و باپیرانی تا دەگەنە کاکە ئەحمەدی شێخ و شێخ مارفی نۆدێ لەگەڵ مورشیدی گەورە تەریقەتی قادری شێخی گەیلانی هەموو شتێک بوون بۆ میرزا غەفوور. ئەگەر لە ئەدەبی کوردیدا بۆ شاعیرێک بگەڕێین و ناوی «شاعیری دەربار»ی پێ ببەخشین بێ گومان باڵندەکە لەسەر سەری میرزا غەفوور دەنیشێتەوە. شێخ مەحموود هەموو ئەو مەرجانەی تێدا هەبوو شاعیری دەرباری هەبێ، وەکو مورشیدی تەریقەتی دەروێشی و سیاسی و شۆڕشگێڕ و مەلیک، لە دواییدا شێخ خۆشی شاعیر بوو.

ئەم لیریکەی میرزا غەفوور نموونەییێکە لە ڕووی هونەرییەوە بۆ ئەو شیعرانەی بەتایبەتی دایناون ستایشی بنەماڵەی کاک ئەحمەدی شێخیان تێدا کراوە.

## ٣

لە شیعرێکی ماتەمیندا میرزا غەفوور شیوەن بۆ شەهیدبوونی ئیسماعیل خانی شکاک (سمکۆ) دەکا:

خوداوەندا بەزایەع چوو ئەوەند وەخت و زەمانم بوو
ئەزەل جەور و جەفا و میحنەت ڕەفیقی میهرەبانم بوو
بەنەوعێ بەختی بەدبەختم لە وادی میحنەتا وێڵە
سەراسیمە و پەرێشانم نە ڕۆژ و وەخت و ئانم بوو
چ حاڵی نیم لەم ئەحواڵە بەتەنیا هەر منی مەزلووم
سەروسەودای خەیالاتی گەلێ لالە ڕوخانم بوو
کە چوو بەختی مەلیک مەحموود لەسەر تەختی سلێمانی
ئومێدێکم بەسمکۆ بوو ئەویش مایەی غەمانم بوو



لە وەختێکی کە خۆی ناسی لە دوژمن بوو بەشێرپەنجە
لە هەر قیسمەی وولاتمدا حەقیقەت پشتیوانم بوو
لەگژ ڕۆم و عەجەم هەڵچوو لە ڕووی ئینگلیز و ڕووس وەستا
بەحەق ئەو بۆ حەقی میللەت کە ڕۆڵەی بێ ووچانم بوو
لە وەختێکی کە دوور کەوتووم لە دیداری جەمالی یار
سەرم کێوی دەماوەندە تەم و غەم باری شانم بوو
ئەوە سەرچاوەیی چاوم لە خوێندا سەددی دەربەندە
کەوا ڕۆیی لە پێش چاوم ئەوی ڕووحی ڕەوانم بوو
بەخۆڕایی نییە قومری دەناڵێنێ لە گوڵشەندا
ئەویش مەزلوومە بێچارە و دەڵێ سەروی ڕەوانم بوو
چریکەی بولبولی مسکین نەما گوڵشەن تەهی بوو گوڵ
لە وادی حەسرەتا ماوە دەڵێ غونچەی گوڵانم بوو
هەتا ڕۆژی قیامەت من دەبێ هەر خاک بەسەرداکەم
بڵێم سەردار و سالاری جەمیعی کوردەکانم بوو
بەجێ ماوم لە پشدەردا ئەنیسم میحنەت و دەردە
زەمانە ڕەنگ و ڕووی زەردە عەدوی وەک ئاسمانم بوو
دەسا حەقمە ئەگەر گوێچکەی فەلەک پڕ کەم لە ئەفغانم
کە ساڵی هیجرەتی (سمکۆ پەناهم تاکە خانم) بوو
بەپوشتی گەر (ڕەزا) کوشتی وەلێ ئەو ڕەنگە ئەو ڕشتی
ئەمێنی تا ئەبەد (میرزا) بڵێ ئەو جاویدانم بوو

شیعرێکی ڕەندە بە ئەسرینی خوێناوی ئاو دراوە. شاعیر لە دڵێکی ناسکی پڕ لە سۆز و میهرەبانی ئاه و هەناسەی گەرم هەڵدەکێشێ بۆ قارەمانێکی میللی چەکی هەڵگرتووە و داوای مافی کورد دەکا. لە پێش ئەودا شاعیر بەتەمای مەلیک مەحموود بوو، بەڵام ئەم لە گێتی دەرچوو و بە بەهەشت شاد بوو، سمکۆ بوو بەجێگری مەحموود کەچی ڕۆژگار ئەویشی لە کورد سەندەوە.

سمكۆ قارەمانێكی ئازا بوو لە ڕووی دوژمنانی كوردا وەستا: ڕۆم (تورک)، عەجەم، ئینگلیز و ڕووس. تاوانی كوشتنی كەوتە سەر ڕەزا شای پەهلەوی بەنامەردی كوشتی. شاعیر شیعرەكەی بەرستەی (سمكۆ پەناهم تاكە خانم) كۆتایی پێ دێنێ. بەحسێبی ئەبجەد ڕستەكە دەكاتە ساڵی ١٣٤٩ هیجری بەرامبەر ساڵی ١٩٣٠ی مەسیحییە. ساڵی كوشتنی سمكۆیە.

٤

لە شیعرێكیدا میرزا غەفوور بۆ داشۆرینی خدر ئەفەندی دەڵێ:

ئەهلی مەرگە مەرگی خۆتان گەر بكەن مەنعی غەفوور
بێ نەوا مسكێن و كاسب گۆشەگیر و بێ قوسوور
حەیف و شەرمە خاڵە میرزاتان بدەن بەو دوونییە
ڕێزی بێگانە ئەبەد ناگا بەڕێزی خزمی دوور
چەكمە ڕەق حەقیە كە چڵكاوخۆری ئینگلیز بێ دەبێ
یا حەپەی بێ میسلی دێڵ یان وەكو گورگ لوورە لوور
موئمینە لای خۆی لەسەر یەک مۆمنە ئەم كارەی كە كرد
چاوی هێندە قایمە و نەماوە قەت شەرمی حوزوور
دلبەر و مەحبووبە وو دڵدار و هەمڕازم بو ئەو
ئەو مونەققەشدارە بۆ كەوتۆتە گیژی سەلم و توور
بۆ ڕەدیفی مومسیک و تەحسیلی ئیسلاحی تەڵەب
با تەڵەب كەم دوختەری بینباشی بیكەم لنگ لە ژوور
با ووجوود سووچی نییە لەم ئەمرە بینباشی فەقیر
گوو بەڕیش ئابا وو جەددی خدرە فەندی مەندەبوور
ئەو ئەبەن عەن جەد كە دابوون پیشەیانە بۆیەكا
وەک نە بای دیبێ و نە باران شاربەدەربووی شارەزوور
با لە خاسسەی خاسەیان بەم كاسەیان پێخوست بكەم
هەر لە قوریە و قەلعەوە تا چەمچەماڵ و شیوە سوور



جوملە كوونی و دوودەكی و گەوواد و بێ شەرم و حەیان
ماڵی عالەمیان لە لا تاڵانە میسلی كەللەپوور
یا ئیلاهی بەندەیی پڕ جورم و عیسیانە (غەفوور)
تۆ ببەخشایی بەحەققی سوورەتی تاها و توور

لەم شیعرەدا خدر ئەفەندی باشكاتبی كارگێری سوپایی مەرگە كەوتۆتە ژێر زەبری داشۆرینی میرزا غەفوور. ئەم كابرایە كەسێكی كەركووكی و جلخوارێكی توركچی و لە دەسەڵاتی ئینگلیزی داگیركەرەوە نزیک بووە. خراپەی لەگەڵ خەڵكیدا كردووە. شاعیر لە هێرشەكانیدا بەقسە جنێوی بازاڕی بەكارهێناوە. هەندێ ناو و ناتۆرەی كە بۆ كەركووكییان دروست كراون دێنێتەوە بیر وەكو بەستی خاسەی كەركووک و ژێر پردە بەردینەكەی كە هەتیوبازی لێ دەكرا. هەموو خەڵكی كەركووک لە قەڵا و خوارەوە (قۆریە) ڕزگارییان نەبووە لە جنێو، تەنیا بەمە دڵی ئاوی نەخواردۆتەوە، جنێوی بەدەوروبەری كەركووكیش داوە لە چەمچەماڵەوە تا شیوەسووری نێوان سلێمانی و كەركووک. جگە لە خدر ئەفەندی میرزا غەفوور كەسانی دیكەشی داشۆریوە، هی وەكو حەسەن دەدە كۆنە ئەفسەری عوسمانی لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئینگلیز و قۆمیسەری پۆلیس بووە لەسەر سنووری عیراق و ئێران و توركیا. هەروەها ملی خەڵكی دیكەشی گرتووە و دایشۆریون، لەوانە مووچەخۆرانی میری و هەندێ لە ئاغایانی پشدەر.

لە داشۆرینی حەسەن دەدە میرزا غەفوور دەڵێ:

چبكەم لەگەڵ چەرخی دەنی تەبعی چەواشە
ئەغنامی وەجاغ حەسرە لە ئەو ماكەر و جاشە
فەوتاوە لەبەر جەوری هەموو مامەش و زوودی
ئەموالی ڕەعییەت هەموو مەنهووب و بەلاشە
مەعكووسە فەلەک كاری هەموو چەوت و چەوێڵە
مەلكۆكە وەكو زابیتەیە حوكمی لە پاشە
دەورانییە ئێستاكە فەلەک هەر دەمە ڕەنگێ
دێنێتە موقابیل لەگەڵ ئاوریشم و قوماشە
كێ تاب و تووانای هەیە ئەم وەزعە قوبووڵ كا
چۆن لایەقە ئەم سەرحەدە بەو حیزە قەڵاشە

بەتیۆریی قەدەر میرزا غەفوور گلەیی لە کرداری گەردوون دەکا چۆن ئەو خەڵکەی گرفتاری ئێش و ئازار کردووە. هەموو خەڵک بەعەشیرەتەکانی مامەش و زوودییەوە لە زوڵم و زۆری حەسەن دەدە ڕزگارییان نەبووە. سەرکەوتنی شاعیر لە داهێنانی ئەم شیعرە ئەوەیە جنێوی میللیی ناشیرینی بازاڕی لە قاڵبی هونەریدا دایڕشتۆتەوە و پەیکەرێکی جوانی لێ دروست کردووە.

## ٥

لە شیعرێکیدا میرزا غەفوور کردەوەی چەوتی گەردوون دەووروژێنێ و بۆ مەسەلەی نیشتمانی کورد بەکاری دێنێ:

لە دەس وەزعی زەمان یاران دڵم ئاسیمە سەر ماوە
لە کرداری کەچی گەردوون فەلەک حەیران و شێواوە
چ ئەحواڵە لە خوداوەندا کەوا عالەم بەیەکبارە
لە یەکتر دوژمنی خوێنن دڵی ئیسلامی گۆڕاوە
بەقەولی فاسیدی عالەم تەبەددول بوو دڵی خۆشی
نەما مەیل و مەحەبەت ڕشتەیی ناموسی شۆڕاوە
ئەسەف بۆ میللەتی کوردی کە غیرەت حاسیڵی کوردە
لە جێی ناموس و غیرەتیان هەموو سوئی ئەمەل ماوە
دەڵێن روکنی شەریعەت ڕەسمە بۆ ئەم میللەتی کوردە
کەچی ئێستاکە بۆ جیفە نە کورد ماوە نە دین ماوە
چ خاکێ کەم بەسەر یاڕەب بڵێم چی چۆن خەلاسیم بێ
لە دەس ئەم قەومە بێ مەغزە نەمێنم من لەمەولاوە
درێغ بۆ حاڵەتی کوردی کە بۆتە مەحبەسی هەر کەس
کە فەرقی نیک و بەد ناکا لە بێ ئیقدامی وەستاوە
سەباتی بۆ نییە ڕۆژێ لەسەر قەول و قەراری خۆی
لەبەر بوخل و حەسادەت کوێر بووە زیهنی پەشووکاوە
عەجەم بازە گرۆهێکی و کەمێکی ماوە دڵسۆزە
بەمولک و میللەتی کوردی چ کارێکە کە قەوماوە



گەهێ تەعقیب و ئیستیقبالی تورک و گاهێ ئینگلیزە
چ فیکری میللەتی ناکا چلۆن داوێکە تەنراوە
وەرن بەشقی خودا فیکرێ لە حاڵی کوردەواری کەن
بەجەمعییەت بەیەک ڕەنگی ئەگەر سەر ڕشتەیی ماوە
کە بەڵکو مولک و میللەت جوزئی تەئمینی حاسیل بێ
هەتا لەم وەزعە دەورانە هەتا ئەم داوە نەپساوە
بەقەولی بێ نەواییم کەن ئەگەر حەددی جەسارەتمە
فیدایی قەوم و میللەت بێ (غەفوور) لەم ژینە تۆراوە

لەم شیعرەدا میرزا غەفوور ئایین و نەتەوایەتی تێکەڵ بەیەکتری دەکا. لە ڕێی ئایینەوە ڕزگاری بۆ کورد دەخوازێ. ئاماژەکردنی بۆ ئەو کوردانەی بوون بەپیاوی دوژمن لە جێی خۆیەتی. دوژمنەکان دەستنیشان دەکا لە عەجەم و تورک و ئینگلیز. ئیتر شاعیر هیچی بۆ نامێنێتەوە ئەوە نەبێ ئامۆژگارییان بکا و بڵێ «یەک بن»، بەبێ ئەوە سەرناکەون. لە دەوروبەری سەد و پەنجا ساڵ پێش سەردەمی ژیانی شاعیر کورد لە مەیدانی خەبات و ڕاپەڕیندا بووە کەچی نەبووە بەهیچ، لەبەرئەوەی یەکێتی لە ناو ڕیزەکانیدا نەبووە.

لە شیعرێکی دیکەیدا شاعیر پیرۆزبایی لە ڕزگاربوونی ناوچەی پشدەر دەکا لە دەست ئینگلیز:

گەلێ پێم خۆشە ئەم حاڵە کە بێ خۆف و موحابا بووم
لە سایەی غەوسی گەیلانی لە بەندی غەم بەرەڵلا بووم
ئەوەندەی سەرفی عومرم کرد لە پشدەردا هەدەر بوو چوو
کە نەمزانی لە سایەی نەخلی بێ بەرگ و سەمەردا بووم
لەگەڵ لات و لەوار و پێستەخۆری دەوری عوسمانی
لە داوی ساحیبی ناساحیبا موددێک لە بەندا بووم
بەئومێدی شەرەف هەر کەس لە پشدەر ئیستیقامەت کا
لە حەسرەتدا دەبێ بمرێ و بڵێ چۆن تووشی سەودا بووم
لە دەستی سوورفلی چاوشینی تینەت پیسی ئیبلیسی
بەڵێ وەک یووسفی کەنعان کە زیندانی زولەیخا بووم

بەناهەق لەو تەلیسماتە هەموو عومرم بەزایەع چوو
چ حاڵێ بوو هەموو وەختێ لە گەرداوی خەتەردا بووم
چ عومرێ بوو بەبێهوودە نە بۆ خوا بوو نە بۆ بەندە
عەبەس ڕۆیی لە جادوودا لە زومرەی جانەوەردا بووم
بەوەڵڵا هەق بەدەستم گەر بڵێم ویژدان گوڕێزی کرد
لە ناو ئەو قەومە بێ مەغزە منیش بۆیە تەوەڵلا بووم
بیحەمدیللا نەجاتی بوو لە کابووس موڵک و میللەتمان
وەکو من کەبک ئاسا چۆن لە چوارچێوەی قەفەسدا بووم
وەکو پشدەر لە بەندی پیسی ئینگلیز خەلاسی بوو
لە داوی کیبر و بێ هۆشیش ڕەها بێ من بەپاشا بووم
تەماشای (خاڵە میرزا) کەن دەڵێ عومرم لە نوێ نووسرا
لە ئەعرافم خەلاسی بوو لە دونیا جورم پەخشا بووم

ئەو ماوەیەی میرزا غەفوور لە پشدەر زیندەگانی کردووە، ناخۆشترین ڕۆژگارێک بووە لە هەموو ژیانیدا. وەک ئاشکرایە ئەم ماوەیە قۆناغی گواستنەوە بوو لە مێژووی کوردی ئەو ناوچەیەدا. دەسەڵاتی تورک لە لایێک، هەڵسانەکانی شێخ مەحموود لە لاییێکی دیکەوە، دەست تێوەردانی دەرەبەگی کورد لەملا، چاو تێهەڵقوڵتاندنی عەرەبی عیراق لەولا، مایەی ئاژاوە و داونانەوە و تەشقەڵەی سیاسەت و دیپلۆماسییەت بوو، میرزا غەفووری شاعیر لە ناو ئەم گێژاوەدا دەخولایەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا گوشاد و بەختیار بوو بەوەی پشدەر لە دەسەڵاتی ئینگلیز ڕزگاری بوو.

شاعیر لەم لیریکەدا وشە و زاراوەی وەکو «ساحیب» بەکار دێنێ. ئەمە بۆ تاکی سەربازی سوپای ئینگلیز و هەموو کاربەدەستێکی ئینگلیز بەکار دەهێنرا. زاراوەکە لە هیندستانەوە هاتبووە لای ئێمە. وشەکانی «سوورفل» و «چاوشین» بۆ هەموو بێگانەییێکی ئەوروپایی بەکار دەهێنرێ.

نەمانی دەسەڵاتی ئینگلیز لە پشدەر مایەی شادی بووە بۆ میرزا غەفوور، چونکە خۆشی نەویستووە لەبەرئەوەی خراپەی بۆ کورد کردووە بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا لەبەرئەوەی ئیسلام نەبووە و دیان بووە.



٦

میرزا غەفوور سوورە لەسەر ئەوەی ڕزگاری کورد بەرێگەی ئایینەوە نەبێ سەرناگرێ:

ئەرێ یاران لەبەرچی وایە عالەم مات و حەیرانە
لە گەرداوی غەم و هەمدا ئەسیر و دڵ پەرێشانە
دەبینێ دۆست و ئەحبابیش نەما مەیل و مەحەببەتیان
کەوا ئێستا لە دەرهەق یەک دەکۆشن بێ حیجابانە
ئەسەف بۆ میللەتی ئیسلام کەوا کوردایەتی مەحوە
لەبەر سووئی ئەمەل ئەمڕۆ سیاسەت مەردی مەیدانە
وەها کەوتۆتە داوی فیکرەتی تەحسیلی جیفە و ماڵ
شەریعەت پایە ماڵ و عیلم و تەدریسیش بەیەک ئانە
چییە ئەم گونبەدی ئەفلاکە شینە وا لەسەر قینە
بەدایم هەر وەکو بوومە بەحیلە و فێڵ و ئەفسانە
فەلەک بۆ خۆی دەنی تەبعە وەها وەزعێکی گێڕاوە
بەکوللی کەس نییە فیکری بەچاکی لەم خیابانە
سەباتی بۆ نییە پێنج و دوو ڕۆژێ لەززەتی نادا
بەکەس هەروەک ئەبووجەهلە لە دووی خوێنی شەهیدانە
بەهەر نەوعێ تەماشاکەی ئەوەندە دوون ڕەفتارە
ئەساسی وایە ڕووی شینە بەعەکسی هەر لە دەورانە
خەیاڵی عالەمی دونیای نییە غەددار و بێ باکە
تەماشا چی لە عالەم کرد گەدایە ئێستا سوڵتانە
حیجابێکی نییە بەدبەختە بۆ ئەولادی کاکەحمەد
دەگێڕێ وەزعی ناهەموار و مەیلی کافرستانە
خەجاڵەت بی لە دیوانی خودا ئەی چەرخی بێ مروەت
کە بوویتە دوژمنی خوونی لەگەڵ ئەم قەومی کوردانە
دەسا چبکەم ئەگەر جارێ دەگا دەستم بەدامانت
دەبینی چیت بەسەردێنم دەکەویە ڕەوتی دۆمانە

شاعیر لێرەدا ساکارانە و دڵسۆزانە دەنوارێتە مەسەلەی نیشتمانی کورد. ئایین و سیاسەت تێکەڵ بەیەکتری دەکا. ئاگاداری ئەوە نییە ئەگەر بەرێگەی ئایینیشەوە مەسەلەی کورد بگاتە ئەنجام، بینینە تیۆرییەکە و کۆششە پراکتیکییەکە دەبێتە سیاسەت.

لە چوارینێکیدا میرزا غەفوور دەڵێ:

خۆزگە بەو ڕۆژەی کە تەسلیمی دەسی جەللاد دەبم
بۆ تەناف یا سەربڕین مەنسوورِ وار ئازاد دەبم
گەر نەنووسێ خوێنی من حەرفی ئەنالحەق حەق نییە
ڕوخسەتی شاهم نەبێ شاگردی بێ ئوستاد دەبم

لەم چوارینە جوانە داهێنراوەدا شاعیر خۆپیشاندانێکی قەڵەباڵغی پڕ لە شۆڕشی وشە و ڕستە و تەعبیری جیاوازی دروست کردووە. ماناکانی لە شیعری سۆفیزمی کلاسیکی وەرگرتووە. شاعیر خۆزگەی ئەوەیە وەکو مەنسووری هەلاج لە سێدارە بدرێ و خوێنی بڕژێ و ئەو خوێنە ببێ بەمەرەکەب و ڕستە بەناوبانگەکەی «أنا الحق» (من ڕاستیم) تۆمار بکا. شاعیر بەوتەیێکی دانایانە و شاعیرانە کۆتایی بەچوارینەکەی دێنێ لەو کاتەی کە دەڵێ: هەموو دەروێشێک ئەگەر موریدی نەبێ، وەکو قوتابیی بێ مامۆستا وایە.

***

میرزا غەفوور کوڕی حاجی عومەری کوڕی حاجی عەباس بەبیروباوەڕ شەیدای بنەماڵەی کاک ئەحمەدی شێخ و نەوەکانی بوو تا دەگاتە شێخ مەحموود. شاعیر لە خۆشەویستی ئەمانەوە هۆگری سەرداری تەریقەتی قادری شێخ عەبدولقادری گەیلانی بوو. ئەمە میرزا غەفووری کرد بەدەروێشی شێخ مەحموود، کە شێخ خەریکی کوردایەتی بوو میرزاش لەبەر خاتری ئەو بوو بەکوردپەروەر و داوای مافی نەتەوەیی کوردی دەکرد. شاعیر باوەڕی بەبیری موسوڵمانەتی و دەروێشایەتی و کوردایەتی بووە. ئەمەی بەڕاستی بووە.

میرزا غەفوور شاعیرێکی بەدیمەن بوو. لە ڕووی داڕشتنی ڕستەوە شیعری بەرز و ڕەوان و داهێنراوە، لە ڕووی کێشەوە پڕ لە ئاواز و بێ گرێیە، لە ڕووی قافیەوە ئاسان و سووکە. هەموو مەرجەکانی شیعری کلاسیکی لە بابەت ڕوخسار و ناوەرۆکەوە لە شیعریدا دەبینرێن. مانای تازەی سەردەمی خستۆتە ناو قاڵبی کۆنی کلاسیکییەوە.

## بەشی نۆیەم

## ئەدیب

## ١٨٧٤ - ١٩٣٢

### ژیانی ئەدیب

ڕەسووڵ کوڕی مەلا سادق کوڕی عەبدولڕەحمانی زەندییە، بەبنەچە دەچێتەوە سەر هۆزی کەریم خانی زەند. لە گوندی شا وەلی ناوچەی موکریان لە ساڵی ١٨٧٤ لە دایک بووە. خوێندنی حوجرەی مزگەوتی لە زانستییەکانی ئایینی ئیسلام و زمانی عەرەبی تەواو کردووە. وەفایی مامۆستای بووە و وانەی پێ وتووە. لە گێتیی شیعردا وەکو شاعیرانی دیکە وشەی «ئەدیب»ی هەڵبژاردووە و کردوویەتی بەنازناوی شاعیرییەتی.

لە ماوەی خوێندن و لە دوای تەواوکردنی بەرنامەکانی مەلایەتی مەیلی بۆ کۆمەڵی مەلایان و دەروێشان نەبووە، لێیان دوورکەوتۆتەوە. بۆ دابینکردنی گوزەرانی خۆی و ماڵ و منداڵی ئاشەوانی و دارتاشی کردووە، بەلایەوە ئاسایی بووە بەسەربەرزی هەموو کارێک بکا بۆ بەڕێوەبردنی خێزانی، تەنیا مەلایەتی نەکردووە. زۆربەی ماوەی ژیانی خەریکی فێرکردنیب منداڵی دەوڵەمەندان بووە، خوێندن و نووسینی فێر کردوون. لەوانە لە گوندی پەسوێ منداڵانی قەرەنی ئاغای مامەشی فێری خوێندن و نووسین کردووە. ئەم کارەی تا سەر نەبووە لەگەڵ ئەو ئاغایە تێکچووە و بەماڵەوە باری کردووە بۆ شنۆیە، لەوێ بووە بەمامۆستای کوڕەکانی ئەورەحمان ئاغا لە گوندی سەرگیز. لەبەر ڕەوشتی بەرزی و سەرڕاستی و شانازیکردن بەخۆیەوە ئەدیب لەوێش نەحەواوەتەوە. مەلا مەحموود ناوێکی لێ پەیدا دەبێ لەو دووڕوانە دەبێ مەلایەتی و دەروێشی پێکەوە دەکەن و یەکێک بووە لە سۆفییەکانی شێخ شەمسەدینی بورهان. ئەم مەلا مەحموودە دەبێتە بەکری مەرگەوەر، لە نێوان ئاغا و ئەدیب، هەرچی خراپە هەیە لەگەڵیدا دەکا. ئەنجامی شاعیرمان دەگاتە ئەوەی لە پێشانا بەقسە و جنێو سەری شۆڕ دەکەن لە پاشانا بەلێدان و فەلاقەکردن مامەڵەی لەگەڵدا دەکەن. ناچار ئەم هەڵوێستە ناشیرینەی ئاغا دەگاتە پلەیێک ئەگەر دەریش نەکرێ پێویست دەکا خۆی ئیتر لە سایەی ئەم ئاغا بێ ڕەوشتەدا نەژی.

لە پاشانا ئاغا پەشیمان دەبێتەوە، بەڵام کردەوەکە لە ڕادەیێکدا بووە پەشیمانی پارە نەکا. دڵی ئەدیب بەم پەشیمانییە نەرم نابێ. زۆری پێ ناچێ ئەم کردەوە نامرۆڤایەتی و



ناهەموارە بەرامبەر بەشاعیرێکی دڵ ناسک تووشی نەخۆشییێکی سایکۆلۆجی دەکا جارێکی دیکە هەڵنەستێتەوە.

ئەدیب لە ساڵی ١٩٣٢ کۆچی دوایی کردووە و لەسەر وەسیەتی خۆی تەرمەکەیان بردۆتەوە بۆ گوندی دەربەند و لەوێ نێژراوە.

### شیعری ئەدیب لە ڕووی ڕوخسارەوە

ئەدیب شیعری زۆر کەمە، بەڵام ئەوە دەهێنێ لاپەڕەی تایبەتی بۆ تەرخان بکرێ لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا. شاعیر تەنیا دوو بەحری عەرووزی بەکار هێناوە، هەزەج و ڕەمەل. بەپێی کەمی شیعری لە دەنگی قافیەدا دەوڵەمەندە، بابەتی قەسیدەی پێنجینی زۆرە. ئەگەر قافیەی پێنجینەکان و هەموو شیعری دیوانی بەسەر بکرێنەوە ئەم دەنگانە بەرچاو دەکەون: ا، ت، د، ر، ز، ک، ل، م، ن، وو، (ە - ـە)، ی، ێ.

لە بابەتەکانی شیعری کلاسیکی لە ڕووی ڕوخسارەوە ئەدیب بایەخی بەم هونەرانەی خوارەوە داوە:

١- غەزەل: ئەم جۆرە شیعرە لە ڕووی ژمارەی دێڕەکانیانەوە کورتن. غەزەلی شەش دێڕە شیعری هەیە تا نۆ دێڕە شیعر.

٢- پێنجین: کۆمەڵێک قەسیدەی پێنجینی هەیە لە پێنج بەند (کووپلە) تا یازدە. بەڕاستی ئەدیب لە شاعیرانی دیکە زیاتر بایەخی بەم جۆرە شیعرە داوە، نزیکەی نیوەی بەرهەمی لەم بابەتەیە و نیوەکەی دیکەی غەزەلە. لێرەدا کاریگەری شیعری ئەدەب (میسباح - ددیوان) بەسەر شیعری ئەدیبەوە ئاشکرایە لە ڕووی بەکارهێنانی هونەری پێنجین لە دانانی شیعریدا.

٣- پێنج خشتەکی: چەند غەزەلێکی تاهیر بەگی کردووە بەپێنج خشتەکی، لەو کارەیدا سەرکەوتوو بووە چونکە توانیویەتی سێ نیوە دێڕی شیعرەکەی خۆی بێنێتە پلەی دێڕە شیعرەکانی تاهیر بەگ.

## شیعری ئەدیب لە ڕووی ناوەرۆکەوە

بەری شیعری ئەدیب لە ڕووی ناوەرۆکەوە یەکجار تەسکە، نوێکردنەوە لە بەرهەمیدا بەدی ناکرێ، هەمووی لە چوارچێوەی دوو سێ مەبەسی شیعری کلاسیکی کوردی قوتابخانەی نالی دەسووڕێتەوە. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا شیعری لە ڕووی هونەری و داهێنانی ئیستێتیکییەوە نرخی خۆیان هەیە.

ناوەرۆکی شیعری ئەدیب لەم مەبەسانەیە:

١- دڵداری و وەسف: بەشێکی هەرە زۆر لە دیوانی شاعیر لەم بابەتەیە، دڵداری لەگەڵ سروشت تێکەڵ کردووە و لە شێوازی کۆن نەچۆتە دەرەوە.

٢- ڕاز و گلەیی: ئەم جۆرە شیعرەی بەنەرمی تێکەڵ بەداشۆرین کردووە. لە هەندێ شیعریدا دەتوانرێ لیریکەکە بەداشۆرین و ڕاز و گلەیی دەستنیشان بکرێ.

٣- داشۆرین: ئەم جۆرە شیعرە لە دیوانی ئەدیبدا کەم نییە، چونکە لە ژیانیدا گەلێک ئازاری چەشتووە، دەسەڵاتدار و زەبر بەدەست چەوساندوویانەتەوە. ڕەخنە و داشۆرینی بۆ ئاغا و دەوڵەمەندان هەیە. هەرچۆنێ بێ ئەدیب کەسایەتییێکی تایبەتی هەبووە، لە ژیاندا عەودالی دۆزینەوەی سەربەستی و یەکسانی بووە، بەڵام نەیدۆزیونەتەوە!

## نموونەی شیعری ئەدیب

١

لە غەزەلێکیدا دەڵێ:

چاوەکەت مەستە بەناهەق فێری مەیخانەی مەکە
لێی گەڕێ مەمنوونی بەزمی دوردی پەیمانەی مەکە
زولفی سازاوت دەسا تەرتیب و چینی تێک مەدە
حەیفە تووشی جەوری ڕیش و کێشی لەرزانەی مەکە
پەرچەمت جێی ئاشیانەی بولبولی تەبعی منە
چونکە ئێشکچی شەوە تۆ مەنعی هێلانەی مەکە
گەردەنم پێی خۆشە حەلقەی تای تەنافی زولفەکەت
چاوەکەم ئیتر حەوالەی تۆق و زۆلانەی مەکە



دڵ بەمەیلی خۆی دەمێکە عاشقی باڵاکەتە
تۆخودا مائیل بەغەیری خۆت و بێگانەی مەکە
هەر لە ئەووەل تۆ دڵت بردم بەنازی چاوەکەت
تازە فێری ڕاو و ڕەسم و تەبعی پەروانەی مەکە
عاشقی غونچەی دەمت تاکەی دەبێ ئاوارە بێ
مەحرەمی ڕازە حەواڵەی چۆڵ و وێرانەی مەکە
هەر بەڕەسمی دیدەنی باسێکی نایینێ دەمت
دلبەری وا نابێ عەیبە نانەجیبانەی مەکە
خۆت دەزانی وەک (ئەدیب) کەس بەندەگی بێ ناکرێ
وا بەڕیسوایی لە ناو ئەم خەڵکە ئەفسانەی مەکە

ئەم شیعرە وەسفی چەند ئەندامێکی جوانی دلبەرە وەک چاو و زولف و پەرچەم و دەم و باڵا. شاعیر ئەم ئەندامانە دەبزوێنێ، لە ئەنجامدا دەبنە مایەی نازونووز و وێنەی هونەراوی شیعری دروست دەکەن. لە دواجاردا شاعیر لە جاران زیاتر هۆگری دلبەرەکەی دەبێ.

لە شیعرێکی پێنجینەدا شاعیر دەڵێ:

ڕووت شەمسی تەمموزە هەموو پڕ تابش و تاوە
ئەگریجەیی چین چینە لە ڕووت پەخش و بڵاوە
حەیرانی دەمت بم بەمەسەل شووشە گوڵاوە
قوربانی دوو زولفت کە دەڵێی سونبولی خاوە
مەیلت ئەوە چەند ڕۆژە لەسەر وەعدە نەماوە
ڕۆژێ نییە مەستانە کە عەهدت نەشکێنێ
وەک کاهروبا ئەو دڵی مسکین نەڕفێنێ
وەک قەوس و قەزەح ساتی بەڕەنگێ دەنوێنێ
بێ گیان بەدەنی خەستە جیگەر بۆچی دەمێنێ
وەک شووشەیی ناسک دڵی بێچارە شکاوە
پێم فەرموو گوناهم چییە ئەی سەروی دڵارام
چیدی مەکە دڵڕەنجە ئەسیری منی ناکام

کووا تاقەتی ئەو جەورە هەموو تاب و توانام
ئەبرۆیی کەچت حاڵی دەمی مەرگی نیشاندام
تەهدیدی سەری تیری موژانت بەعەلاوە
ئاوارە وو خونخوارە مەگەر وامیقی عەزرام
لۆمەم چ دەکەن کوشتە وو سەرگەشتەیی لەیلام
غەرقی غەم و سەوداسەر و ئاشوفتە وو شەیدام
بۆ دانەیی خاڵت بەفریو چووم دڵی کێشام
سەرتاسەری دەورەی قەمەرت دانە وو داوە
سێوی چەنەگەت ئاوی حەیات و چەهی زەمزەم
ئەی گیانی عەزیزم بەفیدای ئەو سەر و پەرچەم
ئەورۆکە دەڵێم خاکی هەموو دەر وەسەرم کەم
پرسیم چییە دەرمانی برینی دڵی پڕ غەم
فەرمووی کە دەوای سەهوە (ئەدیب) کاری کراوە

ئەم شیعرە موناجاتێکی دڵدارییە شاعیر تێیدا بەجوانی دلبەر هەڵدەڵێ. دەمێک وەسفی ئەندامە ورد و جوانەکانی دلبەر دەکا ، دەمێکیش ڕاز و گلەیی دەروونی بۆ دەردەخا و بەڵگەی بۆ دێنێتەوە کە زۆر خۆشی دەوێ. خۆی بەوامیق و مەجنوون دەچوێنێ دلبەریش بەعەزرا و لەیلا. گەرمییێکی دەروونی لە شیعرەکەدا نابینرێ بەڵام ئەوە هەیە مانای جوان لە قالبی شیعرێکی پڕ ئاواز دەکەوێتە بەرگوێ و شیعری شاعیرانی پێشوو دێنێتەوە یاد و لە گوێی خوێنەر دەزرنگێتەوە.

لە پێنجینێکی دیکەی دا شاعیر لەسەر عەیاری شیعرەکەی پێشووی دەڕوا و دەڵێ:

ئەی ماه جەبین ئافەتی دین دلبەری عەییار
ڕووت ڕەوزەیی ڕیزوان و نەعیمی گوڵی دڵدار
پڕ عەبهەر و ڕەیحان و سەمەن سونبولی گوڵنار
قوربانی قەدت بم کە دەڵێی سەروە بەڕەفتار
تاکەی لە غەمت دەربەدەر و سینە بریندار
لەو ڕۆژە کە ئامانجی شەهی سەخت کەمانم
دەمزانی لە هیجری ئەلەمت بابی ئەمانم



چون مەدحی سیفاتی تووە هەر ویردی زمانم
باکم نییە بەم شوهرەتە بەدناوی زەمانم
ئەی وای لە دەست جەوری تو وو تەعنەیی ئەغیار
سەوداسەریی و گۆشەنشینیی و سەلامەت
داخی غەمی مەعشووقە نیهانیی و شەهامەت
بێ ناڵە برین گریە دەبێ ئەشکی عەلامەت
بەو خوایە نییە ڕوویی تۆ بێ سەنگی مەلامەت
جەبرانی دەکا غەمزەیی دوو نێرکسی خومار
حاشا لە سەر و قەوم و لە ئەحباب و برادەر
گەر حوکمی سلێمان لەسەر ئەم موڵکە سەراسەر
با دەست ڕەسم بێ بەهەموو موڵکی سکەندەر
بێ فائیدەیە بۆ منی مسکێنی قەلەندەر
نیساری دەکەم پاکی لە بۆ یەک دەمە دیدار
ئەی خوسرەوی خووبان سەبەبی شین و گرینم
بۆ غەمزەیی شیرینە کەوا گۆشە نشینم
دایم بەئومێدی نەزەرت مات و حەزینم
وا چاترە ئەم حوسنە کە جار جارە ببینم
خەوفی سەرمە هەڵبگرێ پەردە لە ڕووی کار
تا عیشق نەبێ مەسجید و مەیخانە بەتاڵە
عاشق چ غەمی میحنەت و فەوتی سەروماڵە
بۆ عاشقی ڕووی یار دەمی زەوق و پیاڵە
مفتی غەڵەتی کرد کە دەڵێ بادە حەڵاڵە
باوەڕکە حەڵاڵە کە حەرامە لە ڕیاکار
تەنبوور و دەف و بوربوت و پەیمانەیی مەزهەر
یا میسک و بخوورات لە کاشانەیی مەجمەر

سەد نەغمە وو سەد پەند لە مەیخانە وو مینبەر
عیزز و حەشەم و ڕوتبەیی شاهانە وو ئەفسەر
نابێ بەسەفای زەوقی حوزوورت دەمی ئەفکار
بێ تاعەت و پڕ مەعسییەت و ڕووت و عەجیبم
بێ سەروەت و بێ تۆ شەو موحتاج و غەریبم
داخوازی مەی و موفلیس و بێ هۆش و شەکیبم
حاجەت بەموعەررەف نییە وا دیارە (ئەدیب)م
ڕووم ناوەتە سەر خاکی دەرت عاجز و ناچار

لەم شیعرەدا دیسانەوە شاعیر موناجات لەگەڵ دلبەردا دەکا، لە چوارچێوەی ئەو کۆمەڵە وێنە و مانایانەی لە غەزەلەکانی دیکەیدا هەیە نەچۆتە دەرەوە، هەروەها لە مەرجەکانی چوارچێوەی کلاسیکی کۆنیش لای نەداوە. بەواتاییێکی دیکە ئەگەر شیعرە دلدارییەکانی لەسەر یەک کێش و قافیە دابڕێژرێنەوە دەبن بەقەسیدەییێکی درێژ، چونکە هەموویان وێنەی یەک بابەتی دلداری و وەسفن بەپێی دەستووری شیعری کلاسیکی کوردی.

۲

لە شیعرێکیدا ئەدیب ڕوو دەکاتە قەرەنی ئاغای مامەش و پێی دەڵێ:

تۆ لە لایێکی دەڵێی ئەهلی دڵ و ویجدانم
خاسسە مەنسووبی زەکی خاکی شەهی بورهانم
ئەرشەدی موکریی و بەگزادەیی ئەکرادی نەجیب
ئەعقەلی مەنگوڕ و پیران و شنۆ و لاجانم
پڕ خوشووع و وەرەع و ڕازیی و تەسلیمی قەزا
سۆفیی سافی دەروون دوور لە درۆ و بوختانم
مونکیری تاعەتی تۆ نیمە لە قەول و عەمەلت
کە موناقینە لەیەک مەحتەل و سەرگەردانم
کەی منت دیت بەدوو چاوت لە خەتا و جورم و گوناه
وا بەتەقلید و هەوا کەوتیە دووی خیزلانم



خزمەتم کردی زەمانێکە قەدیم هەم بەلەدی
با حوقووق و بەوەفا خۆش سیفەت و ئینسانم
سووئی زەننی تۆ لە کەم لوتفییە دەرحەققی (ئەدیب)
وەرنە مەعلوومە (ئەدیب) موخلیسی ئاغایانم

ئەدیب دەردی دڵی هەڵدەڕێژێ بۆ ئەو ئاغایەی خراپەی لەگەڵدا کردووە و ئازاری داوە. پێی دەڵێ خۆت وا پیشان دەدەی پیاوی چاکی، سۆفیی شێخی بورهانی نەقشبەندی، پیاو ماقووڵی کورد و ناوچەی موکریانی، عاقڵترین خەڵکی مەنگوڕ و پیران و ناوچەکانی شنۆ و لاجانی، بەڵام ئەمە ناگونجێ لەگەڵ ئەو خراپەیەی لەگەڵ منت کردووە، منێکی خزمەتم کردووی و هەمیشە دڵسۆزی ئاغایان بووم.

لە شیعرێکی دیکەیدا لەم بابەتەوە ڕوو دەکاتە ئاغایێکی دی:

ئەتۆ دوێنێ قەرارت دا دەگەڵ من
کە چوار پارچە قەڵەم هەن خالیس ئاسن
ئەمن ئەوڕۆ هەتا شەو مونتەزیر بووم
خودا ببڕێ بڵا پیاوی درۆزن
ئەگەر بێ و ماڵی شێخی لێ وەدەرخەی
چلۆن ساقیت دەبێ وەک کێری بێ گون
لە پێش چاوی هەموو عالەم دیارە
لە هەرزانی بەوێنەی دەنکی هەرزن
دڵی بردم مەواعیدی لەتیفت
کەچی ئەمڕۆ لە من بووە بووکی بێ بن
درۆ زۆر شەرمە بۆ ئاغایی وەکو تۆ
دەبیە ئامانجی تەعنی دۆست و دوژمن
بەگیانی شێخ جەلالی بۆم نەنێری
درۆ سەر دەردەخا وەک کلکی بالون

بەبیر و بۆچوون و ڕەوشت ئەدیب لەگەڵ ئاغا و کاربەدەستان ڕێک نەبووە، چونکە خاوەنی هەڵوێستی خۆی بووە. لێرەدا ئاغایێک دەکا بەنموونەی کردەوەی خراپ. ئەو

ئاغایە درۆی لەگەڵدا کردووە، ئەو بەڵێنەی پێی داوە نەیگەیاندۆتە ئەنجام. ئیتر بەتەوسەوە بۆی دەچیتە مەیدان و دەڵێ ئەگەر بەڵێنەکەت نەهێنییە دی، من لە لای شێخ جەلال شکاتت لێ دەکەم، بێ گومان ئەو شێخ جەلالە نەقشبەندییە و شێخی ئەو ئاغایە بووە.

لە ڕووی هونەری ڕەوانبێژییەوە ئەدیب داهێنانی جوانی هەیە لەم داشۆرینەدا بەتایبەتی وێنەی کراوە (ئیرۆتیک)ی وەکو «کێری بێ گون» و «کچی بێ بن»ی بەکار هێناوە. ئەندامانی سێکسی لە لەشی ژن و پیاودا وەک جنێو جەوهەرێکی گرنگە لە شیعری داشۆرین لە ئەدەبی نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستدا.

### ٣

میرزا عەلی ناوێک سکرتێری قەرەنی ئاغای مامەش بووە، شیعرێکی داشۆرینی لە دژی شاعیر هۆنیوەتەوە و بەناوێکی نهێنی «برایم» بڵاوی کردۆتەوە، ئیتر ئەدیب بەم لیریکە شاعیری دەرباری گوم ناو دادەشۆرێنێ:

مەعلوومە کە لەم مەفسەدە کێ ئوسسی ئەساسە
تەرزی مەسەلە جێی سمی کەر چنگی مەیاسە
وا نیمە بەکوردی تەرەفی خۆم کە نەناسم
ڕووی دیارە لە بن پەردە وەکو ئاسۆ پەڵاسە
مەعلووم بەقووەی کلکە سەگ ئێسک دەشکێنێ
بێچارە برایم نییە بەو هۆش و حەواسە
بێ سر نییە ئیخفای تەخەللوس لە هیجادا
جا کێشیی و گەووادییە ئەم ترس و هەراسە
هاجی تەرەفی من کەرە مونشی بێ چ کاتب
هێند ئەحمەقە بۆی واجیبە مەهمووز و قەراسە
بێ تەبع و هەوایە بەکەری بێتە مەسافم
شیعرم وەکو شێست تیرە موقابیل بەمەساسە
نا مونتەزەمە شیعری نەفامانەیی جاهیل
وەک جندە مووپاهاتی بەگاندان و لیباسە



تەبعی کەچی وەک جەوهەری جوو بوو وەدەری خست
گەر چاری نەما جندە سیلاحی کەتە داسە
تەعقیبی مەکە چیدی (ئەدیب) بەم قەڵەمی هەجو
دوژمن کە بەئەو تەعنەی لە نێو ژانی نیفاسە

ئەو وتانەی ئەدیب بۆ داشۆرینی «برایم»ی شاعیری گوم ناو هەڵیبژاردووە لە سەرچاوەییێکی شاعیرانەوە هەڵقوڵاوە. ئەدیب سەرکەوتوو بووە لە داهێنانی ئەو سیفەتانەی بەڕاستی پێویستییان بەلێکدانەوە و شیکردنەوە نییە چونکە زۆر ئاشکران. ئەم شیعرە ڕەنگدانەوەی پێوەندی شاعیر خۆیەتی لەگەڵ ئاغا و دەست ڕۆیشتوان. یەکێکی وەک ئەدیب ناتوانێ لەگەڵیاندا بژی، بەڵام ئەو برایمە لەبەرئەوەی بەخو و ڕەوشت، بەبیروباوەڕ وەکو ئەوانە دەتوانن هاریکاری لەگەڵ یەکتریدا بکەن. لە شیعرێکی دیکەیدا شاعیر لەباتی شیعری شین و ماتەم بۆ مردنی عەلی عەباس سکرتێری ئەمیر تومانی فەرمانبەری نەغەدە دابنێ شیعری داشۆرینی بۆ هۆنیوەتەوە لە شیعرەکە دەڵێ:

غوررەیی میهری جەلالی مەهی حەوتەم بەژمار
چووە ناو دۆزەخییان ڕووحی موشەررەف بوو بەنار
چوون لە بۆ مەوسییە خوانی فەلە و ئاخوند جوهوود
حەشەرەهوڵڵاهو مەعە فیرعەون و هامان جیوار
عیسەویی و مووسەویی و ڕەعیە و ئەکراد و عەجەم
هەموو تەلعینی دەکەن وەک شبری لەیل و نەهار
عەجەمان دێنە عەزاداری بەتەسلییە دەڵێن
کەر سەقەت بوو بەسەقەر باقییە سێ جاشە حیمار
سابیقەی خزمەتی بوو چاکە فەرامۆشی نەکەن
لە قەزای حاجەت ئەگەر شام و سەحەر شەڵواردار

ئەو کەسەی شاعیر دایدەشۆرێنێ لە لای زۆربەی خەڵکی ئەو ناوچەیە خۆشەویست نەبووە، ئەمانە لەسەر هەر ئایین و ئایینزاییێک یا میللەت و نەتەوەییێک بووبن. شاعیر بۆ ئەوە مردووە کە دەخوازی لەگەڵ فیرعەون و هامان حەشر بکرێ بۆ ئەوەی بیبێتە یەکێک لە دانیشتوانی دۆزەخ.

***

ڕەسووڵ کوڕی مەلا سادق کوڕی عەبدولڕەحمانی زەندی ناسراو بەئەدیب، شاعیرێکە لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم شیعری کلاسیکی کۆنی کوردی دەور کردۆتەوە. لە مەرجە هونەرییە ئاساییەکانی دەرنەچووە. لەبەرئەوەی بەرهەمی کەمی لە بەردەستدایە، هەموو بابەتە کلاسیکییەکان بەرچاو ناکەون. ئەوەی لە ناوەوەیە پلەی هونەرییان بەرزە.

شیعری ئەدیب سەرچاوە و کەرەستەییێکی بەکەڵکە بۆ تێگەیشتنی کۆمەڵی کوردەواری لە ناوچەی موکریان و پێوەندی کاردەبەستان لەگەڵ خەڵکی دیکەی ناو کۆمەڵ. شاعیر کەسێک بووە خاوەن هەڵوێست، سەری بۆ کار و کردەوەی خراپی ئاغا و زەبربەدەستان شۆڕ نەکردووە.

# بەشی دەیەم

## ناری

۱۸۷٤ - ۱۹٤٤

### ژیانی

محەمەد کوڕی مەلا ئەحمەد کوڕی مەلا محەمەد کوڕی عەبدولڕەحمانە، لە گوندی ساوجی کۆن لە مەریوان لە ساڵی ۱۸۷٤ لە دایک بووە، بەڵام ماوەیێک لە گوندی کیکن ژیاوە و لە دواییدا گوندی بێڵوو بووە بەجێی زیندەگانی، لەبەرئەوە لە ناو خەڵکیدا بەکاکە حەمەی بێڵوو ناوی دەرکردووە و لە شیعریشدا ناوی «ناری» هەڵبژاردووە وەک نازناوی شیعری. ناری بەواتای (ئاگرین) هاتووە.

سەرەتای خوێندنی ناری لای باوکی بووە. لەسەر دەستووری خوێندنی کۆنی حوجرەی مزگەوت بۆ مەبەسی خوێندن لە گەلێ جێ ژیاوە، لەمانە لە هەندێ لە ئاواییەکانی ناوچەی مەریوان و سنە و پێنجوێن، لە پاشانا ماوەیێکیش لە سلێمانی خوێندوویەتی، ئینجا جارێکی دیکە ڕووی کردۆتەوە سنە بەمەبەسی خوێندن و لە مزگەوتی دارولئیحسان نیشتەجێ بووە، لەوێوە چووە بۆ بانە و ئەوجا سابلاغ (مەهاباد). ناری ئارەزووی ئەوەی بووە مزگەوتەکانی کوردەواری سەرووتر تاقی بکاتەوە، بۆ ئەم مەبەسە ڕووی کردۆتە ناوچەکانی وان و باشقەلا، ماوەیێکیش لە هەولێر بووە. بۆ تەواوکردنی دوا قۆناغی خوێندن چۆتە ڕواندز لە لای ئەسعەد ئەفەندی خەیلانی گەیشتۆتە خوێندنی دوا پلەی مەلایەتی، هەروەها لەسەر دەستی ئەویش لە ساڵی ۱۸۹۷ ئیجازەی دوازدە عیلمی مەلایەتی وەرگرتووە و بۆ دواجار گەڕاوەتەوە مەریوان.

ناری کە بەیەکجاری گەڕایەوە مەریوان، باوکی کۆچی دوایی کردبوو و لە ژیاندا نەما بوو. بۆ مەبەسی کاری مەلایەتی و دابینکردنی ژیانی تایبەتیی خۆی لە گوندی کیکن، نزیک مەریوان نیشتەجێ بووە. لە پاشانا ژنی هێناوە و خێزانی پێکەوە ناوە. لە ساڵی ۱۹۰٤ حوسێن بەگی بێڵوو لە گوندی خۆیدا کردوویەتی بەمامۆستای حوجرەی مزگەوت. بێڵوو گوندێکە لە نێوان پێنجوێن و مەریوان. ئیتر هەموو ژیانی لەوێ بردۆتە سەر و بەکاکە حەمەی بێڵوو ناوبانگی دەرکردووە.

لە دوای کوشتنی شێخ سەعیدی حەفید لە مووسڵ لە ساڵی ۱۹۱۰دا بەماوەیێک شێخ



مەحموود لە گەشتێکیدا بۆ مەریوان ئاشنایەتی لەگەڵ ناری پەیدا دەکا. لە پاشانا دەبن بەهاوڕێی نزیک و یەکتریبیان خۆش دەوێ. قسەی خۆش و گاڵتەوگەپ و شەڕە شیعر (شیعر شیعرێن) لە نێوانیاندا زۆر بووە. لە شێخ مەحموود بیستراوە وتوویەتی: ناری یەکێ بووە لەو کەسە دەگمەنانەی ناو کۆمەڵی کوردەواری لە کەس شتی بەدیاری وەرنەگرتووە. هەروەها لەم بارەیەوە شێخ ڕەئووفی شێخ مەحموود وتوویەتی: حوسێن بەگی بێڵوو بۆی گێڕاوەمەتەوە، تاهیر بەگی جافی شاعیر گوندی بالیکەدەری بەناوی دیاری بەناری بەخشیوە. کە ئەم قسەیە گەیشتۆتە ناری بەسەرسوڕمانەوە وتوویەتی: چۆن من بووم بەعەبدی تاهیر بەگ و فیرعەونی ئەم مەزڵوومانەی دێی بالیکەدەر! من نە عەبدایەتیم پێ دەکرێ نە فیرعەونی. بەم جۆرە دیارییەکە ڕەت دەکاتەوە. دیسانەوە لە زاری شێخ ڕەئووف بیستراوە وتوویەتی: ناری لووتی ئەوەندە بەرز بووە، هیچی لە کەس وەرنەگرتووە و ڕەنجبەری کردووە و تەنیا لەسەر کیسەی خۆی ژیاوە.

ناری کەسێکی گفتوگۆ شیرین و بە دەموپل و نوکتەچی و قسە خۆش بووە. خزمەتی هاوڕێ و برادەرانی خۆی کردووە، چاو تێر بووە، خەڵکی ڕێزیان گرتووە و خۆشیان ویستووە.

کاکە حەمەی ناری لە ساڵی ۱۹٤٤ کۆچی دوایی کردووە لە گوندی بێڵوو نێژراوە.

### شیعری

#### لە ڕووی ڕوخسارەوە

بەپێی ئەم خاڵانەی خوارەوە شیعری ناری لە بابەت ڕوخسارەوە ڕوون دەبێتەوە:

۱- کێش: شیعری ناری هەمووی لەسەر بەحری عەرووز ڕێکخراون. شاعیر بەحرەکانی هەزەج و ڕەمەل و موزاریع و بەسیت و موتەقاریبی بەکار هێناوە. لە ناو کێشەکاندا لە هەمووی زیاتر بەحری هەزەج و ڕەمەلی ڕەچاو کردووە.

۲- قافیە: ناری هەموو دەنگەکانی ئەلفوبێی زمانی عەرەبی و کوردی بۆ قافیەی شیعری بەکاری نەهێناوە. تەنیا ئەم دەنگانە لە شیعریدا دەبینرێن: ا، ب، ت، ج، د، ر، ز، س، ق، ل، م، ن، وو، ۆ، ە، ی، ێ. بەگشتی بایەخی تەواوی بەقافیە داوە لە ڕووی سووکی ئاوازی ئەو دەنگانەی دەبن بەقافیە. هەرچی پاش قافیەشە لە شیعریدا بەرچاو دەکەوێ. لە خوێندنەوەی شیعریدا خوێنەر دەکاری ئەم وشە و ئامرازانە لە گوێیدا

بزرنگێنەوە: دەکا، ناکا، هات، چبکەم، ژن، بوو، تۆ، هاتەوە، نییە، هەیە، چییە، نابێ، بێ، چی، دەوێ، نەبێ، خۆم.

٣- ڕەوانبێژی: ناری یەکێکە لەو وەستایانەی شیعری کلاسیکی بایەخی زۆریان بەڕەوانبێژی داوە، هەموو بابەتەکانی ئەم شێوازە جوانکارییە لە بەرهەمی شیعریدا دەبینرێن. ڕەوانبێژی پێوەندییێکی بەهێزی لەگەڵ ڕەمز و ئیشارەت و موعەممادا هەیە جار جارە هەناسە لە ڕۆمانتیک وەردەگرێ، بۆیە کۆمەڵێک شیعری ناری وەک سەرچاوەییێکی گرنگ دەکەونە بەردەست ڕەخنەگری ئەدەب بۆ دۆزینەوەی وێنە و مانای بەرزی داهێنراو لە شیعریدا.

٤- زمانی شیعر: زمانی شیعری ناری وەک وشەی فەرهەنگی ئاسانە، بەڵام کە ڕستە و مانای لێ دروست دەکرێ هەندێ جار قورس دەبێ. ئەگەر زمانی شیعری لەگەڵ شاعیرانی دیکەی کلاسیکی کورد بەراورد بکرێ، ئەو ڕاستییە دەزانرێ ناری لەو شاعیرانە کەمتر وشەی بێگانەی بەکار هێناوە، ئەگەر بەکاریشی هێنابێ ئەو وشانەیە کە چوونەتە ناو زمانی کوردییەوە و خوێندەوار و نیمچە خوێندەواری کورد ئاگای لەو وشانەدا هەیە. بەگشتی تەعبیری ناری لە بابەت زمانەوە زیاتر کوردانەیە، واتە وشەی بێگانەی کەمتر بەکار هێناوە.

٥- غەزەل (لیریک): ئەم بابەتە شیعرەی لە ڕووی قەوارەوە مام ناوەندییە، بەزۆری لە نێوان دە دێڕ و بیست دێڕە شیعر دایە، شیعری زۆر کورتی کەمە و قەسیدەی درێژیشی کەمترە.

٦- پێنجین: کۆمەڵێک پێنجینی هەیە لەسەر بنچینەی قافیەی ئاسایی (اااا ب...) دامەزراوە. شاعیر لەم جۆرە شیعرەدا داهێنانی هەیە وەکو ئەوەی لە هەر بەندێکی پێنجینەدا سێ نیوە دێڕی یەکەمی لەسەر قافیەییێکە، دوو دێڕی دوایی لەسەر قافیەیێکی دیکەیە (ااا ب ب...)، هەروەها لە پێنجینێکی دیکەدا نیوە دێڕی دوایی لە هەموو بەندەکاندا دووبارە و سێ بارە کراوەتەوە.

٧- پێنج خشتەکی: ناری ئەم جۆرە شیعرەی کەمە، شیعرێکی مستەفا بەگی کوردی کردووە بەپێنج خشتەکی.

٨- تەرجیع بەند: دیوانی ناری تەرجیع بەندێک دەور دەکاتەوە، دەکرێ تەرجیع بەندی نیشتمانی پێ بوترێ. لە شەش بەند پێکهاتووە، هەر بەندی بریتییە لە پێنج دێڕە شیعر.



## لە ڕووی ناوەڕۆکەوە

شاعیر تا پلەییێک مەرجەکانی شیعری کلاسیکی لە بابەت ناوەرۆکەوە پاراستووە. لە هەندێ بەرهەمیدا شناسنامەی شیعرەکەی دیار و ئاشکرایە، وەک تەنیا دڵداری بێ یا ستایش، کەچی لە شیعری دیکەیدا هەست بەم دیاردەیە ناکرێ. هەروەها ناری لە هەموو بابەتەکانی شیعری کلاسیکی نەوتووە، بەڵام نموونەی زۆربەیانی هەیە.

١- نەعت: ستایشی پێغەمبەر لای ناری هەیە، بەڵام کەمە، ئەو کەمە بەرز و ڕەنگینە، کەچی شیعرە ئایینییە گرنگەکەی دیکە ئیلاهییات (موناجات) لە بەرهەمیدا بەرچاو ناکەوێ.

٢- وەسف و دڵداری: مەبەس لەمە ئەو جۆرە شیعرەیە بەهەناسەییێکی دڵداریی مەجازی یا ماچوموچ و دەسبازی لەگەڵ ژنی جواندا نووسرابێتەوە. ئەم جۆرە شیعرە وەک ئاشکرایە بەزۆری لەگەڵ وەسفی سروشت و بەتایبەتی کەژی بەهارا تێکەڵ دەبێ ئەم بابەتە شیعرە لە دیوانی ناریدا زۆر نییە.

٣- ستایش و پێداهەڵدان: نموونەی ئەم بابەتە لە بەرهەمی ناریدا زۆرە. ئەوەی سەرپێیی ئەم شیعرانە بخوێنێتەوە وا دەزانێ ناری دەفێکی بەدەستەوە گرتووە و بەم ئاوازەوە شیعری خۆی دەکا بەگۆرانی بۆ ئەوەی خەڵکی دەستی بگرن و خێری پێ بکەن، کەچی ڕاستییەکەی ئەوەیە بەشایەتی شێخ مەحموود و شێخ ڕەئووفی کوڕی کەم کەسی وەکو ئەو لە کۆمەڵدا بووە دەستی لە کەس پان نەکردبێتەوە و هەموو جۆرە دیاری و سەوقاتێکی ڕەت نەکردبێتەوە. کەوابوو مەسەلەی ئەم هەموو ستایشە زۆرەی لە شیعریدا دەبینرێ ئەوەیە هاوڕێ و دۆستی زۆر بوون، پێوەندیی لەگەڵیاندا دڵسۆزانە بووە بۆیە هەموو شیعرەکانی لەم بابەتەوە زادەی ئەو خۆشەویستییە مرۆڤایەتییە بوون.

شێخ مەحموود لە دۆستانی ناری لە لای ئەو لە هەموویان خۆشەویستتر بوو. جگە لەو شاعیر یار و یاوەر و دۆستی زۆر بوون کەسانێکی وەکو کوڕانی شێخ مەحموود بابا عەلی و شێخ ئەحمەدی حەفید و بڕێک لە بەرزنجییانی خزمی شێخ مەحموود، ئەوجا شاعیرانی وەکو تاهیر بەگ و عەلیی کەمالی باپیر ئاغا و قانیع و شێخانی تەوێڵە و بیارە و مەلا عەزیزی بالیکەندی و هی دیکە.

٤- کۆمەڵایەتی: بەشێ لە ناگزووری و گیروگرفتی کۆمەڵ لە شیعری ناری ڕەنگی

داوەتەوە، وەکو شاعیرانی دیکەی کلاسیک لەو باوەڕە دایە چارەنووس (قەدەر) بەرپرسیارە. دەرمانی دەردی کۆمەڵ بەلای شاعیرەوە ئامۆژگارییە. هەندێ لەوانەی لە شیعریدا هاتوون وەرگیراون، هی دیکە لە داهێنانی شاعیرن. بەم پێیە ئەم دیاردانە دەبن بەهۆی ئەوەی وێنە و ماناکانی شاعیر لەم جۆرە شیعرانەدا وەک بیروڕاییێکی دانایانە و فەلسەفییانە خۆیان بنوێنن.

٥- نیشتمانپەروەری: یا گیانی کوردپەروەری (کوردایەتی) لە لای ناری لە ئەنجامی دۆستایەتی لەگەڵ شێخ مەحموود پەیدا بووە. ئەم دۆستایەتییە لە سەرەتادا لەسەر بنچینەی ئایین و دەروێشیزمی تەریقەتی قادری بووە کە باپیرە گەورەی شێخ مەحموود شێخ مارفی نۆدێ و کاک ئەحمەدی شێخ دایانمەزراندووە، لە پاشانا بەهۆی ئەوەی شێخ مەحموود شێخایەتی و تەریقەتی گواستۆتەوە و لەگەڵ سیاسەت تێکەڵ بەیەکتری کردوون و دەسەڵاتیان لێ پەیدا بووە، بەم شێوەیە شێخ مەحموود بووە بەخاوەن دەسەڵات و لە ئەنجاما بووە بەگەورەی کورد. لێرەدا بۆ ناری زۆر ئاسایی بوو بەهۆی شێخ مەحموودەوە گیانی کوردایەتی لە دڵ و دەروونیدا چەکەرە بکا و ببێ بەبیروباوەڕ و لە بەرهەمی شیعریدا ڕەنگ بداتەوە.

٦- شیعری کراوە (ئیرۆتیک): لە دیوانی ناریدا هەندێ وێنەی کراوە لە بارەی ئەندامی شارراوەی لەشی ژنەوە دەبینرێ، ئەم وێنانە خاسیەتی تایبەتییان هەیە، لەوانەن لە ئەدەبی کوردیدا بەنوێ و داهێنراو بژمێررێن چونکە شاعیر بەچاوێکی نزم دەنوارێتە ژن، بەلای ئەوەوە لە بنجدا بۆ چێژ و خۆشیی پیاو دروست بووە، هەروەها کەسێکە تاوانی کردووە، دایکە حەووای هەموو ژنانی گێتی خۆی و ئادەم پێغەمبەری بەدەرکردن دا لە بەهەشت. لەبەرئەوە پێویستە پیاو کە ماچوموچی لەگەڵدا دەکا ئازاری بدا. ژن بۆ ئەوەیە لە لایێک چێژ و خۆشی بداتە پیاو و لە لایێکی دیکەوە هەقی خەتا و تاوانی خۆی وەربگرێ.



## نموونەی شیعری

### دڵداری

١

لە شیعرێکیدا ناری دەڵێ:

وەک ڕوودی بەری دووڕووەیە چەشمەیی چاوم
وەک سۆزی دڵی شێخە کزە جەرگی بڕاوم
مەشهووری هەموو عالەم و ئافاقە کەوا من
سەودازەدەیی عیشوەیی تورکانی ڕەزاوم
تورکێ کە بەزۆری نەزەر و ناز و گریشمە
بردوویە قەتاری خێرەدی یەغمە کراوم
ئاهوو ڕەوشێ غەمزە فرۆشی بەنەزاکەت
پرسی لە عەقیدە و ڕەوش و مەزهەب و ناوم
پێم ووت کە لە زومرەی خەدەمی عاشقی ڕووتم
بۆ میهری ڕوخت مایل و موحتاجی هەتاوم
موحتاجی دەرم تالیبی دینار و درەم نیم
غەمبار و برینداری دڵی تازە بڕاوم
(ناری) لە دەری حەزرەتی مەحموودە تەمەننای
دەرمانی عیلاجی دڵەکەی تازە دزراوم

لەم لیریکەدا ناری یاری بەوشە دەکا و وێنەی ڕەوانبێژی دادەهێنێ. چاوی خۆی بەڕووباری دووڕووەوە دەچوێنێ، ئەمە گوندێکە لە مەریوان، ئینجا تورکانی ڕەزا و واتە جوانانی ئەو جێیە شاعیریان خستۆتە ناو کەمەندی دڵداریی خۆیانەوە. ڕەزا و ئاواییە لە هەورامانی ئەودیو. وەک دەردەکەوێ دەبێ یەکێک لەو جوانانەی ڕەزا و دڵی نارییان سمی بێ. شاعیر لەم شیعرە پڕ سۆزەشیدا بەرامبەر بەژن شێخ مەحموودی لە بیر ناچێتەوە دوا دێڕی شیعرەکە بەناوی ئەو پیرۆز دەکا کە دەڵێ دەرمانی دڵی دزراوم لای شێخە.

## ٢

له لیریکێکی بابەتی وەسفدا دەڵێ:

هەتا غـونچـەی گـوڵـی دڵ بێ لە لالەی نەوبەهارم چی
لەگـەڵ شـمـشـادی باڵاکـەی لە سـەرووی جـۆیبـارم چی
کـە یاری دەس بدا بۆ مـن لەسـەر سـینـەی بەجـووتێ بەی
لە بازی و سەیری مۆرەی نەردی سەر تەختە و قومارم چی
ئەگـەر بگرم لە دەس یەکـدەم ترنجی غـەبغـەبەی کـاڵـی
لە لیـمـۆی زەرد و سـێـوی ئاڵ و نارنج و هەنارم چی
ئەبەد تەشبیـهی ڕۆژ و شـەو بەزولف و ڕوومـەتی ناکـەم
کـە وەسـفی دوو مـونافی هەر وەکـو لەیل و نەهارم چی
کـە بۆ مـاچی دەمی وەک چاوی مـەسـتی تۆبە دەشکێنم
غـولامی تورکی مـەخـمـوورم لە شـێـخی تۆبەکـارم چی
بەشەرحی خاڵ و خەتتی حیکمەتی ڕوخساری مەشغووڵم
لە سـیـرری حـاشـیـەی زولفی سـیـاهی تار و مـارم چی
بەقـانوونی غـولامی گـەر قـوبووڵم کـا لە دەرگـادا
لە چەتری عـەیش و تەخـتی ناز و تاجی ئیعـتـبـارم چی
گـرێبـانی سـەبووری پارە کـردم تیـری مـوژگـانی
دەبا من ڕوو لە سـەحـرا کـەم لە ئارام و قـەرارم چی
لە خـۆفی چاوی مـورغی دڵ لەسـەر شەهدی لەبی لاچوو
کـە یەعنی من لە زەخم و حـەملەیی بازی شکارم چی
خـەیانەت تا ئەبەد (ناری) بەتەحـریکی مـوژەی ناکـەم
لە بەند و کـۆت و زنجـیـری فـەلاقـەی سـەختی یارم چی

لەم شـیـعـرەدا ناری هەندێ شت لە سـروشت و ژیانی کـۆمـەڵایەتی دەدۆزێتـەوە، ئەو کەرەستانەی بۆ بەراورد و لەیەکچواندن بەکار دەهێنرێن. شاعیر بەشێوەیـێکی دیکە ئەو بەراوردە دەکا. بەلای ئەوەوە شتەکە لە سیفەتی دلبەری ناکا، هەروەها سیفەتی ئەویش لە شتەکە ناچێ، بەڵکو سیفەتەکەی دلبەر هەر خۆیەتی و تاک و تەنیایە و شتی دیکە لە



ناوەوە نییـە شایانی ئەوە بێ لەگـەڵ ئەودا بەراورد بکرێ، بۆیە شـاعیـر داوای ئەوە دەکـا سیفەتە ئەسڵییەکە بۆ خۆی بێ، بەم ڕەنگە پێویستی بەو شتەی ناو سروشت و کۆمەڵ نییە.

## ٣

ناری وەسفی کەنیشکێک دەکا کەوای تاقەی لەبەر بووە:

ئەو کـەوا تاقـە بەشـێـوەی پێکەنین
وەردەگـێـڕێ پیـری سـەد سـاڵە لە دین
تازە سـەییـادە لـە چینۆ هـاتووە
عـیـدی قـوربانە بەقـوربانی دەبین
ئاهوییێکی وەحـشـە دڵ وەحشی دەکـا
ئەی دڵ ئاگـا بە بەوەحـشی دەرنەچین
حەسرەتی زەردی شـەمـامـەی باغـەڵی
عەیشی سوورم پێ دەکا هەردەم بەشین
(ناری) ئـەمـرۆ عـاجـز و ئاشـوفـتـەیە
جـەرگی سـووتاوە بەهیـجـری نازەنین

ئەو ئادەمزادەی ناری وەسفی جوانیی دەکا گۆیا کەوای قوماشی تاقەی لەبەر بووە. زۆر ئاساییە خوێنەر نەزانی ئەمە کیژۆڵەییەکە، یا مێردمنداڵێکە چونکە لەو سەردەمەدا ژن و پیـاو کـەوای تاقـەیان لەبەر دەکرد. خۆ ئەگـەر بووترێ کە دەڵێ لە چینەوە هاتووە مـانای ئەوەیە ئەو یارە کچە، ئەمەش بەڵگەییێکی بەهێز نییە بۆ یەکالاکردنەوەی ئەو یارە کوڕە یا کچە! تەنیـا لە دواییـدا شاعیـر کە دەڵێ «شەمـامـەی باغـەڵی» یارەکە وەکو پەیکەری کچێکی جوان دەکەوێتە خەیاڵی خوێنەرەوە. لە پاشانا شاعیر لەباتی ڕستەی «لە چینەوە هاتووە» دەڵێ «لە چینۆ هاتووە» ئەمە کاریگەری دیالێکتی گۆرانییە.

## ٤

ناری ڕاستی وتووە کە ژنی کردووە بەهەوێنی ژیان:

باڵی هومـا سـێـبـەری زولفی پەرێشـانی ژن
نافـەیی مـوشکی خـەتا پەرچەمی ئەفـشـانی ژن

کەعبەیی ئەربابی دین قیبلەیی خەڵوەت نشین
شەمعی شەریعەت کوژێن ڕوومەتی ڕەخشانی ژن
بایسی توولی حەیات عیللەتی فەوت و مەمات
خەندە بەڕووی نازەوە ڕوومەتی ڕەخشانی ژن
باغی دڵ و کانی دڵ گوڵشەنی ڕوخسارییە
گەنجی فەرەح بەخشی دڵ لەعلی بەدەخشانی ژن
ئایەتی میهر و وەفا سوورەتی سیدق سەفا
مەرهەمی دەرد و جەفا غونچەیی خەندانی ژن
مەرکەزی عەیش و نەشات زەمزەمی عالی سیفات
چەشمەیی ئاوی حەیات چاهی زەنەخدانی ژن
مەئمەنی ئەمن و ئەمان مەلجەئی شێری ژیان
چەتری سەری عاریفان سێبەری دەربانی ژن
ئەم غەزەلی (ناری)یە عیللەتی ناچارییە
ترسە لە بێ نایی یو مەسخەرە پێدانی ژن

لەم شیعرەدا ناری ئەو سیفەت و ڕەوشتانە لە ژندا دەستنیشان دەکا کە دەبن بەمایەی خۆشی بۆ پیاو. بێ گومان دژی ئەمانەش لە ژندا هەیە. شاعیر لە گەلێ شیعری دیکەیدا باس لەو خەوشە ناشیرینانەی ژنی کردووە، وەک ئاشکرایە نایەوێ بەدڵ و بەگیان باوەڕی هەبێ یا بەرگری لەوە بکا کە خۆی لەم شیعرەدا وتوویەتی. لەبەرئەوە دەڵێ ناچار بووە ئەم شیعرە دابنێ، ئەگەر نا هەرچی وتراوە مەرج نییە ڕاست بێ.

٥

ناری لە بەندی یەکەمی پێنجینێکی دە بەندیدا دەڵێ:

مەخمووری مەی و غەمزەیی دوو نێرگسی کاڵم
پامالی خوماری مەیە ئیدراک و کەمالم
بێ شەمعی ڕوخی شەوقی نییە گۆشەیی ماڵم
بۆ میهری وەفا شاهیدی مەیخانەیە حاڵم
دیدە کاڵ و شەمعی ماڵ و ڕوو بەخاڵم بۆ نەهات



بەندی دوایی پێنجینەکەش بەم ڕەنگە کۆتایی پێ هاتووە:

(ناری) چییە لوتفی نییە دەربانی نیگارم
سووچت چییە لای تاقمی دیوانی نیگارم
بتکەم بەفیدای توڕڕەیی فەرمانی نیگارم
تۆ بێژە بەیاران و غولامانی نیگارم
ئەمری شاه و حوکمی جاه و دەفعی ئاهم بۆ نەهات

وەکو لەم بەڵگەیە دەردەکەوێ ناری هەوڵیداوە پێنجینەکەی لە ڕووی ڕوخسار و ناوەڕۆکەوە مۆری مستەفا بەگی کوردی پێوە بێ. گیانی کوردیی شاعیر لە فەزای شیعرەکەدا شنە دەکا. هەست ناکرێ ئەم غەزەلە بۆ مێیینە وترا بێ و ناچێتە ناو عیشقی مەجازی زەمینییەوە، بەڵکو بۆنی شیعری موتڵەقی دڵداریی سۆفیزمی لێ دێ.

**ستایش و پێداهەڵدان و شانازی**

بەشی هەرە زۆری شیعری ئەم بابەتەی ناری پێشکێشی شێخ مەحموود و بنەماڵەی شێخانی سلێمانی کراوە.

لە قەسیدەیێکیدا دەڵێ:

بەئاه و ناڵە مەشغوولم لە نەغمەی ساز و تارم چی
ئەسیری میحنەت و دەردم لە سەیری نەوبەهارم چی
لەگەڵ خاری غەما جووتم لە عەیشی گوڵشەن ئازادم
نەخۆشی دەردی هیجرانم لە خۆشی لالەزارم چی
لە پایەی گەردی سەیوانی فیراقت بێ نەوا ماوم
لە ناز و نیعمەت و گەنج و مەتاعی ئەهلی شارم چی
مەحەللەی گۆیژەی شەوقم سەراسەر پاکی وێرانە
لە کەیف و سوحبەت و سەیران و چەشمەی سەرچنارم چی
بەبێ تۆزی ڕیکابی کە چەتری خوسرەوی سەر بوو
لە تەختی مەسنەدی دارا وو تاجی شەهریارم چی
بەبێ سایەی ووجوودی تۆ کە سەرمایەی حەیاتم بوو

له سایه و سێبەری شمشاد و سەروی جۆیبارم چی
بەبێ شەمعی جەمالی تۆ کە پەروانەی دڵی من بوو
له شوعله و شەعشەعەی بەنزین و مەه خورشید و نارم چی
هەتا چۆڵی بیابانی فیراقت ماڵ و مەئوامە
له سەیری قەسری شیرین و له ئەیوان و تەلارم چی
موریدی میحنەت و دەردم غەمی تۆ پیر و مەولامە
له مرقەی سۆفیی و هاوار و جەزبەی تۆبەکارم چی
له لەوحی سینەما تا قامەتی ئەلفت خەیالم بێ
له فێ وو ڕێ وو شینی مەنزڵی بێ یار و تارم چی
تەبیبم غەم جەفا هەمدەم ئەلەم هەم قووتە هەم مەرهەم
خەریکی شیوەنم دەم دەم لە ڕەنج و غەم گوسارم چی
کە بۆ من دەردی دووری ئافەتی ڕووح و سەر و ماڵە
له شۆر و لۆمە وو فیتنەی زەمانە و ڕۆژگارم چی
بەپیری دڵ شکستی تەکیەگاهی چۆڵی پیرانم
له زیکری پیری هەورامان و بەحسی شالیارم چی
کە من غەرقی زریباری غەمی تۆ بم له بێلوودا
له ناڵە و شیوەن و دەرد و غەمی ئەغیار و یارم چی
مەدینەی ناسرییەی دڵ بەیادی تۆ کە ئاوایە
له مەعموورەی عیراق و تورک و چین و قەندەهارم چی
ووتی نەفسم بەخزمەت چی قوبوولم کە ووتی هەی دەی
له خزمەتچی سەگ و مەلعوون و پیس و نابەکارم چی
لەگەڵ بەدئەسڵدا وەک ئەو نەتیجەی ئولفەت و مەیلە
کەوا بێ من له مائیل بوو مار و گورگەهارم چی
بڵێ (ناری) له کونجی میحنەت و غەمدا هەتا ماوی
بەبێ بازی فەرەح ئاخر لە سەیران و شکارم چی

ناری ئەم قەسیدەیەی بۆ شێخ مەحموود نووسیوە لەو سەردەمەی لە شاری ناسرییەی باشووری عیراق لە ساڵانی ١٩٣١ - ١٩٣٣ دەستبەسەر بووە. لەم قەسیدە ناسکەدا



شاعیر یادی ئەو جێگە و ڕێگە و سەردەم و کاتە خۆشانە دەکاتەوە، هەندێکیان پێوەندییان بەشێخ مەحموودەوە هەیە، ئەوانی دیکەیان بەشاعیر خۆیەوە. لەوانە گردی سەیوان و گەڕەکی گۆیژە و سەرچنار و قەسری شیرین و پیران (گوندێکە لە مەریوان) و هەورامان و بێلوو و ناسرییە و عیراق و چین و قەندەهار، لەو جێگایانەدا کاتی خۆشی دەدۆزرێتەوە، بەڵام ئەو خۆشییانە بەو چی، ئەگەر شێخ مەحموود دیل و ئاوارەی هەندەران بێ. لە دوا نیوە دێڕی قەسیدەکە دەڵێ ئەگەر بازی فەرەح واتە شێخ مەحموودی لەگەڵدا نەبێ، ئەو سەیرانەی دەیکا کەی بەسەیران و ڕاووشکار دەچێ، ماتەمێکە بۆ خۆی!

## دانایی و کۆمەڵایەتی

دانایی و بیری قووڵ و قسەی نەستەق و ئامۆژگاریی گەردوونی لە هەندێ لە شیعرە مەبەسە جیاوازەکانی ناری بەڕوونی دیارە. جگە لەوە هەر لە ناو ئەو جۆرە شیعرانەدا ئاماژە هەیە بۆ برێک لە دیاردەی کۆمەڵایەتی.

١

ناری لە شیعرێکیدا دەڵێ:

هەتا سایەی بەهەمسایەی هوما بوو
هوما وەک سێبەری بێ سایە مابوو
ووتم زەخمی موژەی دەرمانی مەرگە
کەچی فەرموویە دەردی بێ دەوا بوو
مەگەر عومرم لە بۆ وەسڵی بەبادەم
کە شانەی پەرچەمی بادی سەبا بوو
بەگریەم پێکەنی و دڵ کەوتە خەندە
کە یەعنی عوقدەیی موشکیل گوشا بوو
ترازووی زولفی ڕۆژ و حوسنی کێشا
تەفاووت هەر لە ئەرزۆ تا سەما بوو
خەتی توڕڕەی شکستەی بۆبە حەل بوو
لە شەودا کوڵمی بێ شەم شەوچرا بوو

نەمـا مـەیلی بەچا سـاقی لە مـێـدا
شەکەرخەندە بەڕەنگی مەی کە چا بوو
ئەگەر کەوسەر لە عاشق مەنعە بۆچی
خـەمی زولفی کـەمـەندی ئەولیـا بوو
کە تەوقی غەم ئەزەل تەقسیم کرا دیم
ئەوی تەوقی لە ملدا بوو مـەلا بوو
لە گـەنج و دەوڵەتی نەزم و غـەزەلدا
وەکو (نالی) غەنی (ناری) گەدا بوو

لە سەرەتای خوێندنی ئەم شیعرە هەست بەگێتیی داهێنانی بێ پایانی نالی دەکرێ. ئەمە پێش ئەوەی خوێنەر بگاتە دێڕی دوایی کە ناری بەناوهێنان یادی نالی دەکاتەوە، ئەو بەدەوڵەمەند دادەنێ خۆی بەهەژار لە مەیدانی شیعردا. خەیاڵی شاعیر لەم شیعرەدا لە ناو قاڵبی داناییدا مەییوە. وەستایەتی ناری لەوە دایە توانیویەتی هەندێ کەرەستەی بەراورد بەکار بێنێ لە پێناوی وێنەکێشانی ئەندامە جوانەکانی دلبەر، لە لایێکی دیکەوە گێڕانەوەی باس و خواسی کردەوە دڵگیرەکانی ئەو یارە خۆشەویستە.

٢

لە شیعرێکی دیکەیدا لەم بابەتەوە دەڵێ:

خـەمی پشـتی بەنی ئادەم بەباری ژن نەبوو چی بوو
ئەسـاسی غـوربەتی ئادەم بەباری ژن نەبوو چی بوو
ئەگەر هارووت و مارووتن لە چاهی زیللەتا جووتن
بەفیتنەی چاوی مەستی پڕ خوماری ژن نەبوو چی بوو
ئەگەر قابیل بەقاتیل بوو لە حەق بێ مەیل و غافل بوو
سەبەب گوڵزاری ڕوخساری عوزاری ژن نەبوو چی بوو
لە کێوی بێستوونی میحنەتا فەرهادی بێ مەئوا
پەرێشان و پەشێو و داغداری ژن نەبوو چی بوو
نەمامی کەوکەبەی شیرین لە وەختی میهری فرزەندی
لەسەر باغی گوڵی بۆس و کەناری ژن نەبوو چی بوو



ئەگەر بێژەن موقەییەد بوو لە چاهی شاهی تورکانا
بەحەلقەی داوی زولفی خار و ماری ژن نەبوو چی بوو
ئەگەر مەجنوونە شەیدایە بەشێتیی وێڵی سەحرایە
بەدڵ ڕەنجوور و بێ سەبر و قەراری ژن نەبوو چی بوو
لە زیندانی جەفادا بێ سەفا ما ماهی کەنعانی
بەمەکر و داوی تەزویری بەکاری ژن نەبوو چی بوو
مەلا وەک تاقمی شێخ و بەگی داماو و بێ چارە
سەرەفگەندەی چەپۆک و دەردەداری ژن نەبوو چی بوو

لەم شیعرەدا ناری هەوڵ دەدا جێگەی ژن لە بوونی ژیانی گەردوونی ئادەمزاد دیار بکا. بۆ ئەمە پەنا دەباتە بەر ڕووداوی ڕۆژگار و مێژوو بەچاکە و خراپەیەوە. شاعیر ئەوە دەگێڕێتەوە ژن ئادەمی هەڵخەڵەتاند بۆیە لە بەهەشت دەرکرا. کێشە و کارەساتەکانی هارووت و مارووت، هابیل و قابیل لە سایەی ژنەوە بوو. شێت و شەیدایی و ئێش و ئازاری فەرهاد و مەجنوون و ئاوارەیی و بەندیخانەی یووسف هۆکاری ژن بوو. لەو کاتەی ناری بەڕووکەش ژن بەسەرچاوەی گوشادی پیاو دادەنێ، هەر ئەو ژنەش بەکانیی خراپە و ئاژاوەی دەژمێرێ.

## ماتەمنامە و شیعری جیابوونەوە

ئەم بابەتە شیعرە لە دیوانی ناریدا زۆر نییە، لە هەندێ بەرهەمیدا بەرچاو دەکەوێ. جاری وا هەیە شین و شەپۆر بۆ کەسێکی دیاریکراوی لە ڕوو دەگێڕێ، جاری وەهاش هەیە نازانرێ ئەو کۆچ کردووە یا دوورکەوتە و بەلەنگازە کێیە.

١

لە شیعرێکیدا بۆ شەهیدبوونی شێخ سەعیدی حەفیدی باوکی شێخ مەحموود دەڵێ:

فەلەک بۆ گەردوشی تۆ لەحزەیە تەرکی جەفا ناکا
بەقانوونی ئەدەب شەرمێ لە خاسانی خودا ناکا
مەگەر ئەو مادەری شمری سەگ و بووجەهلی مەلعوونە
کەوا قەت تەرکی غەم پێدانی ماتەمتەلعەبا ناکا

بەتەرزی ئیبنوموڵجەم پارە بێ جەرگی کەوا ڕەحمێ
بەئاه و سۆزشی سینەی حەزینی مورتەزا ناکا

***

حەفیدی حەزرەتی کاکەحمەدی قوتبی سلێمانی
کە بێ ئیمدادی فەیزی بەرگی گوڵ نەشئەونوما ناکا
لە شاری مووسڵا وەسڵی بەئەنواری شەهادەت بوو
بەڵێ روتبەی شەهادەت تەرکی ئالی مستەفا ناکا

***

کەسێ یەک زەڕڕە ئیمانی لە دڵدا بێ بەئیمانم
قوبوولی بوردەباری زیللەتی ئەم ماجەرا ناکا
نەماوە ئابڕوو بۆ ئەهلی گوڵ عەنبەر لە عالەمدا
بەبێ شک جوو لەمەولاوە لە قوتبیش مەرحەبا ناکا
سلێمانی بەبێ (نی) واقیعەن تەسغیری سەلمایە
کە ئەهلی وەک زەعیفەی بێ هونەر مەیلی غەزا ناکا
ئەگەر گوڵ ئابڕووی مابێ ئەبێ هەر سەر بەزانوو بێ
ئەگەر عیرفانی بێ بولبول بەڕووی گوڵدا نەوا ناکا
ئەگەر قومری درۆ ناکا لە دەوری هیجرە ناڵینی
لە دەوری گوڵ لە گوڵشەندا بە جوز نەعرەی بەبا ناکا
سەبووری لازمە تا ڕۆژی مەحشەر (ناری)ا هەرگیز
فوغان و شیوەنت جەبری زەلیلی ما مەزا ناکا

شینی ناری لەم شیعرەدا بۆ شەهیدبوونی شێخ سەعیدی حەفیدە لە ساڵی ١٩١٠ لە مووسڵ. شاعیر وەک نەوەی پێغەمبەر تەماشای دەکا و بەکەسێکی پیرۆز لە قەڵەمی دەدا چونکە زادەی کاک ئەحمەدی شێخ و باوکی شێخ مەحموودە. ئینجا ناری گیانی کوردایەتی لە خۆشەویستییەکەی شێخ مەحموود وەردەگرێ.

ئەم شیعرە لە سەرەتا و ناوەڕاستدا لیریکێکی ئاساییە، لە دێڕە دواییەکانیدا پێش ئەوەی شیعرەکەی کلیل بدا، بەوێنەی جوان دەیرازێنێتەوە بەوەی کەرتی (نی) لە وشەی (سلێمانی) وەردەگرێ، ئەوەی دەمێنێتەوە (سُلَیْما)یە. ئەمە بەعەرەبی بچووککراوەی



وشەی (سلمی)یە. شاعیر ئەمەی بۆ سووک و نزمکردنی خەڵکی سلێمانییە، پێیان دەڵێ: بۆچ ئێوە وەک ژن زەعیفەن، هەڵناستن و غەزا ناکەن لە دژی خەڵکی مووسڵ و تۆڵەی شێخ سەعید ناکەنەوە!

## ٢

لە بابەت دووری و ئاوارەیی و کارەساتی مردنەوە ناری پێنجینێکی پێنج بەندی هەیە، لە بەندی یەکەمیدا دەڵێ:

دەمێکە من لە غوربەتدا غەریقی بەحری حیرمانم
بەبێ گوڵ غونچە دەم دایم موقیمی کونجی گریانم
لە شوێنی بولبولی دڵ مات و سەرگەردان و حەیرانم
دەمێ بۆ گوڵ دەمێ بۆ دڵ زەلیل و زار و گریانم
گوڵەکەم ڕۆ دڵەکەم ڕۆ بەجارێ ماڵی وێرانم

بەم بەندە کۆتایی بەپێنجینەکەی دێنێ:

فریشتەم تاکو یاوەر بوو بەدایم عیشوەکاری بوو
سووروری مەجلیسان خۆش بوو بەزاری عیشقی(ناری) بوو
لە باغی وەسڵی دڵدا بێ غەم و ئەندۆ هەزاری بوو
کە بەختم چوو گوڵیشم چوو دڵیشم دەردی کاری بوو
گوڵەکەم ڕۆ دڵەکەم ڕۆ بەجارێ ماڵی وێرانم

ئەم پێنجینەی ناری برێک جیاوازی لەگەڵ پێنجینی ئاساییدا هەیە، بەوەی نیوە دێڕی دوایی لە هەموو بەندەکاندا دووبارە و سێ بارە دەبێتەوە.

هەرچەندە ئەم جۆرە شیعرە لە ئەدەبی کوردیدا دەچێتە خانەی غوربەت و دووری و جیابوونەوە، بەڵام بەم هەموو «ڕۆ ڕۆ...»یە شیعرەکە لە ماتەمنامە نزیک دەبێتەوە.

## شیعری کراوە (ئیرۆتیک)

شیعری کراوەی ناری پێوەندیی بەماڵی شێخ مەحموودەوە هەیە. شیعرێکی بۆ شێخ مەحموود وتووە، یەکێکی دیکەی بۆ بابا عەلیی کوڕی شێخ مەحموود داناوە.

١

شێخ مەحموود حەزی لە کچێکی جوانی خەڵکی مەریوان کردووە، ناوی مینا بووە. ناری بەم هۆیەوە بۆ گاڵتەوگەپ شیعرێکی بۆ دادەنێ و بۆی دەنێرێ. شێخ بەو شیعرە لە دڵدارییەکەی پەشیمان دەبێتەوە.

ناری دەڵێ:

زەرفی مینا شاهی من مەزرووفی ئەڵماسی دەوێ
وەک کونی ماکینە دەرزی تیژ و ڕەققاسی دەوێ
قەتعی ڕێگەی دۆڵە سوور و کانی گەرمی بەمووان
هیممەتی چاپوک سواری قەومی بڵباسی دەوێ
بەحری قولزوم تەجرەبەی قووڵی بەهەر کەس ناکرێ
ئیمتیحانی بێخی دەریا شەخسی غەوواسی دەوێ
چاوی مێروو موشکیلە تەشخیسی ئەو بێ زەڕڕەبین
ماهی نەو دۆزینەوەی ئەو زیادە ئیحساسی دەوێ
وەزعی بێ زەرفی لە بۆ تۆ ئیشی بێ زەرفی نییە
بوو کە شمشێری موجەوهەر مەحفەزی خاسی دەوێ
موختەسەر زەرفی زەریف و شەمعەدانی وەک بلوور
شەمعی کافووری میسالی بێ گرێ و ڕاسی دەوێ

ئەم شیعرە وەک لە پێش چاوە هەمووی ڕەمز و تەورییە و وێنەی ڕەوانبێژییە لە وەسفی ئەندامی مێیینە و نێرینەی ژن و پیاو. زەرفی مینا واتە ئەندامی مێیینەی مینا خانم پێویستی بەئەڵماس هەیە ببیرێ. مانای فەرهەنگی مینا شووشەیە، لە دواییدا بووە بەناو بۆ ژنان. ئەڵماس ئاماژەیە بۆ ئەندامی نێرینەی پیاو. هینەکەی مینا وەک کونی ماکینەی دروومان وایە پێویستیی بەدەرزی تیژ هەیە، دەرزی هینەکەی پیاوە. دۆڵەسووری بۆ میهبەل بەکار هێناوە، لە وەسفی لۆچی ئەندامەکەی مینا دەڵێ لە ناو کانییێکی بەرمووان



دایە، واتە ئەو کانییەی لە دەورووبەریدا موو ڕواوە. لەم شیعرەدا ناوی دۆڵەسوور و مووان هاتووە، ئەمانە هەردووکیان دوو گوندن لە ناوچەی مەریوان. لە دوای ئەمە شاعیر دەڵێ مینا خانم ئەوەندە بەهێز و سرک و سۆزانییە سوارچاکێکی بڵباسی گەرەکە. وەک زەریای سوور (قولزوم) وایە پێویستی بەغەوواسی چاک هەیە. ناری گەلێ بەڵگەی دیکە لە وێنەی ڕەوانبێژی جوان دەدۆزێتەوە بۆ ناشیرین کردنی هەڵوێستی شێخ مەحموود لەو دڵدارییەی شاعیر لەسەر ئەو باوەڕەیە ئەو کچەتیوە شایانی شان و شکۆی شێخ مەحموود نییە. جگە لەوە شێخ خێزانی هەیە و لەوەدا نییە بتوانێ دەرەقەتی ئەم کچە بێ.

٢

هەواڵێک لە ناوەوە بووە گۆیا بابا عەلی کوڕی شێخ مەحموود ویستوویەتی کیژێکی عەرەب بخوازێ ناوی کافیە بووە. ناری ئەم شیعرەی بۆ نووسیوە:

ڕۆژی عیشوە و عوشرەت و عەیش و تەرەب
ئەی موبارەک بێ لە تۆ شۆخی عەرەب
لەم مەقامە لازمە تەبریکی تۆ
گەر حەریفێ بێ کچ و عالی نەسەب
دەم وەکو گوڵ غەبغەبی هەر وەک ترنج
قامەتی وەک نەخل و مەمکی وەک ڕوتەب
کافیە بۆ سوحبەت و هەم شافییە
بۆ غەمی تەنیایی و شیرین لەقەب
قەوسی ئەبرۆی وەک کەمانی حەیدەری
ڕووی بەلووسی هەر وەکو لەوحی زەهەب
بیگرە و بیخە و گوڵۆڵەی کە وەکو
کوولەکەی دەروێش و خورما وو عینەب
بیخە شیوەن هەر وەکو باوک نەماو
چرکە چرکی بێخە وەک چیتی حەڵەب
بیخەرە ژێر حەملەیی حەمدانەوە
بیکە گاڵتە و تێی ترنجێنە بەگەپ
سووری سەر خڕ بێنە ڕەقس و پێکەنین

لووتی هەڵمـاسێ و ڕەقی کـە وەک حـەتەب
بیــــــدەرە بەر زەرگـی تیــــــژی قــــادری
پێی بکێـیشـە حەی حـەیی یا لیلعـەجـەب
هەر وەکـــــو حـــــەککاکی دانـا هەڵکەنە
نەخـشی (وا متُّ) لە لێـوی ئەو بەقـەپ
هەر وەکــو جــۆڵا شــەپیــتکەی پێــوەدە
لابـەرە پـەردەی ســـــــەرا پـەردەی ئەدەب
مـەسلەحـەت وایە (قل)ی لێ بکەی بە(فل)
تا هەتا مـــاوە لە تۆ نەگــرێ عـــەتەب
حـــەملەیی شــێـــرانە چاکـــە تا بڵێ
(إنّه لَيْثٌ شَـــجِــــيعٌ مُنْتَـــخَبْ)
(ئەو شــێـــرێکی ئازا و هەڵبـــژاردەیە)
دوور لە تۆ (ناری) بەبێ کــەس مـــاوەتۆ
بێ حـەواس و عــەقل و ئیــدراک و ئەدەب

شاعیر وێنەکانی ئەم شیعرەی لە ناو تەمومژی ڕەوانبێژیدا نوقوم کردووە، بەڵام لە ڕووی هونەری و جوانکارییەوە سەرکەوتووە. لە سەرەتادا بەجوانی ئەندامانی لەشی کچە عەرەبدا هەڵدەڵێ. ئاماژە بەدوو کتێبی «کافیە» و «شافیە»ی خوێندنی حوجرەی مزگەوت دەکا، بەیادی ئەوەی ئەو کچەی باسی لێوە دەکا ناوی «کافیـە»یە. ئینجا بابا عـەلی هان دەدا وەک شێرێک هێرش بەرێتە سەر ئەو کچە ناسکە بەستەزمانە ئەوەندە بیگەوزێنێ و هاواری لێ هەڵسێ و ناڵەی وەک دەنگی هەڵزڕاندنی قـوماشی چیتی حەڵەب بکەوێتە بەرگوێ. ئەوەندە بەهێـز حەمدانەکەی (ئەندامی نێرینەکەی) تێ بترنجێنی وەکو زەرگی تیژی دەروێشی قادری میتکەی بشێوێنێ و هەلا هەلای بکا، وای بەسەر بێنێ بەزمانی عەرەبی خۆی بڵێ: «متُّ!» واتە (هاوار مردم!). شاعیر لەسەر ئەو باوەڕەیە ئەگەر زاوا وا لە بووک نەکا هەتا هەتایە گلەیی لێ دەکا، بەڵام بەپێچەوانەوە ئەگەر هەڵسوکەوتی وای لەگەڵدا بکا دەڵێ: شێرێکی ئازا و هەڵبژاردەیە!

لەم شیعرەدا ناری ئەم کیژە عەرەبە جوانەی لە ئازارستانێکدا زیندانی کردووە، زاوا بووە بەزەبانییەیێکی دۆزەخ و بووک بەتاوانبارێکی گەورە. ڕاستییەکەی ئەوەیە ئەم شیعرە هەر



بەم شێوەیەی بەرهەمێکە لە شیعرە جوان و هونەرییەکانی بابەتی کراوە (ئیرۆتیک) لە ئەدەبی کوردیدا. ئەم هەموو دۆزەخەی ناری دەبێ بەبەهەشت و شیعرەکەش لە چوارچێوەی ئەو پیـاوە کـوردە و کـچـە عـەرەبەی بۆیان وتراوە دەچێـتـە دەرەوە و دەبێ بەنموونەیێکی نەرمونیانی شیعری کلاسیکی و بەزیندوویی دەمێنێتەوە لە هەموو کات و ڕۆژگارێکدا.

**نیشتمانپەروەری**

لە شیعری نیشتمانپەروەری و کوردایەتیدا ناری بەشی هەیە.

١

لە شیعرێکیدا دەڵێ:

مـن ئەدیبی کــــوردم و نـاوم نـیـــیـــــە
کــوردە هەر غــافل لە ناو و بێ خــەبەر
کوردە خـۆ مەحکومـە بۆ تورک و عـەجەم
کـوردە بێ فـیـکر و خـەیاڵ و بێ ئەسـەر
کـوردە هەر وەک بیـدی مـەجنوون مـاوەتۆ
بێ سـەر و بێ سـێـبـەر و خـاڵی لەبەر
کوردە وەک وەحشی لە بۆ چەشتەی تەمەع
خـۆی دەخـاتە مـۆڵەکـە و داوی خـەتەر
کــوردە بێ شــان و شکۆ مـاوە و نەمـا
قـیـمـەتی حـەتتـا وەکـو توور و گـەزەر
کـوردە فـیـکری عـاقـیـەت بینی نیـیـە
غـافل و بێ دەرک و بێ سـەمع و بەسەر
کـوردە بێ کـەس هەر کـەسێ دێتـو بەزۆر
دەیگرێ دەیـکا بەگــــا بێ یا بەکــــەر
بێ ووجـوودی مـوسـتـەمـیع لەم عـەسرەدا
(ناری)ا تاکـەی چەناگـەی بێ سـەمـەر

نـاری لەم دێڕانەدا بەبێ زیادەڕۆیی بـاس لە ژیانی تاڵ و دیلایەتی و سـەرشـۆڕی و

دواکەوتوویی کورد دەکاتەوە لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا. تەنانەت لە دوای هەرەسهێنانی هەموو ڕاپەڕین و هەڵسان و شۆڕشەکانی کورد لە کوردستاندا لە پێناوی سەربەخۆیی. بێ گومان شاعیر لەبەر ڕۆشنایی بیری میتافیزیکی شێوە کلاسیکییەکەی ڕۆژهەڵات لە مەسەلەکە ورد دەبێتەوە و باس لە واقیعەکە دەکا وەکو خۆی، بیر لە چارەسەری ناکاتەوە.

٢

لە دیوانی ناریدا تەرجیع بەندێک بەرچاو دەکەوێ، بەڕاستی جێی خۆیەتی ناو بنرێ «تەرجیع بەندی نیشتمانی». شیعرەکە بریتییە لە شەش بەند، هەر بەندی لە پێنج دێڕە شیعر پێکهاتووە، هەریەکەیان یەکێتیی قافیەی خۆی هەیە، دێڕی دوایی جووت قافیەیە (مەسنەوی) پێوەندی بەقافیەی بەندەکەوە نییە. قافیەی هەموو بەندەکان بەم جۆرەیە (اا اا ب، اااا جـ...). شاعیر لە بەندی یەکەمدا دەڵێ:

ئەی خاکی وەتەن بۆچی نەما شێوەیی پارت
بۆ بوو بەشەوی زوڵمەت و تاریکە نەهارت
بۆ باسی نەما دەفتەری ئەحکامی ئیلاهی
بۆ یادی خودا وا لە گوریزا لە کەنارت
بۆ عاجز و بێزاری لە مەعشووقەیی تەقوا
بۆ پیرەژنی کۆنە هەوا بووبوو بەیارت
وەک بازی جەفاکاری ستەم پیشەیی نەمروود
بۆ تەیری سەفا مورغی جەفا بوو بەشکارت
سا بۆچی نەکەم شیوەنی گوڵ سیسە لە باغا
دڵ بۆچی نەکەم لەت لەت و سەد پارە لە داغا

بەندی دوایی لە تەرجیع بەندەکەدا بەم شێوەیە هاتووە:

ئەی خاکی وەتەن غەفلەتی بێ غایە هەتاکەی
مەشغوولی هەوا وو هەوەس و کایە هەتاکەی
بۆ یادی مەقامی ئەبەدی مەحوە لە دڵتا
شەوق و تەرەب و مەنزلی بێ پایە هەتاکەی



دونیا کە هەموو لەحزە هەم ئاغووشی کەسێکە
سوحبەت لەگەڵ ئەم فاحیشە ڕیسوایە هەتاکەی
بۆ خۆت کە دەزانی لە مەرگ نیتە هەڵاتن
بەس ئەم هەموو تەفرە و شتە بێ جایە هەتاکەی
نازیش مەکە ئەی نەفسی فرۆ مایە بەتەدریس
نەک دەستی ئەتۆ بێ بگرێ خایەیی ئیبلیس

لەم دێڕە شیعرانەدا ناری فرمێسک بۆ بەختی کورد دەڕێژێ، مێشکی پڕە لە پرسیار، ئەو پرسیارانە وەرامیان نییە. لە دواییدا ڕۆڵەی نەتەوە هان دەدا، بیر بکەنەوە لە خراپە دوور بکەونەوە، لە چاکە نزیک بن، دوایی بەو ناخۆشییە بێنن کە بەدرێژایی مێژوو چەشتوویانە، کەس هێندەی ئەوان تووشی دەرد و بەڵا نەبووە.

## پەخشانی

بەشی زۆری بەرهەمی ئەدەبی ناری شیعرە، جگە لەوە پەخشانی جوانی شیعرئامێزی هەیە، لەوانەی بەعەرەبی سەجعی پێ دەڵێن، وێنەی ئەم جۆرە بەرهەمە لە چەند نامەیێکیدا دەردەکەوێ. لەم ماوەیەدا دوو نامەی دەخرێنە پێش چاو.

١

نامەی یەکەمی بۆ شێخ مەحموود نووسیوە:

«ڕووح و دڵ قوربانی ناڵی کەوشەکەت
سەربەسەر گەردی حەساری حەوشەکەت
دائیما موحتاج و موشتاقی لە بۆ
گەنجی یادی خاتری بێ خەوشەکەت

ئەگەر لە ڕێگەی مەرحەمەتەوە حاڵی ئەم پیرە غولامی خۆتانە مەنزوور بفەرموون بەکوردی و بەکورتی ئەمەیە عەرزم:

بەتیغی میحنەت و دەرد و جەفا جەرگی مەلا لەت بوو
بەڵێ مەعلوومی ئافاقە مەلا نیوەی مەلالەت بوو

وە ئەگەر مەیلت بەبەیانی توولانی بی و ئارەزووت لە حیکایەتی «قویلە و چووچانی» بێ ئەمەیە عەرزم:

دوور لە تۆ چاوم بێ بینش ماوە، قووەی بیستنم بۆ ناڵە و گرمەی هەوری بەهاری نەماوە، حەواسم سەراسەر فەوتاوە، دڵم بەئاگری مەحروومی وەک کەبابی سلێمانی برژاوە، جەرگم لە قازانی سینەدا بەبڵێسەی دووری وەک سڵقی کەرکووکی هەمیشە چاوەڕێگەی حافزم بۆ یاسین، موحتاجی هاتنی مەلام بۆ تەلقین، مائیلی شەش گەز جاو و دوو گەز خاکم بۆ تەسکین! وەلێ ئەگەر بەشارەتی مژدەی سوروور و سەلامەتی زاتی موبارەکتم زوو پێ بگا کە بۆ من ئەم مژدە ئاوی حەیاتە یەقینم وایە چاوم ببێ بەدووربین و زەڕەبین، وە لەگەڵ حەزرەتی خدر لە حەیات موساوی بین.

عەرزی مەخسووس کۆچ و کلفەت و دایکی سەعید بەگی بادەڵانی پەنایان هێناوە بەغولامی خۆتان، لەسەر واقیعەیێک کە نیسبەتی قەتلیان لە سەعید بەگ داوە، وە فیعلەن مەحبووسە لە حەپسخانەی حوکوومەتایە، ناچار منیش ئەوا پەنام قاپیی موبارەکت هێنا، شایەد فیکرێ بەحاڵی ئەو بفەرموون کە شایەد لە زەحمەتی حەپسا نەجاتی ببێ، وە مەعلووم ئەم پیرە غولامی قاپیی خۆتانە تا قیامەت، مەسروور و مەمنوون و موتەشەکیرتانە.

ئیتر هەرچی بڵێم زیادەیە، غولامی دەرگای خۆتانە ناری».

ناری ئەم نامەیەی لە مەریوان نووسیوە و بۆ شێخ مەحموودی ناردووە. لەسەر دەستووری کۆن بەشیعر دەستی بەنووسینی نامەکە کردووە، ئینجا کەوتۆتە مەدح و ستایشی شێخ، دووبارە تێکستی نامە پەخشانییەکەی بەشیعر ناواخن کردووە، ئینجا هۆی نووسینی نامەکەی بۆ شێخ گێڕاوەتەوە و تکای لێ کردووە هەوڵ بدا بەڵکو سەعید بەگی بادەڵانی لە بەندیخانە بۆ ڕزگار بکا.

## ٢

نامەی دووەمی بۆ بابا عەلی شێخ مەحموودی نووسیوە لەو کاتەی بۆ خوێندن لە میسر بووە:

«ئەی قیبلەیی ئەربابی وەفا، شەمعی شەبوستانی سەفا، ڕەونەقی دیوانی ئەدیبان و لەبیبان، دەبوستانی هونەرپەروەر و ئەهلی عورەفا، تاجی ووجووهی شورەفا، سەدری جەمیعی نوقەبا، فەخری جەمیعی نوجەبا، لالەیی گوڵزاری عەلی، گوڵبونی باغ و چەمەنی تاقمی ئەقتاب و وەلی، کانی گەوهەر، نووری بەسەر، ئەفسەری سەر کەوکەبی فەرخوندە سیەر، تاکو لەسەر دەورەیی ئەم چەرخە ببێت و بگەڕێ شەمس و قەمەر، جیسمی لەتیفت



بەئەلەم عاجز و ئەفسوردە نەبێ، زاتی ڕەئووفت بەهەم و میحنەت و غەم هەمدەم و پەژموردە نەبێ، بۆ منی بێ بەرگ و نەوا یەعنی بەقانوونی وەفا ویردی جیهانم ئەمەیە، زیکری زمانم ئەمەیە، مەزهەری ئیلتافی خودا بێ، لە حەوادیس بەریی و بێ غەم و بێ دەرد و بەلا بێ، لە هەموو مەحفەل و مەجلیس فەرەح ئەنگێزی دڵ و ئەهلی دڵ عوقدە گوشا بێ، بەدڵ ئاسوودە لە ناز و گریشمەی نەزەری دلبەری شیرین کەمەر و سیم بەر و جیلوەگەر و شۆخ و زولەیخا سیفەتی میسریی و تورکانی خیتابی بەخەتا، پەنجەیی تەرسا بەچە یا موغبەچەیی عیشوەگەری نەی کەمەری ئاهوویی سیمین زەقەنی جادوویی ئەفسانە زەنی وەک جیگەری من لە فیراقت بەدەنی جامەیی تۆ پارە نەکا. تۆ بەغولامی قەدی وەک عەرعەری دوو نێرگسی جادووگەر و فەتتان و جەفا پیشە وو خونخوارە نەکا.

بێینەوە سەر بەحسی گلە و بێ مەرحەمەتی، یەعنی دەلیلم ئەمەیە شێوەیی خەتتی ئەحسەنی تۆ نیسبەتی پیراهەنی تۆ مەتلەبی عوششاقە نەبوو، دەوڵەتی عوششاق نەبوو، عەیشی دڵی پارە نەبوو، ئافەتی ئەغیارە نەبوو، گەنجی هەوا خواهە نەبوو، ڕەنجیشی بەدخواهە نەبوو، مەخفیی پۆشیدە نەبێ چاکە لە ڕووتا کە ئەگەر ڕووتە، وە یا تاقی دوو ئەبرووتە، وەک قیبلە وەهایە.

بەسەری تۆ دڵەکەی من بەهەموو لەحزە وەکو قیبلەنومایە، لە تەریقی ئەدەبا سادیقی بێ کیزب و ڕیایە، لە هەموو بەخششی جوود و قەڵەمت ڕازی و قانیع بەسڵاوێک و دوعایە.

وەسسەلام

محەمەد بێڵوویی»

لەم بڕە پەخشانەدا ناری ویستوویەتی مەشقی ئەم جۆرە بەرهەمە بکا لە ئەدەبی کوردیدا، ئەگینا لە بنج و بناواندا ئەم پەخشانە کانگا و سەرچاوەی شیعرە. مەبەس لێرەدا لایەنی ڕێکخستنی ڕستە و عیبارەتە، ئەمانە هەموویان سەر بە بەحری عەرووز و کێشی خۆماڵی و قافیەی هەمەجۆرن، ئەوەی شاعیر کردوویەتی ئەوەیە یەکێتیی کێش و قافیەی ڕستەکانی شکاندووە یا ڕەنگاوڕەنگی کردووە، بۆیە بەرهەمەکە بووە بەپەخشانی ئاسایی ئەو بابەتەی لە ئەدەبی عەرەبیدا سەجعی پێ دەووترێ.

***

کاکە حەمەی بێڵوو (ناری) دەرچووی حوجرەی کۆن و دوازدە عیلمی ئایینی ئیسلام و زمانی عەرەبی بوو. داب و نەریتی ڕۆشنبیری نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم کاری لێ

کردبوو، لە هەندێ لە تەنگوچەڵەمە بنچینەییەکانی کۆمەڵ گەیشتبوو، بۆیە نوێگەری لە شیعریدا بەدی دەکرێ. وشە و ڕستەی تازە بابەتی بەکار هێناوە.

پێوەندی لەگەڵ شێخ مەحموود لە سەرەتادا لە ژێر کاریگەری ئایین و تەریقەتی قادری بوو، بەهۆی ئەوەی شێخ لە نەوەی کاک ئەحمەدی مورشیدی گەورەی تەریقەت بوو لە سلێمانی، ناری زۆر لێیەوە نزیک بوو، بەڵام لە دواییدا شێخ مەحموود وەکو سەردارێکی کورد بووە هۆی ئەوەی هەستی نەتەوایەتی لای شاعیر ببزوێ.

زمانی شیعری ناری تایبەتییە بەخۆی، شوێنەواری دیالێکتی گۆرانی زمانی کوردی بەزمانی شیعرییەوە دیارە. لە ڕوخساردا لە هەموو بابەت و ژانرە کلاسیکییەکانی نییە، کەچی لە ناوەرۆکدا زۆر دەوڵەمەندە، لەگەڵ ئەوەشدا هەوڵی نەداوە قەسیدەیێک بۆ بابەتێکی دیاریکراو بەکار بێنێ، بەڵکو بابەت و ناوەرۆکە جیاوازەکانی تێکەڵ بەیەکتری کردووە. هەر چۆنێ بێ تاکە لیریکی واش بەرچاو دەکەوێ لە یەکەم دێڕیدا خۆی بەخوێنەر دەناسێنێ.

ناری لە شیعری کراوەدا (ئیرۆتیک) وەستایەتی نواندووە، وێنەی داهێناوی هونەری جوانی هەیە شاعیرانی پێش ئەو خەیاڵیان لێ نەکردۆتەوە. ناری یەکێکە لە دوا شاعیرانی کلاسیکیی کورد لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا.

## بەشی یازدەم

## زێوەر

**١٨٧٥ – ١٩٤٨**

### ژیانی زێوەر

زێوەر نازناوی شیعری عەبدوڵڵا کوڕی محەمەد ئەفەندی کوڕی مەلا ڕەسووڵە. بنج و بناوانی خێزانیان لە گوندی بێکۆڵەی پشدەر بووە لە پاشانا هاتوونەتە سلێمانی. لە ساڵی ١٨٧٥ لە کۆڵانی شێخانی گەڕەکی کانی ئاسکان لە دایک بووە. ئەم خێزانە بەهۆی هاوسێیەتی لە سەردەمی منداڵی زێوەرەوە ئاشنایەتییان لەگەڵ ماڵی شێخ مەحموود بووە. باوکی خوێندەوار بووە بۆیە لە ڕۆژگارانی دەسەڵاتی عوسمانی بووە بەمووچەخۆری میری. دەوری گرنگی بووە لە پێگەیاندن و پەروەردەکردنی زێوەر، بەتایبەتی لە ڕووی ڕۆشنبیری و خوێندەوارییەوە.

زێوەر سەرەتای خوێندنی لە قوتابخانەی ڕوشدییە بووە، لە پاشانا وازی لێ هێناوە و ڕووی کردۆتە حوجرەی مەلا سەعید (خواجە ئەفەندی) لەوێ لەسەر پرۆگرامی ئەو سەردەمەی خوێندووە تا قۆناغی فەقێیەتی. ماوەیێک لە سلێمانی بووە ئینجا چۆتە مەریوان و بانە، لە پاشانا سابڵاغی (مەهابادی) موکریان، ئەوجا بەرێگەی رواندز ڕووی کردۆتە هەولێر و کەرکووک، لەوێوە بۆ سلێمانی و لە مزگەوتی بێ تەبەق (مزگەوتی عیرفان) وانەی زانستیی عەرووز و قافیە فێر بووە. لە دواییدا کەوتۆتە قۆناغی موستەعیدی لە حوجرەی مزگەوت.

لە ساڵی ١٨٩٨ زێوەر یەکێک بووە لە یاوەرانی شێخ سەعیدی حەفید کە سوڵتانی عوسمانی میوانداری کردبوون. ئەو کاتە خەڵکەکە بەزۆری بۆ خوێندن دەچوونە ئەستەموڵ، کەچی هەرچەندە زێوەر بۆ خوێندن گەشتی ئەوێی نەکردبوو، بەڵام لە ماوەی زیندەگانی لەم شارە پێشکەوتووەدا گەلێ شت فێر بووبوو، لەگەڵ ئەوەی زانیارییێکی پێویست لە بەردەستدا نییە لە بابەت ئەو ماوە کەمەی ژیانی زێوەر لە ئەستەموڵ. بێ گومان ئەو شارە لەو کاتەدا وەکو پردێک بوو لە نێوان ئەورووپا و ئاسیا. زێوەر ئاشنایەتی لەگەڵ پێشکەوتنی پیشەسازی ئەورووپا پەیدا کردبوو، ئاگاداری بزووتنەوە ئەدەبی



عوسمانی و نەتەوەکانی ئەورووپا لە ڕێگەی زمانی تورکییەوە. کەم و زۆر پێوەندی لەگەڵ کوردانی ئەستەمووڵی ئەو ڕۆژگارە بووە. لە پاشانا لەگەڵ شێخ سەعیدی حەفید گەڕاوەتەوە سلێمانی. ئاشکرایە پیرەمێردیش لەم گەشتەدا لە یاوەرانی شێخ سەعید بوو بەڵام ئەو لەگەڵیاندا نەگەڕایەوە سلێمانی.

لە مارتی ١٩٠٨ زێوەر لە پاش تاقیکردنەوەی تایبەتی کرا بەمامۆستای دەستووری زمانی تورکی لە قوتابخانەی ڕوشدییەی سوپایی سلێمانی. لە ساڵی ١٩١٤ کە ناوی قوتابخانەی ڕوشدییەیان گۆڕی و کردیان بە«قوتابخانەی تەشویقییە» زێوەر بوو بەمامۆستای یەکەم (باش موعەلیم). لەم کارەدا بەردەوام بوو تا سەردەمی داگیرکردنی ئەمپریالیستی بەریتانی (ئیحتیلال) و لە کانوونی یەکەمی ١٩١٨ بوو بەباشکاتب. زۆری نەخایاند ئەم کارەی لە دەست چوو تا ١٩ی شوباتی ١٩٢١ لە قوتابخانەی «نموونەی سەعادەت» بەمامۆستا دامەزرا. لەو ماوەیەدا باری سیاسی سلێمانی لە هەڵبەزین و دابەزیندا بوو، هەڵسوکەوتی نالەبار زیانی هەبوو بۆ زێوەر و بووە هۆی ئەوەی لە کارکردن دوور بکەوێتەوە. لە ساڵی ١٩٢٥ جارێکی دیکە بەمامۆستای یەکەم دامەزرایەوە لە قوتابخانەی یەکەمی سلێمانی، لە پاشانا گوێزرایەوە قوتابخانەی دووەمی سلێمانی. لەم کارەیدا مایەوە تا ساڵی ١٩٣٠ و گوێزرایەوە ناحیەی بەرزنجە تا ساڵی ١٩٣٨ لەوێ مایەوە ئەوجا بۆ بیارە، لە پاشانا لە مووچەخۆری دوور خرایەوە.

زێوەر شاعیرێکی خاوەن کەسێتیی خۆی بووە، هەمیشە بە ڕاستی و بێ پێچوپەنا بیروڕای تایبەتی خۆی دەربڕیوە، لە ڕۆژگارێکی بێ ئارامی نوقوم بوو لە ناو تەنگوچەڵەمە و گۆڕانی لەپڕ و بەگوڕ ژیاوە. لەو سەردەمانەدا بەتایبەتی لەگەڵ بەرپابوونی جەنگی یەکەمی گیتی گۆڕانی سیاسی لە ناوچەی سلێمانی زۆر و بەتین بوو: دەسەڵاتی عوسمانی دەرەبەگی، ئینجا ئەمپریالیستی بەریتانی، ئەوجا بزووتنەوەی نەتەوەیی، لە پاشانا دەسەڵاتی ئینگلیز و عیراقی داگیرکەر، لە دواییدا عیراق بەناوی شۆڤێنییەتی عەرەبەوە تا ساڵی ١٩٣٠ هێمنی و تەبایی ئەوتۆ لە ناوەوە نەبووە.

زێوەر وەکو هەموو شاعیرێکی ڕەسەن ئاوێنەی ئەم هەموو گیروگرفت و هەڵوێستانە بوو. بیروڕا و ئیدیۆلۆجییەتێکی زۆر لە ناوەوە بوون، دژ بەیەکتری بوون، ئاژاوەی سایکۆلۆجی فیکرییان لە مێشکی هەموو خوێندەوار و ڕۆشنبیرێکی کورد دروست کردبوو. لەبەرئەوە ئەگەر ڕۆژێک لە ڕۆژان زێوەر وتبێتی «حەنتووش حلاوی و ڕەسووڵ سیرینی قەت دەس لە

ملی یەکتری ناکەن» و لە ڕۆژێکی دیکەدا ستایشی مەلیکی عیراقی کردبێ، دووڕوو نەبووە، تاوانی نەکردووە. واقیعێکی چەسپاندووە و بەرهەمێکی شیعری داهێنراوی لە ڕووی هونەرییەوە دروست کردووە.

شاعیری ئەم ماوەیەمان کەسێکی شارەزا و زیرەک بوو، هەرچەندە لە ڕووی داراییەوە لە هەژاران نزیکتر بوو بەڵام لووت بەرز بوو، بەتایبەتی بەرامبەر بەو کەسانەی لە لایەن هەندێ کەسەوە بەگەورە و پیاوماقووڵ حسێب کراون.

عەبدوڵڵا ئەفەندی یا مەلا عەبدوڵڵا وشەی «زێوەر»ی کردووە بەنازناو. ئەم وشەیە بەمانای جوان و جوانی هاتووە واتە (جمال). لە کۆمەڵی تورکی عوسمانی «زێوەر» بەوێنەی «زبوەر» ناوی کەسانە بۆ پیاوان بەکار دەهێنرێ.

زێوەر لە ڕۆژی ١٠ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٤٨ لە سلێمانی کۆچی دوایی کردووە و لە گردی گۆڵان (جۆگە) بەخاک سپێرراوە.

## بەرهەمی ئەدەبی زێوەر

لووتکەی داهێنانی زێوەر لەو شیعرانە دایە کە لە دیوانیدا کۆکراونەتەوە. جگە لەمانە بەشێک لە بەرهەمەکانی دیکەی پێوەندییان بەئەدەبەوە هەیە، هەندێکی تریان لە دەوروبەری ژیاننامە و مێژوو و چیرۆک و وەرگێڕان و زمان و ئەدەبی میللی (فۆلکلۆر) دەسووڕێنەوە. بەم پێیە زێوەر لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا لەو شاعیرانەیە بەشداری لە پەرەسەندن و پێشخستنی بەرهەمی پەخشانی ئەدەبی کوردی کردووە. لەم بەرهەمە ئەدەبییانەیدا زێوەر لە ڕووی داهێنانی هونەرییەوە نەگەیشتۆتە پلەی شیعرەکانی. ئەم دیاردەیە تەنیا لە زێوەردا نابینرێ، بەڵکو ئەو نووسەرانەی دەستییان لە شیعریش نەدەدا و بەرهەمیان تەنیا پەخشان بوو نەگەیشتبوونە پلەی شاعیرەکان، چونکە ئەمانە تاقیکردنەوەییێکی کۆن و بەرزی قوتابخانەی نالییان لە ژێردەستدا بوو، کەچی ئەوانەی خەریکی بەرهەمی پەخشانی بوون کەرەستە و سەرچاوەیان کەم بوو چونکە ئەم بابەتە لە ئەدەبی کوردیدا تازە سەری هەڵدابوو و تاقیکردنەوەی کەم بوو و هێشتا نەکەوتبووە سەرپێ.

بەشێک لە بەرهەمی ئەدەبی زێوەر لە سەردەمی ژیانی خۆی و پاش مردنی چاپ کراون، هەندێکی دیکەی تا ئێستا بەدەسنووسی ماونەتەوە.



## بەرهەمە چاپکراوەکانی زێوەر

١- ژیانی پێغەمبەران، وەرگێڕانی کوردی (قصص الانبیاء)یە لە سلێمانی لە ساڵی ١٩٢٠ چاپکراوە.
٢- دەستەگوڵی لاوان لە سلێمانی لە ساڵی ١٩٣٩ بڵاوکراوەتەوە.
٣- خێوی ناو مزگەوت، لە سلێمانی ١٩٤٦ کەوتۆتە دەست خوێنەران.
٤- گەنجینەی مەردان، لە لایەن محەمەدی مەلا کەریم کۆکراوەتەوە و لە بەغدا لە ساڵی ١٩٨٥ چاپکراوە.
٥- چیرۆکی حوکوومەتێکی خەیاڵی و بەشێک لە کتێبی عەلی سیدۆ گەورانی «لە عەممانەوە بۆ ئامێدی» لە عەرەبییەوە کراوە بەکوردی لە سلێمانی لە ساڵی ١٩٩٩ بڵاوکراوەتەوە.

جگە لەم چاپکراوانە «فەرهەنگی زێوەر»ی عەرەبی - کوردی هێشتا دەسنووسە و بڵاو نەکراوەتەوە. هەروەها هەندێ نووسینی دیکەی هەیە بەتایبەتی کاری ئەدەبی لە زمانانی بێگانەوە وەریگێڕاونەتە سەر زمانی کوردی کەچی ئەمانە لەناوچوون و ونبوون.

گرنگترین یادگاری زێوەر دیوانی شیعریەتی. بەشێکی ئەم دیوانە لە بەغدا لە ساڵی ١٩٥٧ بڵاوکراوەتەوە. چاپی تەواوی دیوانەکە لە لایەن مەحموود زێوەرەوە ئامادە کراوە (کۆکردنەوە و پێشەکی و نووسینی پەراوێز) لە هەولێر لە ساڵی ٢٠٠٣ گەیشتۆتە دەستی خوێنەران. ئەمەیان باشترین سەرچاوەییێکە بۆ پاراستنی بەرهەمی ئەم شاعیرە گەورەیە.

## شیعری زێوەر لە ڕووی ڕوخسارەوە

لە دیوانی زێوەردا بابەتە گرنگەکانی شیعری کلاسیکی و میللی لە ڕووی ڕوخسارەوە بەرچاو دەکەون. لەوانە «پارچە» و «غەزەل» بەمانای لیریکی کورت، هەروەها چیرۆکی شیعری میللییانە (بەیت). جگە لەمانە کۆمەڵێک «چوارین» و «تاک»ی هەیە. زۆری چوارینەکانی لەسەر دەستووری ئاسایی کلاسیکی دەڕۆن لە ڕووی قافیەوە (اا ب-ا)، بەڵام زێوەر دەسکاری لەمەدا دەکا، قافیەی (ا ب ا ب) و (اا ب ب) لە ناویاندا دەبینرێ.

دیوانی زێوەر کۆمەڵێک «تاک»یش دەور دەکاتەوە لە یەک دێڕ پێکهاتووە و هەردوو نیوەدێڕەکە لەسەر یەک قافیە (اا)ن.

شاعیر تەرجیع بەندی هەیە، دەسکاری هونەری لەم بابەتە شیعرانەدا کردووە. نیوەدێڕە درێژەکان لەباتی یەک نیوەدێڕ بۆ هەردوو نیوەدێڕ، نیوەدێڕێکی کورتی داناوە. هەروەها گەمە بە قافیەش دەکا، بەڵام بەشێوەییێکی مۆزاییێکی ئەندازیاریی ڕێکوپێک.

لە هونەری پێنج خشتەکیدا زێوەر دەستڕۆیشتوو بووە. کۆمەڵێک شیعری شاعیرانی هاوچەرخی خۆی کردووە بەپێنج خشتەکی لەوانە شیعری مەلا ڕەشیدی لاوە (مائیل)، نەسیب، شێخ ڕەزا، تاهیر بەگ، مەحوی، سەید ئەحمەدی نەقیب، حەریق، وافی. لە پێنج خشتەکییەکانیدا ئەگەر زێوەر لە ڕووی هونەرییەوە لە شاعیرانی دیکە باڵاتر نەبێ لە پلەی شاعیرییەتی ئەوان نزمتر نییە.

هەوێن و کەرەستەی دروستکردنی پەیکەری شیعر لەکن زێوەر ئەمانەی خوارەوەن:

**کێش**

زێوەر هەردوو کێشی بەحری عەرووزی و کێشی خۆماڵی لە شیعریدا بەکارهێناوە. شیعرە عەرووزییەکان زۆر زیاترن لە شیعرە خۆماڵییەکانی.

لە شیعرە عەرووزییەکاندا ئەم بەحرانەی بەکارهێناوە: ڕەمەل، هەزەج، موزاریع، ڕەجەز، خەفیف، موجتەس، موتەقاریب، سەریع.

لە شیعرە سیلابییە خۆماڵییەکانیشدا زۆربەی کێشەکانی بەکارهێناوە، بەتایبەتی دە بڕگەیی و هەشتی و حەوتی. لە دە بڕگەییدا هەردوو جۆری بەکارهێناوە، ئەوەی وەستان لە ناوەڕاستیدایە و ئەوەی وەستانی تێدا نییە.

**قافیە**

زێوەر هەرسێ جۆرە قافیەی بەکارهێناوە:

١- یەکێتیی قافیە.

٢- جووت قافیە (مەسنەوی).

٣- قافیەی ڕەنگاوڕەنگ.

لە شیعری یەکێتیی قافیەدا زۆربەی دەنگە عەرەبی و کوردییەکانی ئەلفوبێی کوردی بەکارهێناوە، بەڵام دەنگە تایبەتییەکانی زمانی عەرەبی وەکو «ث» و دەنگە تایبەتییەکانی زمانی کوردی وەکو «گ» کەمن. ئەو دەنگانەی لە شیعری یەکێتیی قافیە



بەکاری هێناون ئەمانەن: ا، ب، ت، ث، ج، خ، د، ر، س، ف، ق، ک، گ، ل، م، ن، ه، (ە – ـە) و، وو، ۆ، ی، ێ.

بەشێکی زۆری شیعری زێوەر لەسەر سیستێمی جووت قافیە دانراون (ا ا، ب ب، ج ج...) بەتایبەتی قەسیدەکانی واتە بەیتەکانی ئەوانەی پێوەندییان بەشیعری پەروەردەیی (دیداکتیکی)یەوە هەیە.

زێوەر قافیەی ڕەنگاوڕەنگی کەم نییە، واتە ئەو شیعرەی لەسەر زیاتر لە قافیەیێک ڕێک دەخرێ. لەم لایەنەوە ئەم چەشنە قافیانە دەبینرێن (ا ب ب ا)، (ا ا ا ا ب ب)، (ا ا ب ب) و هی دیکە.

شاعیر قافیەی ڕەنگاوڕەنگ بەزۆری لە سروودی قوتابخانە و گۆرانییەکانیدا بەکار دێنی. جگە لەمانە زێوەر لە قافیەی مەسنەویدا پارچە شیعری وای هەیە هەموو دەنگەکانی ئەلفوبێی عەرەبی تێیدا بەکارهێناوە، ئەوانەی لە عەرەبیدا نین و تەنیا لە کوردیدا هەن (ۆ)ی بەکارهێناوە.

**پاش قافیە**

زێوەر بایەخی زۆری بەپاش قافیە داوە. لە دیوانی شیعریدا ئەم وشانە وەک پاش قافیە دەکەونە بەرچاو: منم، سینەما، نەما، ناکا، درۆیە، ئەمرۆ، بم، ئەکەی، هەیە، نەما، ئەکا، فەلەستین، بووم، ببێ، ئێستا، ئەکا، چبکا، هێنا، خۆم، چبکەم، برایم، مەڕۆ، کردووە، هەیە، وەرە، نییە، بەسەر، مەکە، بابێ، بێ ئەوێ، هاتەوە، شێخە، ڕۆژی کورد.

**زمان**

زمانی شیعری زێوەر لە دوو وێنەی جیاوازدا خۆی دەنوێنێ. لە شیعرە عەرووزییەکانیدا تا پلەیێک وشەی بێگانە بەکار دێنێ، بەپێچەوانەوە لە شیعرە میللی و خۆماڵییەکانیدا بەتایبەتی جووت قافیەکان زیاتر وشەی کوردی پەتی بەکار دێنێ. بەشێوەیێکی گشتی شاعیر ژیانێکی تازە دەداتە ئەو وشانەی دەچنە ناو کەرەستەی دروستبوونی شیعرەوە، لە حاڵەتی وەستان و تەزینەوە (بەنج بوونەوە) دەیانبا بۆ حاڵەتی بەخۆهاتنەوە و بزووتنەوە، لە مانای بەندیخانەی فەرهەنگ دەردەچن بۆ مانای ئازادی شیعرایەتی، لەبەرئەوەیە ئەو وشانە لە شیعری زێوەردا بەشێوەییێکی دیکە دەکەونە بەرگوێی خوێنەر، چونکە بە مانا و وێنەیێکی نوێ هەناسە دەکێشن. شاعیر ئەو وشە بێگانانە هەڵدەبژێرێ بۆ شیعری

ئەوانەی لای کورد پەسەند کراون وەرگیراون و بوون بەبەشێک لە زمانی کوردی و بەکارهێنانیان لە لایەن شاعیرەوە زیاتر مۆرکی زمانی کوردییان پێ دەبەخشێ.

### رەوانبێژی

زێوەر شارەزای شیعری کلاسیکی ئیسلامەوییە (عەرەبی و فارسی و تورکی عوسمانی و کوردی) لە شیعرە عەرووزییەکانیدا ئەو وێنە رەوانبێژییە مەعنەوی و لەفزییانە بەکار دێنێ کە لەگەڵ سروشت و تاقیکردنەوەی شیعری کلاسیکی کوردی دەگونجێن. بەڵام لە شیعرە میللییە خۆماڵییەکانیدا ئەو وێنە رەوانبێژییانە بەکار دێنێ کە لە شیعری قوتابخانەی نالیدا لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەمدا پەیدابوون. دیارە زێوەر خۆشی لە گەورە شاعیرانی نەوەی دووەمی ئەو قوتابخانەیە.

## شیعری زێوەر لە ڕووی ناوەڕۆکەوە

زێوەر بە دەستڕەنگینی وەستایە، بەخەیاڵ داهێنەرە، بەچێژ هەستیارە، بیناسازێکە (میعمارێکە) لە وشەی پڕ ئاواز و ڕستەی بەساز و کێشی ئاسان و قافیەی سفت پەیکەری بەرهەمێک دەتراشێ دەبێتە نموونەی داهێنراوێکی هونەری بەرز.

مەیدانی شیعری زێوەر لە ڕووی ناوەڕۆکەوە گەلێ فراوانە، بەرهەمی دەچێتە ناو دیوانی شیعری ئەو شاعیرە کەمانەی کورد کە هەموو لایەنێکی ژیانیان گرتۆتە باوەش، بەتایبەتی لایەنی پێشکەوتنی پیشەسازی و پەرەسەندنی سیمای مەدەنییەتی ئەوروپا و گیانی نەتەوایەتی بەپێی ئەو بووژانەوە نەتەوەییەیەی لە دوا ساڵانی سەدەی نۆزدەم و سەرەتای سەدەی بیستەم لە ناو میللەتانی ڕۆژهەڵاتی ناوڕاست پەیدا بوو. بەم پێیە زێوەر بابەتە کلاسیکی و میللییەکانی لە ئەدەبی کوردیدا پاراستووە و هەروەها بەشداری لە بابەتە تازەکانی وەک شیعری نیشتمانپەروەری و کوردایەتی و سیاسی و کۆمەڵایەتی سەردەمی خۆی کردووە.

### شیعری ئایینی

لە شیعری ئایینیدا بایەخی بەئیلاهییات و موناجات نەداوە، کەچی شیعری هەیە لە بابەتی «نەعت»ی پێغەمبەر و جەژنی مەولوودەوە وەسفی جەژنی ڕەمەزانیش هەرچەندە دەچێتە ناو شیعری ئایینییەوە بەڵام هەناسەیێکی کۆمەڵایەتی و ڕابواردنێکی سەیران و



خۆشیی سەر زەوی داوەتێ. لەبەرئەوەی لە تەریقەتدا بەرەو لای قادری کشاوەتەوە ستایشی شێخ عەبدولقادری گەیلانی و کاک ئەحمەدی شێخ لەمانەش زیاتر ستایشی شێخ مەحموودی یەکجار زۆرە. ئەوەی شێخ مەحموود تەنیا لەبەر تەریقەتی قادری نییە بەڵکو وەک سیاسی و سەرکردە و مەلیکێک لە شێخ مەحموود دواوە. هەروەها ستایشی شێخ عەلائەدینی بیارە (زیائەدین)ی کردووە لە شێخانی تەریقەتی نەقشبەندی.

لە شیعرێکیدا لە نەعتی پێغەمبەر و بەهۆی جەژنی مەولوودەوە دەڵێ:

لە هەر چوار گۆشەیی دونیاوە ئەمڕۆ جەژنی مەولوودە
چ مەولوودێ زوهووری حەزرەتی مەحبووبی مەعبوودە
چ مەحبووبێ کە نووری چاوی جوملە ئەهلی تەوحیدە
چ مەحبووبێ سەراسەر مەخزەنی عیلم و وەفا وجوودە
خودا لەم مانگەدا ئەو نوورە پاکەی خستە سەر دونیا
لەسەرمان ئیحتیرامی مانگی وا مەتلووب و مەقسوودە
کە ئەحکامی مونیری نووری شەرعی خستە ناو عالەم
هەچی ئەحکامە مەنسووخە هەچی ئەغیارە مەترووودە
شەوی پاکی ویلادەت سوبحی ئیقبالی موسوڵمانە
دەری ڕەحمەت کراوە دەرگەهی ئیدبارە مەسدوودە

ئەم وشە گەرمانە لە دەروونێکی پڕ باوەڕەوە هەڵقوڵاون، شاعیر ڕەچاوی تەعبیر و لێکسیکۆنی ئەم جۆرە شیعرەی کردووە، بەڵام لە شاعیرانی پێش خۆی جیابۆتەوە. ڕستە و مانای ئامادەکراوی بەکارهێناوە وەکو ئەوان، کەچی لەگەڵ ئەوەشدا لە هەندێ وێنەی شیعرەکەدا هەست بەداهێنانی نوێ دەکرێ.

### غەزەلی کلاسیکی

غەزەلی ئاسایی و لاسایی کلاسیکی زێوەر لە جوانی و داهێنانی هونەریدا بووە بەمایەی دەوڵەمەندی دیوانی شیعر لە ئەدەبی کوردیدا.

## ١

له غەزەلێکیدا شاعیر دەڵێ:

باعــیــسی دووریتــە گــەر دڵ ناله وو ئەفـغــان ئەکــا
دەردی هیـجرانه سـەبەب گـەر دیده خـوون ئەفـشـان ئەکا
هەر زەمــان ناری فـــیــراقت دێتــە ناو کــوورەی دەروون
مــیــروەحــەی ناڵـەم له هەر لا ئاگــرێ پەخـشــان ئەکــا
تۆ کــە جــەللادی بەئەڵـمــاسی مــوژەت دڵ کــون مــەکــە
زەخــمی ئەبرۆت کــاریــیــە چارێ له هەر دەرمــان ئەکــا
شەمعی ڕووت کەوتۆتە ناو زوڵماتی زولفی وەک شەوت
دڵ وەکــو پەروانە هەردەم مــەیلی خــۆ ســووتان ئەکــا
نەوغــــەزالێکی تێـــدایە دڵ فــــڕێن و دلبـــــەرە
ســا بەخــۆڕایی نیــیــە دڵ مــەیلی کــانیــسکان ئەکــا
قــەت بەمــەقــســـوود و مـــەرامم ئاســمـــان دەوری نەدا
باغی خــەڵقی دڵ گـــوشـــاد و باغی من وێران ئەکـــا
گــەر هیــلالی ئەبرووانت بێـتــە عــەرسـەی زاهیــری
سـەد وەکـو (زێوەر) بەسـاتێ دێت و خـۆی قـوربان ئەکـا

ئەم غـەزەلە ئەگەر ناوی خـاوەنی تێدا نەبێ ڕەنگ هەیە خـوێنەر نەزانێ لە دانراوەکـانی زێوەرە. بەڵام دەزانێ بەرهەمی یەکێ لە شاعیرانی سلێمانییە بەوەی ناوی کانی ئاسکانی هێناوە کە گەڕەکێکە لە گەڕەکەکانی ئەو شارە. وێنەکانی ئاساییین و لە بەرهەمی لاسایی ناچنە دەرەوە، ئەوەندە هەیە وێنە هونەرییەکان شارەزایانە و شاعیرانە دارێژراون.

## ٢

له شیعرێکیدا زێوەر دەڵێ:

له هیجرا ڕوو له ساقی و شیشەیی سەهبا نەکەم چبکەم
ووجوودم گەر بەفـەرشی مەیکەدە و مینا نەکەم چبکەم
له ناو تۆفـانی ئەفکارا نەهەنگی لائیــلاه هەســتێ
تەشەببوس گەر بەکەشتی نووحی ئیللەڵڵا نەکەم چبکەم



مەتاعی حوسنی ئەو مەحبووبە نەقدی داغ و سەودایە
له بازاڕی مـەحـەبـبـەت بەڕووح سـەودا نەکـەم چبکەم
ئەوا مــەحــرووەمی خــۆی کــردم دڵی بردم دەری کــردم
بەسـۆزی دڵ هەمـوودەم ڕوو لە قـاپی خـوا نەکەم چبکەم
له هەر لا زەبتی ناکــەم مــوددەعی تا تۆ ڕەئیـــسم بی
بەقـانوونی مـورووەت گـەر ڕەجا ئیـجـرا نەکـەم چبکەم
بەروتبەی وەسڵی ئەو ناگەم ئەگەر عومرم هەموو دانێم
له دەست ئەو زاڵـمە لەم کارە ئیـسـتیـغنا نەکـەم چبکەم
ئەڵێن ئەوراقی زوڵـمی تۆ تەواو نابێ بەتەحـــریرات
وەکو (زێوەر) بەتەقریر گەر ئەدای مەعنا نەکەم چبکەم

ئەم شیعرە بەئاشکرا دیارە کەوتۆتە ژێر کاریگەری شیعرێکی بەرزی مەحوی لە داهێنانی گێتیی سۆفیزمدا.

بەنووری بادە کەشفی زوڵمەتی تەقوا نەکەم چبکەم
بەشەمعێکی وەها چاری شەوێکی وا نەکەم چبکەم

زێوەر شیـعرەکەی لێکدەداتەوە یا شی دەکاتەوە، وێنەی وا دروست دەکا هەندێکیـان لە ئەوەی ئەو دەکـەن، کـەچی لە داهێنانی هونەریدا هێـشـتـا ناگـاتە ئەوەی مەحـوی، بەڵام شیعرەکەی ئەمەش بەهیچ جۆرێ لە جوانی و بەرزیەتی لیریکەکەی زێوەر کەم ناکاتەوە و لە خانەی داهێنانی شیعری کوردیدا دەمێنێتەوە.

## ٣

له لیریکێکیدا کاریگەری نالی بەزەقی بەسەر زێوەرەوە دیارە، بەگشتی نالی لە مەحوی زۆر زیاتر کـاری لە زێوەر کـردووە. لە بنجـدا زێوەر قـوتابیـیـێکی زیرەک و هوشـیـاری قوتابخانەی شیعری نالییە. لە لیریکێکیدا زێوەر دەڵێ:

گــوڵبــونی قــەد بولبــولی تەبع ئیــخــتــیــاری کــردووە
دڵ دیســـــان مـــــەیلی هەوایی نەوبەهاری کــــردووە
ئاهوویی ســاحــیب خــەت و خــاڵ هاتە مــەیدانی دەروون
بــازی دڵ بــۆیــە خـــــــەیالاتی شکـاری کــــــــردووە

گەر ئەپرسی ڕۆژ ئەمەند بۆچ دێتە دەر ئاوا ئەبێ
شەوقی ڕوخساری نیگارە بێ قەراری کردووە
دوێنێ چوومە سەیری گوڵشەن شیبهی ڕووی تۆم دی گوڵێ
گوڵ کە پێی زانی هەزار جار ئیفتیخاری کردووە
موژدە بێ بای وەعدە ئەنگووت پێشڕەوی هات عەندەلیب
حەسرەتا هاوتەبعی یارم دەی فیراری کردووە
مەکتەبی ڕوشدییەی سینەم تیایە کەسبی غەم
ئەی دریغ! گوڵشەن لە جێی گوڵ بەرگی خاری کردووە
بەس دوعاکاری ڕەقیب بە (زێوەر)ا خۆی کەوتە غەم
ئەو بەشێکە ڕۆژی قیسمەت حەق دووچاری کردووە

ئیلهامی ئەم لیریکە لە شیعرێکی نالی وەرگیراوە:

گوڵبونی قەددت لە قوبەی سینە غونچەی کردووە
غونچە بەم شیرینییە قەت نەیشەکەر نەیکردووە

زێوەر لەم شیعرەدا لە ئاسمانی خەیاڵی نالی باڵەفڕێ دەکا. شاعیری گەورە شیعرەکەی لە نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەم هۆنیوەتەوە، ڕەنگدانەوەی ئەو ڕۆژگارە بووە، کەچی زێوەر لە دوای سەدەیێک ئەم شیعرەی داناوە، ئەگەر لە شیعرەکەیدا ناوی قوتابخانەی ڕوشدییەی عوسمانی لە سلێمانی نەهێنایە شیعرەکەی بەبەرهەمی نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەم دەژمێررا.

## ٤

زێوەر لە لیریکێکیدا جارێکی دیکە بەهەوای نالییەوە دەڵێ:

مەیتەری عەقڵم کومەیتی نەفسی زنجیر کردووە
وەرنە جووتەی نەحسی بۆ جەبهەی فەلەک گیر کردووە
عومری من وا زۆر نییە ئێستە زەمانی عەیشمە
دەردی عەشقی نەوجەوانێ وا منی پیر کردووە
ڕەنگی سوورم بوو بەزەرد و قەلبی ساغم بوو بەداغ
ساحیرێکە زاهیر و پەنهانی تەغییر کردووە



قەت لە خۆم دا من گومان نابەم قەباحەت زەڕەیێ
موقتەزای تەبعییە ناحەق کە خۆی زویر کردووە
کافرێکە دەفعەیێ جوابی سەلامێکی نەبوو
سەد کەڕەت نامەم بەخوێنی دیدە تەحریر کردووە
کەس لەگەڵ (زێوەر) ڕەفاقەت ناگرێ ئەو ناعیلاج
خۆی بەوێڵداشی دەسیسە و مەکر و تەزویر کردووە

سەرچاوەی ئەم لیریکەی زێوەر غەزەلێکی نالییە:

تا لە من ئەو زولفە ڕێی بۆس و کەناری گرتووە
ناودەمم بێ شوبهە تامی زەهری ماری گرتووە

وەکو لەم غەزەلەدا دەردەکەوێ زێوەر گەلێ گیرۆدەی هەوا و خەیاڵ و چێژی نالی بووە، لەم شیعرەدا کاریگەری ئەو زۆر نییە، کەچی لە غەزەلەکەی پێشوو زیاترە. لە بارەی زمانی شیعرییەوە، زێوەر پەنا دەبا بۆ هەندێ وشەی قورس و بەکار نەهێنراو لە زمانی کوردیدا، وەکو «کومەیت» بەو ئەسپە دوو ڕەنگە (موللەمەعە) دەوترێ ڕەنگی لە نێوان ڕەش و قاوەیی بێ، یا وشەی سەختی وەکو «وێڵداش» دەخاتە ناو شیعرییەوە. ڕاستی ئەم وشە تورکییە «یولداش»ە، بەمانای هاوڕێ و برادەر هاتووە.

## ٥

لە غەزەلێکیدا زێوەر دەڵێ:

بەقامەت سەروی بۆستانی بەتەڵعەت ماهی تابانی
لە بەینی ماه ڕوویانا وەکو بەدری نومایانی
لە پێشا مەدرەسە و دێر و خەراباتم لە لایەک بوو
دوو میحرابی برۆت کێشامیە دینی موسوڵمانی
لە حوزنا پیری کەنعانم عەجەب سەبری جەمیلم بوو
بەدڵ موشتاقی بۆی وەسڵم ئەلا ئەی یووسفی سانی
بەدەفعی سیحری چاوانت یەدی بەیزام هەیە ئەمما
لە ئەشکی خۆمەدا غەرقم بەسەیری ڕوویی تابانی
بەشەر مەیلی بەشەرِ زۆرە جەفات گەر کەم ئەبوو ئەمووت
لە بەینی عالەمی ڕووحانیان مەئمووری ڕەحمانی

بەڵێ ڕۆژی بەدیعی تۆ بەعیدی غەیر ئەشوبهێنم
حەنایی پەنجەیی و بەرگم لە سایەی ئەشکی ڕوممانی
چ حاجەت تیری موژگانی لە مندا سەرف ئەکا ناحەق
کە من بۆ خۆم گرفتارم بەتای زولفی پەرێشانی
کەلامی شەککەرین (زێوەر) وەکو ئیعجازێ ئەنوێنێ
قەمەر دوو کەرت ئەکا هەر گا کە مەیلی بێ بەئاسانی

لە پێشانا شاعیر ڕوو دەکاتە دلبەر و وەسفی پەیکەری جوانی دەکا، ئینجا دەکەوێتە وەسفی هەست و نەستی ناو دەروونی بەرامبەر ئەو دڵدارییەی دلبەرەکەی بردۆتە ناو ناخی دڵییەوە. ئینجا دەکەوێتە گێڕانەوەی بەسەرهاتی پێغەمبەران یەعقووب و یووسف، عەساکەی مووسا پێغەمبەر، هەموو لایەنێکی غەم و پەژارە و جوانی و جادوو و ئەفسانەی کۆنی ئایینەکانی پێش ئیسلام کۆ دەکاتەوە و هەموو کردەوە و کەراماتی سۆفیزم لە وێنەی دلبەری خۆشەویستدا دەبینێ.

٦

شاعیر برێک نەریتی ئەتنۆگرافی کۆمەڵی کوردەواری دەخاتە ناو لیریکێکیدا:

ساقی بەجیلوە هەستە بۆم پڕکە یەک قەڕابە
ئەم شەو بەیادی چاوت مەیلم لەسەر شەرابە
موتریب دەسا بهێنە ئالاتی کۆن و تازە
قانوون و چالغیی و نەی عوود و دەف و ڕەبابە
من نامەوێ حیجاز و ڕاست و نەوای عیراقی
شۆر و قەتار و حەیران بۆ من بڵێن سەوابە
ڕووی دلبەرێکی کوردی نادەم بەمیسر و تائیف
یەک بەیتی ووردی نالی نادەم بەسەد عەتابە
دڵ دەردەداری یارە بیمار و بێ قەرارە
بەینێکە ئینتیزارە ئەحواڵە کە خەرابە
مەنعم مەکە لە ناڵین ئەی شۆخی دیدە شاهێن
بۆ چاوەکانی مەستت جەرگم ئەڵێی کەبابە



مەوجوود نەبێ ئەمانە یا ئەو برۆ کەمانە
(زێوەر) بەتیری میحنەت دووچاری سەد عەزابە

لە ڕووی نیشتمانپەروەری و کوردایەتییەوە زێوەر گوێی بەئاواز و گۆرانیی شۆر و قەتار و حەیران ڕاهاتووە، ئەمانە کوردین، نایەوێ گوێ لە ئاوازی حیجاز و ڕاست و نەوای عیراقی بگرێ چونکە بێگانەن و گوێیان گۆش نەکردووە. هەروەها کچە کوردێکی جوان نادا بەیەکێکی تایەفی (شاری تایەف لە حیجاز) گومانیش لەوەدا نییە تاکە دێڕێکی شیعری نالی نادا بەسەد ئاواز و گۆرانیی عەتابەی عەرەبی باشووری عیراق.

٧

لە غەزەلێکی وەسفی دلبەردا زێوەر سەما بەسروشتی وڵاتی سلێمانی دەکا، لە کاتێکدا شایی دەبەستێ بۆ ئاهەنگی گواستنەوەی کچە بووکی کوردستانی جوان:

تکانی ئابڕووی چەمەن بەڕوویی ئابدارەوە
شکاندی نرخی نەسترەن بەزولفی موشک بارەوە
چمە لە مەی لە نەی لە جام ئەگەر بەلەنجە بێتە لام
بەڕوویی تابدارەوە بەچاوی پڕ خومارەوە
عەرەق نییە لە عالەما کە لابەرێ لە دڵ غەما
جگە لە قەترە عارەقێ لە ڕووت کە دێتە خوارەوە
نەشاتی من جەمالی تۆ بەراتی من ویسالی تۆ
خەیاڵی من لە خاڵی تۆ بەعیشوە لێم مەشارەوە
عەزیزەکەی حەبیبی من نیگارەکەی تەبیبی من
با شەق بەرێ ڕەقیبی من وەرە بەسەد ویقارەوە
فیدایی خەدد و قەددی تۆ چەمەن بەفەوجی گوڵیەوە
بەبولبول و بەچڵێیەوە بەقومریی و هەزارەوە
فەڕەنگ ڕوو زەنگ موو عەجەم سیاق و ڕووس خوو
ئەناسرێ کە کوردە زوو بەپێچی لار و خوارەوە
نیساری زولفی عەنبەری هەموو وڵاتی گوڵ عومەر
بەعەرد و بەرد و دارەوە بەئاوی سەرچنارەوە

ئەمن گەیاندمە ئەنوەری فونوونی شیعر و شاعیری
ئەتۆ گەیانتە سامیری بەچاوی سیحرکارەوە

بەهارە! سروشت لە میهرەجانی شایی و شادی دایە. دلبەر مەیلی بۆ شاعیر هەیە، کەم ڕێک دەکەوێ هەڵوێست بەدڵی ڕەقیب بێ. ئەو بووکە قەشەنگە، سپی و موو زەردە وەک ئەورووپاییییان، لەنجەی فارسییە، ڕەوشتی ڕووسییە، بێ گومان ئەوانە نییە کەناچەی کوردە، بەپێچی سەری دەناسرێتەوە. سروشتی هەموو ولاتی گوڵ عومەر (گوڵعەنبەر، خورماڵ) و شارەزوور و ئاوی سەرچنار لە سلێمانی بەڵگەییێکن ڕەنگدانەوەی جوانی ئەو دلبەرەن.

## نیشتمانپەروەری و کوردایەتی

لە دوای جەنگی یەکەمی گێتی و داگیرکردنی ناوچەکانی کوردستانی باشوور لە لایەن ئەمپریالیستی بەریتانییەوە تا ساڵی ١٩٣٠ ماوەی شەڕوشۆڕ و ڕاپەڕینی جەماوەر بوو. ئاژاوە پەردەی هێمنی و ئاسوودەیی دڕی بوو و میللەتی کورد لە ژیانێکی سەختدا بوو بەتایبەتی ناوچەی سلێمانی.

کەسێکی وەکو زێوەر لە ساڵی ١٩٢٤دا وەکو هەموو دڵسۆزێکی کورد ئامانجی ئەوە بووە کورد بگاتە هیوا و مەبەسی و دەوڵەتی نەتەوەیی خۆی دامەزرێنێ. بەرپەرچ و تەگەرەی بنچینەیی بۆرجوازییەتی عەرەب لە عیراق و بەرژەوەندی ئەمپریالیستی بەریتانی بوو، کورد خۆشی لە ڕووی سیاسییەوە نەگەیشتبووە ئەو پلەیەی بەرژەوەندی خۆی لەگەڵ چاکەی ئینگلیز بگونجێنێ، بۆیە کەسێکی وەکو زێوەر بەچاوی دوژمنایەتی تەماشای عەرەبی کردووە و نەیویستووە لەگەڵیدا بژی. ئەم هەڵوێستەی زێوەر لە ساڵی ١٩٢٤دا بووە، کەچی هەر ئەو شاعیرە لە پاش ماوەییێک بیروڕای گۆڕیوە، لەو کاتەی پێکەوە ژیانی کورد و عەرەب بووەتە دیاردەییێکی ئاسایی. لێرەدا کە باسی برایەتی کورد و عەرەبی کردووە لە ڕاستی دوور نەکەوتۆتەوە.



١

شاعیر لە لیریکێکیدا دەڵێ:

یابە! فەرزەن تۆ شای زەمینی
ڕازیم بەبەشی خۆم و مسکێنی
دیجلە و فوراتت با هەر بۆ خۆت بێ
منیش کوردستان شاخی ڕەنگینی
هەواکەی شاهۆ ئاوەکەی قەندیل
لائەبا لە دڵ ئێشی برینی
قەت ڕێک ناکەوی دەست لە مل یەک کەن
حەنتووشی حیللاوی و ڕەسوول سیرینی
من لام باش نییە سواری شانم بی
وا عەرزت ئەکەم هەر بەشیرینی
خورمای خۆت بۆ خۆت مێووژم بۆ خۆم
لەکوم دینوکوم ولییە دینی
(لَکُم دِینُکُم وَلِیَ دِینی)

ئەم شیعرە لە سەردەمێکدا وتراوە ئومێدی مانەوەی حوکومەتی کوردی لە سلێمانی هێشتا مابوو. زێوەر ئەوە دەگەیەنێ ئەگەر دەوڵەتی کوردی دروست بێ قازانجی میللەتی تێدایە، چونکە لە هەموو ڕووییێکەوە بەتایبەتی لە داراییدا دەتوانێ خۆی بەڕێوە ببا. بەڵام شاعیر کە دیجلە و فورات پیرۆزی عەرەب دەکا، هەرچەندە ڕاستە و کەس لاری لەوەدا نییە شاعیر داهێنانی هونەری خۆی بخاتە ڕوو، بەڵام چەندە عەرەب هەقی بەسەر دیجلە و فوراتەوە هەیە کورد زیاتر چونکە سەرچاوەکەی لە کوردستانە و بەناو خاکی ئەودا دەخزێ تا دەگاتە شاخی حەمرین.

٢

ئەو کاتەی مەسەلەی کوردی عیراق لە ناوەوە بوو، لە کوردستانی باکوور کێشەی نەتەوەیی کورد زیاتر تەشەنەی کردبوو. تیرۆری تۆرانییە کەمالییەکان گەیشتبووە پلەیێک سەرکردەکانی کوردیان لە سێدارە دەدا، خەڵکی هەژاری بێ چەکیان لە ژن و منداڵ

دەکوشت و یا ئاوارەی دەرەوەی مەڵبەندی خۆیانیان دەکردن.

زێوەر لە ساڵی ١٩٢٥ شیعرێکی پڕ لە سۆزی کردووە بەبرووسکە و بای شەماڵی ڕاسپاردووە بیگەیەنێتە شۆڕشگێڕان:

ئەی شەماڵ! ئەی شەماڵی شاخی شیمال
ئەی فیدای جیلوە و شنەت سەرومال
حورمەت و حەسرەتی منی بەدحال
بیگەیەنە بەشاخی باغی میسال
جاریێ ئیفایی ڕەسمی تەعزیم کە
بۆسەیی لاتەناهی تەقدیم کە
چونکە ئەو شاخە زەوقی میللییەت
عەشق و سەودا و خەیاڵی حوررییەت
تیا دەژی فیکری بەرزی کوردییەت
لە بەهەشت زیاترە بەقودسییەت
چونکە ئەو شاخە بەرزە گوڵگوونە
مەعدەنی ڕووحە شاخی ئاڵتوونە
تورک ئەڵێ قەبری کوردە ئەو شاخە
بام بڵێ چونکە باتینەن باغە
باغی مەردانی چوست و گوستاخە
جێی وەتەنپەروەری جیگەر داغە
تورکەکان نەشئەیان دەرئاغۆش کرد
بۆچی تەئریخیان فەرامۆش کرد
هەر فیدائی لە ئینقیلابا چوو
پێی مەڵێ مردووە بڵێ زیندوو
چونکە بێ شوبهە موددەتێکی زوو
شێری مەیدان لە نەسلی پەیدا بوو
قارەمان و دلاوەرانی پەسین
وەتەن ئیحیا ئەکەن بەعەزمی مەتین



گوڵ و بەرد و درەختی خوون ئالوود
میللەتێکی جەسیم ئەخاتە ووجوود
ناسیری کوردە حەزرەتی مەعبوود
کوردی مەزلوومی دەستی تورکی عەنوود
ماڵ و منداڵی کوردی بێ چارە
بام پەرێشان کرێن و ئاوارە
ئەی شەماڵ! پێی بڵێ لە بەعدی سەلام
بەرزتری تۆ لە عەرش و کورسی لە لام
قابیلی تۆیە حورمەت و ئیکرام
نووری تۆ نووری مانگ و ڕۆژە تەمام
مەئمەنی خاسی قەومی کوردانی
ئەبەدیی مەنزیلی شەهیدانی
ئوفوفت ئەرخەوانییە لە بەهار
ڕەنگی سوورت شەفەق ئەکا ئیزهار
ئینعیکاسی تەسادومی ئەنوار
تاجی قەوس و قەزەح ئەکا بەنیسار
لالە زارت کە سوور و ڕەنگینە
عەکسی خوێنی شەهیدی ڕێی دینە
ئەو مەقامە مەقامی لاهووتە
سورمەیی چاوی قەومی مەبهووتە
جێی زیاراتی ئەهلی ناسووتە
ئەو گوڵە بۆ حەیاتی دڵ قووتە
کورد نەڕەنجێ لە خوێنی ڕێژراوی
نەخشی سەر ڕووحە بەردی خوێناوی
قەومی ساحیب مەتانەت و سەبات
چونکە بێ قەدرە لای هەوای حەیات

حورمەت و غیرەتی ئەکا ئیسبات
باقیە عەزمی تاکو ڕۆژی مەمات
عاقیبەت شاخی بەرزی کوردستان
عەلەمی کوردی تیا ئەکا جەولان

ئەمە شیعرێکە بەگیانی ڕۆمانتیکی و لاساییکردنەوەی شیعری نوێی تورکی عوسمانی ئاودراوە. شاعیر داوای مافی خەڵکی کورد دەکا، شاعیرانە وێنەی سروشتی جوان بۆ مەبەسی دڵی قووچاوە و گیانی پەشێو بەکار دێنێ. پاڵەوانی ئەم لیریکەی زێوەر نەتەوەی کوردە، بۆرجوازییەتی تورک و کردەوە تیرۆریستییەکانی بووە بەقارەمانێکی دیکە و خۆی لەم شیعرە تراجیدییەدا دەنوێنێ.

بەڵێ ئەگەر تورک بەوە باغ و لەخۆبایی بێ تا ئەندازەیێک لووتکەی شاخ بکا بەکێڵی گۆڕی کورد. زێوەر بەهەناسەیێکی پڕ باوەڕ وەرامی دەداتەوە و لەوە دڵنیایە لە دواڕۆژدا لەسەر پۆپەی شاخ ئالای کوردستان دەشەکێتەوە. ئەم ئەنجامە هەتا ئێستا دەست نەکەوتووە، بەڵام نزیک بۆتەوە.

**بۆ شێخ مەحموود**

لە بەرهەمی شیعری زێوەردا شێخ مەحموود مەقامێکی بەرز و پایەیێکی بڵندی هەیە وەک کەسێکی هەڵکەوتووی سیاسی و کۆمەڵایەتی، هەروەها وەک نەوەی کاک ئەحمەدی شێخی تەریقەتی قادری. گەلێ لە بەرهەمی شیعری ڕاستەوخۆ یا ناڕاستەوخۆ پێوەندییان بەشێخ مەحموودەوە هەیە.

١

لە یەکێ لە ستایشە زۆرەکانی زێوەر بۆ شێخ مەحموود دەڵێ:

موژدە بێ یاران کە شاهی دیدەمەستان هاتەوە
ساقیی بەزمی تەرەب بۆ مەیپەرستان هاتەوە
با بەنەغمەی دڵگوشا بولبول لەگەڵ قومری بڵێن
غونچەیی خۆش بۆیی باغ و سەروێ بۆستان هاتەوە
ساقیی و موتریب مەی و نەی بێننە جەولان و جۆش
شاهی سەدری مەجلیس و شەمعی شەبوستان هاتەوە



ئافتابی چاوی مەستی کەوتۆتە ژێر قەوسی برۆ
با گەدایان قوڕ بەسەر بن فەسڵی زستان هاتەوە
دیدە عەبهەر قەد سنەوبەر ڕوو قەمەر موو عەنبەرە
چەندە ڕەنگینە بەهاری گوڵ بەدەستان هاتەوە
دیدە حەیران بوو لە نەززارە و تەماشاکردنی
شاهی ئەسکەندەر لە ئاوی تاریکستان هاتەوە
(زێوەر) ئەمجا بەس بەیان کە شەکوەیی ئەحواڵی خۆت
وا موعینی بێ نەوا وو بەخت سستان هاتەوە

لە ناوەڕۆکی ئەم شیعرە ئەوە دەردەکەوێ شێخ مەحموود لە گەشتێکیدا گەڕاپێتەوە سلێمانی، یا لە ئاوارەیی و ناو شاخ و زیندان ڕزگاری بووبێ و هاتبێتەوە ناو شار. ناوەڕۆکی ئەم شیعرە باس لە خەبات و نیشتمانپەروەری و فەرمانڕەوایی شێخ مەحموود ناکا، بەڵکو ستایشێکە زێوەر بۆ خۆشەویستێکی نووسیوە. شاعیر لەم قسانەیدا بەمانای وشە ڕاستگۆیە. شێخ مەحموودی زۆر خۆشویستووە، شێخیش فرە ڕێزی لێناوە، بەناوی ئەوەی مامۆستای بووە. شاعیر هەندێ لەو سیفەتانەی لە شیعری کلاسیکیدا بۆ ستایش کەوتوونەتە ناوەوە لەم شیعرەدا بەکاری هێناون.

٢

لە شیعرێکیدا زێوەر بەم جۆرە پیرۆزبایی لە شێخ مەحموود دەکا بەهۆی جەژنێکی ئایینییەوە:

ڕۆژی جەژن ئەتفالی وورده پوولی جەژنانەی ئەوێ
هەریەکە لای باب و مامی ڕوپیە یا ئانەی ئەوێ
دوختەری نەورەستە بۆ زیادی جوانی و زینەتی
وەسمە بۆ ئەگریجە بۆ پرچی خەنە و شانەی ئەوێ
هەرزەکار و کووچەگەرد و خوێرییانی ناو گەڕەک
هەندێ زوڕنا و هەڵپەڕین هەندێکی مەیخانەی ئەوێ
تاجیرانی موعتەبەر بۆ خزمەتی میوانیان
نوقڵی بومبا و ڕاحە وو حەڵوای گەزۆی بانەی ئەوێ

شێخ عیسامەددین و ئەمسالی لە دەروێش و مورید
شەککەر و گیسک و برنج و ڕۆنی شێخانەی ئەوێ
بۆ مەعاشی خۆی و ئەم خەڵکە ڕەئیسی مالیات
دەفتەری ئەعشاری تازە و قەیدی بزنانەی ئەوێ
سواری ئەسپی خۆی ئەبێ لای نوختەکان سووری ئەدا
عەبدول ئاغای ئاشناشم باجی بارانەی ئەوێ
بێنە سەر باسی ڕەئیسی داخیلەی مەملەکەت
خەلعەتی خاسی مەلیک ئینعامی شاهانەی ئەوێ
نەسلی پاکی شێری یەزدان شێری حەق زاتی مەلیک
حەزرەتی شێرانە وو ئاساری مەردانەی ئەوێ
(زێوەر)یش لەم ڕۆژەدا چۆن دوعا مەقبوول ئەبێ
هەر دەوامی ریفعەتی تاجی مولووکانەی ئەوێ
بەرقەرار و پایەدار و نامداری کەی خودا
تا فەلەک بۆ زیب و زینەت ئەم ستارانەی ئەوێ

لە سەردەمی فەرمانڕەوایی شێخ مەحموود لە ساڵی **١٩٢٣** پێش جەژن ئەم شیعرەی داناوە و بۆی ڕەوانە کردووە. شیعرێکی ناسکە، باس لە نەریتی کۆمەڵایەتیی کوردەواری دەکا، وێنەی جموجۆڵی و سەیران و ڕابواردنی جەژن دەکێشێ، وەک ماوەی حەسانەوە و پشوودان، هەروەها لە کەلوپەل و شتوومەکە پێویستییەکانی جەژن دەدوێ و داوا دەکا بەئاسانی بکەوێتە دەست خەڵکی. لە دواییدا پیرۆزبایی لە شێخ دەکا بەهۆی جەژنەوە و لە خودا دەپاڕێتەوە هەتا ژیان لەسەر ڕووی زەوی ماوە دەسەڵاتی شێخ بەرقەرار بێ.

## سیاسەت و کۆمەڵایەتی

هەندێ لە ڕووداوە گرنگەکانی سەردەمی ژیانی زێوەر بەتایبەتی لە ماوەی هەردوو جەنگی یەکەم و دووەمی گێتیی سەدەی بیستەم لە لیریکەکانی شاعیر ڕەنگیان داوەتەوە.



١

لە بابەت ڕووداوە جەنگییەکانی ساڵانی **١٩٣٥ - ١٩٣٦** زێوەر دەڵێ:

تێک ڕژاون خۆ بەخۆ سوور بوو بەخوێن دەشت و چیا
ئینتیقامی ئەهلی ئیسلامە لە ناو ئیسپانیا
گەر هێلاسلاسی موسوڵمانانی خستە ناو کەمەند
حەق تەعالا دەسبەجێ بۆی نارد شەقی ئیتالیا
چونکە ئەووەل خزمەتی ئیسلامەکانی کرد حەبەش
ناوی چاکەی باقییە لای ئەورووپا وو ئاسیا
هەر ئەڵێم باسی سیاسەت ناکەم و لێی دوور ئەبم
عاقیبەت ئەمخاتە نووسینی زوڵمەکانی تورکیا
ستالینیش ئەبێ نوتقێ بدا بۆ کوردەکان
خاک و ئاو و جێگەمان دوای خستوون فینلەندیا
دەست لە مل قەومی عەرەب کەن موتتەحید بن دوو بەدوو
شوهرەت ئاوازتان ئەڕوا هەتا ژاپۆنیا

زێوەر لەم شیعرەدا باس لە ڕووداوەکانی ئیسپانیا دەکا لە ساڵی **١٩٣٦**، ئەمە مایەی خۆشی و گوشادی بوو، هەواڵی شادی بوو ئیسپانییەکان بێن بەدوو بەرە و یەکتری بکوژن چونکە هەردوو لایان دوژمنی ئیسلامن، پێشکەوتنخوازە نیشتمانپەروەرەکان و کۆنەپەرستە فاشستەکان. کە باس لە دەس درێژی ئیتاڵیا دەکا بۆ سەر حەبەشە (ئەتیوپیا) شاعیر لایەنی ئیتاڵیا دەگرێ چونکە حەبەشە موسوڵمانانی چەوساندبووەوە. داوا لە ستالین دەکا پشتی کورد بگرێ. ئینجا ڕوو دەکاتە کورد و پێیان دەڵێ ئەگەر لەگەڵ عەرەب یەکتری بگرن ناوبانگتان دەگاتە یابان. مەبەسی بنچینەیی زێوەر لە دانانی ئەم شیعرە ئەوەیە باس لە زۆرداری تورک بکا بەرامبەر بەکورد، ئەم مەسەلەیە ئەوەندە گەورەیە شاعیر دەڵێ، من سیاسی نیم و باسی سیاسەت ناکەم بەڵام کردەوەی خراپی تورک بەقسەم دێنێ.

## ٢

لە دوای جەنگی دووەم کێشەی سیاسی فەلەستین گەیشتە لووتکە و بەدابەشکردنی لە نێوان عەرەب و جوولەکە کۆتایی هات و دەوڵەتێکی تازە بەناوی ئیسرائیلەوە دروست بوو لە ڕۆژهەڵاتی زەریای سپیی ناوەڕاست. لە ڕووی سۆزی ئایینی ئیسلامەتییەوە گریان و شین و شەپۆری زێوەر بۆ فەلەستین عەرش و قورشی هێناوەتە گریان:

گریانە فەلەک چاوی لە ئەحوالی فەلەستین
بوریانە مەلەک جەرگی لە ئەهوالی فەلەستین
لەعلی یەمەنە سوور بووە شاخی هەموو ئاخۆ
ڕەنگینە بەخوێنی ژن و منداڵی فەلەستین
شەللالەیی ئاو سەیری مەکە زۆرە لە دونیا
شەللالەیی خوێن سەیرە لە ناو ماڵی فەلەستین
هەر کوشتنە خوێن ڕشتنە ئیعدامە لە هەر لا
سووتاوە بەبۆمبایی عەدو و باڵی فەلەستین
جەژنە خەنەبەندانە لە هەر شار و دیارێ
خوێناوە خەنەی بازن و خەڵخاڵی فەلەستین

زێوەر بۆ نزیککردنەوەی مەسەلەی نیشتمانی فەلەستین لە دڵ و دەروونی کوردا وشەی «فەلەستین»ی کردووە بەپاش قافیە بۆ ئەوەی لە هەموو دێڕێکدا خوێنەر لەگەڵ مەسەلەکە بێ. ئەم دێڕانە پێشەکییێکی پڕ لە سۆزن خوێنەر ڕادەکێشن لە ناو کێشەکەدا بژی و بەهی خۆی بزانێ.

زێوەر لە لیریکەکەیدا بەردەوامە:

لاشەی شوهەدا دەعوەتی ئینگلیزە لە سەحرا
کردوویەتی بۆ وەحش و قەل و داڵی فەلەستین
شەو چاترە لەم عەسرە کە عەسری مەدەنی بێ
ئیسباتی قسەم شاهیدە ئەقوالی فەلەستین
ئەی هیند و عەرەب تورک و عەجەم کوردی موسوڵمان
چۆن جوولەکە بێ حاکمی فەعالی فەلەستین



وا ئەهلی سەلیب هاتەوە سەر قودسی موبارەک
ئەی ڕووحی سەلاح لابەرە زیلزالی فەلەستین
بێ ڕزق و ئیرادە هەموو مەئیووس و پەرێشان
بۆتە ڕەمەزان ئەووەلی شەووالی فەلەستین

زێوەر هاوار بۆ هەندێ لە نەتەوە موسوڵمانەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست دەبا وەکو هیندی و عەرەب و تورک و عەجەم و کورد بۆ ئەوەی هەڵسن و فەلەستین ڕزگار بکەن. جوولەکە بەخەڵکی خاچ پەرست (گاوور) دەچوێنێ. دیارە لێرەدا شاعیر مەبەسی ئەوەیە ئەوەی خاچ پەرستەکان بەموسوڵمانانیان کرد لە سەردەمی سەلاحەدینی ئەیووبی ئێستا جوولەکە بەموسوڵمانانی دەکا، لەبەرئەوەیە هاوار بۆ سەلاحەدین خۆی دەبا، یاخود گیانی سەلاحەدین زیندوو بێتەوە چۆن ئەو کاتە خاچ پەرستانی لەناوبرد ئێستاش جوولەکە تەفروتوونا بکا.

زێوەر بەم دێڕانە کۆتایی بەلیریکەکەی دێنێ:

سەهیوونی لە ئەڵمانەوە دێ خاوەنی موڵکە
خاوەن نییە بێ مایە وو حەممالی فەلەستین
ئینگلیز! بەحەرب داخڵی ئەم خاکە نەبووی تۆ
چۆن ڕووت هەیە خۆت کردووە بەجەنراڵی فەلەستین
ڕێی حەق ئەگرن تالیبی عەدلن هەموو ئیسلام
بەو واسیتەوە ڕەوشەنە ئیقباڵی فەلەستین
مەشهوورە کە جوو لەشکری دەججالە لە ئاخیر
مەهدی هەیە بۆ چارەیی دەججالی فەلەستین
گەر موددەعی بەم قەتل و قیتالە دڵی خۆشە
گوم نابێ لە ئەحفاد و لە ئەنجالی فەلەستین

لێرەدا زێوەر جوولەکە سەهیوونییەکان بەبێگانە دادەنێ لە ئەڵمانیاوە هاتوون و خاکی فەلەستینیان داگیر کردووە. ئەم سەین و بەینە ئینگلیز دروستی کردووە، بەڵام لە دواییدا دەبی هەر ئیسلام سەربکەوێ، چونکە جوولەکە دەجالن و محەمەدی مەهدی بۆیان پەیدا دەبێ. ئەم بیروباوەڕە لە داهێنانی شاعیر نییە بەڵکو لە حیکایەتەکانی ئەفسانەی ئایینی باوەڕی پێ کردووە و وەریگرتووە.

## وەسف

وەسف لەم ماوەیەدا ئەو بابەتە یا هونەرە کلاسیکییە نییە کە لە ئەدەبی کۆندا لە مەبەسە گرنگەکان بوو، بۆ دلبەر و سروشت بەکار دەهێنرا و زۆر جاریش لەگەڵ دلّداری و ستایش تێکەڵ بەیەکتری دەکران، بەڵکو مەبەس وەسفی دیاردە و ئامێر و ئەو شتە تازایانەیە لە ئەنجامی پێشکەوتنی پیشەسازی و تەکنۆلۆجیا پەیدا بوون. هەروەها وەسفی هەندێ شتی دیکەی کە لە ئەدەبی کلاسیکیدا باو نەبوون.

١

زێوەر لە وەسفی فڕۆکەدا دەڵێ:

دێوێکە گیانی تیا نییە ئەکشێ بەچەشنی مار
بێ دەست و قاچ و خوێنە بەبێ گۆشت و بێ دەمار
ناو جەرگی پڕ لە ئاگرە هەردەم کە دێتە ئیش
خۆراکی ئاوە بێ دەم و دان بێ سمێڵ و ڕیش
هەرچەندە بێ پەڕە کە لەگەڵ کەوتە ئاسمان
چەند ڕۆژە ڕێگە زوو دەبڕێ ناگرێ ووچان
ناڵین و گرمە گرمی لە هەستان و ڕۆیینا
هەورە برووسکەیێکە بەسەر گیانی دوژمنا
ئەم دێوە گەورە بەچکەی زانینە ئەی هەژار
زانینە دێو لە ئاسن ئەکا و باڵەکەی لە دار
زانینە گیان ئەخاتە لەشی دار و بەردەوە
زانینە زێڕ و زیو کە دەرێنێ لە هەردەوە
زانینە شاخی گەورە وەکو لۆکە شڕ ئەکا
زانینە جەرگی شەو کە لە ڕووناکی پڕ ئەکا
دەریا کە بوو بەڕێگەی ڕۆژ و شەوی هەموو
زانین نەبێ کە هێزی ئەوەی بێ مەگەر چ بوو
زانستییە چرایە وەکو زێڕی باغەڵە
گیانی وولاتە بۆ سەر و گوێی دوژمنە پەڵە



شاعیر فڕۆکە بەدێو دەچوێنێ، وەک باڵندە دەفڕێ، ناو جەرگی ئاگرە، خۆشڕەوە لە فڕیندا. زێوەر دروستکردنی فڕۆکە و هەموو پێشکەوتنێکی پیشەسازی دەگەڕێنێتەوە بۆ زانستی، ئەمە بۆی هەیە ئەوەی بەبیردا دێ وا دەزانرێ ناکرێ زانستی دەیکا.

٢

لە وەسفی سینەمادا زێوەر شیعری نووسیوە:

داخی حەسرەت نەخشی بەست ئەمساڵ لە تەختی سینەما
بۆ ئەوانەی ڕا ئەکەن سەربەست ئەچن بۆ سینەما
کێ ئەڵێ حەربەگرانی زۆر پەرێشانە جیهان
تۆ بچۆرە سینەما وا تێ ئەگەی برسی نەما
کوڕ لە باوک کچ لە دایک شەرمیان لا خستووە
سینەما کارێکی وای کرد هیچ مناڵ ترسی نەما
بۆ تەماشا زۆر کوڕ و کچ بوونە هاوڕێی باوک و دایک
هیچ غەمی باوکیان نییە وای درهەم و فلسی نەما
یەک بەیەک کۆشش ئەکەن تا زوو بچن بۆ ژوورەوە
با هەزار جار بانگ بکەن وا لۆجە وو کورسی نەما
عیلم و فەننی ئەورووپا فێربوون کە سەیری وێنە بێ
ئاگری حەسرەت ئەمێنێ هەر لە لەوحی سینەما
پێم بڵێن تا ئێستە چی فێربوون منیش دێم جار بەجار
تا نەڵێن پێم پاش ملە (زێوەر) کەوا شانسی نەما

زێوەر ئەم شیعرەی لە سەردەمی جەنگی دووەمی گێتی وتووە کە سینەما تازە لە سلێمانی کەوتبووە ناوەوە. لە بەرهەمەکەدا ئەوە ئاشکرایە شاعیر لە دژی سینەمایە، وای بیر کردۆتەوە ئەو دەسکەوتە تازەیە لە گێتیی پیشەسازیدا دەبێتە هۆی تێکدانی خوو و ڕەوشتی کوڕ و کچی کورد. جگە لەوە تەماشاکردنی ئەو سینەمایە بەپارەیە، لەوانەیە زۆر کەس بۆی نەکرێ ئەم پارەیە بدا بەمنداڵی. لە دواییدا شاعیر هەندێ پاشگەز دەبێتەوە و لەو کەسانەی دەچنە سینەما دەپرسێ ئەگەر ئەوان شتێک فێر بووبن با بە ئەویش بڵێن بۆ ئەوەی بچێتە سینەما، ئەو کاتە پێی ناڵێن لەم شتە بەکەڵکە بێ بەش بوو.

## ٣

زێوەر وەسفی هەندێ شاری کردووە، هەرچەندە هەوێنی جوانکاری هونەری لەو شیعرانەدا زۆر نییە و لە وەسفی جوگرافی دەکەن، بەڵام دەشێ بەشیعرێکی بەرزی پەروەردەیی (دیداکتیکی) دابنرێن بۆ بەڵگە لە وەسفی شاری بەغدا دەڵێ:

چ خۆشە مەنزەرەی جوانی شارەکەی بەغدا
کە شێخ و زاهید و سۆفی ئەخاتە سەر سەودا
حەدیقەکانی نموونەی بەهەشتە بۆ خۆشی
دروستە ناوی بنێی عەدەن و جەننەتولمەئوا
ئەچیتە سەیر و تەماشای حەدیقەی غازی
پڕە لە بازی شکاری و ئاسکی سەحرا
لەسەر ئەریکە بەڕێکی کە چوویت و دانیشتی
هەزار حوور و پەری دێن و دەڕۆن بە بەردەمتا
نەمامی مەم وەکو دوو سێوی ئاڵ و لیمۆی زەرد
دەسی ئەخاتە دەسی دیدە نێرگسی شەهلا
نیگاهی شاریعی غازی و ڕەشید و ئەمسالی
لە شانزلیزەی پارس زیاترن بەسەفا
کەناری جاددە درەختانی ڕێک و مونتەزەم
میسالی قەددی حەبیبانی ناسک و ڕەعنا
کە بچیتە سەیری قوسوور و دەوائیری ڕەسمی
بەجازیبەی فەرەحی دڵ دەخاتە ڕەقس و سەما
بچیتە کەرخی ڕەیاحین و گوڵ لە ژێر ئەشجار
چ ئابدار و چ شیرینە ڕیزی دار خورما
بەپرتەقاڵ و کەبات و ترنج و لیمۆئی
کە بۆنی خۆش بەهەموو شاریعا ئەکەن ئیفشا
هەوا موعەتتەرە عالەم موعەنبەرە بێ شک
سەدای قومری و بولبول بەسە لەباتی غینا



بەشەو ئەبینی لەسەر ئەرز ئاسمانی یەکەم
ئەلەکتریکە کەواکیب کە شەوق ئەدا بەهەوا
کە سەیری دیجلە ئەکەی دێ بەسەد هەزار عەزەمەت
خورەو و ڕەی نییە ئەڕوا بەبێ هەرا و سەدا

لەم دێڕانەدا وەسفێکی ڕووکەشی جوگرافی شاری بەغدا دەکەوێتە بەرچاو. شاعیر ناوی ئەو شەقام و باغچە و پارکانە دەبا کە کچە جوانانی شار پیاسەی تێدا دەکەن. هەروەها وێنەی دیمەنی شەو و ڕووباری دیجلە و گڵۆپەکانی کارەبای شەقام و باڵەخانەکان دەگرێ. ڕەنگە بەشێوەییێکی دیکە شەوەکانی هەزار و یەک شەوی هاروونی ڕەشید و شەهرزادی جوان و شەهریاری مێباز بێننەوە یادی خوێنەر.

ئینجا شاعیر لە بەغدا دەدوێ وەک مەڵبەندێکی زانستی:

دەماری جیسمی بڵند باعیسی حەیاتی وڵات
ئەوە کە زینەتی داوە بەباغ و قەسر و سەرا
مەحەللی عیلم و مەنافیع و مەنابیعی سەروەت
هەموو لە عاسیمەی ناو عیراق ئەبێ پەیدا
حەقیقەتەن ئەوە پایتەختی زاهیر و باتین
پڕ لە شاه و وەزیرانی عالەمی ئوخرا
جونەید و سیرری و بەهلوول و بیشر و کەرخی هەموو
موجاویرن لە حوزووری شاهی دین ئیمام مووسا
ئەتۆ نەزەر مەکە ئەو قەسر و گونبەدی زاهیر
لە بۆ تەوافی مەلەک بارەگاهی وا لە سەما
غوباری قەبری کلی چاوی جەعفەری و سوننی
نیگاهی مەرقەدی شادیی دڵی غەنی و گەدا
لە پاش ئیمامی زەمان مەرتەبەی کە باڵایە
جەنابی غەوسی زەمانە ڕەئیسی ئەهلی هودا
مەسافی تۆ نییە ئەم ساحە واسیعە (زێوەر)
لە بەحری ئەتڵەسی بۆ تۆ مەحالە بێیتە سەنا
لەباتی مەدحی بخوێنە عەلەیهومولریزوان

عـەلەیهی ئەلف و سـەلاتین وە رەحـمـەتین و ریزا
(عَلَیـــهِ أَلْفُ صـــلاةٍ وَرَحْـــمَـــةٍ وَرِضـــا)

لێرەدا زێوەر بە جوانی بەسەر ئەم شارە مەزنەدا هەڵدەڵێ وەکو پایتەختی عێراق و جێگەی گەورە پیاوان. ناوی کۆمەڵێک لە شێخانی تەریقەتی سۆفیزم و پیاوانی ئایینی ئیسلام دێنێتەوە یادی خوێنەری ئەم لیریکە جوانەی. لە ناو ناوەکاندا ئەم زاتانە دەکەونە بەرچاو: ئەبولقاسمی جونەیدی بەغدایی (٨٢٢م - ٩١٠م)، ئەبولحەسەنی سیرری سەقەتی (٨٦٥م مردووە)، باڵوولی دانا، بیشری حافیی بەغدایی (٨٤١م مردووە)، شێخ مەعرووفی کەرخی (٨١٥م مردووە)، ئیمام مووسای کازم (٧٤٥م - ٧٩٩م)، شێخ عەبدولقادری گەیلانی (١٠٧٧م - ١١٦٥م)، محەمەدی مەهدی، خەڵکی شیعەی ئایینزای ئیسلام چاوەنۆڕی زیندووبوونەوەی دەکەن لەو کاتەی ژیانی سەر ڕووی زەوی کۆتایی پێ دێ.

لەم شیعرەدا کە زێوەر باس لە بەغدا دەکا وەکو بڵێی ئەو قسەیە دووبارە دەکاتەوە لە مێژووی کۆنی مرۆڤایەتیدا بەغدا دایکی گێتی و پایتەختی بوو.

٤

زێوەر لە ساڵی ١٩٣٩دا بووە بەکارگێڕی قوتابخانەی سەرەتایی بەرزنجە، لە وەسفی ئەو ئاوەدانییەدا بەبێ ئەوەی ناوی بێنێ دەڵێ:

پابەندی بەنی کاڵە وو پڕ سیرمە کڵاشم
پەروەردەیی چنگ سووتەکە وو ساوەر و ماشم
من چیمە لە فاسۆنی فەڕەنگ چۆغەیی لیڤی
تا شاڵی مەرزیانە خوری بێ بەقوماشم
دانیشتنی سەرچاوەیی ئاوانی چیاکەم
نایدەم بەهەموو موڵکی جیهان گەرچی گەداشم
بۆ سەیری گوڵ و مێرگی نزاران لە بەهارا
چاوم وەکو نێرگس گەشە مەفتوونی هەواشم
بۆ نیکوی بەدی عالەمی دونیا لە کەنارم
بودینی خەڵک بێ زەرەرم نیوە مەلاشم



داخم ئەوەیە هاووەتەنم زۆری نەزانە
بەم دەردەوە ئەتلێمەوە ئاو کەوتووە ئاشم
هەرچەندە لە شار دوور و لە دێش دەربەدەرێکم
پێم خۆشە کە کەوتوومە مەحەللی بەنی هاشم

لەم شیعرەدا زێوەر بەجۆرێک کوردایەتی دەکا لە دەوروبەری جەنگی دووەمدا باو بوو. خەڵکی کورد ئەو سەردەمە هەموو دیاردە و کردەوە و کردارێکی ناوچەیی و نیشتمانی کوردەوارییان بەچاکتر دەزانی لەوەی بێگانە، وەکو لەبەرکردنی جلی قوماشی کری خۆماڵی و بەکارهێنانی هەموو شتێکی خۆمانە بەڵگەی نیشتمانپەروەری بوو. شاعیر لێرەدا هەندێ نەریتی ئەتنۆگرافی کوردەواری بەکار دێنێ و لەگەڵ ئەوانەی بێگانە بەراوردیان دەکا وەکو کاڵە و کڵاش و خواردەمەنیی وەک چەنگ سووتەکە و ساوەر و ماش بەراوردیان دەکا لەگەڵ فاسۆنی فەرەنگ (قوماشی ئەورووپایی)، هەروەها باس لە چاوتێری خەڵکی بەرزنجە دەکا.

٥

لە شیعرێکیدا زێوەر بۆ وەسفی شاری خانەقین هەوای شیعری پەروەردەیی جوگرافی تێکەڵ بەوێنە ئامادەکراوەکانی شیعری کلاسیکی کۆن دەکا:

جەننەتە بێ شوبهە شاری خانەقین
ئاوی ئەلوەندیشی وەک مائی مەعین
دیمەنی سەر پرد و سەیری ئاوەکەی
سۆفیی ووشکیش ئەخاتە هەڵپەڕین
گەر لەسەر پرد هەر تەماشای ئاو بکەی
قەت خەفەت ناخۆی دڵت نابێ حەزین
وێنەیی وا کەم لە دونیادا هەیە
باغی جوان ئاوی ڕەوان ئەهلی بەدین
ئەهلەکەی کوردی غەریب دۆست و نەجیب
ڕوو گوشاد دڵشاد و ئازاد و ئەمین
سەیری ئەو شارە ئەکەن ئەهلی فەلەک
داغ و حەسرەتیانە وەک ئەو ئەهلە نین

گەر تەماشای کۆشک و خانوویان بکەی
وا ئەزانی لەندەنە یاخۆ پەکین
داری خورما داری لیمۆ و پرتەقاڵ
داری نارنج و کەباتی چین بەچین
زینەتی داوە بەشار و جادەکەی
ئاسمان حەسرەت کەشە بۆ سەر زەمین
قەیسەری وەک کۆشکی قەیسەر عالییە
کاسبی ڕووخۆش و دەم پڕ پێکەنین
مەعهەدی دینییەیی مزگەوتەکان
پڕ لە ئیسلامی حەقیقی دوور لە کین
هەر حەدیقەی بۆی بچی چاو ڕوون ئەکا
سەوزە و گوڵزارە زەرد و سوور و شین
قووەتی گیان قووەیی نووری نەزەر
مەزهەری ئاساری ڕەببولعالەمین
جاددەکانی مونتەزەم ڕێک و ڕەوان
پڕ لە ئایینە و ڕەونەدی نازەنین
بانگ ئەکەن بۆ ئەهلی سەر عەردی مەلەک
ئەو بەهەشتە فەدخولووها خالیدین

زیاتر لە نیو سەدە پێش ئێستا لە ساڵی ١٩٤٤ زێوەر ئەم شیعرەی بڵاو کردۆتەوە، هەستی بەوە نەکردووە کوردایەتی تێدا دەکا، چونکە ئەو کاتە کارێکی ئاسایی بوو خەڵکی خانەقین بەکورد بژمێررێن. شاعیری دڵسۆز نەیزانیوە بۆ ئەمڕۆ کوردایەتی کردووە. هەرچۆنێ بی شایەدی زێوەر بۆ کوردبوونی خانەقین گەلێ گرنگە بۆ ئێستا کە بگرە و بەردەی دروست کردووە.

شاعیر بابەتی وەسفی بۆ هەندێ لە ڕۆژنامە و کۆوارەکانیش بەکارهێناوە وەک ستایش و پێدا هەڵدان ئەوانەی لە سەردەمی ژیانی خۆی بڵاو کراونەتەوە وەک «بانگی کوردستان» (سلێمانی ١٩٢٢)، «ڕۆژی کوردستان» (سلێمانی ١٩٢٢)، «ژیانەوە» (سلێمانی ١٩٢٤)، «ژیان» (سلێمانی ١٩٢٦)، «گەلاوێژ» (بەغدا ١٩٣٩).



## سروود و گۆرانی

زێوەر یەکێکە لەو شاعیرە کوردانەی بەشدارییێکی بەرچاویان کردووە لە دانانی سروود و گۆرانی بۆ قوتابییان. ژمارەیێکی زۆری لەم بابەتە شیعرە هۆنیوەتەوە. هۆی ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی زۆربەی ماوەی ژیانی کارکردنی بەمامۆستای قوتابخانە بردۆتە سەر، هەمیشە لەگەڵ قوتابیان بووە، لە هەر چوار ماوە دەسەڵاتە سیاسییەکەی کە بریتییە لە داگیرکەری عوسمانی و ئینگلیز و بەڕێوەبەرایەتییەکانی شێخ مەحموود و دەسەڵاتی عیراق. زۆربەی سروودەکانی بەناوەرۆک و ئاواز لە سروودی دەوری عوسمانی و تورک وەرگیراون، هەندێکیشیان لە عەرەبییەوە کراون بەکوردی. بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا سروودی ڕەسەنی کوردییان تێدا هەیە.

١

یەکێ لە سروودە بەناوبانگەکانی زێوەر:

ئەی کوردینە ئەی مەردینە
با دەست لە ناو دەست کەین هەموو
بۆ بەرزیەتی خاکی وەتەن
بۆ یەکێتی بچین هەموو کوردین هەموو
بێکەس نییە دایکی وەتەن
ئێمە فیداکاری ئەوین
تا کورد لە عالەم دەرکەوێ
بۆ یەکێتی بچین هەموو کوردین هەموو
ئەجدادمان شێری زەمان
حوڕبوون بەسەربەستی ژیان
باکمان نییە ئێمەش لە کەس
بۆ یەکێتی بچین هەموو کوردین هەموو

ئەم سروودە وێنەیێکی ڕەسەن و داهێنراوی شیعری کوردییە، کەچی بۆ چڕین ئاوازەکەی تورکییە «أنقرە نک داشنە باق» واتە (بنواڕە بەردی ئەنقەرە)، مارشێکە پڕ لە گیانی

کوردایەتی و خۆشەویستی دایکی نیشتمان. تا ئێستا یەکێکە لە سروودە بەهەرمێنەکان لە قوتابخانە سەرەتاییەکانی کوردستانی عیراق.

٢

لە سروودێکی دیکەیدا دەڵێ:

ئەی وەتەن چەند خۆشەویستی رووحی شیرینی منی
مەزرەعە توخمی نەشات و باعیسی ژینی منی
بێتو گەر من کۆهکەن بم وەسڵی شیرینم ببێ
تیشەیێ نادەم لە بەردت تۆی کە شیرینی منی
گەرچی ئەرزی هێند بڵندی وەختە لای من بچیە عەرش
واسیتەی سەربەستیی و ئیجرایی ئایینی منی
ئیفتیخاری میللەتی تۆی مادەرێکی میهرەبان
خوا هیلالیشی بەتۆدا ماه و پەروینی منی
نەوبەهاران بەو هەوای زۆر سافەوە وەک جەننەتی
فەسڵی زستانیش سەراسەر باغی نەسرینی منی
بۆچی نەقدی جیسم و جانی خۆم بەشاباشت نەکەم
خاکی ڕاهی حوکمڕانی عیزز و تەمکینی منی
ئارەزووی فیکری سیاحەت ناکەم ئیتر ئەی وەتەن
تۆ لە جێگەی قاهیرە و تاران و بەرلینی منی

زێوەر ئەم سروودەی لە ساڵی ١٩٢٢ نووسیوەتەوە، لە سروودی پێشوودا لەگەڵ کوردان قسەی کردووە «ئەی کوردینە ئەی مەردینە...» کەچی لەم سروودەیدا موناجاتی لەگەڵ نیشتمانە. کوردستان ئەوەندە جوان بووە بە دلبەر و خۆشی دڵدارە. وەک خاکێک تەماشای ئەم خۆشەویستەی دەکا. ئیتر دەکەوێتە بەراوردکردن لە نێوان نیشتمانی هەندێ لە شارانی دیکە. کێش و قافیەی شیعر ناچاری دەکا ناوی قاهیرە و تاران و بەرلین بێنێ، بەڵام بێ گومان بەلای شاعیرەوە نیشتمانەکەی ئەو لە هەموو ئەو جێگایانە جوانترە بۆیە پێویستی بەگەشتوگوزار و گەڕان و حەسانەوە نییە بۆ ئەو وڵاتانە.



٣

زێوەر سروودێکی بۆ عیراق وتووە:

ئەی عیراق ئەی عیراقم ئەی نووری چاوان!
چەندە جوانی لە نەزەردا بوویتە گوڵشەنمان
لە شیمال و لە جونووبا مەنزەرەی فەتتان
دانیشتوانت وەک برامن وەک برای هاوجان
شاخەکانت دەشتەکانت ڕووح ئەبەخشێ پێم
ئاوی سافت جێی تەوافت لادەبا ئەحزان
ئاگری عەشقت لە دڵدا ڕۆشنە بۆمان
تۆ حەیاتی جێی بەراتی مەنبەعی ئیمان

ئەم سروودە لەسەر ئاوازی سروودی عەرەبی «یا بلادی یا بلادی یا ضیاء البلدان» واتە (ئەی وڵاتم ئەی وڵاتم ئەی ڕووناکیی وڵاتان) دانراوە. زێوەر لە سییەکانی سەدەی بیستەم سروودەکەی هۆنیوەتەوە لەو کاتەی دەسەڵاتی مەلیکی لە عیراقدا لەنگەری گرتبوو و مەسەلەی نیشتمانی کورد لە گۆڕەپانی ڕاپەڕین و شۆڕشەوە گواسترابووەوە مەیدانی هێمنی و ئارامی، ڕۆشنبیری کورد خەریکی خەباتی خوێندەواری بوو بەپێی ئەو چۆرە مافەی «قانوونی زمانانی ناوچەیی» دابووی بەکوردی عیراق. ئەمە تا پلەیێک کەڵکی هەبوو بۆ لەناونەچوونی میللەتی کورد.

## گاڵتەوگەپ و پەند و ئامۆژگاری و مەتەڵ (هەڵهێن)

زێوەر بەبێ شیعر نەژیاوە، لە دوو زەریایدا مەلەوانی کردووە، یەکێکیان ئیلهامی، وێنە و ڕووداو وەک برووسکەیێک لە ناو دڵیدا هەڵقوڵیوە بۆ لای مێشک و بووە بەشیعر، ئەمە ئەو شیعرەیە کە داهێنراوی پێ دەوترێ. ئەویتریان بیری وێنە و ڕووداو وەک واقیعێک لە مێشکیدا هەڵقوڵیوە و وەک شنەباییێک بۆ لای دڵ چووە و بووە بەشیعرێکی پەروەردەیی بۆ فێربوون و ڕابواردن.

بابەتی گاڵتەوگەپ و پەند و ئامۆژگاری و مەتەڵ (هەڵهێن) و قسەی نەستەق لە بنجدا بەپەخشان دەکەونە ناوەوە لە ئەدەبی میللیی سەرزاری نەنووسراو (فۆلکلۆر) لە پاشانا شاعیر ئەم بابەتانە دەگوێزێتەوە بۆ ئەدەبی نووسراو. زێوەر ئەگەر بەزۆری بەرهەمە

میللییەکانی نەکردبێ بەشیعر، لەسەر لاساییکردنەوەی ئەو بەرهەمە میللییانە شیعری لەم بابەتانەی داناوە. لە شیعرێکیدا دەڵێ:

کەسێ چاک بێ کرداری
لێی قوبووڵ بکە دیاری
ئەوەی کەوا بەدفیکرە
قەت دیاری لێ وەرمەگرە
هەیە نانێک ئەبەخشێ
خۆی پێوە هەڵئەکێشێ

ئەمە پەند و ئامۆژگاری ناو خەڵکە زێوەر کردوویەتی بەشیعر. ئامۆژگارییێکی دیکەی ناو کۆمەڵی کوردەواری بەشیعر هۆنیوەتەوە:

تۆ کە سادەی عەرەق مەخۆ ڕۆڵە
هاوپیاڵەت مونافیق و زۆڵە
هێزی قاچت نییە هەتا ڕاکەی
دەستەکانیش لە بۆ دیفاع کۆڵە

ئینجا شاعیر ڕوو دەکاتە ئەو کەسانەی ڕەخنە لە کەسانی دیکە دەگرن خۆیان خاوەنی ئەو کردەوانەن کە بەخەوشی دەزانن:

یەک عەیبی خەڵک ئەبینی خۆت ساحیبی هەزاری
خەڵکت لە لا خەرارە خۆشت وەکو دەواری
زاهیر فەقیر و سالم بەڕەنگ و بەرگی عالم
ئەمما لە ناو دەروونا مارێکی زەهرداری
چۆن پێت بڵێم موسوڵمان یا فەردی نەوعی ئینسان
دووری لە خێر و ئیحسان مەستی مەی و قوماری
دەستت لە سەنعەتا بێ ناوت لە حورمەتایە
قەلبت لە غەفلەتا بێ قەڵب و زەلیل و خواری

زێوەر نموونەی ئەم جۆرە بەرهەمە ئەدەبییانەی زۆرە. دەوری گرنگیان هەیە لە پەروەردەکردنی منداڵ و زۆرترین توێژەکانی ناو کۆمەڵ.



مەتەڵ (هەڵهێن) لە ئەدەبی میللیدا دەخرێتە ناو ڕستەی پەخشانییەوە. هەڵهێنانەکەی یا وەرامەکەی بە وشەیێک دەبێ، بەڵام لە ئەدەبی نووسراودا شاعیر بەشیعر باس لەو شتە شارراوەیە دەکا، وەرامەکەشی دیسانەوە هەر بەشیعر دەبێ.

## شیعری پەروەردەیی (دیداکتیکی، تەعلیمی)

بەرهەمی شیعری زێوەر لەم لایەنەوە دەکرێ بەدوو بەشەوە:

١- **چیرۆکی شیعری میللی:** ناوەرۆکی ئەم چەشنە بەرهەمە لە حیکایەت و بەسەرهات و ڕووداو و گێڕانەوەی ناو خەڵک وەردەگیرێ. کات و جێگە و قارەمان و بزووتنەوەی تێدایە، کاری شاعیر ئەوەیە جارێکی دیکە ڕووداوەکە لە ناو قالبی شیعر دادەڕێژێتەوە. زێوەر بایەخێکی زۆری بەم جۆرە ئەدەبە داوە. لە دیوانی شیعریدا هەندێ چیرۆکی شیعری ڕەند دەکەونە بەرچاو: تەحسیل دیدەیی ساحیب شەهادات، دارفرۆش (لە نووسینی شاعیری فرەنسی ئەلفۆس لامارتین و وەرگێڕانی بۆ تورکی عوسمانی موعەلیم ناجی)، سێ هاوڕێی چاوبرسی، چیرۆکی خێوی ناو مزگەوت و سۆفی کەریمی چەرچی، ئەمەیان لە ٢٨٥ دێڕە شیعری کێشی سیلابی خۆماڵی و قافیەی مەسنەوی (ا ا، ب ب، ج ج...) پێکهاتووە.

٢- **وانەی زانستی بۆ قوتابیان بەشیعر:** ناوەرۆکی ئەم جۆرە شیعرە لە بەرهەمی زێوەردا بریتییە لە هەندێ لە وانەکانی قوتابییان بەپێی بەرنامەی سەرەتایی زانستەکان بەشیعر هۆنراونەتەوە. زانیاریی لە کتێبی قوتابخانە وەرگرتووە بۆ ئەوەی بەئاسانی لەبەر بکرێ. لە دیوانی شیعری زێوەر وانەی «جوگرافیای عیراق» بەرچاو دەکەوێ. هەروەها بابەتی دیکەش دەبینرێ وەکو: خواناسین، باوک، دایک، گۆرانیی فەللاح، گۆرانی دیدەوانی (کەشافە)، سەعات، تۆپی پێ، دووڕوویی، تەمەعکار، پشیلەی ڕیاکار، ژمارە، ناوی ڕۆژەکان، بۆکچان، گۆرانیی بەیداغ، هەنگ، ورچی خەتیب و مەیموون، کۆتر و ڕاوکەر، خودا، تاووس.

## چوارین

زێوەر کۆمەڵێک چوارینی ڕەنگینی هەیە، وەکو زۆربەی چوارینی شاعیرانی دیکە ناوەرۆکیان بریتییە لە بیری دانایی و قسەی نەستەق و خەیاڵی دڵداری و وەسفی سروشت.

١

لە چوارینێکیدا زێوەر دەڵێ:

چ خۆشە گەر لەپڕ یاری سەمەن ڕوو یا سەمەن بۆ بی
لەبەر چۆگانی زولفیدا سەری من هەر وەکو گۆ بێ
خەیاڵی چەهرەیی گوڵ ئاتەشینی گەر لە دڵ گوم بێ
ئیلاهی مەجمەری سینە سەراپا پڕ لە پشکۆ بێ

ئینگلیز کە ویلایەتەکانی مووسڵ و بەغدا و بەسرەیان داگیر کرد لە دوای جەنگی یەکەمی گێتی یاریی پۆلۆیان لەگەڵ خۆیانا هێنا. زێوەر پێش ئەمە ئاگاداری ئەم یارییە بووە. شاعیران سەلکی خۆیان کردووە بەگۆ بۆ ئەوەی دلبەر لەم یارییەدا بەکاری بێنێ. شاعیری لای ئێمەش بەجۆرێکی دیکە تابلۆییێکی دڵداری دروست کردووە لەم بابەتەوە. زولفی درێژی یاری کردووە بەچۆگان (قاشۆ، گۆپاڵ، گۆچان)، دیارە سەلکی شاعیریش بووە بەگۆ. لە خودا دەپاڕێتەوە ئەگەر نەخشی جوانی لە دڵی شاعیردا نەمێنێ پڕ لە پشکۆی بکا بۆ ئەوەی بسووتێ و لەناوبچێ.

٢

لە چوارینێکیدا داهێنانێکی ڕەوانبێژی هەیە:

مانگی ڕەمەزان کە بیست و نۆ بێ
ساحێب شەرەفە هیلالی شەووال
ئەمما ڕەمەزان کە سی تەواو بێ
قەدری نییە مانگ بەدانگ و مسقال

ئەگەر ساڵێک مانگی ڕەمەزان بیست و نۆ ڕۆژ بێ و سی ڕۆژ نەبێ مانگی شەوال سەربلندە چونکە هەموو موسوڵمانێک لێی دەگەڕێ بۆ ئەوەی بیکا بەجەژن، بەڵام ئەو ساڵەی ڕەمەزانی سی ڕۆژ بووبێ مانگی شەوال هیچ حورمەتێکی نامێنێ چونکە کەس لێی ناگەڕێ. ئاشکرایە موسوڵمان ئەگەر ڕەمەزان سی ڕۆژ بگرێ دەیکا بەجەژن و لە مانگ ناگەڕێ.



٣

زێوەر چوارینێکی بۆ زیندانی کردنی شێخ مەحموود وتووە:

بەحەبسی یووسفی سانی دڵی عالەم موکەددەر بوو
دڵی زیندان بەتالع بوو بەدیداری مونەووەر بوو
لە تەشتی سینە وو جامی سەرا سەد پەنجە ئەشکێنم
هەتاکو موژدەیێکم دێتە گوێ ئەو مانگە وا بەربوو

یووسف پێغەمبەر ڕەمزی گەورەیی و جوانییە لە لایەن هەموو ئایینەکانەوە، بەسەرهاتی بووە بەئەفسانەی دڵداری و سەرچاوەییێکە گەلێ بەرهەمی جوانی لێ دروست کراوە لە ئەدەبی هەندێ لە نەتەوەکانی سەر ڕووی ئەم زەوییە. زێوەر شێخ مەحموود بەیووسفی دووەم دەژمێرێ. گیرانی وەکو گیرانی مانگ وایە. بەلای شاعیرەوە شێخ مەحموود مانگە، ئەگەر مانگ بگیرێ لە کوردەواریدا لە دەف و تەپڵ و قاپوقاچاغ دەدرێ بۆ ئەوەی جنۆکە و شەیتانەکانی دەوری مانگیان داوە لابکەون و مانگ بکرێتەوە. زێوەریش لە تەشت و سینە و جامی سەرا دەدا بۆ ئەوەی شێخ مەحموود ئازاد بکرێ.

٤

لە چوارینێکیدا زێوەر دەگەڕێتەوە مەشقی ڕەوانبێژی:

بۆ موتالا و خوێندنم سەفحەی جەمالت کافییە
ڕەنجی بێ هوودە ئەکێشم با لە شەرحی کافییە
ئیبنی سینا و شیفای ئەو با لە مەیدانا نەبن
چاوەکانت بۆ عیلاجی دەردەکانم کاییە

لەم چوارینەدا زێوەر گەمەیێکی ڕەوانبێژی دەکا لەگەڵ وشەی «کافیە» و هەندێ لایەنی سامانی بیری ئیسلام دەور دەکاتەوە. بێ گومان کافیە ناوی ئەو کچە جوانەیە کە شاعیر وەسفی کردووە و شیعری بەسەردا هەڵداوە، هەروەها کتێبێش هەیە بەناوی «کافیە»وە، بەم ناوەوە عەبدولڕەحمانی جامی و عوسمان کوڕی عومەری شارەزووری کتێبیان هەیە. بەشێ لە وێنە ڕەوانبێژییەکان پێوەندییان بەئیبنی سینا و کتێبەکەی «شفاء»ەوە هەیە.

٥

له چوارینێکیدا زێوەر دوو کەسی زیاتر لەیەکچوو و کەمتر لەیەکنەچوو بەراورد دەکا:

وەحشەتم زۆر لا پەسەندە ئەگەر
مەدەنی بن ستالین و هیتلەر
گەر موسوڵمانی وەک هەنێ کەس بێ
دینی بوودات لە لا موقەددەس بێ

لێرەدا بەلای شاعیرەوە ستالین و هیتلەر قەت نابن بەمەدەنی، واتە دیمۆکراتی. مەسەلەی ئەم دوو پیاوە وەک کەسانێکە تەنیا بەناو موسوڵمانن. ئەگەر ئەمانە بەڵگەی موسوڵمانەتی بن دەبێ ئایینی بوودا پیرۆز بێ.

٦

شاعیر واز لە ستالین ناهێنێ و لە چوارینێکی دیکەدا دەڵێ:

ئەی خانمی ئەلمۆدەی نەشمیلەیی قژ ڕووت
لێم مەگرە کە لێوم بخەمە سەر دەم و سەر ڕووت
بیستوومە شیوعیت و منیش ئێستە هەژارم
قانوونی موساواتە من و تۆ کە ببین جووت

شاعیر چاوی بەکچێکی عەلمۆدەی نەشمیلی جوان کەوتووە بەکۆمۆنیستی زانیوە. هەرچۆنێ بێ حەزی لێ کردووە و پێی وتووە وەرە لام با ببین بەدلبەر و دڵدار، دەستووری ئێوە یەکسانییە. شاعیر لێرەدا وا بیر دەکاتەوە، یا دەیەوێ بەخەیاڵی شیعری وا بیر بکاتەوە، کۆمۆنیزم و ستالین بەشێوەییێک کۆمەڵیان بەرەڵڵا کردووە بووە بەگەرەلاووژە، کوڕ و کچ، پیاو و ژن بەماچوموچ وا خزاونەتە ناویەک بەزمێکە ئەوسەری دیار نییە. زێوەر وا دەزانێ بەئاسانی ئەو کچەی دەست دەکەوێ، بەڵام لێرەدا شاعیر لە مەسەلەکە نەگەیشتووە، کۆمۆنیزم ئەو جۆرە ئیباحییەتەی تێدا نییە. ڕاستییەکەی ئەوەیە پڕوپاگەندەی ئەمپریالیستی جیهانی ئەو سەردەمە و ئایینە جیاوازەکانی سەر ڕووی زەوی کاریان لە شاعیر و خەڵکی دیکەش کردووە.



٧

له چوارینێکیدا زێوەر ڕوو دەکاتە ڕەفیق حیلمی و قسەی لەگەڵدا دەکا:

ئەی ڕەفیقی موحتەرەم ئەی خاوەنی شیرین مەقال
هاتە بەر مەددی نەزەر فیکرت وەکو ئاوی زولال
من ئومێدی گەورە گەورەم پێتە بۆ ئەم میللەتە
نەک خەیاڵی خۆت سەرف کەی تۆ لە زیکری خەت و خال

زێوەر ڕەفیق حیلمی بەکەسێکی ڕۆشنبیر و خوێندەوار لە قەڵەم داوە، ئاگاداری نووسینی بووە و هەندێ شیعریشی خوێندۆتەوە، وا دەردەکەوێ شیعرەکانی بەدڵ نەبووە، لەبەرئەوە ئامۆژگاری دەکا خەریکی سیاسەت و نووسینی بەکەڵک بێ بۆ کورد و واز لە شیعر نووسین بێنێ. ئەوەی پێویستی بەڕوونکردنەوە هەیە ئەوەیە ڕەفیق حیلمی شیعری جوانی بەکوردی و تورکی هەیە.

**تاک**

بابەتی تاک لای ئەم شاعیرەمان برووسکەییێکی کورتە وەرامی پرسیارێک دەداتەوە یا هەڵوێستێک هەڵدەسەنگێنێ یا شیکردنەوەی قسەی نەستەقێک یا پەندی پێشینانێکە، یا چرکەییێکە بەرامبەر ڕەنگینی جوانێک، یا جریوەییێکە لە ناخی دەروونی ئەستێرەییێک هەڵدەقوڵێ.

١

لە تاکێکیدا دەڵێ:

پیرێ بچێتە مەجلیسی جوانانەوە کەرە
جوانێ بچێتە مەجلیسی پیران مونەووەرە

بەلای شاعیرەوە پیر لە ناو کۆڕی لاواندا تاریکییە، کەچی بەپێچەوانەوە لاو لە ناو کۆڕی پیراندا ڕووناکییە.

٢

لە تاکێکیدا زێوەر ستایشی کاک ئەحمەدی شێخ دەکا:

مەدحی کاک ئەحمەد ئەکەم ئەو شاهی مەه جاهە بەنام
ئەولیـای عـەسری هیـلالن ئەو وەکـو مـاهی تەمـام

زێوەر بەراورد لە نێوان کاک ئەحمەدی شێخ و هەموو شێخ و ئەولیاکانی سەردەمی ئەو دەکا. کاک ئەحمەد بەمانگی چواردە و ئەوان بەمانگی یەک شەوە دەچوێنێ.

٣

لە تاکێکی دیکەیدا ناوەرۆکی پەندی پێشینانێک دەگێڕێتەوە:

حیزی و دزی و خیانەت نە مەحکوومی ئەسیری
هیچیان دەماغ شکێن نین وەک عیللەتی فەقیری

زێوەر گیروگرفتی هەژاری لە سەرووی هەموو ناکۆکییێکی کۆمەڵایەتی دادەنێ. ئەوەندە ناحەزە لەگەڵ هەژاری زمانی حالی لەگەڵ عـەلیی کوڕی ئەبوتالیب دەڵێ «ئەگەر هەژاری پیاوێک بوایە دەمکوشت».

***

مـەلا عـەبدوڵڵا ئەفـەندی زێوەر خـاوەنی دوو قـوتابخـانەی هونەرییە لە نـاو شاعـیـرانی کورد. یەکەمیان قوتابخانەی مەلایەتی کۆن و دوازدە عیلم کردوویەتی بەمەلا. دووەمیان قوتابخانەی تازە بابەتی خوێندنی نوێی فیزیا و کیمیا کردوویەتی بەئەفەندی. بەم هۆیەوە بەرهەمی شیعری بووە بەنموونەی ڕەنگدانەوەی ژیانی دڵداری و کۆمەڵایەتی و سایکۆلۆجی و سیاسی و هەموو لایێکی گوزەرانی کوردەواری.

لە شیـعری عـەرووزیدا وەسـتـا بوو، ڕێ خـۆشکەرەوە بوو لە نوێکردنەوەی بزووتنەوەی شیـعری کوردی، دەورێکی گرنگی هەبوو لە چەسپاندنی. شیـعری بۆ هەموو توێژەکانی کـۆمـەڵی کـوردەواری وتووە، لە مـەلای کـۆن و ڕۆشنبـیـری تازەوە تا نەخـوێندەوار و بۆرەخوێندەوار. هەمـوو کـوردێک لە هەرچی پلەی خـوێندەواری و گـوزەرانی دارایی بێ لە بەرهەمی شیعری زێوەردا بەشی خۆی هەیە لە منداڵی قوتابخانەی سەرەتاییەوە تا پیری ڕۆشنبیر و نەخوێندەوار.

## بەشی دوازدەم

### حەمدی

### ١٨٧٨ - ١٩٣٦

رەببی مـووی لێ بێ زمـانی پەنجـەکـانی هەڵوەرێ
هەرکەسێ گوڵشەن بەدەردی گوڵخەنی دۆزەخ بەرێ

### ژیانی حەمدی

ئەحمەد کوڕی فەتاح بەگ کوڕی حاجی ئیبراهیم بەگ کوڕی مەحموود بەگی ساحێبقڕان. نازناوی شیعری «حەمدی»یە، لەسەر دەستووری شیعری کلاسیکی لە بەرهەمیدا بەکاری هێناوە.

حەمدی لە ساڵی ١٨٧٨ لە سلێمانی لە دایک بووە. سەرەتای خوێندنی لە تەمەنی منداڵیدا لای مەلا عەزیزی زەلزەلەیی دەست پێ کردووە. ئەمین زەکی مێژوونووس هاوڕێی حوجرەی بوو. لە پێشانا قورئانی خوێندووە ئینجا هەندێ لە پرۆگرامەکانی خوێندنی مزگەوتی ئەو سەردەمەی تەواو کردووە. لە دواییدا ڕووی کردۆتە حوجرەی مەلا سەعیدی خواجە ئەفەندی لە مزگەوتی عەزیز ئاغا (مزگەوتی ناو بازاڕ). سەری لە مزگەوتی دیکەی شاری سلێمانی داوە، لەوانە خانەقای مەحوی بەمەبەسی خوێندن، ماوەیێکیش لە قوتابخانەی ڕوشدییەی مولکی عوسمانی خوێندوویەتی. حەمدی خوێندنی حوجرەی مزگەوت و قوتابخانەی ڕوشدییەی تەواو نەکردووە و وازی لە خوێندن هێناوە، بەڵام لە خۆ فێرکردن نەپچڕاوە تا گەیشتۆتە پلەیێک بووە بەخوێندەوار و ڕۆشنبیرێکی بەدیمەن.

بنەماڵەی حەمدی بەبنەچە دەچنەوە سەر کوردی شاری سنەی ناوچەی ئەردەلان. بەهۆی خزمەکانییەوە گەشتی ئێران و کوردستانی ئێرانی زۆر بووە. سەری لە تەورێز داوە، هاتوچۆی بەغدای کردووە. ژیانی لە سەرەتادا هێمن و بێ گرێ بووە. لە دواییدا کە بەتەمەن گەورەتر بووە، وەک هۆشمەند و تێگەیشتوو کەوتۆتە ڕوو. دەمارگیر بووە بەرامبەر هەڵوێستی ناهەموار. بەرگری لە بیروباوەڕی خۆی کردووە ئەگەر لە ئەنجامدا تووشی هەزار گیروگرفتیش بووبێ.



لە سەردەمی فەرمانڕەوایی عوسمانییەکان نێوانی حەمدی و شێخ مەحموود خۆش نەبووە لەو کاتەی ژیانی شێخ بێ گرێ و ئاسوودە بووە، بەڵام لە کاتێکدا دەسەڵاتی ئینگلیز لە جەنگی یەکەمی گێتیدا لە سلێمانی پەیدا بوو حەمدی لە شێخ نزیک بووەوە و وەک یەکێک لەو خەڵکانە دەژمێررا کە هۆگر و خۆشەویستی شێخ مەحموود بوون. شەڕی بازیانی ساڵی ١٩١٩ لە نێوان لەشکری شێخ و ئینگلیز بەشکان و گرتنی کۆتایی هات. ئینگلیز ئەوی خستە بەندیخانەوە و حەمدی و ئەوانەی سەر بەشێخ بوون خۆیان ڕزگار کرد بەوەی بەرەو شاخ بوونەوە. حەمدی بۆ ماوەی سێ ساڵ ژیانی ئاوارەیی لە ناو شاخ و کێوەکاندا بردە سەر.

لە ساڵانی ١٩٢٢ - ١٩٢٤دا جارێکی دیکە شێخ مەحموود فەرمانڕەوایی دامەزراند و بوو بەمەلیکی کوردستانی باشوور حەمدی کرد بەوەزیری گومرگ لەو حوکوومەتەدا. ئەو پێوەندییە باشەی لەگەڵ شێخ هەتا سەر نەبوو، وابوو لەگەڵی تێکچوو. بەشیعری بەرزی داهێنراو کەوتە ڕەخنەگرتن لە کردەوە بێ جێیەکانی شێخ مەحموود. هەر چۆنێ بێ ئەم شیعرانە و هەموو ستایشەکانی دیکەی حەمدی بۆ شێخ هیچ جۆرە تەنگوچەڵەمە و جیاوازییێکی تێدا نییە و بەداهێنانی بەرز دیوانی شیعری کوردییان ڕووناک کردۆتەوە.

لە دوای تێکچوونی دامودەزگای نەتەوەیی کورد لە سلێمانی و پەیدابوونی زاراوەی «کوردستانی عیراق» شاری سلێمانی و ناوچەکەی بوون بەلیواییێک (پارێزگاییێک) لە عیراق، حەمدی خۆی خانەنشین کرد و خەریکی ژیانی تایبەتیی ماڵەوەی خۆی و خوێندنەوە و نووسینی شیعر و پێشوازی کردنی میوانان بوو تا لە ڕۆژی ١٢ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٣٦ بەهۆی وەستانی دڵ ماڵئاوایی کرد و لە گۆڕستانی گردی سەیوان نێژرا.

### دیوانی حەمدی

دیوانی شاعیرانی کلاسیکی کورد لە ڕووی بەرنامەی بڵاوکردنەوەی بەرهەمی شیعریان دوو ڕێگەی گرتووە.

١- هەموو ئەو شیعرانەی بەناوەڕۆک دەچنە ناو بابەتی ئایینەوە وەک بەشێکی گرنگ دەکەونە پێش شیعری دیکەوە. ئەمانە بەموناجات و ئیلاهییاتی ستایشی خودا دەست پێ دەکەن، ئینجا ستایشی پێغەمبەر (نەعت) و ستایشی شێخ و ئەولیاکانی ئایینی

ئیسلام، لە دوای ئەمە هەموو شیعرەکان بەپێی دەنگی قافیە یەک لە دوای یەک چاپ دەکرێن چونکە شیعرەکان لەسەر بنچینەی یەکێتیی قافیە هۆنراونەتەوە.

٢- شیعری شاعیر هەمووی بەسەریەکەوە بەپێی دەنگەکانی ئەلفوبێی زمانی عەرەبی و کوردی کە بۆ قافیە بەکار هێنراون بەڕیز لە دیوانی شیعردا چاپ دەکرێن لە ئەلفەوە (ا) تا یێ (ی).

لە نووسینەوەی دیوانی حەمدی سیستێمێکی تازە بەکارهێنراوە، پارێزگاری هەردوو شێوە کلاسیکییە کۆنەکە کراوە.

نووسینی شیعرەکان لە دیوانی حەمدی بەم جۆرەیە:

١- شیعری یەکەمی دیوانەکە بەناوی «سوورەتی فاتیحە»یە. لە سەرەتاوە تا دوایی، واتە لە بیسمیللاوە تا ئامین هەموو ئایەتەکانی ناواخن (تضمین) کردووە لە ناو دێڕەکانی شیعرە کوردییەکەدا.

٢- دوو قەسیدە لە موناجاتی خودا.

٣- دوو قەسیدە لە ستایشی پێغەمبەر (نەعت).

٤- قەسیدە و غەزەلێک لە وەسفی «ڕۆژ».

٥- «شەو» و «ئەرز» و «ئاسمان» و «کوردستان» هەریەکەیان بەغەزەلێک یا قەسیدەیێک وەسف کراون.

٦- وەسفی شەڕی دەربەندی بازیان لە نێوان لەشکری شێخ مەحموود و سوپای ئینگلیز لە ساڵی ١٩١٩.

٧- «ساقی نامە» بەهار و مەی و مەیخانە.

٨- قەسیدەیێکی درێژ لە وەسفی «کۆمەڵەی زانستیی کوردان» لە ٢ی نیسانی ١٩٢٦ هۆنراوەتەوە.

٩- قەسیدەیێکی درێژ لە ستایشی حەمدی بەگی بابان.

١٠- قەسیدەیێک بەناوی «دڵ».

١١- شەش پارچە شیعر بەناوی «تەرجیع بەندی ئایینی»یەوە.

هەموویان بەڕستەی عەرەبی «ماعَرَفْناكَ حَقَّ مَعْرِفَتِك» (تۆمان نەناسی وەکو هەی) دواییان هاتووە.



١٢- دوو تەرجیع بەند لە ستایشی پێغەمبەر، پاش قافیەیان وشەی «محەمەد»ە.

١٣- پێنج پارچە تەرجیع بەند لە ستایشی خەلیفەکانی ڕاشیدی ئەبووبەکر و عومەر و عوسمان و عەلی و حەسەن و حوسێنی کوڕانی عەلی.

١٤- قەسیدەی «شێوەنی کوردی باکوور» لە ٢٤ی مارتی ١٩٢٥ هۆنراوەتەوە.

١٥- دوو قەسیدە بەناوی «زەمان» و «قەومی کورد».

١٦- دوازدە قەسیدەی ڕەند بەناوی «تەرجیع بەندی نیشتمانی». سێ قەسیدەی یەکەم بەم دێڕە کۆتاییان هاتووە:

شیرەکەم پێتان حەڵاڵە خوێنەکەم گەر گوم نەکەن
نامداران و حەمیەت کاری ئەولادی وەتەن

نۆ قەسیدەکەی دیکەش بەم دێڕە کۆتاییان هاتووە:

ڕەببی مووی لێ بێ زمانی پەنجەکانی هەڵوەرێ
هەرکەسێ گوڵشەن بەدەردی گوڵخەنی دۆزەخ بەرێ

١٧- شیعرێک بۆ لافاوەکەی سلێمانی لە ساڵی ١٩٣٢دا دانراوە.

١٨- دوو شیعری مەحوی و شیعرێکی سالم و سێ شیعری مستەفا بەگی کوردی کراون بەپێنج خشتەکی.

١٩- وەرام بۆ مەلا عەبدولخالیقی ئەسیری (اثیری).

٢٠- سکاڵای نیشتمان.

٢١- سێ پارچە موستەزاد، یەکێکیان نیوە دێڕی بچووکی دووەم فارسییە، بەم جۆرە موستەزادە کە دەبێ بەمولڵەمەع.

٢٢- شیعرێک بەناوی «خاوەن شکۆ فەیسەڵی یەکەم» لەو کاتەی فەیسەڵ لە ساڵی ١٩٣١ گەشتی سلێمانی کردووە بەم شیعرە پێشوازی لێ کراوە.

٢٣- «گۆرانیی نەورۆز» بۆ جەژنی نەورۆزی ساڵی ١٩٢٥ وتراوە. لە نۆ بەندی هەشت نیوە دێڕ شیعری پێکهاتووە (ا ا ا ا ا ا م م)، (ب ب ب ب ب ب م م)، (جـ جـ جـ جـ جـ جـ م م).

٢٤- دوو پارچە شیعر بەناوی «فەلسەفە»وە.

٢٥- چوارینەکان، بریتین لە (٦٤) چوارین.

٢٦- تاکەکان، بریتین لە (٥) تاک.

٢٧- غەزەلەکانی دیوانی حەمدی بەپێی دەنگەکانی ئەلفوبێی عەرەبی و کوردی ڕیز کراون. ئەوەی شیاوی باسە ئەوەیە شاعیر لە قافیەدا هەموو دەنگەکانی ئەلفوبێی عەرەبی و کوردی بەکارهێناوە.

## شیعری حەمدی لە ڕووی ڕوخسارەوە

### کێش

هەمووی شیعری حەمدی لەسەر بەحرەکانی عەرووز ڕێکخراون. ئەو بەحرانەی لە کێشەکاندا بەکاری هێناون ئەمانەن: هەزەج، ڕەمەل، موزاریع، موتەقاریب، خەفیف، ڕەجەز، موجتەس. شیعری خۆماڵی سیلابی نییە، بەڵام وەکو ڕاستییێک هەندێ لە بەحرە سووکەکانی عەرووز کە بۆ هۆنینەوەی شیعری حەمدی و شاعیرانی دیکەی کلاسیکی کوردی بەکار هێنراون بەکێشی سیلابیی میللی خۆماڵیش دەکێشرێن.

### قافیە

حەمدی یەکەمین شاعیری کوردە لە شیعری یەکێتیی قافیەدا هەموو دەنگەکانی ئەلفوبێی عەرەبی و کوردی بەکار هێناوە، تەنیا دەنگی (پ)ی کوردی نەبێ لە شیعریدا بەرچاو ناکەوێ. واتە دەنگە تایبەتییەکانی عەرەبی (ث، ذ، ص، ض، ط، ظ)، هەروەها دەنگە تایبەتییەکانی کوردی (چ، ژ، گ، وو، ۆ، «ە - ـە»، ێ) بۆ قافیە بەکاری هێناون. قافیەی مەسنەوی (جووت قافیە) لە شیعری حەمدیدا زۆر کەمە تاکوتووک بەکاری هێناوە.

### پاش قافیە

زیادەڕۆیی تێدا نییە ئەگەر بوترێ حەمدی لە ناو شاعیرانی کورد یەکەمە لە زۆری بەکارهێنانی پاش قافیە، ئەمە زیاتری دەگەڕێتەوە بۆ ئەوەی شیعری بەژمارە و قەوارە (کەم و زۆری دێڕە شیعری غەزەل و قەسیدە) لە شاعیرانی دیکە زیاترە وەکو لەم لیستەیەدا دەردەکەوێ.



«ڕەحمەتێ، دەستی، ڕۆژ، شەو، ئەرز، ئاسمان، دڵ، موحەممەد، هات، ئەچێ، کورد، دەخیل، من، نەگری، ئەدا، جەژنە، یار، ناچێ، سینە، ئەم بەفرە، ناگرن، ژیانەوە، دۆست، بوو، ناگرێ، ئەکەی، ئەسپەکەم، بەردە، دی، کردووە، کەوت، ئەکا، دەرخا، ئەڕوا، ئەدا، کا (بکا)، ناکا، چبکا، درا، جا، نەبات (نەبا)، دەسی کەوت، دەست، دۆست، حەوادیس (حوادث)، بۆچ، ماچ، ئۆف، ئاخ، شاخ، نەکرد، شکاند، برد، کرد، کاغەز (کاغذ)، لەزیز (لذیذ)، کەمتر، زیاتر، نوور، یار، ڕەز، بەناز، شەمس، خەلاس، خەت (خط)، ناکا حەز - حەز ناکا (ناکا حظ)، واعیز، دڵی قانیع، ساغ، عەشق، خەیاڵ، چاوم، نەبڕم، نەگرم، نابەم، خۆم، تۆم (هی تۆم)، ناکەم، تا مردن، کردن، مەحزوون، ئەکەن، من، گرین، ئەو، برۆ، نەچوو، بوو، کامە، ئەو زولفە، بەشیە (بەشیەتی)، ڕەنگینە، حەڵاڵە، قسە، بۆ چییە، دێتەوە، وەرە، هاتەوە، ئاڵا (لێی ئاڵا یا تێی ئاڵا)، کێی (هی کێی)، چی، خاڵی، نەشکێ، سێ (ژمارە ٣)، جارێ، نەبێ، دێنێ، ناگەڕێ، دەگرێ، ناوێ، تۆبە بێ».

پاش قافیە لای حەمدی جۆرە ڕیتم و ئاوازێک دەداتە کێشی شیعرەکە. هەروەها لە قافیە بنچینەیییەکەی ئەو شیعرەی پاش قافیەی هەیە حەمدی شارەزاییانە بەزۆری هەوڵ دەدا هیچ وشەیێکی قافیە بەمانا فەرهەنگییەکەی دووبارە نەبێتەوە.

## شیعری حەمدی لە ڕووی ناوەڕۆکەوە

حەمدی خۆی لە چوارچێوەی تاکە مەبەسێکی شیعری کلاسیکی لە ڕووی ڕوخسار و ناوەڕۆکەوە حەشار نەداوە. ڕاستە کەسایەتییێکی شیعری دیار کراوە لە پەیکەری ئادەمزادێکدا، بەڵام بریتییە لە قوتابخانەیێکی شیعری بەرز. ئەم قوتابخانەیە لە نالی بۆتەوە، بەدرێژایی ڕۆژگار تا ئێستا ڕەسەنایەتی خۆی پاراستووە. حەمدی قوتابییێکی زیرەکی ئەم قوتابخانەیەیە، نالی و شاعیرانی دوای ئەوی دەور کردۆتەوە، بێ گومان خۆشی لە نەوەی دووەمی قوتابخانەکەیە. لە گێتی ئەدەبی کوردیدا یەکێ لە گەورەترین شاعیرانی گیانی ئەو قوتابخانەیان پاراستبێ حەمدی بووە.

حەمدی لە ڕوخساردا زۆرە، ڕەنگاوڕەنگە، بەری فراوانە، کەچی خاوەنی یەک شێوازە لە زمان و تەعبیر و لێکسیکۆن و ڕەوانبێژی بەهەموو بابەتەکانییەوە.

حەمدی شاعیری بەڕاستی بووە، تەنیا شاعیری تایبەتیی شتێک نەبووە، بەڵکو

شاعیری دەروونی خۆی بووە، شاعیری کوردستان بووە، شاعیری بەهار و نەورۆز و ئاسمان و شەو و ڕۆژ بووە، شاعیری هەموو ژیان بووە.

شیعری حەمدی لە دەروونێکی پڕ لە سۆز و بیروباوەڕێکی ڕێکوپێک و ئامانجێکی خاوێنەوە دەرچووە. کە ستایشی خودا و پێغەمبەری کردووە ڕاستگۆ بووە، چونکە بەعەقیدە موسوڵمانێکی بێ گەرد بووە، کە باسی کورد و کوردستانی کردووە ڕاستگۆ بووە، چونکە نیشتمانپەروەرێکی دڵسۆز بووە، کە باسی یار و بەهاری کردووە، ڕاستگۆ بووە، چونکە دڵدارێکی بەسۆزی ئادەمزاد و سروشت بووە. توانای بیری شاعیر و خەیاڵی ناو دڵ و دەروونی بەڵگەیێکی گرنگە بۆ ئەوەی ئاسۆی مێشکی گەلێ فراوان بووە، مەیدانی دڵی بێ پایان بووە و توانیوبەتی هەموو شتێکی هەست پێ کراوی ژیان لە مەیدانی شیعردا کۆ بکاتەوە.

تا سەردەمی ژیانی حەمدی قاڵبی کۆنی بابەتی تەرجیع بەند بەزۆری بۆ شیعری ئایینی بەکار دەهێنرا و لە ئاهەنگی مەولوودی پێغەمبەر بەئاوازی دەف و تەپڵ بەگۆرانی دەوترا. حەمدی بۆ یەکەم جار بۆ مەبەسی نیشتمانپەروەری و کوردایەتی تەرجیع بەندی بەکار هێنا. لەم لایەنەوە دوازدە قەسیدەی هۆنیوەتەوە لە بەرهەمە جوان و بەرزەکانی دەژمێررێن.

جگە لەوە بەگشتی حەمدی لە هەموو شاعیرانی دیکەی کورد زیاتر شیعری کێشی عەرووزی و یەکێتیی قافیەی بۆ مەبەسی ناوەرۆکی تازە بابەتی بەکار هێناوە.

## گەشتی گێتییە دەوڵەمەندەکەی حەمدی

### شیعری دڵداری

حەمدی غەزەلخوانی شیعری دڵداری و وەسفی ئەدەبی کوردستانی باشوورە. غەزەلی بە وشە شیعرییەکانی ئەدەبی ئیسلامەوی ڕازاندۆتەوە. لە کێشدا بەحرە عەرووزییە سووکەکان ئاوازی پڕ لە سازی داوەتە لیریکەکان.

١

لە شیعرێکیدا دەڵێ:

دەبێ ئەهلی بەسەرِ فەرقی گوڵی بەر پێت لە کل چبکا
لە ڕووتا غەیری زەم بولبول دەبێ تەعریفی گوڵ چبکا



کە ئەو سەروە بەنووری مەی لە گوڵشەن کوڵمی هەڵگیرسا
کە گوڵ ڕەنگی لە ڕوو نەبڕێ نەسووتێ بۆی چقل چبکا
ئەگەر ئەو شۆخە یەکدەم دەم بەخەندە ڕوو لە گوڵشەن کا
لە شەرما غونچە گەر عەودەت نەکاتە بەتنی چڵ چبکا
وەرە زاهید ببینە مەشعەلی حوسنی جەمالی یار
بەغەیری مەزهەبی ئاتەش پەرستی فەرموو دڵ چبکا
لە بازاڕی مەحەببەت موشتەری لەو ماهە حەیرانە
ڕەواجی حەزرەتی یووسف کە کەمتر بێ لە قول چبکا
لە بەرگی عارییە مەجنوون کە عاری بوو بەلەیلای ووت
دەبێ ئازادە سەروی گوڵشەنی عەشقت لە چڵ چبکا
هەموو عالەم کە سەرگەرمی قەدەح بازی مەین (حەمدی)
لە هاژەی سەیلی فرمێسک و لە گریانی بەکوڵ چبکا

لەم شیعرەدا حەمدی لەگەڵ دلبەر دەدوێ و پێی دەڵێ: ئەگەر گوڵی بەرپێی لە ناوەوە بێ، واتە تۆزی بەرپێی، گوڵ نرخی نییە، چونکە ئەو تۆزە لە کل چاکترە. ئەگەر دلبەر خۆی دەربکەوێ پێویستە بلبل جنێو بەگوڵ بدا. بەم جۆرە شاعیر لە وێنەی جوان دەگەڕێ لە سروشتدا، هەمووی ڕەت دەکاتەوە بەرامبەر ئەو خاسیەتانەی لەودا هەیە.

٢

لە پارچە شیعرێکدا دەڵێ:

لە زولماتی شەوا جانانە شەمعێکی شەبستانە
شەرابی کەیفی عوششاق و نەشاتی بەزمی مەستانە
گەهێ وەک بت زیارەتگاهی ڕەندانی خەراباتە
گەهێ ڕەندانە سەر حەلقەی عوموومی بت پەرستانە
لە سەحنی گوڵشەنا خۆشخوانە گاهێ هەر وەکو بولبول
بەڕەنگ و بۆ گوڵ ئاسا گوڵ نمایندەی گوڵستانە
گەهێ بۆ دلبەری ئەسبابی کوردانەی لەبەردایە
گەهێ بۆ ساحیری هەروەک پەری مەستووری فستانە

لەگەڵ دڵ (حەمدی) بۆ سەیر و تەماشا گەر تەمەع ناکەی
بەسە ئەم حوورییە وەک جەننەت و بۆستانە بەستانە

جانان ناوێکی دیکەی یار و دلبەرە، حەمدی لە شیعریدا بەکاری هێناوە. ئەو شتانە پێوەندییان بەدڵداری و جوانییەوە هەبێ لەو جانانەیەدا دەکەونە بەرچاو. جانان مۆمی تاریکستانە، شەرابی بەزمی مەستانە، دەمێک بتە، دەمێکی دیکە سەرۆکی بتپەرستانە، لە گوڵشەدا گوڵە و بلبلیشە. دەمێ شۆخێکە جلی کوردی لەبەردایە، دەمێکیش جادووگەرە لە ناو جلوبەرگ شارراوەتەوە، لە ئەنجامدا هەموو شتێکە وەک حۆریی بەهەشت وایە.

### ٣

حەمدی لە شیعری دڵداریدا گەمەی ڕەوانبێژی وشەیی هەیە، لە لیریکێکیدا ناوی کۆمەڵێک لە شارانی وڵاتانی عەرەب و لای خۆشمان ناوی سلێمانی دەبا:

ئەم ئەهلی کەمالە هەموو حەیرانن و مەبهووت
ئەم ئەرزە لە دووت بۆچی کە لەرزایەوە نەبزووت
ئەی تورکی پەری چەهرە بەسەرگەندەوە دەیڵێم
بۆ تۆیە دڵی خەڵقی وەکو غونچە نەپشکووت
بۆ مردنە ئەیدا بەیەکا ئێستە حەڵەب لەب
ڕووناکی لە دڵیا نییە بێرووت بەبێ ڕووت
ئەو شامە کە شامی بەمەسەل سوبحی جەژن بوو
بێ تۆ سەحەری شامی غەریبانە بەبێ قووت
ئەم دینە مەدینەی نییە مەککە مەکە دەخلی
بێ یومنی یەمەن تائیفە ئەلبەت بووە پەڕپووت
بێ نووری بەسەر بەسرەیە بێ شوبهە زەلیلە
بێ کەڵکە بڵێم بیکەمە قوربانی کوێت کووت
وێرانە عەمارە لە زەمین دایە سەماوە
دێوانەیە دیوانییە بۆ سیلسیلەیی مووت
خۆی ناوەتە قوڕ قورنە ڕەوانە لە دوو چاوی
دوو شەت بگەڕێ ڕوویی جیهان بۆ خەتی ئەبرووت



ئەم شاری سلێمانییە وەک تەختی سلێمان
وا کەوتە هەوا ئاگری گرت بوو بەقەرەبووت
(حەمدی) کە بەقەدەر زەڕڕە حەیاتێکی کە ماوە
هەر بۆ ئەوەیە بێ بەفیدای نێرگسی جادووت

حەمدی ئەم شیعرەی لە ساڵی ١٩١٨ نووسیوەتەوە. بەگەمەی ڕەوانبێژی تابلۆیێکی مۆزاییکی دروست کردووە بەناوهێنانی هەندێ لە شارەکانی وەکو حەڵەب، بێرووت، شام (دیمەشق)، مەدینە، مەککە، یەمەن، تایف، بەسرە، کوێت، کووت، عەمارە، سەماوە، دیوانییە، قوڕنە، سلێمانی.

شاعیر لەم لیریکەدا مەبەسی بەراوردکردن و لێکچواندن بووە لە نێوان دوو شتی ویستوویەتی باسیان لێوە بکا. هیچ جۆرە مەبەستێکی سیاسی لە ناوەوە نەبووە، بەڵام بەبێ ئەوەی شاعیر هەستی پێ بکا دیاردەی سیاسی کاری لێ کردووە بەهۆی ئەوەی لەگەڵ کۆتایی جەنگ نەخشەیێکی سیاسی تازە لە خاکی دەوڵەتی عوسمانی دروست بووە، ئەو شارانەی شاعیر ناوی هێناون لە جزیرەی عەرەب و وڵاتی شام و ویلایەتە کۆنەکانی عوسمانی ئەوانەی لە دواییدا بوون بەعیراق. بێ گومان ناو هێنانی سلێمانی لەگەڵ ئەوانا گرنگە چونکە ئەویش وەک شارانی دیکە داوای سەربەخۆیی دەکرد. لێرەدا تێبینییێکی سیاسی و جوانکاریی سەرنج ڕاکێشەر هەیە ئەویش ناو هێنانی کووت و کوێت، ئەمە شایەدییێکی گرنگە لە لایەن شاعیرێکی کوردەوە ڕاستییێکی مێژوو بخاتە ڕوو کە ناوی کوێتی وەک قەزاییێکی ویلایەتی بەسرە حسێب کردووە و لە ڕووی زمانیشەوە وشەی «کوێت»ی بەبچووک کراوەی وشەی «کووت» داناوە. لە سەردەمی عوسمانیدا هەردوو شارەکە دوو قەزا بوون سەر بەویلایەتی بەسرە.

### ٤

لە لیریکێکیدا حەمدی هەستی خۆی دەردەبڕێ لە وێنەیێکی ڕەشبینیدا لەو کاتەی ئاوارە بووە لە گوندێک بەناوی «چنارە»وە:

قەت چنارەی پێ مەڵێن ناوم ئەوا نا بەرد و دار
غەیری باڵای وەک سنەوبەر فەرموو کەی بوو بە چنار
ناوی چاوم بوو بەجەنگەڵ هێندە چیوەی پیا چووە
وەک مەغارە بەردە ئەترافم سەرەوژێر و کەنار

کاشکی ئەوسا ئەسیری دەستی ئینگلیزێ دەبووم
نەک بکەومە داوی زولفی پڕ خەم و پڕ پێچی یار
سوێند بەکەعبەی ئەبروان و مەسحەفی ڕوومەت ئەخۆم
مەستی مەی نابێتە مەستی غەمزەیی چاوی خومار
بەس بەشەو وەرگێڕە ڕۆژم ئەی سەبا ڕەحمەت ببێ
پەرچەمی خاوی بەئەفشانی مەنێرە سەر عوزار
نەخلی باغی حوسنە بالات سەرکەشە سەرویش نییە
تازە غونچەی گرتووە سێوە بزانم یا هەنار
هەر بەخوێنی دیدەکانی دامەنی گوڵ گوڵ دەکا
مەیلی گوڵشەن بۆ دەکا (حەمدی) ئیتر فەسلی بەهار

لە سەردەمێکی ناخۆش و کۆمەڵێکی پڕ لە غەوغا لە ساڵی **١٩١٩** شاعیر سلێمانی بەجێ هێشتووە و لە گوندی چنارە نیشتۆتەوە بۆ ئەوەی گیانی خۆی لە مردن بپارێزێ. حەمدی لەم لیریکەدا مەبەسی داهێنانی وێنەی شیعرییە. دەڵێ ئەو ناوە ناسک و جوانە «چنارە» بۆ ئەم جێگەیە بەکار مەهێنن چونکە لەوێ ئاوارە بووە و ئازاری پێ گەیشتووە. شاعیر بەلایەوە ئەگەر بەدیلی بکەوتایە دەستی ئینگلیز لەوە باشتر بوو بەئاوارەیی لە چنارەدا بژی. ئینجا ئەم هەموو نەگبەتی و ئێش و ئازارە بەچاکە گەڕایەوە، چونکە ئەگەر لە چنارە نەبووایە تووشی ئەو دڵدارییە نەدەبوو. دلبەری ئەو کچە پەریزادەی بەهەشت بوو، سنگی تازە غونچەی گرتبوو، بەڵام حەمدی نەیدەزانی سێوە یا هەنار!

**٥**

حەمدی لە نەخشی مۆزاییکی گێتیی ڕەوانبێژی و جوانکاریدا دەست ڕەنگینە:

خۆشە سەرشانم بەباری زەحمەتی دونیا بێ ڕێش
تا قیامەت نەک بەباری مینەتی نامەرد و خوێش
دەستی حاجەت ئاشنای گیرفانی مومسیک بوو ووتی
وەک هێلانە زەردە زەردەواڵە لیرەی نۆش و نێش
تیغی بوڕڕانی زەمانە هەر زمانە موختەسەر
گەر زمان بێڵێ زەمانە جەرگی کێ دێنێتە ئێش



کەی نەئیستیعدادە لوقمەی چەور و شیرینی جیهان
خۆ هوما ئێسکی نەمێنێ هەر دەگاتە باڵی مێش
ڕۆژی پێنج دەفعە موئەززین بانگ ئەکا تەرفیع ئەکەی
بۆ منارەی بەرزی دونیا ڕاستیی نەگرێتە پێش
بۆتە دەستووروڵعەمەل ئەم قافیانە بۆ جیهان
ڕێش و خوێش و نێش و ئێش و مێش و پێش و کێشەکێش
ڕام ئەکێشن نەفس و دڵ بۆ کۆیی یار و مەیکەدە
ناعیلاجی و زەعفە (حەمدی) کردەیێک بۆ کێشە کێش

حەمدی لە مانادا پەنا دەباتە بەر قسەی نەستەق و وتەی دانایانە و پەند و ئامۆژگاری، بەگشتی شیعری کلاسیکی کوردی ئەم مانایە دەور دەکاتەوە. حەمدی لەم شیعرەدا مەبەسی ئەوەیە وشەکانی قافیەی هەموو شیعرەکە بکا بەنیوە دێڕی شیعری دووەمی پێش دێڕی دوایی (ڕێش و خوێش و نێش و ئێش و مێش و پێش و کێشەکێش) بۆ ئەوەی لیریکەکە ببێ بەگەمەیێکی ڕەوانبێژی جوان.

**٦**

لە شیعرێکیدا حەمدی سێ شت سەرنجیان ڕاکێشاوە، بۆ مەبەسی داڕشتنی پەیکەری لیریکێک بیریان لێ دەکاتەوە:

غەیری ئەم سیانە لە گوڵشەن مەنعی من ناکا کەسێ
باغەوان یەک بولبولان دوو خاری دامەنگیر سێ
سێ بەڵایە وا منی شێت و لەت و پەت کردووە
چاوی یەک ئەگریجە دوو ئەبرۆیی وەک شمشێر سێ
کوشتە وو دڵ پڕ لە داغ و بەستەیی سێ کافرم
خەتتی یەک خاڵی سیەهـ دوو گێسوویی زنجیر سێ
زار و دڵ خوون و جیگەر کونکون بوویی ئەو سێ شتەم
خەندەیەک دوو لێوی دوو موژگانی هەروەک تیر سێ
وا ئەزانم بەر کەسی ناخەن بەهەشتیش سێ گرۆهـ
ئەشقیایەک سائیلان دوو مورشیدی ڕەنگ پیر سێ

ئەم سێیانە نایەڵن بمرم لە کۆیی دلبەرا
تەعنەیەک تەزویر دوو زەردەخەنەی تەحقیر سێ
مانیعم سێیانە کەڕ و لاڵم ئەکەن وەختی ویساڵ
شەوقی دڵ یەک نازی یار دوو پەنجەیی تەقدیر سێ
تا بێ ئەم سێیانە لوتفی قەت لەگەڵ (حەمدی) دەبێ
کیبری ئەو یەک زیللی من دوو فیتنە وو تەزویر سێ

حەمدی لە نیوە دێڕی یەکەمی هەموو لیریکەکە لەو هۆیە دەدوێ کە بووە بەمایەی بیرکردنەوە بۆ هۆنینەوەی شیعرەکە. ئەوجا لە نیوە دێڕی دووەم ناوی سێ شتەکە یا کردەوەکە دەبا. ئەگەر لەبەر شێوازی شیعری نەبووایە دەبوو بەپێچەوانەوە بێ، لە پێشانا ناوی سێ شتەکە بهێنێ ئینجا باس لە کاریگەرییان بکا. بەڵام ئەوەی شاعیر کردوویەتی ئەویش جۆرە جوانکارییێکی تێدا هەیە.

٧

لە شیعرێکیدا حەمدی خەریکی یاری کردنە بەناو و دەنگی تیپەکانی ئەلفوبێی زمان:

نیمە یارایی نیگاهی (غەین و میم و زێ وو هێ)
(غەمزە) دڵدۆزە لەتم کە تۆ بە(شین و یێ و رێ)
(شیر)ی ئەبرۆت یەک ئیشارەی بۆ منی شەیدا بەسە
تیژە چونکە داویە کوورەی مەحەببەت (ئەلف و بێ)
(ئاب)ی تیغت دیارە ئاوی زیندەگانی تێکەڵە
کوشتەگانت زیندوون تار ڕۆژی (حێ وو شین و ڕێ)
(حەشر)ە هەستاوە لە عالەم قاپی تۆبە داخرا
غولغولەی عالەم کە گەییبە ئەوجی (چیم و ڕێ وو خێ)
(چەرخ)ی کەچ ڕەفتارە باقل دەورەیێکی تر ئەدا
پڕ زەهر کا جامەکەم وەک (شین و ڕێ وو بێ وو تێ)
(شەربەت)ی مەرگی لە ئاوی زیندەگی پێ خۆشترە
وەعدەیی وەسڵی نەدەیتێ (حێ وو میم و دال و یێ)



(حەمدی) تا کەی هەر بناڵێنی لە ژێر باری غەما
بۆچی نابێ ئەی سەنەم ڕەحمەت بەویشا جارێ بێ

قافیەی ئەم شیعرە دەنگی «ێ»یە، شاعیر هەموو دێڕە شیعرەکانی جگە لە نیوە دێڕی دووەمی دوا دێڕ، بەوشەیێک کۆتایی پێ هێناوە پێویستە ناوی دەنگەکان بهێنرێ، وەک «غ، م، ز، ە» (غەین، میم، زێ، هێ) واتە (غەمزە). جا هەموو قافیەکانی کە بەوێنەی تیپ لە نیوە دێڕی دووەمدا نووسراون، لە نیوە دێڕی یەکەمی دێڕی دوایی تیپەکان کۆکراونەتەوە وشەکە نووسراوە، وەک «ش، ێ، ر» (شێر)، «ا، ب» (ئاب)، «ح، ش، ر» (حەشر)...

خوێنەر لەوانەیە لەبەر کێش و قافیە و پراکتیک کردنی دەنگی ئەم هەموو تیپانە ئاگای لە مانای شیعرەکە نەمێنێ، کەچی بەڕاستی ئەگەر خوێنەر بۆ ناسینی وێنە و مانای شیعرەکە بگەڕێ بەرامبەر شیعرێکی جوان و داهێنراو دەوەستێ.

٨

حەمدی لە شیعرێکیدا مانگ و مانگی ڕەمەزان و جەژنی کردووە بەهەوێنی لیریکێک لە وەسفی دلبەر:

من لە عالەم چوومە دەر چیمە بەسەر ئینسانەوە
ئێستە ئیسلامم کە چوومە مەسلەکی حەیوانەوە
شێت و شەیدایی نیگاهی چاوی مەستی دلبەرم
پێکەنینم دێ بەکوشتن چیم بەسەر گریانەوە
کوڵمی هەڵگیرسا وەکو ئاگر بەنووری ئابی مەی
دڵ وەکو پەروانە چۆتە مەجلیسی سووتانەوە
کەس نەبوو داوێنی ساقی بابدا ڕەحمی ببێ
خوێنی من بۆچی ئەکاتە کاسەیی خووبانەوە
تاجداری خوسرەوانم چونکە خاکی کۆیی تۆم
خاکی کۆی تۆ گەوهەری تاجە بەسەر سوڵتانەوە
ئارەزووی وەسڵم لە هیجرانا ئەگەر حاسڵ دەبوو
جا دەبوو بمرم بەداغی یەک نەفەس هیجرانەوە

حاشیەی گێسوو عەیانی کردووە سیڕڕی جەمال
هەروەکو تەفسیری بەیزاوی بەسەر قورئانەوە
خوینی من کەوتۆتە سەر لێووت حەقمە بیخۆمەوە
بیدە وەک ساقی کە ئەیدا مەی بەدەم مەستانەوە
من فیراری دەوڵەتم ئەمما ئەسیری زولفی یار
شاد و مەحزوونم کە مەشهوورم بەدوو عینوانەوە
دوور نەکەوتی بۆیە ئەم جەژنە بەڕۆژوو مامەوە
جەژنی من جەژنانەیی تۆ بێ بەماڵ و جانەوە
توخودا ڕەحمەت ببێ بەسیە ئیتر بنوێنە ڕوو
ئینتیزاری مانگە (حەمدی) چونکە بەم سەربانەوە

حەمدی لە سەردەمی ئاوارەییدا لە ساڵی ١٩٢٠ لە دوا ڕۆژانی مانگی ڕەمەزان لە هەڵەبجە میوانی عوسمان پاشای جاف بووە. لە سەربانی کۆشکی پاشا وەک هەموو خەڵکێکی دیکە لە مانگ گەڕاوە و ئەو ئێوارەیە دەرنەکەوتووە لەبەرئەوە بۆ ڕۆژی دوایی خەڵکی بەڕۆژوو بوون.

ناوەرۆکی شیعرەکە گێڕانەوەی هەست و نەستی شاعیرە بەرامبەر ئەو دلبەرەی گرفتاری بووە. وێنەی شیعری بەرزی بۆ خۆشەویست دروست کردووە، تا گەیشتۆتە ئەوەی ڕووی بەلاپەڕەی قورئان بچوێنێ و قژی بکا بەڕەمزی جوانی و لەگەڵ تەفسیری بەیزاوی بەراوردی بکا، واتە ڕووی لاپەڕەی قورئانە و قژی تەفسیری بەیزاوییە وەک پەراوێز دەوری داوە.

حەمدی بۆ سەیران ڕووی لە هەڵەبجە نەکردبوو، بەڵکو لە دەست ئینگلیز ڕای کردبوو. لەوێ تووشی دڵداری بوو، دیلیەتی دلبەری پێ خۆش بوو کەچی کۆیلەتی ئینگلیز بەلایەوە شوورەیی بوو.

شا بەیتی ئەم لیریکە ئەوەیە مانگ دەرنەکەوت، بەواتاییێکی دیکە دلبەر دیار نەبوو، لەبەرئەوە حەمدی بەڕۆژوو مایەوە. بۆیە لە دوا جاردا لە دلبەر دەپاڕێتەوە بۆ ئەوەی دەربکەوێ نەک لە مانگ چونکە لەو سەربانەدا لە خۆشەویست دەگەڕێ.



## ٩

حەمدی زۆر خەریکی داهێنانی هونەرییە لە شێوازی ڕەوانبێژی کلاسیکی شیعری نەتەوەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. لە ناو چوارچێوەی دنیای خەیاڵدا نوقوم بووە، لە مانا و وێنە دەگەڕێ. ئاخۆ کامەیێک لە فریشتەکانی ئەفلاتوون بەفریای دەکەوێ هەڵهێنێکی (مەتەڵێکی) بۆ دێنێ و ئەو دەینووسێتەوە:

خەوم دیوە موعەببیر دڵ حەزینە
نیشانەی شادییە عیززەت قەرینە
لەگەڵ یارم موقیمی گوڵشەنێ بووین
ووتی باغی جینان و حووری عینە
ووتم غونچەی نەپشکووتووی ئەدامی
ووتی دەم تەنگە ڕۆژەی عاریفینە
ووتم دوومـاری نایە گەردنی من
ووتی زولفی سیاهی عەنبەرینە
ووتم سێوێکی خوونساری لە دەم نام
ووتی کوڵمی زەریف و نازەنینە
ووتم دوو نەجمی هەڵهێنا لە قەوسا
ووتی چاوی خوماری نێرگسینە
ووتم ڕۆژێ لە شەودا شوعلەوەر بوو
ووتی پەرچەم لەسەر تەختی جەبینە
ووتم جامی شەرابی دایە دەستم
ووتی شەهدی ویساڵی ئەنگەبینە
ئەگەر خەو مردنە بەم نەوعە خۆشە
جەهەننەم دارە فەرش و بەرد سەرینە
ئیتر ناچێتە خەو مەعلوومە چاوم
لەبەر بێ تالیعی (حەمدی) ئەمینە

شاعیر بەو نیازە ئەم شیعرەی داناوە نیوە دێڕی یەکەمی خەونێکە و دیوبەتی و نیوە

دێڕی دووەم لێکدانەوەی خەونەکەیە: لە نیوە دێڕی یەکەمی ئەم شیعرە وێنەیێک یا
مانایێک دەخاتە ڕوو، نیوە دێڕی دووەم لێکدانەوەیەتی. شیعرەکە هەرچەندە لە هەڵهێن
دەکا بەڵام نابێ بەو. حەمدی سیفەتێکی هاوشان لە هەردووکیاندا دەدۆزێتەوە، وەکو یار
لە گوڵشەندا بوو، ئەمە بەهەشت و حۆرییە؛ یا غونچەی نەپشکووتوو، ئەمە دەمی
بچووکە؛ یا ڕۆژ لە ناو شەودا بوو، ئەمە ڕووەو قژی ڕەش دەوری داوە. هتد...

١٠

حەمدی لە سروشت نابێتەوە، بەهار و بلبل و گوڵ، گێڕانەوەی مێژووی دڵداری هەمووی
بۆ دلبەرە:

گەر تەقازای عەشقە هەڵکەندن ڕەفیقان بێستوون
با بەتێشەی ئاهەوە هەڵچم لە چەرخی بێستوون
هەر دەڵێی کاسەی سیەهبەختانی عەشقە ئاسمان
بۆیە دایم هەر ڕەشە و خاڵی سەرەوژێرە و نگوون
خۆزگە مەوجی خوێنی شەیدایانی ئولفەت یەک ئەکەوت
هەڵگری ئەم ئاسمانە بەڵکو هەروەک بڵقی خوون
مەنعی من بۆچی دەکەن ئەم خەڵقە نازانم کە گوڵ
دەرکەوێ بولبول لە دەس خۆیایەتی شەیدا نەبوون
ڕەسم و ئادابی مەحەببەت تێگەیین تێکی ئەدا
ئافەرم جیننەت لەگەڵ عەشقا کە نیتە چەند و چوون
بت پەرستن خۆ لە من زیاتر لە ڕاستی ئەو بتە
میم و لام و کاف و ئەلف و نوون و سین و ئەلف و نوون
ئینتیزاری دڵ مەکە دەرچێ لە حەلقەی زولفی یار
(حەمدی)یا! توولی ئەمەل پێویستییە عومری فزوون

وێنەی شیعری لەم بەرهەمەی حەمدیدا لە چەند دیمەنێکدا دەردەکەوێ، وەکو شاخی
بێستوون کە فەرهاد خەریکی کونکردنی بووە لەسەر داوای شیرین. هەروەها گومەزی
فەلەک (ئاسمان) بەبێستوون ناوی دەبا لەبەرئەوەی ستوونی (کۆڵەکەی) نییە. خەڵکی
لەبەر چی لۆمەی شاعیر دەکەن! ئایا ئەگەر گوڵ دەرکەوێ بلبل بەدەست خۆیەتی شێت



نەبێ! بلبل دەستوور و قانوون و ڕێ و ڕەسمی دڵداری تێک دەدا لەبەرئەوەی ڕاستی
لەگەڵ شێت بوون (جیننەت) دایە، چونکە شێتی لەگەڵ عەشقدا ڕێکە، چەندوچوونی
لەگەڵدا نییە. ئەمە ئاوڕدانەوەیێکی سۆفیزمییە. شاعیر ئەوە باش دەزانێ نەبوونی قانوون
لە سۆفیزمدا (تەریقەت) لە شەریعەت (ئایین) جیای دەکاتەوە چونکە بوون (قەدەر) لە
سەرەتاوە تا بنەتا (لە ئەزەلەوە تا ئەبەد) لە لەوحی مەحفووز نووسراوە.

داهێنانە هونەری و ڕەوانبێژییەکەی شاعیر لەوەدایە لە نیوە دێڕی یەکەمی پێش دوایی
بەراورد لە نێوان بت و بتپەرست دەکا، ئینجا تیپەکانی «میم و لام و کاف و ئەلف و
نوون و سین و ئەلف و نوون» کۆ دەکاتەوە و بەیەکترییانەوە دەنووسێنێ و دەیانکا بەنیوە
دێڕی دووەمی شیعرەکە. ئەم تیپانە وشەی «مَلَك» (مەلەک) و وشەی «إنسان»
(ئینسان) دروست دەکەن. ئەم نیوە دێڕە دەبێتە لێکدانەوەی نیوە دێڕی یەکەمی دێڕە
شیعرەکە. واتە «بت» مەلایەکەت یا پەرییە، «بتپەرست» ئینسان یا ئادەمزادە، یەکەمیان
دلبەر و دووەمیان حەمدییە.

١١

حەمدی لە وەسفی ئەندامی دلبەر دیمەنی هەمەڕەنگی هەیە، لە شیعرێکدا دەکارێ
بەشێکی زۆریان لێ کۆ بکاتەوە، یا باس لە دوو سێیێکیان بکا.

لە شیعرێکیدا دەڵێ:

هەموو فیتنەی زەمانە کەوتە گۆشەی چاوی فەتتانت
بەڵێ ئاشوفتەیە عالەم لەبەر زولفی پەرێشانت
حەواڵەی هیممەتی ساقی مەکە ڕەحمت ببێ توخودا
کە لێوانە لە نەشئەی ساغیری یاقووتی لێوانت
شەوێ بێ تۆ بەقەد ساڵێکە ساڵێکە شەوە بێ تۆ
وەکو ڕۆژێ لە مەغریب بێتە دەر بێ ببمە قوربانت
عەزاب و ڕەحمەت و دەردی سەری من ئارەزووی تۆیە
لە لام وایە بەڕەسمی دلبەری فەرزە لەسەر شانت
بەعەیبی دامەنی نالە و فیغانی (حەمدی) تێ فکرە
کە چەندە تیژ و خوێنرێژە سەوادی نووکی مۆژگانت

لەم شیعرەدا حەمدی لە چاو و زولف و لێوی دلبەر دەگەڕێ، چونکە فیتنەی زەمانە لە چاو و دەردەداری لە زولف و بێبەشی مەی لە دەم (ماچ) دەبینێ. شاعیر بەم شێوەیە خەیاڵ لەو ئەندامانەی دلبەر دەکاتەوە. ئەگەر دلبەر شەوێک لێی دوور بکەوێتەوە بەقەد ساڵێکە. لەگەڵ ئەوەشدا بەرگەی ئەم هەموو ئێش و ئازارە دەگرێ چونکە ئێشەکە لە پلەی تیژی نووکی مووە جوانەکانی موژەیەتی.

١٢

لە لیریکێکیدا حەمدی موناجات لەگەڵ خۆشەویست دەکا:

دەک فیدات بم شاهبازی خێلی خووبانم وەرە
توخودا ڕەحمت ببێ کەبکی خەرامانم وەرە
پەرچەمت لادە لەسەر ڕوومەت بەمەحزی ئیمتیحان
دەفعی زوڵمەت با ببێ ئەی ماهی تابانم وەرە
من لە دوور هاتوومە دیدەن بۆچی بێ مەیلی دەکەی
کافریش بم خۆشە لای خوا چونکە میوانم وەرە
ڕوومەتی سافت لە پەڕڕەی گوڵ گەلێ ناسکترە
قەد سنەوبەر دیدە نێرگس زولف ڕەیحانم وەرە
با وەکو من عالەمێ شەیدایی زولفی تۆ ببێ
دلبەری مومتاز و شاهی دیدە مەستانم وەرە
من لە تەعنەی دۆست و دوژمن زەڕڕەیێ باکم نییە
بمکوژە ئەمما بەشەرتێ نووری ئیمانم وەرە
غەیری وەسڵی تۆ لە لای (حەمدی) نەماوە ئارەزوو
تاکو ماوم لەحزەیێ ئاسایشی جانم وەرە

ئەم موناجاتە بەگشتی لە شیعری مستەفا بەگی کوردی شاعیری نیوەی یەکەمی سەدەی نۆزدەمی خزمی حەمدی دەکا لە بابەت داڕشتنی ڕوخساری شیعرەکەوە. هەرچی ناوەڕۆکیشە زۆرتر دەشکێتەوە لای عیشقی حەقیقی کە لە شێوازی مستەفا بەگی کوردیدا زۆر ڕوون و ئاشکرایە. هەرچۆنێ بێ لەگەڵ ئەوەشدا چەند وێنەیەکی عیشقی مەجازی (زەمینی) لەم شیعرەی حەمدی بەدی دەکرێ وەک بەکارهێنانی ڕستەکانی: قەد سنەوبەر،



دیدە نێرگس، زلف پەرێشان. ئەم سیفەتانە بەزۆری بۆ مێیینە بەکار دەهێنرێن، کەچی ئەم وێنانە هەندێ جار بۆ عیشقی حەقیقیش بەکار دەهێنرێن، لەبەرئەوە ئەم شیعرە زیاتر دەشکێتەوە سەر شیعری عیشقی حەقیقیی سەر بەداهێنانی سۆفیزم.

**شێخ مەحموود لە شیعری حەمدیدا**

شێخ هاوڕێی زۆر بوون لە ڕۆشنبیر و شاعیر و نووسەر و کاربەدەست و دەوڵەمەند و خزمان و هاوسێیانی ماڵی خۆی لە کۆڵانی شێخانی گەڕەکی کانی ئاسکان. یەکێک لەو هاوڕێیانە حەمدی بوو. یەکسانی لە پێوەندی شێخ و حەمدیدا هەبوو، لە سۆزی مرۆڤایەتییەوە هەڵقوڵا بوو، چونکە شێخ سنووری گەورە و بچووکی لە نێوان خۆی و نزیکەکانی دانەنا بوو، لەبەرئەوە هەر کەسێکی شێخی خۆش بویستایە و ڕەوشت و هەڵوێستی باشی لێ بدیایە ستایشی دەکرد، ئەگەر کرداری خراپیشی هەبووایە ڕەخنەی لێ دەگرت. ئەمە ڕووداوێکی ئاسایی بوو. هەندێ جار نزیکەکانی شێخ ڕوویان لێ وەردەگێڕا، یەکێک لەوانە حەمدی بوو. جا ئەو شاعیرە ئەگەر ستایشی شێخی کردبێ ڕاستگۆ بووە، ئەگەر ڕەخنەشی لێ گرتبێ دیسانەوە ڕاستگۆ بووە. لە هەردوو باردا شێخ بەڵگەی داهێنانی شیعری حەمدی بووە و بەچاکە بۆ سامانی نەتەوایەتی گەڕاوەتەوە و شیعری بەرز کەوتۆتە دیوانی شیعری زمانی کوردییەوە.

١

لە حوزەیرانی ساڵی **١٩١٩** لە ئەنجامی شەڕەکەی دەربەندی بازیان لە نێوان هێزی ڕزگاری کورد و سوپای ئینگلیزی داگیرکەر، هێزی شێخ مەحموود شکا، شێخ بەدیل گیرا و بەبەندکراوی ئاوارەی هیندستان کرا.

بۆ ئەم ڕووداوە حەمدی دەڵێ:

وەک هەوا کەوتوومە گێژی گونبەدی ئەفلاکەوە
ڕەببی بیبینم وەکو کیسرا بەسینەی چاکەوە
بۆ کەسێ تا سەر وەفاداری نەبوو بێ مروەتە
سەیری ئەسکەندەر ئەکەن ڕۆیی بەمشتێ خاکەوە
چاکە دایم هەر لە پێناوی خوا پا ڕۆییوە
گەوهەری دەریا بەدایم وا لە ژێر خاشاکەوە

هەر شکەستی ئەهلی مەعنای مەتڵەبە دەورانی پیر
ڕەش ئەخاتە سەر سپی پیسی ئەخاتە پاکەوە

شاعیر گلەیی لە ڕۆژگار و چارەنووس دەکا، بەچاوی ڕەشبینی دەنوارێتە ژیان. ئەسکەندەری گەورە ئەنجامی چی بوو! چاکە لە پێناوی خراپە لەناودەچێ، ڕەش بەسەر سپی و پیسی بەسەر پاکیدا زاڵ دەبن.

لە کەساسی و بێ هێزییەوە شاعیر لەپڕ ڕادەپەڕێ و دەبێ بەشێر:

ئینتیقامی خۆم ئەسێنم جەهل ئەگەر مانیع نەبێ
شوعلەیی ئاهم ئەنێمە خەرمەنی ئیدراکەوە
خەرقەیی شاه و عەسای مووسا لە لام بێ شەوکەتە
فەخری ئێمە وا بەکەوڵ و پۆست و دار مەشّاکەوە
عیبرەتە ئەربابی غیرەت تێ بگەن من چی ئەڵێم
ئەهلی عیسمەت حەپسە سەربەستی بەلای بێباکەوە
قەومەکانی ڕوپیە خۆرم دێنە بەرچاوم ئەڵێن
کەر بەجۆ بمرێ شەهیدە سەگ بەگۆشتی لاکەوە
لاتن و لۆتی نەفامن بۆ نەشات و مەنفەعەت
دەبنە قوربانی سەگێ بێ شک بەباب و داکەوە

بەلای شاعیرەوە ئەم ژێرکەوتنە لە دواییدا دەبێتە هۆی سەرکەوتن، بەڵام ئەمە بە خوێندەواری دەبێ، بە سۆزی نیشتمانپەروەری و کوردایەتی دەبێ. ئینجا ڕوو دەکاتە دەوڵەمەندە چاوچنۆکەکان بە چاوێکی نزم تەماشایان دەکا و بایەخیان پێ نادا چونکە دژی بەرژەوەندی میللەتی خۆیان بوون. ئەوجا بەلای شاعیرەوە یەکێتیی کورد و عەرەب دەوری دەبێ لە سەرکەوتنی هیوا و ئامانجەکان و کۆتایی بەشیعرەکە دێنێ:

بۆ نەمانی دین و غیرەت هیممەتی کورد و عەرەب
وا بەسەر لەوحەی کیتابی حەسرەتی ئەتراکەوە
تا ئەبێتە مولکی ئەربابی حەمییەت کەم ئەکا
ئاگری تاجیر ئەنێتە خەرمەنی مەلاکەوە
شەرتە تا ڕۆژی قیامەت دەس لە ئەژنۆ بەرنەدەم
سەر لە قوڕ نێم بۆ سیادەت بەم دڵەی غەمناکەوە



بۆ دڵێری حەزرەتی مەحموود مەمدووحی جیهان
تاقەیەک گوڵ بوو بەفەرقی پیری ئەحمەد کاکەوە
بۆ دوو مەحموود خان ئەمیری سەرحەدی ڕۆم و عەجەم
بوونە ئەسحابی قورەیش و چوونە سلکی چاکەوە
ساڵی تەئریخی ئەپرسی (ئالی کاک ئەحمەد غەریب)
کەوتە عالەم دڵ حەزین و دیدەیی نمناکەوە

مەبەسی شاعیر لە ناوهێنانی کورد و عەرەب ئەوەیە ڕۆژگارێکی درێژ دیل و ژێردەستی تورک بوون. ئێستاش کە لە دەست تورک ڕزگاریان دەبێ خەبات و کۆششیان لە دژی ئینگلیزی داگیرکەرە.

شاعیر لەسەر دەستووری شیعری کلاسیکی کۆن، لە نیوە دێڕی یەکەمی دوا دێڕی قەسیدەکە ڕستەی «آل کاک احمد غریب» بەکار دێنێ. بەپێی نرخی تیپەکانی ئەم ڕستەیە بەحسێبی ئەبجەد دەکاتە ساڵی ١٣٣٧ی هیجری، ئەمە بەرامبەر بە ١٩١٩ی مەسیحییە، ساڵی ڕوودانی شەڕی دەربەندی بازیان.

## ٢

لە ئەنجامی شکانی هێزی شێخ مەحموود لە شەڕی دەربەندی بازیان بەدیل گیرا و ڕەوانەی هیندستان کرا و لە شاری یا دوڕگەی تانە بەدەستبەسەری مایەوە. لە ساڵی **١٩٢٢** لە بەندیخانە ڕزگاری بوو، لە ڕێی گەڕانەوە گەیشتبووە کوێت. بەم هۆیەوە حەمدی ئەم چوارینەی داناوە:

کە ڕۆیشتی بەجارێ من دڵ و جەرگ و هەناوم کەوت
کە چوویتە (تانە) تانە سەر گلێنەی هەردوو چاوم کەوت
ئەڵێن هاتوویتە کوێت قوربان بڵێ قوربانی کوێتی کەم
کە نۆبەت بەر سەری نەحسی شکاوی بێ کڵاوم کەوت

شاعیر لێرەدا باس لە دڵتەنگی و پەژارەی ناو دەروونی خۆی دەکا لە کاتی ڕەوانەکردنی شێخ بۆ هیندستان، لە پاشانا هەستی گوشادی و خۆشیی خۆی دەردەبڕێ لە کاتی ئازادبوونیدا.

### ٣

دیسانەوە بۆ ئاوارەیی و دوورکەوتنەوەی شێخ مەحموود لە مەڵبەندی ژیانی خۆی، حەمدی دەڵێ:

وەک مەدینە بێ نەبی بێ یا نەجەف بێ بێ عەلی
شاری غەزنەش ئێستە بێ مەحموودە وەک داریکەلی
حەیفە ئەوجی ئاسمان بێ زینەتی خورشید و ماه
سا خودا بیکەی وەکو خورشیدی ڕەخشان مونجەلی

گێتیی خەیاڵی فراوان و بێ پایانی حەمدی بۆی هەیە هەموو جۆرە داهێنانێکی جوانکاری دروست بکا. دوو وێنەی جوانی شیعرایەتی کێشاوە لە ڕاستییێک وەرگیراون. شاری مەدینە بەبێ پێغەمبەر نابێ چونکە لەوێ نێژراوە. شاری نەجەفیش بەبێ عەلی نابێ چونکە ئەویش لەوێ نێژراوە. دەمێنێتەوە سوڵتان مەحموودی غەزنەوی ئێران و تۆران و مەحموودی کوردستانی ئێمە، ئەم دووانەش جێگەیان شاری غەزنە و ئاوەدانی داریکەلی بوو. ئیتر شاعیر دەڵێ ئەم دوو جێگەیە ئێستە بەبێ مەحموودەکانیانن، واتە ئەگەر دوو شارەکەی پێشوو بەبێ پێغەمبەر و عەلی بن، کە ئەمەیان هەر نابێ، کەچی غەزنە و داریکەلی بەبێ هەردوو مەحموودن.

### ٤

جارێکیان شێخ مەحموود وێنەیێکی فۆتۆگرافی خۆی بەدیاری پێشکێشی حەمدی دەکا. لە وەرامدا شاعیر ئەم چوارینەی بۆ دەنووسێ:

عەکسەکەت پڕ مەحفەزەی چاوە بەجێ جێم کردەوە
لایەقی عەرشی دڵم بوو لوتفەکەت ڕێم کردەوە
من نەوەی کوردیم و لوتفی تاجداری قەومی کورد
کەوتە دەستی بەستراوی خزمەتم پێم کردەوە

بەسۆزێکی ڕاستگۆیانە حەمدی ئەوە دەردەبڕێ وێنەکە چاوی ڕوون کردەوە. شانازی بەوەوە دەکا کە شێخ مەحموود کوردە و خۆشی لەم کوردییەتە بێ بەش نییە. ئیتر هەڵوێستی جگە لە خۆشەویستی دەبێ چیتر بێ بەرامبەر سۆزی خاوەن شکۆ و تاجدارێکی کوردی وەکو شێخ مەحموود!



### ٥

لەگەڵ کۆتایی جەنگی یەکەمی گێتی (١٩١٨) ناوچەی سلێمانی بەتایبەتی شار نێوەندی بێ ئارامی و ئاژاوە و شەڕوشۆڕ بوو تا ساڵی ١٩٢٤. هەڵسان و ڕاپەڕینەکانی شێخ مەحموود لەو ماوەیەدا چەند جارێک بەڕێوەبەرایەتی حوکوومی بەناوی کوردستانی باشوورەوە دامەزراند. لە پێشانا وەک حوکمدار لە دواییدا بوو بەمەلیک. ڕۆژانی خۆشی و شادی لە ئاسۆی وڵاتدا هەڵهات، ئاڵای کوردستان هەڵکرا، پوولی پۆستە کەوتە ناوەوە، بەڵام ڕۆژی ڕەشی ناخۆشی زیاتر بوو. کاربەدەست و بەڕێوەبەر لەم ماوەیەدا شێخ مەحموود و خەڵکی کورد لە لاییێک بوون، لە لاییێکی دیکەوە سیاسەت و دیپلۆماسییەتی ئینگلیز کاری خۆی دەکرد.

لە سەردەمی فەرمانڕەوایی یەکەمی شێخ مەحموود (١٩١٨ – ١٩١٩) حەمدی لە شێخ مەحموودەوە نزیک بوو وەکو لە شیعری ئەو کاتەی حەمدی دەردەکەوێ بۆ ستایشی شێخ. دوا حوکوومەتی کوردی بەسەرۆکایەتی شێخ مەحموود لە ١٩٢٢ – ١٩٢٣دا بوو. لەم سەردەمەدا بیروڕای حەمدی لە بابەت شێخ مەحموودەوە گۆڕا بوو. ئەوی ڕاستی بێ گومان لە نیشتمانپەروەری و کوردایەتی شێخ نەدەکرا، دەسەڵاتی ئەو خەونێک بوو لەو ڕۆژانەدا بۆ کورد هاتبووە دی. بەڵام کردەوەی نابەجێی دەوروبەری شێخ و سیاسەتی دوژمنایەتی تورکی عوسمانی بەرامبەر بەکورد و سیاسەتی ئینگلیز لە پێناوی بەرژەوەندی ئیمپراتۆرییەت و هەڵەی شێخ مەحموود خۆی نەیتوانی چاکە و بەرژەوەندی میللەتی کورد لەگەڵ ئارەزووەکانی ئەمپریالیستی بەریتانی بگونجێنێ. ئەمانە هەمووی بەڵگەی گرنگ بوون شێخ بۆی نەکرێ بەڕێوەبەرایەتییێکی لەبار دامەزرێنێ بۆ دابینکردنی ویستی خەڵک و مانەوەی دەسەڵاتی خۆی.

لەم لایەنەوە حەمدی وێنەیێکی ڕاستی کەموکوورییەکان بەشێوازێکی ئەدەبی لە قەسیدەیێکدا دەکێشێ بەناوی «بۆ ئیدارەی کوردستانی جونووبی» یا «تەشکیلاتی سانی» (واتە دووەم):

باسی تەشکیلاتی سانی هەر ئەکەم بۆ پێکەنین
کەمترین بوو گەورەتر هەم گەورەتر بوو کەمترین
ناعیلاجم ئیسم و شوهرەت باس ئەکەم عاجز مەبن
تا ببینن شکلی وەزعییەت بەجاری قارئین

کۆیلی مولازیم وەزیری خاسسەی قۆڵی یەسار
ئیبنی سەر مزگەوت وەزیری موشفیقی قۆڵی یەمین
کاتبی مابەین بوو تاهیر تەرجەمەی حاڵی بکەم
پیس ئەبێ دیوان لە پاشا موستەحەققە بۆ درین
حەیفە تەعریفی ڕەشە و عەمی و ئەحەی دایە نەکەم
ناکرێ ئەعزان ئەمانە چونکە عوزوێکی بەرین
خەزنە کیسەی باغەڵ و مەسرەف ڕەشەی حاجی فەتاح
حامیلی سینی حەماڵ و زەرفی پڕ ماشینی شین

حەمدی بەشێوازێکی کۆمیدیانە باس لە کەموکووڕیی بەڕێوەبەرایەتی شێخ مەحموود دەکا. ناوی هەندێ لە کاربەدەستان دەبا، بەگاڵتەوە ناو و ناتۆرەیان بۆ دروست دەکا و لە ڕەوشت و کردەوەیان دەدوێ. لەوانە کۆیلی مولازیم – کۆیلی بەتورکی واتە دەشتەکی، خەڵکی دەشت – ئەمەیان شێخ حەمە غەریبە، وەزیری دەستە ڕاست بوو. ئیبنی سەر مزگەوت شێخەلییە هارە ئیمامی مزگەوت، وەزیری دەستە چەپ بوو، کاتبی مابەین تاهیر کوڕی ئەمین ئەفەندی، واتە وەزیری بارەگای مەلیک پیاوی تورکە عوسمانییەکان بوو. شاعیر نایەوێ ستایشی کەسانێک بکا شایەنی هەڵسەنگاندن نەبن وەکو ڕەشەی حاجی فەتاح و عەمێ مارفی دەلاڵی تووتن لە گومرگ و ئەحەی دایەن کە میرزا ئەحمەدی قەڵەمچی بوو. هەروەها دارایی و پارە و خەزێنە بەدەست ڕەشەی حاجی فەتاحەوە بوو، ئەمەیان پێش خزمەت و سینی هەڵگری خواردەمەنی بوو.

حەمدی لە قەسیدەکەیدا بەردەوامە:

تابیعین ئەلوات و هەرزە و قاتیل و دز بوون هەموو
ئەهلی ویجدان و شەریف و تێگەیشتوو مونکیرین
زابیتانی عەسکەری زۆرە و زرە و ئەولا درێژ
هەردوو جلخوار و قلیش و یوونسی باجی هەمین
ئەمری یەومییە و هەموو هەر حەپس و زنجیر و جەزا
فیکری لەیلییە هەموو هەر کوشتن و یەغما و دزین
حاکمی شەرع و عەدل مەحکوومی عالەم مارفە شەل
موخبیری سادیق بوو کازیب سوئی زەن عیلمولیەقین



قاوەچی و پێش خزمەتی دیوانی عالی دوو سمە
ئەم بوو مەشهووری قولی بوو ئەو بوو مەعرووفی شەلین
موحتەرەم مەئموری تەشریفاتی دەوڵەت بوو ووسوو
نازیری فەرشە ڕەحە بۆ خەڵوەتی ئامە ئەمین

شاعیر دەڵێ دەوروبەر هەتیوباز و هەرزە و پیاوکوژ و دز بوون. ئینجا دێتە سەر باسی ئەفسەرانی سوپا، ناوی هەندێکیان دەدرکێنێ زرە و ئەولا درێژ، بەچاوێکی نزم تەماشایان دەکا، ئەمانە هەردووکیان لەگەڵ یوونسی باجی ئەمین (یوونس ئەفەندی ئەندازیار) لە جلخوارەکانن (تورکچی، تۆرانی). حاکمی شەرع و یەکسانی مارفە شەلی ناحەزی هەموو خەڵکی سلێمانی بوو، ئەمەیان باوکی شاعیری کورد ڕەمزیی مەلا مارف بوو. حەمدی دەڵێ قاوەچی دیوانی مەلیک دوو سمە بوون (ئیسماعیل)، یەکێکیان سمەی قاوەچی و ئەویتریان سمەی قولی. هەروەها سەرۆکی پرۆتۆکۆل (تەشریفات) ووسوو بوو، ئەمە ووسوو ئاغای ناسراوی خەڵکی سلێمانی بوو. ڕەحە کانی ئاسکانی سەرۆکایەتی فەرشەی دەکرد. هەرچی ئامەی ئەمینیش بوو (ئامینەی ئەمین) ئەمەیان لە لاوە دانابوو بۆ خەڵوەتی تەنیایی (ماچومووچ). بەم جۆرە حەمدی لەسەر ناوهێنانی ئەو کەسانە دەڕوا کە لە دەسەڵاتی شێخەوە نزیک بوون:

جائیزە بۆ میللەت و کوردایەتی بێ ڕەشبەڵەک
باجی ڕەحمە بێ قەزا بێ نایەڵێ ڕێک هەڵپەڕین
گەرچی ئێستا مردووە مەوقیعیە باسی هەر ئەکەم
نانەوا گوێ ڕەپ بوو شەخسی ئەووەل و مەجلیس نشین
جەردە شێخ سالح کە مورشید بوو لەگەڵ دەروێشەکان
من کە وام زانی لە کۆڕەی حەلقەیی زیکرا فڕین
سەیری سیرەت کەن کە سووڕەت ڕووکەشێکی سەففییە
گورگ ئەچێتە پێستی مەڕ زاڵم ئەبیتە پۆستنشین
ناوی جەمعییەت موجاهید بۆ وەزیفە جیا جیا
دەستە دەستە قاتیل و دز بۆ عیبادی موسلیمین
باسی نەفسی خۆی بەفەزلە من ئەزانم موختەسەر
ئاشکارە قیمەتی گەورە بەتەعریفی قەرین

ناوی ئەو وەختـــــە بەقـــانوونی تەبیـــــعـــەت دانرا
چەرخی چەفیە و زولف و کاکۆڵ دەوری سەر سنگ و سورین

لەم برە شیعرەدا حەمدی باس لە شێخ سالّح دەکا، لە کاتی خۆیدا ڕێگر و جەردە بووە، لە سەردەمی فەرمانڕەوایی شێخ مەحموود بووە بەمورشیدی تەریقەت و دەروێشی و های و هوو. لە پاشانا لە کاتی دەسەڵاتی داگیرکەری ئینگلیز لە سلێمانی بووە بەپۆلیس. ئاژاوە لە ناو کۆمەڵدا گەیشتبووە پۆپە. گورگ بووە بەمەڕ و زۆردار بووە بەدەروێش. کاربەدەست لە دز و پیاوکوژان بوون. ڕۆژگاری زولف و کاکۆڵ و سەردەمی مەمکی سەر سنگ و سورین (سمت) بوو. زولف لەسەر سنگی ژنان و کاکۆڵ لە دەوری سمتی کوران بوون. مێبازی و هەتیوبازی بەهەرمین بوو.

لە دواییدا حەمدی بەم دێڕانە کۆتایی بەقەسیدەکەی دێنێ:

هاتە دەر بۆ ساڵی تەئریخی (کەوا ئاخر شەڕی)
کەوتە بانەوبان بەیادی بانە بوونە قەل فڕین
وا بەحیددەت چاوی هەڵهێنا وەتەن دیسان ئەڵێ
من هیلاکم بۆ خەلەف توچارە جۆیو دووربین
وازیحی ناڵێی دەوای دەردم بەتەوری بەی بلێ
شینە یا سینە دەخیلە جارێ یا سین جارێ شین
جا دوعاکەم بۆ بکە ئەمما وەکو ویردی زمان
تا سەراپەردەی فەلەک ماوە هەتا فەرشی بەرین
(ڕەببی مووی لێ بێ زمانی پەنجەکانی هەڵوەرێ
هەر کەسێ گوڵشەن بەدەردی گوڵخەنی دۆزەخ بەرێ)

شاعیر لەسەر دەستووری شیعری کلاسیکی بەڕێگەی ئەلفوبێی ئەبجەد لەم شیعرەدا سەردەمی ڕووداو دیاری دەکا. بۆ ئەمە ڕستەی «کەوا آخر شری» (کەوا ئاخر شەڕی) بەکار دێنێ کە بەحسێبی ئەبجەد دەکاتە ساڵی ١٣٤٣ی هیجری، ئەم ساڵە بەرامبەر ١٩٢٤ی مەسیحییە. لەم شیعرەدا ئاماژە هەیە بۆ ئەوەی لە کاتی دەسەڵاتی شێخ مەحموودا بەتەمای ئەوە بوون شاری بانە داگیر بکەن، بەو مەرجەی فەرمانڕەوایی ئەو شارە بدرێتە کوڕەکانی یوونس خان و وەک ئەڤتۆنۆمی سەر بەحوکوومەتی شێخ مەحموود بێ، بەڵام ئەم



پیلانە سەری نەگرت. ئیتر ئەم بەڕێوەبەرایەتییە نەک شاری بانەی نەگرت، بەڵکو لە شاری سلێمانیش چوونە دەرەوە و ئاوارە بوون.

لە کۆتایی شیعرەکەیدا حەمدی بێزاری دەردەبڕێ لەو بەڕێوەبەرایەتییە و بەشین ناوی دەهێنێ، هەروەها دژی ئینگلیزیش دەوەستێ و بەسین ناوی دەهێنێ. شین و سین ڕەمزی شین و شەپۆڕ و خوێندنی سوورەتی یاسینە، چونکە کورد لە دەست هەردووکیانا لە سەرەمەرگدایە و خەریکە دەمرێ.

**نیشتمانپەروەری و کوردایەتی:**

لاپەڕەیێکی پڕشنگدار لە دیوانی حەمدی ئەو دوو قەسیدە تەرجیع بەندە نیشتمانییەیە شاعیر لە بابەت ڕاپەڕینی بەر دەرکی سەرا و شەڕی ئاوباریکەوە لە ساڵی ١٩٣٠ دایناون. ئەوەی جێی گومان نییە ئەوەیە لە دوا ساڵانی بیستەکانی سەدەی بیستەم کۆتایی بەبزووتنەوەی ڕزگاری کورد هات لە ڕووی پراکتیکەوە لە هەموو هەرێمەکانی باکوور و باشووری کوردستان، واتە کوردستانی عوسمانی پێشووی دابەشکراو. لە کوردستانی تورکیا ڕاپەڕینی کورد بەسەرۆکایەتی ئیحسان نووری پاشا سەرکەوتنی نەهێنا، لەوێ لاپەڕەی بزووتنەوەی نەتەوەیی کورد هەڵدرایەوە. لە کوردستانی عیراقدا ڕاپەڕینی بەر دەرکی سەرای سلێمانی (١٩٣٠) بەرپا بوو. هەر لەو ساڵەدا شەڕی ئاوباریک لە نێوان حوکوومەتی عەرەبی بەغدا و چەکدارانی شێخ مەحموود ڕووی دا. لەو ڕۆژگارەدا لاپەڕەی هەڵسانەکانی کوردی عیراقیش هەڵدرایەوە و دەنگی نەما.

١

حەمدی لە قەسیدەیێکدا لە بابەت ڕاپەڕینی بەر دەرکی سەرای سلێمانی (٦ی ئەیلوولی ١٩٣٠)یەوە ڕووداوەکان بەم ڕەنگە دەگێڕێتەوە:

بۆ هەوا ئاڵۆزە بۆچی لێڵ و سوورە ئاسمان
گێژەڵووکەی نەگبەتە یا فیتنەیی ئاخر زەمان
هەوری قەهری مەوجی دەریایی غەزەب دێنێتە خۆش
یا فەغان و دووکەڵی ئاهی هەناسە ساردەکان
ڕەنگی گوڵ بۆچی پەڕی بولبول دڵی بۆچی شکا
ناکرێ ئەووەل بەهاری شادمانی بێ خەزان

بەفرە باریوە لەسەر بەختی ڕەشی خاکی وەتەن
یا بە دەم شەستیرەوە مێشکی هەژارانە پژان
بۆ وەتەن زەرد هەڵگەڕاوە بەرگی سوورە شین ئەکا
ڕەنگە ئەشکالی شەهیدی بێ نەوامان دا نیشان

لێرەدا حەمدی خەیاڵی شاعیری بەسەر ڕاستیی مێژوودا زاڵە. سروشتی جوانی بەگوڵ و بلبل و بەفر و باوە هێناوەتە جۆش و بۆ سلێمانی دەگرین.

ئینجا وەسفی کوشتنی خەڵکی دەکا بەچەک و سیلاح:

وەک برێشکە قرچە قرچی جەرگی سک سووتاوە دێ
یا گوڕەی مەترەلۆزە قرمە قرمی تۆپەکان
ئەم هەموو لاوە نەمامن نێژران لەم باغچەیە
ڕیشەیی کوردایەتی بوو یەعنی بۆمان نێژران
جەژنی قوربانە سلێمانی بەمەزبەح دانرا
کورد مەڕن بۆیە بەجارێ هەر لەوێدا سەربڕان
یان کە ئیبلیسی عەلەیهیللەعنە قاورمە بکا
کۆمەڵی ئینسان بەجارێ وا ئەبێ بکرێن لە جان
بۆ شەریفی کورد خەڵاتە هاتووە سەر تا بەپێ
یا کەلەپچەی دەست و تەوقی گەردن و پێوەندییان
بۆچ مەغۆل هەڵساوە یاخۆ دەوری نەحسی جەنگیزە
قەتلی عامی ئەرمەنە یا حادیسەی ڕۆم و بەبان
ناوی خۆی نابوو زەمانی میللەتی کورد خۆ ژیان
بۆچی بەستراوە زمانی وا دەبێ ئاخر زەمان

دیمەنی ئەو دەستدرێژی و کوشتارەی لە میللەتان کراوە بەدرێژایی مێژوو شاعیر دەیهێنێتە سەر شانۆی بەر دەرکی سەرای سلێمانی. لەوێ گرمە گرمی تۆپ و مەترەلۆزە، لاوی کورد دەکوژرێن، ئایا جەژنی قوربانە و قوربانی گەرەکە و ئەو قوربانییە دەبێ کورد بێ و سەر ببڕڕێ! ئینجا مەیدانی جەنگ لە کوشتاری مەغۆل و جەنگیز دەکا، بەربوونەتە گیانی ئەرمەن و بابان لە لایەن تورکە عوسمانییەکانەوە.

ئەوجا حەمدی بەم دێڕانە دوایی بەقەسیدەکە دێنێ:



بۆ نەبوو قەت ئەهلی حاڵێ دەردەدارێ بۆ نییە
ئەم ووقووعاتە چ بوو بۆچی کرا بیکا بەیان
جا وەتەن فەرموو لە پەردەی سینەما وەک سینەما
سووڕەتی گیراوە فەرموو بۆت بکا یەکسەر عەیان
جارێ تەئریخی بنووسە جا بگۆڕە قافییە
تا بەیاناتم بنووسی لێت نەبێ حەرفێ نیهان
بێ هەزار ناوی سلێمانی بەتەئریخ مەشهەدە
ئەم حیسابە عاقیبەت ڕۆژێ دەبێ بیکا زەمان
مەقسەدی ئەسڵ و ئەساسی هەر دوعاکەی پێشووە
ئێستە تیکراری بکە بەڵکە بکا مەبحەث ڕەوان
(ڕەببی مووی لێ بێ زمانی پەنجەکانی هەڵوەرێ
هەر کەسێ گوڵشەن بەدەردی گوڵخەنی دۆزەخ بەرێ)

شاعیر ژیرانە پرسیار دەکا، ئەم کارەساتە چۆن ڕوویدا؟! هۆی چی بوو؟! ئەم پرسیارانە بەداهێنانی هونەری دەژمێررێن، لەبەرئەوە بێ وەرام دەمێننەوە. شاعیر هەست و نەستی بەفرمێسک دەپژێنێ، لۆجێک بۆ خەڵکی دیکە بەجێ دێڵێ. لە داهێنانەکانی دیکەی ئەم شیعرە حەمدی وشەی «مەشهەد»ی دۆزیوەتەوە بۆ دیاریکردنی سەردەمی ڕووداوەکە بەحسێبی ئەبجەد، ئەمە تەنیا ئەو ڕەمزە نییە سالّی ١٩٣٠ پیشان دەدا بەڵکو ئەو شوێنەیە نەوەی عەلیی کوڕی ئەبووتالیبی لێ شەهید کراوە.

## ٢

لە تەرجیع بەندی دووەمدا حەمدی بەم جۆرە لە شەڕی ئاوباریک دەدوێ:

ئەی وەتەن لوتفاً تەواویکە ووقووعاتی میلەل
ئەم مەراقە با نەکا بۆ ئاخری نەشری عیلەل
تێبگەن خەڵقینە تۆ خوا بەس ئیتر تەفرە بخۆن
ئەجنەبی بۆ نەفعی خۆیانە ئەکەن دایم حیەل
نامداری کورد و سێ زابیت بەهاوڕێتی سەلام
کەوتنە مەردانە سەعی حیرەتم بوو فیلمەسەل

ڕۆستەمانە گەر بڵێم غەدرە کە ڕۆستەم هەر بەخەو
کەی تەیارەی دی بەفیلۆ یا تەقەی تۆپی جەبەل
گەر بڵێم ئەسکەندەرانە غەدرە ئەسکەندەر مەدام
ساحیب ئۆردووی و وەزیری وەک ئەرستۆی بوو لەگەڵ
بۆچی باسی حەربی سووورداش و کەناروێت بۆ بکەم
بەم قسانە بۆت تەواوکەم قافیەی نەزم و غەزەل
حەربی ئاوباریک ئەگەر تەسویری بتوانم بکەم
وا دەزانم کورد بەخوێنی کوردەکان دەیکەن بەدەل
شێخ لەگەڵ پەنجا کەسی مەشغوولی ڕاحەت بوون بەڕۆژ
ئاخری مانگی بەهار و ئاوباریک بوو مەحەل
یەک فەوج جەیشی عەرەب حەوسەد نەفەر پۆلیسی تورک
پێشڕەوی دوو سەد سواری تاڵەبانی بوو جەدەل
نەفەری عامی هاتنە سەریەک نەفەر سەرداری کورد
بۆ خوسووفی مانگ وەکو چووبن شەیاتینی بەگەل

حەمدی ڕاستییێک دەخاتە ڕوو لەو کاتەی وازان دەکا بێگانە بۆ بەرژەوەندی خۆی پەنا بۆ هەموو جۆرە پیلان و فێڵێک دەبا. یەکێ لەو کردەوانەی دوژمن شەڕی ئاوباریک ڕاستەوخۆ دەستی ئینگلیزی تێدا بوو و بەفیتی ئەو هەڵگیرسا، بەڵام شەڕەکە لە نێوان کورد و عەرەبی عیراق بوو، تورک یا تۆرانییەکان یارمەتیی عەرەبیان دەدا.

حەمدی هەندێ ڕاستیی مێژوویی دەخاتە ڕوو کە دەڵێ سەرداری جەنگ شێخ مەحموود بوو. سێ ئەفسەری کورد و شێخ سەلامی شاعیر یاریدەدەری بوون. سێ ئەفسەرەکە ڕەئیسی ئەووەل مەحموود جەودەت و ڕەئیس حەمید جەودەت و مولازم کامیل حەسەن لە بەغداوە فیراریان کردبوو گەیشتبوونە لای شێخ مەحموود. حەمدی شاعیرانە ستایشی کورد دەکا لەم شەڕەدا. ئەوە دەردەبڕێ شێخ لەگەڵ پەنجا کەس لە ئاوباریک لە دوا مانگی کەژی بەهار لەپڕ فەوجێکی سوپای عەرەب و حەوسەد پۆلیسی تورک هێرشیان بردە سەر کورد، دوو سەد سواری تاڵەبانی پێشڕەویان بوون.

ئینجا شاعیر لەسەر شیعرەکەی بەردەوام دەبێ:



دانیانە بەر تەقە هەر وەک شەیاتین ڕەجم کەن
مانگ نەگیرا کەوتنە جامبازە ئەمسالی جەمەل
دەنگی شەستتیر و تەیارە قرچەیی تۆپ و تفەنگ
ڕۆژی حەشرێ بوو ئەباری هەر وەکو تەرزە ئەجەل
دووکەڵی بۆمبا تەپوتۆزی سوارە و گوللە تۆپ
ئاسمانی گرتە بەر داگیری کرد بورجی حەمەل
گوللە پرشنگی ئەدا و ئەکشا وەها زەننت ئەبرد
زامدارە بۆ تەداوی هاتووە نەجمی زوحەل
ئەو هوجوومانە کە لەرزەی خستە ئەرز و ئاسمان
نەیگەیان زەررە بە وەزعی یەک منالی کورد خەلەل
وا نەبوو ئەهەمییەتی بۆمبا وو گوللە تۆپەکان
هەر ئەهات ئەدرایە بەر شەق یا بەپێلەققە و بەپەل
من ووتم ئەم حەربە تەمسیلی چەناق قەلعە ئەکا
سەد ئەگەر بکرایە ئەترافی بەتۆرپیل و بەتەل
هەر بەلاشە ڕەشبەڵەک گیرا بوو لەو مەیدانەدا
تاڵەبانی میسلی بەت جوندی هەژاریش میسلی قەل
وەختی مەغریب ڕەجعەتی ئۆردووی کە کرد سەیری هەبوو
سنگ و سک گۆڕا بوو یەکسەر بوو بووە پشت و کەفەل

لەم دێڕانەدا حەمدی وەسفی جەنگەکە دەکا، سروشت هاوبەشی دەکا لەگەڵ تەق و هۆڕی بۆمبا و چەک و سیلاح. شەڕەکە لەگەڵ جەنگەکانی چەناق قەلعەی ڕۆژگارانی دەسەڵاتی عوسمانی بەراورد دەکا، هەندێ زاراوە و کەرەستەی جەنگەکانی سەردەم بەکار دێنێ وەکو تۆرپیل و بەتەل. گاڵتە بەشەڕکەرەکانی دوژمن دەکا. جەنگاوەری تاڵەبانییان بەقاز و سەربازی عەرەب بەقەل دەچوێنێ.

لە پاشانا قەسیدەکەی بەم دێڕانە کۆتایی پێ دێنێ:

وای نەنەی پۆلیسی تورک و یومە یومەی عارەبی
بۆ قەوان هەڵناکەوێ جارێکی تر بەو نەوعە هەل

وا لە ناو جەووی هەوادا ئەم قەوانە مەیلتە
گوێ لە تەلسز بگرە گرتوویە سەراپا موحتەمەل
وەختی ڕەجعەت ڕەحمی فەرموو مەنعی تەعقیبی کە کرد
وا ئەگەر نەبووایە لاشە جێ ئەما وەک باڵی مەل
چاوی هێشتا پیاوی ساغی هەر نەدیوە ئەجنەبی
خزمەتی ئەو چونکە ناکەن غەیری لات و کوێر و شەل
سەیرە چاوی موغریزی کورد بەو تەپ و تۆزی شەڕە
تەم بەسەریا هاتووە گرتوویەتی دەردی سەبەل
کورد ئیتر بەسیە کە ناوی هەر بەنەختە هیممەتێ
زینەتی داوە بەسەر لەوحەی تەواریخی دووەل
یەک بە دە هەرچەندە سەندرا خوێنی منداڵانی کورد
زەحمەتە تا ڕۆژی مەحشەر بکرێ ئەو ئیشکالە حەل
لێم گەڕێ فەرمووی وەتەن ئەمجا دوعاتان بۆ ئەکەم
پشتی یەک بگرن لە سەرتانە خودای عەززەوەجەل
(ڕەببی مووی لێ بێ زمانی پەنجەکانی هەڵوەرێ
هەر کەسێ گوڵشەن بەدەردی گوڵخەنی دۆزەخ بەرێ)

شاعیر باس لە ترسنۆکی شەڕکەرە نەیارەکانی کورد دەکا، بەزمانی خۆیان هاوار بۆ دایکیان دەبەن، دایە دایەی پۆلیسی تورک و سەربازی عەرەب لە شیعرەکەیدا تۆمار دەکا، بەڵام ئەو بەسەرسوڕمانەوە بۆ قەشمەری کردن پێیان دەڵێ ئەم هاوار و پاڕانەوەیان پێویستە لەسەر قەوان تۆمار بکرێ. لە پاشانا حەمدی دەردی دڵی خۆی دەردەبڕێ، بۆ بەختی کورد دەلاوێنێتەوە و بەدێڕە شیعری «ڕەببی مووی لێ بێ...» کۆتایی بەشیعرەکەی دێنێ وەکو زنجیرە قەسیدەکانی دیکەی بەتایبەتی تەرجیع بەندە نیشتمانییەکانی.

٣

یەکێ لەو شیعرانەی منداڵی سییەکان و چلەکانی سەدەی بیستەمی کوردستانی باشووری گۆش کردبوو بەبیری کوردایەتی و بوو بە سەرچاوەی چەسپاندنی گیانی نیشتمانپەروەری لە دڵ و دەروونیاندا شیعری «ئەی وەتەن» بوو:



ئەی وەتەن ڕۆم و عەجەم موشتاقی کوردستانتە
ئیفتیخاری میللەتی کورد شەوکەتی عینوانتە
بەستە سەربەرزی ئێواران و سبەینان مانگ و ڕۆژ
وەک نیشانی ئیفتیخاری سنگ و نەحمەی شانتە
بەرق ئەدا و ئەڕژێ وەکو ئەمواجی گەوهەر چەشمەکان
ئاوە یا ڕووحی ڕەوانی چەشمەیی حەیوانتە
ئاوە یا نوورە لە عەکسی خۆر کە ئەبریسکێتەوە
ئەهلی حیکمەت وا ئەزانێ دوڕەکانی کانتە
گوڵگوڵی سوور و سپی خاڵخاڵی خاکی ڕەش ئەڵێی
پۆدرەیی ڕوخسار و سورمەی ڕشتنی چاوانتە
عاشقی ڕەنگی خەزانی تۆیە بۆیە دێ بەهار
فەسڵی هاوین گەرمە مەیلی بەفرەکەی زستانتە
بۆچی ئەنباری زەخیری کائیناتە شارەزوور
شەهر بازار خوانی میوانە لەبەر میوانتە
باسی میوەی تۆ ئەکەم بۆیە قەڵەم هاتۆتە بەر
بەستەکانم بستەیی ئەهلی دڵ و عیرفانتە
بۆ ئەمەی جارێ بەسەر تا پێ نەنێم ئەفکاری من
یا بە سەر ڕۆیشتنە یا سەربەسەر هیجرانتە
پلپلەی پشتێنی زێڕینی حەبیبی قەومی کورد
زرزڕە و پشتێنەیی بەردینی قەد شاخانتە
بۆیە سیروان و زەرب بۆ شاڵی چۆغە و ڕانکت
وەک حەریر دیجلەی جزیرە با ئەدەی بۆتانتە
کورد کوڕەکاژاوی لووتی وا بڵند کردۆتەوە
هەر وەکو شەمدینی بادین ئارەزووی بەرزانتە
ئاسمان و شاخی بەرز و سەتحی ئەرزت دەردەخا
ماڵی کوردی تۆ ئەوە دیوار و حەوشە و بانتە

پەیکوڵی تا قەسری شیرین ڕاکشاوە پێی کوڵی
دەستی قەندیلت درێژە بۆ چراچی وانتە
پیرەمەگروون تاجی شاهانەی بەسەربەرزی فڕاند
تەم دەماوەند داگرێ مەحجووبی هەورامانتە
خەتتی دیوانی شکستەی گرد و لووتی بەرزی شاخ
وازیحە بۆ سەربەخۆیی تورڕەیی فەرمانتە
جار بەجار (حەمدی) گلەت گەر لێ بکا ناحەق نییە
جەردە ڕامەگرە نەڵێن خەڵقی کە جانی جانتە

حەمدی میللەتی کوردی لەبەر کورد خۆشویستووە، خاکی کوردستانی لەبەر کوردستان خۆشویستووە، ئازادی و بەختیاری بۆ کورد ویستووە. هەرچەندە ئەو کوردە دوور بووبێ لە هیوا و ئامانجی ئەو زیاتر کوردایەتی کردووە، بۆ ئەم مەبەسە شیعرێکی نیشتمانپەروەری زۆر لە دوا ساڵانی ژیانیدا نووسیوەتەوە، واتە لەو کاتەی مەسەلەی نیشتمانی کورد هەندێ کپ بوو و چارەنووسی وا کەوتەوە لەگەڵ عەرەب لە چوارچێوەی دەوڵەتی عیراقدا بژی.

لەم شیعرەدا حەمدی خەریکی وەسفی ڕووکەشی سروشتی کوردستانە، ئەو خاکە ڕەنگینەی شایانی ئەوەیە کورد خۆشی بوێ. جوانە دەوڵەمەندە، بەڵام بێ خاوەنە. یادی گەلێ لە ڕەمزە جوگرافییەکانی کوردستان دەکاتەوە، وەکو: شارەزوور، شاربازێڕ، سیروان، دیجلەی شاری جزیرە، بۆتان، کوڕە کاژاو، شەمدینان، بادینان، بارزان، پەیکوڵی، قەسری شیرین، قەندیل، وان، پیرەمەگروون، دەماوەند و هەورامان.

٤

ڕووداوە خوێناوییەکانی ڕاپەڕینی کوردی باکووری کوردستان لە مارتی ١٩٢٥ لە باشووری کوردستان دەنگی دابووەوە. یەکێ لە شاعیرانی ئەو سەردەمە حەمدی بوو. بەم ڕەنگە شیوەن دەگێڕێ بۆ ئەو کوردە بێ کەس و چارە ڕەشە:

چۆن زمانی خامە نەشکێ نەپچڕێ ڕشتەی خەیاڵ
کاسەیی پڕ مێشکی کەللە بۆ نەبێ یەکسەر بەتاڵ
حامیی قەومی زەعیف و عامیلی عەدل و ئەمان
وا لە کوێیی چۆنی بنووسم بۆی بنێرم عەرز و حاڵ



چۆن لە ژێر ئەم سێبەری گەردوونی دوونە دەرنەچم
خەسمی مادەرزادی قەوم ساحیبی عەزمە و کەماڵ
چۆن لە ساحیب قودرەتی نەوعی بەشەر تەعنە نەدەم
بۆ لە بەختی ئێمەدا ئەمڕۆ هەموویان کەڕن و لاڵ
بۆ بەژێر بەحرا ئەڕۆن و ئاسمانان کەشف ئەکەن
بۆچی ناکەن کەشفی دەردی کوردی بێچارەی شیماڵ
سەیری ناکەن وەک نیگاری لەوحی تەئریخی بەشەر
نەقشی کوڕڕەی ئەرز ئەکا وەک بەحری ئەحمەر خوێنی ئاڵ
کێ لە قانوونی بەشەردا دیویەتی ڕاستی بڵێ
بێ قەباحەت خوێنی ئەم کوردە لە کوللی کەس حەلاڵ
بۆ بە دارا بکرێ پیاوی تێگەیشتووی قەومی کورد
بۆ بنێژێ نەوجەوانانی پێگەیشتووی وەک نیهاڵ
لەحزەیێ نەبڕا لە بەدخواهانی ئەم قەومە فەرەح
خێرخواهیش نەبووە ئانێ بەبێ حوزن و مەلال
درزێ ئەرزێ هەر نییە ئێسکێکی کوردی تیا نەبێ
سەگ نییە نەیخواردبێ گۆشتی ژنێکی یا مناڵ
وا بەخوێناوی سریشک و خامەیی خامی مۆژەم
ئەم عەریزەم نووسی نامەرد بۆم بەرە بادی شیماڵ
بیبەرە مێشکی هەموو ئەفرادی قەومی کوردەوە
تا لە قوڕ نیشن لە ڕۆژی ماتەما ئاڵ و عیاڵ
ڕۆژی تەئریخی لە بیست و چواری مارتا واقیعە
ڕۆژی ماتەم ڕۆژی قوڕ پێوانی کوردە کوللی ساڵ
قەت برا نابێ گلە لەم قەومی خۆتانە بکەن
دەردەدارن بۆیە ناگەن بۆ ڕەفیقانیان بەباڵ
دەست لە شەرحی دەردی کورد هەڵبگرە (حەمدی) چاترە
نەک بکا نەقلت هەتا ڕۆژی حەشر جەڕڕی مەقال

کارەساتی کوردی باکوور شاعیری لە پەلوپۆ خستووە، هۆشی چووە، بیری نەماوە، هاواری لێ هەڵساوە! کێیە پاریزەری قەومی بێکەس بۆ ئەوەی شکاتی لە لا بکا. ئینجا ڕوو دەکاتە بەهێزەکان ئەوانەی نهێنییەکانی زەریا و ئاسمانیان دۆزیوەتەوە، بۆچ ناگەنە فریای کوردی باکوور! لە سێدارە دەدرێن، نەوجوانانیان دەکوژرێن. ئەو زۆرداریيەی بەکورد کراوە، بەکەس نەکراوە. درزەکانی سەر ڕووی زەوی هەموویان ئێسقانی کوردیان تێدایە، هەموو سەگی گێتی گۆشتی ژن و منداڵی کوردیان خواردووە.

شاعیر ناچار دەبێ فرمێسکی خوێناوی دەکا بەمەرەکەب و موژەی دەکا بەقەڵەم و بای شەماڵ دەکا بەتەتەر و ماتەمنامەی پێ دەنێرێ بۆ هەموو کوردێک، بۆ ئەوەی قوڕ بپێوون و هەش بەسەردا بکەن و ڕۆژی ٢٤ی مارتی ١٩٢٥م هەموو ساڵێک بکەن بەڕۆژی شین و واوەیلا. بەلای شاعیرەوە دەردی کورد ئەوەندە گرانە لێی بێ دەنگ بێ باشترە، چونکە دەبێ هەتا ڕۆژی حەشر هەر باس بکرێ تا ئەو ڕۆژەش دەرمانی دەردەکە نادۆزرێتەوە. بەڕاستی شاعیر هوشیار بووە، تا ئێستاش هێشتا نەدۆزراوەتەوە.

### ٥

لەو ڕۆژەی ئیبراهیم پاشای بابان بەردی بناغەی شارە جوانەکەی سلێمانی دانا لە ماوەی هەموو ژیانی شاردا تووشی کارەساتێکی زۆر بووە، کارەساتی ئادەمزاد و کارەساتی سروشت، بەڵام هەر بەرگری کردووە و بووە بەشاری هەڵمەت و قوربانی. نموونەی کارەساتی سلێمانی زۆرە: قەرەج تالانیان کردووە، تورکی عوسمانی داگیریان کردووە، ئینگلیز و عەرەب بەزەبری تۆپ و فڕۆکە وێرانیان کردووە، سروشت لێ تووڕە بووە. ڕەشەبا هیچ بەرنامەییێکی بۆ نییە، دەڵێی گۆیژە کون بووە بەهاوین بەبای ئاگری دۆزەخ دەیبرژێنێ و بەزستان بەبای زەمهەریر لە سەرمانا دەیکوژێ.

یەکێ لە تووڕەبوونەکانی سروشت لافاوی ساڵی ١٩٣٢ی سلێمانی بوو. حەمدی بەم ڕەنگە وەسفی دەکا:

ساڵی جارێ هەر ئەبێ ئەم شارە بێتە مەزبەلە
یا بەبۆمبا یا بەئاگر یا بەبارانی پەڵە
ئاگرت تێبەر بێ گەردوون وا ئەبێ دەور و خولت
نایەڵێ قەت مەزرەعەی ئومێدی کورد بێ دوو پەلە



بۆ مەزەررەت هەر تەنەززولتان کە فەرموو بۆ زەمین
عادەتت وایە کە کوردستان بکەیتە مەرحەلە
بۆچی بوویتە مەسخەرەی ئەرز و سەما ئەی مەملەکەت
بۆچی بوویتە مەعرەزی ئافات و فیتنە و وەلوەلە
خەڵقی وەک تینووی بەراون بۆ نمی باران کەچی
بەو نمە بارانە ئێمەت خستە ئەم مەرگە مەلە
یا بەحاڵی ئێمە گریا گۆیژە فرمێسکی بەخوڕ
هات و لێشاوی سلێمانی کە خستە زەلزەلە
هاژەیی لافاو و گرمەی هەور و چەخماغەی هەوا
لەرزی هێنایە مەلەک ئینسانی خستە هەلهەلە
سەددە هەڵدەستێ لەبەر لافاوی کوردستان لە بێ
دیجلە لێڵ و وێڵ ئەکا شەیتانە دەیخاتە پەلە
موقتەزای خاکە کە هەر شەیئێکی تێدا هەڵکەوێ
هێندە بەرز و دیارییە وەک دارەکانی سەرکەلە
کوندەبووی نەکبەت وەهای زانی کە ئەیوانی جەمە
ئەم کەلاوانەی کە دی گڤ بووبوو ئەتووت هۆکەڵە
پاشی لافاو هەر بەیەک مەوداوە فیرقەی عەنکەبووت
بۆ سەراپەردە لە شاران کەوتبوونە کەڵکەڵە
ئەم برینانە زەمانە هەر دەبێ سارێژی کا
(حەمدی) ئەمما بۆ ئەمەش پێویستە سەعیی و حەوسەڵە

ئەم لافاوەی حەمدی وەسفی دەکا، یەکەمین و دوا لافاوی سلێمانی نەبووە، لە دوای ئەویشەوە هی دیکە ڕوویداوە. شاعیر کارەساتەکانی بەسەر سلێمانیدا هاتوون دێنێتەوە یادی خەڵکی شار. بەگشتی بەسەرهاتی سلێمانی دەکا بەڕەمز بۆ کوردستان. هەر کارەساتێک تووشی سلێمانی ببێ زیانی بۆ هەموو کوردستان دەبێ.

## دانایی و داهێنانی هونەری لە چوارینەکانی حەمدیدا

حەمدی یەکێکە لە شاعیرە سەرکەوتوو و هەرە چاکەکانی کورد لە هونەری چوارینـدا. زۆربەی شاعیران هەتا دەگاتە هەندێک لە گەورەکانیش خۆیان لە چوارین نەداوە، ئەو بابەتەی مانا یا وێنەیێکی بچووکی دیاریکراو دەخرێتە قالّبی چەند ڕستەیێکی کورتەوە، کارێکە پێویستی بەجۆرە شارەزایی و وەستاییییێک هەیە. ئەو توانایە لای حەمدی بەرچاو دەکەوێ.

١

لە چوارینێکیدا دەڵێ:

سوبح پێناکەنێ تا بێ نەوایی شەو بەدڵ نەگری
گوڵی ناپشکووێ تا بولبولی سوبحی بەکوڵ نەگری
بەری نابی درەختی باغی عالەم تا هەموو وەک یەک
بەیەک سۆز و بەیەک شۆر و بەیەک دەم چڵ بەچڵ نەگری

کە شەو بۆ مردنی خۆی دەگریێ، بەیان پێدەکەنێ. گوڵیش ناپشکوێ (پێناکەنێ) تا بلبل بۆی نەگرییێ. ئینجا شاعیر بوون بەیەکێتییێک دادەنێ ئەگەر هەموو لق و پۆپەکانی یەک ئامانجیان نەبێ بێ سوودە.

٢

لە چوارینێکیدا یاری بەوشەی «چنار» دەکا:

من وەکو لالە کە بێبەش بم لە قەددت وەک چنار
وەک یەکە بۆ دڵ چ داغی ئیشتیاقت بێ چنار
بۆ نموونە باغی عالەم نەخلی وەک تۆ دەردەخا
کێ چناری دیوە فەرموو بەربدا وەک ئەو چنار

شاعیر لەگەڵ دلبەر قسە دەکا. گەلێ وێنەی هونەری خستۆتە ناو ئەم ڕستە کورتانەوە. چناری قیت و درێژ کورتە بەرامبەر قەد و باڵای دلبەر. دار خورمای ڕووی زەوی ناگاتە بەرزی ئەو نازەنینە. کامە چنار لەسەر ڕووی زەوی بەری وەک ئەو چنارەی داوە. بەری لە سنگییەتی، ئیتر مەمکۆڵە لیمۆیە، سێوە، هەنارە، ڕەنگە میوەی دیکەش بێ، ئەمەیان شاعیر خۆی دەیزانێ.



٣

لەم چوارینەدا یادی وشەی کوردی و شاعیرە گەورەکان دەکاتەوە:

خەرمانی لەفزی کوردی (کوردی) کە کردی پێوان
(نالی) کە ناڵی کاسەیێکی دا بەویش لێوان
تاراجی کرد کە (مەحوی ئەفەندی) بەلوتفی خۆی
عوشریشی دا بە(حەمدی) ووتی بیبەرە دیوان

حەمدی یادی شاعیرە گەورەکانی وەکو نالی و کوردی و مەحوی دەکاتەوە، نالی و کوردی دامەزرێنەرن. مەحوی نەوەی یەکەمی قوتابخانەی کوردستانی باشوورە. حەمدی بەرامبەر بەم شاعیرانە خۆی بەکەم دەزانێ و دەڵێ ئەگەر مەحوی دەیەکی خەیاڵی شیعری خۆی بداتێ ڕووی ئەوەی دەبێ دیوانی شیعری هەبێ.

٤

لەم چوارینەدا باس لە پێکەنینی غونچە دەکا کە دەبێتە گوڵ:

موبارەک بێ عەزیزم چوونە باغت
وەکو غونچە بپشکووێ با دەماغت
لە دووری تۆ منیش هەروەکو گوڵ
بەرۆکم دادڕم تا سەر لە داغت

شاعیر دلبەر دەباتە ناو باغ، بۆ ئەوەی دەماغی وەکو غونچە بپشکووێ، شاعیر لەبەر دووری دلبەر بەرۆکی دەدڕێنێ وەکو گوڵ، واتە غونچەکە پێدەکەنی یا دەکرێتەوە دەبێ بەگوڵ.

٥

حەمدی بیرێکی دانایی دەخاتە قالّبی چوارینێکەوە:

دێتە دونیاوە بەڕووتی خەڵقی وەک بچنە حەمام
غوسڵی دەرچێ و دەرنەچێ هەر دەردەچێ شاە و غولام
هاتەوە لەو دەرچووانە تێگەیشتوویێ ووتی
خۆ نەگۆڕاوە زەمانە ئەسکی تاس ئەسکی حەمام

حەمدی کۆمەڵێک پەند و وێنەی جوانی لەم دیمەنەدا کۆکردۆتەوە. خەڵکی بەڕووتی دێنە دنیاوە وەک لە گەرماوادا بن دێنە بەرچاو. لەوەدا شا و گەدا یەکسانن. ئیتر یەکێک لەوانەی لە گەرماو بوون وتی، ڕۆژگار نەگۆڕاوە هەر ئەو تاس و هەر ئەو حەمامە کۆنەیە. وشەی «ئەسکی» تورکییە بەمانای (کۆن) هاتووە.

٦

لە وەسفی کوڵم و دەم و چاو و خاڵی دلبەردا حەمدی دەڵێ:

باسی کوڵمی تۆ بنووسێ چۆن قەڵەم گوڵ ناگرێ
یا بکا یادی دەمت غونچە وەکو چڵ ناگرێ
چۆن بەسەر نێرگس نەگیرێ ناوی چاوت بێتە ناو
وەک وەنەوشە بۆ مل و خاڵت بەکەچ مل ناگرێ

داهێنانی ڕەوانبێژی لەم چوارینەدا لە بەراوردی وێنەکانی سروشت لەگەڵ ئەندامەکانی دلبەر لە لووتکەدایە. شاعیر ئەوە دەردەبڕێ ئەگەر قەڵەم وەسفی کوڵمی دلبەر بکا وێنەی گوڵ دەکێشێ، ئەگەر یادی دەمی بکا غونچە چڵ ناگرێ. ئەگەر چاویش خۆی بنوێنێ وێنەی نێرگس دەکێشرێ، ئەگەر مەسەلە خاڵی لاملیش بێ وێنەکە وەنەوشەیە.

٧

لە چوارینێکدا حەمدی بەراورد لە نێوان کوردستان و بەهەشتدا دەکا:

گەر لە مەحشەر ئەبوومە مالیکی جەننەت شەوێ
حوور و غیلمان و بەهەشت و قەسرەکانم دەس کەوێ
نەوعێ تەمسیلی ئەرازی کورد و کوردستان ئەکەم
هیچ کەسێ فەرقی نەکا ئێرانە خۆشە یا ئەوێ

لەم چوارینەدا ئەگەر شاعیر کوردستانی پێ لە بەهەشت ڕەنگینتر نەبێ، لەوانەیە لە جوانیدا وەکو یەک تەماشایان بکا.

٨

لە چوارینێکیدا حەمدی بەڵێن ئەدا هەتا کورد نەگاتە ئامانجی خۆی ئاهەنگ ناگێڕێ بۆ جەژنی نەورۆز:



تۆ لە شەودا بی وەتەن من چۆن بڵێم نەورۆزمە
ئەم گوڵاڵەی ئاڵ و والایەی بەهار پیرۆزمە
جەژنی چی هەر ماتەمێکی ڕووتە شین و گریەیە
تا هەڵێ ڕۆژێ کە کوردیش پێی بڵێ جا ڕۆژمە

ئەم چوارینە نموونەیێکی تری نیشتمانپەروەری و گیانی پڕ لە سۆزی کوردایەتی حەمدییە. ئەگەر نیشتمان لە تاریکستان و دیلستاندا بژی، نەورۆز و گوڵاڵەی ئاڵ و والا پیرۆز نابێ، ماتەم و شین و گریە لە ناو کورددا کۆتایی نایە تا ئەو ڕۆژەی کورد دەگاتە ئامانجی و دەڵێ ئەمەیە ڕۆژی من.

**گۆرانیی نەورۆز**

بەزۆری کارەسات و ناخۆشی بەرۆکی سلێمانییان بەرنەداوە، ئەمانە لە بەرهەمی حەمدی ڕەنگیان داوەتەوە. لەگەڵ ئەوەشدا ساتی خۆشی هەبووە، لەم بارەیەوە شاعیر بۆ نەورۆزی ساڵی ١٩٢٥ سروودێکی هۆنیوەتەوە لەسەر شێوەی بەند (کۆپلە)، هەر بەندی حەوت نیوە دێڕ شیعرە لەسەر کێشی بەحری ڕەجەزی عەرووز. بەکێشی سیلابی خۆماڵی حەوت بڕگە و هەشت بڕگەش دەکێشرێ. لە ڕووی قافیەشەوە بەم جۆرەیە (ا ا ا ا ا ا م م)، (ب ب ب ب ب ب م م)... هەندێ لە بەندەکانی ئەم سروودە:

بەه بەه چ ڕۆژێکی نەوە
هەی هەی چ عومرێکی نەوە
هەوا دەریایی پڕتەوە
گوڵ بۆ چەمەن بەسەر ڕەوە
سەوزە جلەوکێشی ئەوە
دونیا وەک باغی خوسرەوە
شیرینە جێی سەیرانەکەم
ئەمما بدەی جەژناکەم

***

هێنایە لەنجە دەستی چڵ
وەک جامی بادە عەتر و گوڵ

عەرعەر تەقانی دەست و پل
سەما سەما ئەکا بەخول
نەی کەوتە خوێندنی بەدل
نابێ ببم زیاتر خەجل
زۆری بدە جەژنانەکەم
خۆشی ئەکەم سەیرانەکەم

***

تۆ ماهیی و من ئەختەرت
تۆ شاهیی و من ئەفسەرت
تۆ ئەهلی دڵ من دلبەرت
تۆ یاریی و من یاوەرت
تۆ ئاغای و من نۆکەرت
ڕووحم بەسەر گەردی سەرت
کوانێ بدە جەژنانەکەم
ماتەڵ نەبێ سەیرانەکەم

***

گوڵ غەرقی ئاو و ڕەنگە
غونچە دەم و دڵ تەنگە
نێرگس گێژ و دەبەنگە
بولبول لەسەر ئاهەنگە
ڕۆژێکی شۆخ و شەنگە
لوتفێ بکە درەنگە
بێنە بدە جەژنانەکەم
بچم بۆ سەر سەیرانەکەم

***

وەتەن غەرقی عیشوە و نازە
ئەلحەق لە ئەرزا مومتازە



قەلی شەلی ئەڵێی قازە
کەوی هەموو ئەڵێی بازە
بەقاعیدە ئەمەند شازە
وەختە بڵێم کە ئیعجازە
ڕۆیشتوون هاوڕێکانم
بدە پارە پڕ گیرفانم

حەمدی لەم سرووددا بایەخی بەکێش و قافیە و مۆسیقا و ڕیتم داوە. نەورۆز و بەهار لە کۆمەڵێک گوڵ و ئەوەی پێوەندیی بەگوڵەوە هەیە پێکهاتوون. ناوی ئەم گوڵانە و وشەی فەرهەنگی بەیەکترییەوە نووسێنراون، ئاوازێکیان پژاندووە سەما بەناوی گوڵەکان دەکەن. دوو نیوە دێڕی دوایی هەموو بەندەکان لەگەڵ ئەوەی بەڕستە جیاوازن بەڵام بەمانا هەموویان یەکێکن، ڕستەکان لە بنجدا گۆڕانیی میللی سەر زار (فۆلکلۆر)ی منداڵانن، داوای جەژنانەی نەورۆز لە باوکیان دەکەن، شاعیر بەدەسکارییەوە وەریگرتوون.

## ستایشی مەلیک فەیسەڵی یەکەم

حەمدی ستایشی هەندێ کەسی کردووە، لە هەموویان زیاتر شێخ مەحموود. ئەوجا هاتووە بەقەسیدەیێک ستایشی فەیسەڵی یەکەمی کردووە. شاعیرانی دیکەی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم لە کوردستانی عیراقدا ستایشی دامودەسگای دەوڵەتی عیراق و مەلیک و کاربەدەستان و وەزیران و ئەندامانی پەرلەمان و ئەمپریالیستی بەریتانیای داگیرکەر و هی دیکەیان کردووە. ئەم ستایشانە لە ڕووی هونەری و جوانکاری و داهێنانی شیعرییەوە تەماشا دەکرێن.

لە دوای جەنگی یەکەمی گێتی پێوانەی نیشتمانپەروەری لە کوردستانی عیراقدا ئەوە بوو خەڵکی کورد خەبات بکەن لە پێناوی دەستخستنی مافی نەتەوەیی. لەو ماوەیەدا دۆستی نەبوو تەنیا خۆی بوو، پاشماوەی تورکی عوسمانی لە دژی بوون، ئینگلیزی کاربەدەست بەنەیار حسێب دەکرا، عەرەب بەدوژمن لە قەڵەم دەدرا. خەڵکی سلێمانی لە خۆپیشاندانی بەردەرکی سەرای ڕۆژی ٦ی ئەیلوولی ١٩٣٠ دەیانوت: «ئێمە کوردین کوردمان دەوێ...» ، حەمدی و زۆربەی خەڵکی کورد بەدڵ و بەگیان لەگەڵ مافی کورد بوون تا دەوروبەری ئیمزاکردنی پەیمانی عیراقی – بەریتانیی لە ساڵی ١٩٣٠ و دامرکاندنەوەی

بزووتنەوە و ڕاپەڕینەکانی کورد. لەو ڕۆژگارەدا پێویست بوو شاعیر و نووسەر و ڕۆشنبیری کورد خۆی لەگەڵ هەڵسوکەوتی تازەدا بگونجێنێ. لە پەنای ئەو ئازادییە کەمەی بەهۆی «دەستووری زمانانی ناوچەیی» (قانون اللغات المحلية)ەوە درا بوو بەکورد خزمەتی زمان و ئەدەبی کوردی بکا. چەند قوتابخانەی کوردی پەیدا بوون، ڕۆژنامە و کۆواری کوردی بلاوکرانەوە، ئێستگەی بێ تەل (ڕادیۆی بەغدا) بەرنامەی کوردی هەبوو، هەر بۆ ئامانجی چاکەی بیری کوردایەتی دەبۆ ڕۆشنبیری کورد بۆرە عیراقچییەتییێک بکا، لەبەرئەوە ئەگەر حەمدی ستایشی مەلیک فەیسەڵی یەکەمی کردبێ، تاوانی نەکردووە. بەتایبەتی یەکێکی وەکو فەیسەڵ دوژمنی کورد نەبوو. سەرەڕای ئەم هەموو لێکدانەوە سیاسی و ئەکادیمی و ئیدیۆلۆجی و چی و چیترەوە، بەرهەمی ئەدەبی خۆی سەرپشکە ئەگەر داهێنانی جوانکاری (ئیستێتیکی) تێدا بێ.

فەرموون ئەم وەسفە جوانە بێ وێنەیەی حەمدی دەیکا بۆ پێشوازی کردنی مەلیک فەیسەڵی یەکەم لە گەیشتنەکەیدا لە ساڵی **١٩٣١** بۆ سلێمانی:

زەمین ئارایشی خۆی داوە بۆتە ڕوومەتی دلبەر<br>
بەئاهستەی هەوا ئەیکا دەماغی عالەم موعەتتەر<br>
گوڵاڵەی ئاڵ و واڵا وا لە دەورەی بەزمی عالەمدا<br>
لە شەونم پیاڵەیان پڕ کردووە وەک ساقیی کەوسەر<br>
سەما هەر بۆ سەما ئەسبابی تاقەی شینی پۆشیوە<br>
کەواکیب بۆ نیسارە هەڵدەڕێژن شوعلە وەک گەوهەر<br>
وەکو تاقی زەفەر زینەت دراوە کەهکەشان ئەم شەو<br>
لە ڕەقسایە قەمەر هەروا جریوەی دێ وەکو ئەختەر<br>
چ شەوقێکە گڕی بەردایە خۆر ئاگر ئەبارێنێ<br>
هەور چەترێکی هەڵداوە لەسەر ئەم ئەرزە بۆ سێبەر<br>
لە حیرەتدا ووتم ئەم کائیناتە بۆچی خۆی گۆڕی<br>
بەهاوین ئەم زەمینە چۆنی دەرکرد سەوزە وەک مووی سەر

بەوشەی کوردی حەمدی سروشتی هێناوەتە جۆش و خرۆش، گەیشتۆتە پلەیێکی داهێنانی هونەری تا ئەو ڕادەیەی بیروڕای هەموو ئەو کەسانە بەدرۆ دەخاتەوە کە دەڵێن کاری شیعری و هونەری بەڕادان نادرێ. ئەوانەی دەیانەوێ حەمدی دۆستی شێخ مەحموود



بێ و دوژمنی فەیسەڵی یەکەم، چی بەوە دەڵێین ئەو شیعرانەی بۆ هەردووکیانی وتووە گەیشتوونەتە پلەی هەرە بەرز. ئەم شیعرانەی سەرەوە وەسفێکی میهرەجانی سروشت بوو و جارێ هیچ پێوەندییێکی بەمەلیکەوە نەبوو، تا دەڵێ:

وتم کێیە ئەمە ئەم حیشمەتە لەم وەختەدا ووتیان<br>
ئەمە شاهی عیراقە و ئەشرەفی ئەولادی پێغەمبەر<br>
مەلیک زاتی جەلیل و ئەقدەسی فەیسەڵ کە مەعقوولە<br>
بەشیرین عەبدی بێ خوسرەو ببێتە نۆکەری قەیسەر<br>
شەهنشاهێکە ئەیوانی بەرابەر تاقی کەیوانە<br>
جیهاندارێکە دەرگاهی بەسەر بەحر و بەڕا نازیر<br>
بەسەر عەرشی عیراقا هەر بمێنێ سایەیی عەدلی<br>
هوما ئاسا لەسەر سەرمان خودایا ڕاگرێ شەهپەڕ

ئەم دێڕانە بۆ ستایشی مەلیکە، لە ڕووی هونەرییەوە بەرزە، لەبەرئەوە ئەگەر فەیسەڵ دوژمنیش بێ نرخی جوانکاری شیعرەکە نایەتە خوارەوە، خۆ ئەگەر ناحەزێکی مەلیک ناوی لە شیعرەکەدا لابەرێ و ناوی کەسێکی دیکە لە جێی دابنێ شیعرەکە لای ئەویش لە جوانی خۆی ناکەوێ.

### **زەمان** = **ڕۆژگار**

حەمدی بەهەوەسێکی میتافیزیکییانە قەسیدەیێکی داناوە بەناوی «زەمان»ەوە. هەروەها دێڕە شیعرێکی خۆی کردووە بەناوی دووەمی شیعرەکە:

دانی نەماوە ئاشی جیهان ئاش بەتاڵ ئەکا<br>
یا فاشی ئەم سەرائیرە بۆ ئینفیعال ئەکا

قەسیدەکە بەم دێڕانە دەست پێ دەکا:

ئەحوالی ئەم زەمانە لە کایەی مناڵ ئەچێ<br>
دونیاییێکی چ پووچە لە زەرفی بەتاڵ ئەچێ<br>
ئەم باغە هەر دەمە کە دەگا میوەیی ئەڵێی<br>
ئەم کۆنە گومەزە لە دوکانی بەقاڵ ئەچێ

نەقس و کەماڵی خەڵقی جیهان موعتەبەر نییە
هەردوو موحەققەقە کە بەدەستی زەواڵ ئەچێ
گەهـ ڕۆژە وا ئەبێ بەئەسیری زەلامی شەو
گەهـ بەدری کامیلە کە بەدەردی هیلال ئەچێ
ئیقبال و شوومی تابیعی عیلم و جەهل نییە
ڕێکەوتە بازە ئەمڕۆ سبەینێ لە داڵ ئەچێ
ئەیوانی جەم کە هەمدەمی کەیوان بوو مودەتێ
ئەمڕۆ بەپەستی خانەخەرابە لە چاڵ ئەچێ

لەم دێڕانەدا حەمدی بەهەوایێکی ڕەشبینییانە چارەنووسی هەموو شتێک بەنەمان و لەناوچوون دوایی پێ دێنێ. ئەمە ئەستووری بیروباوەڕی ئایینە ئاسمانییەکانە، فەلسەفەکە لەوە وەرگیراوە، دوو گێتی هەیە، یەکەمیان ئەوەی ئێستایە و لە پاشانا کۆتایی پێ دێ، ئەوی دیکەیان ژیانی بەهەشتە، ئەمەیان هەتا هەتایە و هەمیشەییە.

شاعیر بۆ لێکدانەوەی ئەم بیروڕایانە دەڵێ ژیان وەکو ماڵماڵۆکانیی منداڵانە، دنیایێکی بێ نرخە لە زەرفی بەتاڵ دەکا. ڕۆژ دیلی تاریکی شەوە، مانگی چواردە بەدەردی مانگی یەک شەوە دەچێ، زانین و نەزانین ڕۆژێ لە ڕۆژان باڵندەی بازە لە پاشانا لە داڵ دەکا. دیوەخانی جەمشیدی جەم ئەوەندە بەرز بوو چاوشارکێی لەگەڵ ئەستێرەی کەیوان دەکرد کەچی ئێستاکە خەرابەیە.

حەمدی لەسەر بەراوردە هونەری و جوانەکانی دەڕوا:

ئەو نەونەمامە سێبەری دوێنێ لە نار ئەکرد
ئەمڕۆ لە ئاگرایە لە چیلکە و چەواڵ ئەچێ
بێ لێوە ئەم جیهانە تەماشاکە نەی ژەنی
بینایی کوێرە ئەفسەحی دایم لە لاڵ ئەچێ
هەر ناڵە وا لە بورجی جەلالا وەکو هیلال
هەر ماهە وا لە کونجی مەلالا لە ناڵ ئەچێ
بازاڕی دەهرە قیمەتی ئەشیا بەجێگەیە
مێشێ کە نیشتە ڕووی نیگارێ لە خاڵ ئەچێ



دونیا هەناسەیێکە نە چووبێ نە هاتبێ
حاڵێکە بوو بە چی کە لە عالەم بەحاڵ ئەچێ
بەو عومرەوە کە بوویەتی نووح و ووتوویەتی
دونیا لە ڕیحلەتا لە خەوی بێ خەیاڵ ئەچێ

لە وێنەکانی ئەم دێڕانەدا حەمدی تێبینی دانایانەی هەیە وەکو ئەو نەونەمامە تەڕ و جوانەی دوێنێ ئەمڕۆ چیلکە و چەواڵە بووە بەخۆراکی ئاگر. مانگی یەک شەوە لە ناڵ دەکا. تا دەگاتە ئەو باوەڕەی نرخی هەموو شتێک لەو جێگەیەی لێیەتی دیار دەبێ وەکو مێشێکی پیس و ناشیرین ئەگەر لەسەر ڕوومەتی نیگارێک بنیشێتەوە لە خاڵی جوان دەکا، ماوەی ژیان کورتە وەک هەناسەکێشانێک، یا چاو قوچانێک یا چرکەیێکە. نووح پێغەمبەری تەمەن درێژ چەند سەد ساڵێک ژیا، کەچی وتوویەتی ژیانی ئەو لە خەونێکی بێ خەیاڵی دەکرد، واتە زۆر کورت بوو.

حەمدی قەسیدەکەی بەم دێڕانە کۆتایی پێ دێنێ:

بڵقی سەر ئاوە کاکە جیهان تێ بفکرە تۆ
بۆ کەس نەبوو بەماڵ و نە بۆ کەس لە حاڵ ئەچێ
خۆ لابدەن لە باری گرانی حوقووقی خەڵک
بنواڕە کە هەڵگری لە فیلەی حەماڵ ئەچێ
نەکبەتییە ئەو کەسە کە عیززەتی نەفسی عورووج ئەکا
شامی مەلالی بۆیە لە ڕۆژی جەلال ئەچێ
بۆ نەفعە خواشناسی عیبادەت ڕیاییە
تەقوایی ئەم زەمانە بەنرخی وەبال ئەچێ
بانگێکی تر لە غەیبەوە ئێستاکە هاتە گوێم
هێندە زولالە دەنگی لە دەنگی بیلال ئەچێ
ئەلحەشر و وەلقیام ئەکات و جیهان ئاخرە ئەڵێ
لوقمەی حەرامی ئەمڕۆ بەنرخی حەلاڵ ئەچێ

شاعیر وێنە شیعرییە جوانەکانی بەگوێی خوێنەر دەچرپێنێ، ژیان بەبڵقی سەر ئاو دەچوێنێ، بۆ کەس نەبووە بەماڵ. بەراورد لە نێوان ئەو ژیانەی ئادەمزاد هەڵیگرتووە لەگەڵ

کۆڵەکەی سەرشانی فیلەی حەماڵ دەکا. فیلە ناوی کۆڵهەڵگرێکی ناو شاری سلێمانی بووە.

ئینجا لە تێکچوونی شیرازەی کۆمەڵ دەدوێ. خوداناسی بۆ بەرژەوەندی کەسێتییە، خراپە بووە بەچاکە، پارووی حەرام لە حەڵاڵ دەکا. حەمدی ژیرانە لە فەلسەفەی ئیدیالّی و بیروباوەڕی میتافیزیکی و غەیبی و ڕەشبینی و دوورکەوتنەوە لە خۆشیی ژیانی سەر زەوی وێنەی شیعرێک دروست دەکا هەست و چێژ دەبزوێنێ و لە چوارچێوەی فیکر دەچێتە دەرەوە و قسە لەگەڵ دڵدا دەکا وەکو داهێنانێکی سۆفیزم خۆی دەنوێنێ.

***

ئەحمەد حەمدی ساحێبقڕان یەکێکە لە شاعیرە گەورەکانی سەرانسەری ئەدەبی کوردی و ئەدەبی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم. خەیاڵ و چێژی بەسەر مێشک و بیریدا زاڵ بووە. شارەزایی لە ئەدەب و خوێندەواری و هەڵسوکەوتی ڕۆشنبیریی نەتەوەی خۆی بوو. هەموو بەرهەمی شیعری لە دڵێکی پڕ لە سۆزەوە هەڵقوڵاوە تا ئەگەر تەنگوچەڵەمە و گیروگرفتێکی زۆریشی تێدا بووبێ. کوردی زانێکی باش بووە. بەشداریکردنی لە بزووتنەوەی شیعری نوێی کوردی زۆر بووە. دەستی لە ڕوخساری شیعر نەداوە، ناوەرۆکی گۆڕیوە. لە چوارچێوەی شیعری کلاسیکی کۆندا داهێنانی بەرزە، بەقەوارە زۆرە. دیوانی شیعری ئەگەر لە دیوانی هەموو شاعیرانی کورد گەورەتر نەبێ، یەکێکە لە گەورەکان.

حەمدی وەستایانە توانیویەتی بیروباوەڕی تازەی سیاسی و کۆمەڵایەتی و نیشتمانپەروەری و کوردایەتی سەردەمی خۆی لە بۆتەی شیعری کۆنی کلاسیکی دابڕێژێ، بەشێوازێک لە جەماوەری کوردەوە نزیک بێ. بەکارهێنانی بەحرە سووکەکانی عەرووزی نزیک لە کێشی خۆماڵی بوونەتە هۆی ڕەوانی شیعری لە ڕووی مۆسیقا و ڕیتمەوە.

# بەشی سێزدەم

## سافی

## ١٨٧٣ - ١٩٤٢

### ژیانی شاعیر

کاک مستەفا کوڕی کاک عەبدوڵڵا کوڕی کاک عەلی کوڕی کاک مستەفای هیرانییە. وشەی «کاک» لە کوردەواریدا بۆ ڕێز لێنان لە پێش ناو بۆ برا گەورە یا هەر کەسێکی ڕێزدار بەکار دەهێنرێ. لەم بنەماڵەیەدا ئەم وشەیە لەباتی مەلا یا شێخ بەکارهاتووە. کاک عەبدوڵڵا باوکی کاک مستەفای شاعیر بووە، نازناوی «سانی = ثانی»یە، لە ساڵی ١٩٠٦ لە گوندی هیران کۆچی دوایی کردووە. لەم کتێبەدا وەک شاعیرێک باسی لێوە کراوە.

کاک مستەفا لە ساڵی ١٨٧٣ لە گوندی هیران لە دایک بووە. ئەم ئاواییە ماوەی ٢٢کم بەلای کۆیەوە لە شەقڵاوە دوورە. خوێندنی بەرایی لای باوکی بووە، لە دواییدا بەشێکی خوێندنی لە حوجرەی مزگەوتەکانی کۆیە و هەولێر و ڕواندز و گوندی سەران بردۆتە سەر. ئینجا لە لاجان و سابڵاغ (مەهاباد) و گوندی پەسوێی کوردستانی ئێران بەشێکی دیکەی خوێندنی مەلایەتی تەواو کردووە. کە تەمەنی دەوروبەری سی ساڵی بووە کاک عەبدوڵڵا (سانی) باوکی کۆچی دوایی کردووە، ناچار بووە دەست لە خوێندن هەڵبگرێ و ببێ بەجێنشینی باوکی و بەکاک مستەفای هیرانی ناوبانگ دەربکا. ئیتر لە پاش ئەمە کاری دیاری دەکرێ و دەبێ بەشێخی تەریقەتی قادری و وەک مورشیدێک تەکیەی قادری هیران بەڕێوە دەبا. لەو ماوەیەدا وەک شاعیرێک نازناوی سافی (صافی) بۆ خۆی هەڵدەبژێرێ. ئەم وشەیە بەمانای دڵپاکی و خاوێنی بیروباوەڕ هاتووە، بێ گومان وەک زاراوەیێک پێوەندیی بەئیدیۆلۆجییەتی سۆفیزمەوە هەیە.

لە کۆنەوە لە گوندی هیران حوجرەی خوێندنی مەلایی و شەریعەت مێژووییێکی بووە. لە سەردەمی ژیانی سافی لە لایەن خۆیەوە سەرپەرشتی کراوە. هەندێ مەلای ناودار لەو قوتابخانە ئایینییە وانەی زانستییەکانی ئیسلامی و زمانی عەرەبییان وتۆتەوە. هەندێ لە مەلا گەورەکانیش لە هیران خوێندنیان تەواو کردووە. سافی لەو شێخانە بووە تەریقەتی



لەگەڵ شەریعەت گونجاندووە. بۆ ئەم مەبەسە گەشتی بەغدای زۆر بووە بۆ زیارەتی تەکیەی شێخ عەبدولقادری گەیلانی. لەتەک ئارامگەی شێخ خەلۆەتی کێشاوە.

سافی کەسێکی کۆمەڵ حەز بووە، دۆست و برادەری گەلەک بوون. لە ناو هەموو توێژەکانی کۆمەڵدا ناسراو بوو. جگە لە دەروێش و مریدی تەریقەتی قادری لەگەڵ شاعیرانی هاوچەرخی خۆی پێوەندیی بووە بەتایبەتی بێخود و خادیم و هی دیکە.

سروشتی هیران لە هەموو کەژەکاندا دڵڕفێنە. لە ناوچەکەدا خەڵکی کە هیران و نازەنین دێننەوە یاد دوو گوندی خۆڕسک دێتەوە بیریان، ئەمانە چێژی گوشادی و خەیاڵی شیعری دەدەن بەئادەمزاد. هەر ئەم سروشتە جوانەشە لە داروبار و درەخت و گوڵ و گوڵزاری ڕەنگین و میوەی بەتام و ئاوی کانی و جۆباری زوڵاڵ ئەو چێژە جوانەی بەخشیوەتە سافی و کەسوکاری و چەند شاعیریان لێ هەڵکەوتووە. سافی ئاشقی کەو بووە، ڕاوە کەوی پێ خۆش بووە بەڵام نەیکوشتووە، بەڵکو بەخێوی کردووە وەک هەوەسێک بۆ ڕابواردن. بەمە بووە بەکەوناس. جگە لەمە مەراقی گۆرانی و ئاواز بووە، لەگەڵ گۆرانیبێژ و دەنگخۆشان دۆست بووە. غەزەلی کۆنی کلاسیکی و دەنگی خۆش و ئامێرەکانی مۆسیقای وەکو دەف و تەپڵ لە ئاهەنگی مەولوود یا هەر ئاهەنگێکی دەروێشی هەوەسی سافی بووە، بۆیە لەگەڵ گۆرانیبێژانی سەردەمی خۆی نزیک بووە و خۆشیانی ویستووە. بەشێ لە شیعری کراون بەگۆرانی و بەدەنگ و ئاواز بێژاون.

سافی ژیانێکی نەرمونیانی بێ گرێی بردۆتە سەر، ڕۆژگار بەدڵی ئەو و لەسەر ویست و ئارەزووی بووە لەو مەڵبەندە خۆش سروشتەی بۆ کەم کەس ڕێک کەوتووە. شاعیر لە ١٢ی شوباتی ١٩٤٢ کۆچی دوایی کردووە و لە هیران نێژراوە. لە دوای خۆی کوڕی گەورەی کاک عەلی بووە بەجێنشین و مورشیدی تەکیەی قادری لە هیران. ئەم کاک عەلییە شاعیر بوو، نازناوی «سەفوەت» بووە، لە ساڵی ١٩٧٧ کۆچی دوایی کردووە.

### شیعری سافی

#### شیعری سافی لە ڕووی ڕوخسارەوە

سافی یەکێکە لەو شاعیرانەی پێڕەوی مەرجەکانی شیعری کلاسیکی کردووە لە بابەت ڕوخسارەوە. زۆربەی شیعرە لیریکییەکانی لە حەوت دێڕ پێکهاتوون، ئینجا نۆ دێڕە شیعری. دیوانی شاعیر تەنیا قەسیدەیێک دەور دەکاتەوە لە بیست و شەش دێڕ پێکهاتووە، قافیە «ە – ـە»یە.

ئەو بەحرە عەرووزییانەی شاعیر بەکاری هێناون ئەمانەن: هەزەج، ڕەمەل، ڕەجەز، موزاریع، موتەقاریب، زۆربەی هەرە زۆری شیعرەکان لەسەر بەحری هەزەج و ڕەمەل ڕێکخراون. قافیەی شیعری سافی لەسەر چەند دەنگێکی ئەلفوبێی کوردی دامەزراوە، وەکو: ا، ت، ر، م، ن، و، (ە – ـە)، ی. لەمەدا ئەوە دەردەکەوێ شاعیر بەشێکی کەمی لە هەموو دەنگەکانی ئەلفوبێی کوردی و عەرەبی بەکار هێناوە. هەروەها دەنگە تایبەتییە عەرەبییەکانی وەکو: ث، ط، ظ... هتد، وە کوردییەکانی وەکو: پ، ژ، گ،... هتد بەکاری نەهێناون.

لە دیوانی سافی مولەممەعێک بەرچاو دەکەوێ بەچوار زمانی کوردی و تورکی و عەرەبی و فارسی وتوویەتی:

ئەی بادی سەبا هەستە لە حالّم بەوە هوشیار
شەرحی دڵی ماتەمزەدەکەی من بەرە بۆ یار
لەو فیرقەتی ئەو وا ڕەمەقێ ماوە لە عومرم
ئومێدی حەیاتم نییە ڕووحم نەبێ غەمخوار
(آجیلغە دشدی شو غریب گوگلمە هیهات)
(وصلنلە نجات بو لمسە بیچارە کیمی وار)
(کیمسە صورەمز علت عشاقنە هرگز)
(تیمارە سنک بشقەسی یوق زمرەء بیمار)
(لا أمْنَعُ عَنْ قُربْكَ منْ لَوْمَةِ لائم)
(أنْ أصْبرَ في بُعْدكَ قَدْ أحَرقُ بالنار)
(لَوْ جسمي بعيدٌ لَكَ فالروحُ قَريب)
(إنْ تَرْحَمَ بالروحِ وأن تَقَتلَ فاختار)
(من مستم أز ان بادەء صهباء تو لكن)
(اين سرّ تو در جلوەگهی عشق تو هشيار)
(کاشانەء لاهوت بود لائق آن کس)
(مال و سر و جانش کە نهادە بەرە یار)
خۆی کوردییە (سافی) لە هەوای عیشقی تۆ ئێستێ
کوردی و عەرەبی و فارسیی و تورکی بووە ئەشعار



ئەم لیریکە لە نۆ دێڕە شیعر پێکهاتووە، دوو دێڕی سەرەتا و دێری دوایی بەزمانی کوردین، شەش دێڕەکانی دیکە دووانی یەکەمیان تورکی و دووانی دووەمیان عەرەبی و دووانی سێیەمیان فارسییە.

لەم ماوەیەدا سەرتاپای شیعرەکە جارێکی دیکە دەنووسرێتەوە بەوەرگێڕانی دێڕە بێگانەکان بۆ زمانی کوردی.

ئەی بادی سەبا هەستە لە حالّم بەوە هوشیار
شەرحی دڵی ماتەمزەدەکەی من بەرە بۆ یار
لەو فیرقەتی ئەو وا ڕەمەقێ ماوە لە عومرم
ئومێدی حەیاتم نییە ڕووحم نەبێ غەمخوار
(درێغ بۆ ئەو دڵە ئاوارەیەی کە تۆراوە)
(بێچارە کێی هەیە! تەنیا بەدیداری یار دەگاتە ئامانج)
(لە هیچ کاتێکدا کەس لە دەردی عاشقان ناپرسێ)
(بەرەی نەخۆشان لە تیمارکردن بەولاوە هیچیان ناوێ)
(لە تۆوە نزیک بم باکم لە لۆمەی خەڵکی نییە)
(ئەگەر لە دووری تۆ ئارامم بێ بەئاگر دەسووتێم)
(ئەگەر لەشم لە تۆوە دوور بێ گیانم لە تۆ نزیکە)
(بەزەیی هاتن بەگیانم یا کوشتنم بەدەست تۆیە)
(من مەستم بادەی سەهبای تۆیە بەڵام)
(ئەم نهێنییەی تۆ لە جێی جیلوەی عیشقت بەهوشیاری ئاشکرا دەبی)
(مەنزلی لاهووت «خوداوەندی» لایقی ئەو کەسەیە)
(ماڵ و سەر و گیانی خۆی بخاتە بەر پێی یار)
خۆی کوردییە (سافی) لە هەوای عیشقی تۆ ئێستێ
کوردی و عەرەبی و فارسیی و تورکی بووە ئەشعار

جگە لە مولەممەع دیوانی شاعیر کۆمەڵێک قەسیدەی چوارین (ا ا ا ا، ب ب ب ا، جـ جـ جـ ا) و قەسیدەی پێنجین (ا ا ا ا ا، ب ب ب ب ا، جـ جـ جـ جـ ا) دەور دەکاتەوە. هەروەها سافی پێنج خشتەکی هەیە لەسەر غەزەلی ناری و عەونی. هەرچی شیعری

خۆشیەتی شاعیرانی وەکو نووری و سەفوەت و لۆلانی و ئەنوەر و جەریحی و جەمال بەرزنجی و عەونی و بەندی و بێبەش کردوویانە بەپێنج خشتەکی.

## شیعری سافی لە رووی ناوەرۆکەوە

بەگشتی شیعری سافی لە رووی ناوەرۆکەوە دڵداری و وەسف چوونەتە ناو یەکترییەوە، هەندێ جاریش بەتەنیا دەکەونە روو، شاعیر دلبەر و یارێکی دیاریکراوی نییە. هەردوو سیفەتی ژن و پیاو لە دڵدارییەکەیدا بەرچاوە. سافی هەوڵ دەدا خۆشەویستەکەی بخاتە ناو گێتیی سۆفیزمەوە، بەڵام نەچۆتە ناو ناخی چوارچێوەی سۆفیزم و داهێنانی نییە وەک شێوازی رۆمانتیکییانە و سیمبۆلییانەی جەلالەدینی رۆمی و مەلای جزیری و مەحوی، بەڵکو لە وەسف و پێ ناسین و لێکدانەوە و بەکارهێنانی زاراوەی سۆفیزم سەرکەوتووە.

سافی بەلای مەبەسەکانی دیکەی شیعری کلاسیکی نەچووە، وەک موناجات و نەعت و ستایش و داشۆرین و ئەوانی دیکە. زاراوە و لێکسیکۆنی سۆفیزم لە شیعریدا هەیە، ئەگەر بەگشتی مانای شیعری لێک بدرێتەوە زیاتر دەشکێتەوە سەر عیشقی مەجازی نەک عیشقی حەقیقی. هەرچەندە تەریقەتی لەگەڵ شەریعەتدا گونجاندووە کە بەڕاستی لە دژی یەکترین، بەڵام تا ڕادەیێک شەریعەتی پشتگوێ خستووە.

سافی شاگردێکی زیرەکی قوتابخانەی نالییە. کاری مستەفا بەگی کوردی روون و ئاشکرایە بەسەر هەندێ لە شیعرەکانی، دەڵێی ئەو ئامێرە مۆسیقییانەی ئاوازیان بۆ شیعری کوردی داناوە هەر ئەوانەن سافیش بەکاری هێناون. سەرەڕای ئەم هەموو جوانکارییەی لە شیعری سافی کۆبوونەتەوە یادی شێخ عەبدولقادری گەیلانی سەرانسەری دیوانی داگیر کردووە.

## نموونەی شیعری سافی

ئەدگار و خاسیەتی شیعری سافی لە مەبەسی غەزەلی دڵداری و وەسف نەچۆتە دەرەوە. شێوازی لاساییکردنەوەی قوتابخانەی غەزەلی نالییە لە رووی روخسار و ناوەرۆکەوە، وەک قوتابییێکی زیرەکی ئەو قوتابخانەیە سافی یەکێکە لە شاعیرانی نەوەی دووەم یا سێیەمی ئەو قوتابخانانەیە و لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەم نوێ کراوەتەوە.



١

لە غەزەلێکیدا بەم شێوەیە هەستی گیانی خۆی دەردەبڕێ:

دڵ لە بۆ مەحبووبە ئێستا گریە وو زاری دەکا
وا لە هەردوو چاوەکانی خوێن و ئاو جاری دەکا
وا سەراسەر رووی زەمینی گرتووە خوێناوی ئەشک
دوودی ئاهیش رۆژی پۆشی و ئاسمان تاری دەکا
زۆر بەئازارە دڵی زارم لەبەر هیجرانی یار
ناحەقە ئەو عالەمە لەو زارە بێزاری دەکا
مەرحەبایێکم بکا بۆ دڵفرێبی منیەتی
وەرنە ئەو بێ رەحمە کەی بۆ عاشقان یاری دەکا
رێی موسوڵمانی لە دڵ نێشت پەرچەم و ئەگریجەکەی
بۆیێ ئێستێ وا بەیادی زولفی زینناری دەکا
چاوەنۆڕی یارە بۆیێ رێگە دەڕشێنێ بەخوێن
عەیبی لێ مەگرە کە ئەو بێچارە خوێنباری دەکا
قەت مەڵێن یار بێ وەفایە وا بەناحەق دەیکوژێ
بیکوژێ یا نەیکوژێ (سافی) فیداکار دەکا

ئەم یارەی شاعیر هەیوولایێکی نادیار و بێ ناسنامەیە. لە بەشی یەکەمی غەزەلەکەدا شاعیر پەرێشانە لەبەر دووری ئەو یارە، گریان و فرمێسکی خوێنین، دووکەڵی ئاه و هەناسەی ئاسمان دەکا بەتاریکستان. ئەگەر لێی بپرسێتەوە دەگەشێتەوە، بەڵام کەی یار ئاوڕ لە عاشقان دەداتەوە! شاعیر هەوڵ دەدا شێوازێکی سۆفیزم بئاخنێتە ناو شیعرەکەوە کە باس لە رێوڕەسمی شەریعەتی ئیسلام و زیننار (پشتێندی) مەسیحییان دەکا.

٢

لە غەزەلێکیدا دیسانەوە لە دووری یار دەدوێ:

دڵ لەبەر دەردی فیراقی یارە مەیلی مەی دەکا
گوێی لە دەنگی ساز و عوود و بەزمی نای و نەی دەکا

سەردەمێ مەست و خومارە خادیمی مەیخانەیە
وەختی تەسبیحی لە دەستە سۆفییە حەی حەی دەکا
ڕۆژی وایە هەر بەکەیف و پێکەنین و خەندەیە
بەعزە جار مەجنوونە دایم گریە بۆ لەیلەی دەکا
بەعزە جاران عالیم و عامیل و عابید خۆیەتی
وەختی جەهل و فیسقی زۆرە عالەمی لۆمەی دەکا
پێی دەڵێم ئەی دڵ وەرە ئێرانی یا تورانییە
ئەو لە بەینی هەردوو جێگە ڕوو لە دەشتی ڕەی دەکا
دڵ نزانم شێتە یا سەرخۆشە یا دێوانەیە
یا ئیلاهی ئیشی وا عەکسی بەمن تاکەی دەکا
دوورە لە یارە دڵ لە بۆیی بێ سەباتە (سافی)یا
تاکو لەم سەگ مەرگەدا بێ ئیختیاری وەی دەکا

هۆی ئەو شێتییەی شاعیر تووشی بووە دووری لە دلبەرە. سافی وەسفێکی وردی فەلسەفەی سۆفیزم دەکا وەک ڕێبەری ئەوپەڕی ئازادی و سەربەستی و داهێنان. سۆفیزم لە ئەنجامی تەنگوچەڵەمە و ناهەمواری لە ژیانی ئادەمزاددا دروست بووە بۆ ئەوەی لە ناوی ببا. ئەمە بە سەربەستی نەبێ نابێ بۆیە کابرای سۆفی عەرەقخۆرە، بەدەم مۆسیقا و گۆرانییەوە هەڵپەڕکێ دەکا. دەمێک مەیخانە چییە، دەمێکی دیکە تەسبیحی بەدەستەوەیە حەی حەی دەکا. دەمێ خەندە و پێکەنینە، دەمێکی دیکە گریان و واوەیلایە. دەمێ زانا و دانایە، دەمێ بێ سەودا و نادانە. ئەوجا شاعیر لەگەڵ دڵی قسە دەکا و پێی دەڵێ، وەرە ببە بەئێرانی یا تورانی، واتە نەژادی سپی ئاری یا نەژادی زەردی تورکی – مەغۆلی، بەڵام ئەو ڕوو دەکاتە مولکی ڕەی، بەمانای ئەوەی دان بەنەژاد و خوێن و بنەماڵە و عەشیرەت نانێ. لە ئەنجامدا سۆفیزم شێتی و سەرخۆشییە. ئەمە تیۆریی بنچینەیی فەلسەفەی سۆفیزمە لە شەریعەت جیای دەکاتەوە، چونکە شەریعەت قانوون و دەستووری بۆ ژیان داناوە لە سەرەتاوە تا دوایی، واتە لە سەرەتای ژیانی سەر زەوییەوە تا ڕۆژی قیامەت بەمەرجێک نابێ دەسکاری بکرێ.



### ٣

دووری لە یار سەرچاوەی ئیلهامی شاعیرە:

لەبەر مەیلی مەیی عیشقی تووە یاری وەفادارم
لە تەکیە و خانەقا دەرچووم خەریکی دەیر و زیننارم
لە حوببی تۆ لە لای ئەو عالەمە کافر بووم گەرچی
کە نازانن لە عەینی کوفرەوە ئیسلامییە کارم
ئەگەر سەد جار دەرم کەی قەت بەبێ تۆ سەبرەکم نایێ
بەزۆری دێمەوە دەرگانەکەت ئەی دۆست ناچارم
لە بەدکرداری من ڕوو وەرمەگێڕە ئەی شەهی خووبان
کە تۆ ڕوو وەربگێڕی کەس نییە گەر بێتە غەمخوارم
لە دووریت لەززەتی من پایە ماڵی زیللەتە هەردەم
حەیاتم بێ جەمالی تۆ مەماتی ژینە ئەی یارم
ئەگەر شەمعی ویساڵی تۆم نەبێ ڕۆژم شەوی تارە
بینایی نووری چاوانم ئەتۆی ماهی زیادارم
ئەوەندەم عیجز و شادی وەسڵ و هیجران دیوە ئەی یاران
لە ڕۆژی حەشردا ئەسلا نە حاجەت جەننەت و نارم

ئەم غەزەلەش وەکو ئەوەی پێشوو لە بزووتنەوەی ناوەوە و سەربەستیی بیر دەدوێ. سافی دڵداری دەکا بەبەهانە لە پێناوی عیشقی یار. لە تەریقەت لادەکەوێ نەک تەنیا قادری کە تەریقەتی خۆیەتی بەڵکو لە نەقشبەندی و لە تەکیە و خانەقاشیان دوور دەکەوێتەوە و دەبێ بەمەسیحی. شاعیر ئاماژەی هەیە بۆ دڵداری خوسرەوی پەروێز و شێخی سەنعان ئەوانە کەوتبوونە ناو داوی دڵداری کچە مەسیحی. بەلای سافییەوە ئەگەر لەبەر دڵداری دیانیشی پێ بڵێن کارەسات دروست نابێ چونکە لە ڕاستیدا موسوڵمانە، هەردوو ئایینیش باوەڕیان بەخودا هەیە.

وێنەکانی دیکەی ئاساییین لە شیعری کلاسیکیدا، وەکو ڕوو وەرگێڕانی دلبەر لە دڵدار، دەرکردنی، دوورکەوتنەوە لێی، دلبەر نازانی نزیکبوونەوەی لە دڵدار ڕووناکییە بۆی. شاعیر ئەوەندە خۆشی و ناخۆشی دیوە پێویستی بە بەهەشت و دۆزەخ نییە. بینینی یار یا جیلوەی کردگار (بینینی کردگار) وا هۆشی شاعیری بەنج کردووە دەمی بێدار و دەمێ

هوشیارە. لەم هەڵوێستەدا ئاماژە هەیە بۆ موناجاتی مووسا لەسەر کێوی توور (حۆریب)، نووری خودا دەبینێ و خۆی نابینێ.

ئەو ئاماژە سۆفیزمییانەی سافی ناچنە ناو داهێنانی ڕۆمانتیکی – سیمبۆلی ئەدەبی سۆفیزمەوە، بەڵکو وەسف و لێکدانەوە و ڕوونکردنەوەی هەندێ لە ئەدگار و سیماکانیەتی.

٤

یار هەمیشە لە شاعیر زیز و لالووتە و قەت لەگەڵیدا نییە:

یاری خۆم لێ زیزە بۆیە حەز لە مەرگی نەو دەکەم
شەو کە بێهۆشم لە تاوی وامەزانە خەو دەکەم
ڕۆژ بەیادی ڕووی هەتا هێوارە هەر هاوارمە
شەو لە فیکری زولفی تا سوبحەینی سوحبەت لەو دەکەم
بۆ شکاری مورغی وەحشی نەک هەڵۆ وو شاهینم
عیشقی چاوی بازی خۆمم بۆیە ڕاوی کەو دەکەم
لەو دلارامە بپرسن وا دڵ ئارامی نەما
جارێکی چارێکی دەردم کا دەخالەت بەو دەکەم
گوێم لە ساز و عوود و نەی چاوم لە ساقی و بادەیە
خادیمی پیری موغانم بۆیە وا پەیڕەو دەکەم
سەرف و سوودی نەقدی دڵ لەم عالەمە بێ مایەیە
تا بەکەی بێ فایدە سەرفی گەنجی کەیخوسرەو دەکەم
(سافی)یا کافیمە بۆ دونیا و قیامەت یاری خۆم
چیم لە باسی عالەمە هەر زیکری ناوی ئەو دەکەم

ئەگەر هەموو کات یار لە شاعیر زیز نەبێ و لێی دوور نەبێ، وێنەی شیعری و هەست و نەستی ناوەوەی لە کوێ بێنێ! هەمیشە بیر لەو دەکاتەوە. ناوی ئەندامی لەشی دەبا، وەکو زلف بەڵام وەسفی ناکا. ئیتر لە ناو زاراوە و وێنە شیعرییە داهێنراوەکانی پێش خۆی دەسوورێتەوە، هەندێ جار وێنەی نوێ دروست دەکا، هەندێ جاریش دووبارەکردنەوەی وێنە دروستکراوەکانی پێشووە.



٥

لە غەزەلێکیدا شاعیر ئەندامە مەتریالییەکانی یار دەبینێ:

لەو ڕۆژە لە عیشقی یار سەودایی سەرێکم بوو
ئەمما بەسەبەب ئەغیار بۆ جان خەتەرێکم بوو
سەرمەشقی خەت و خاڵی ویردی دڵ و دینی من
بۆ ئایینی شەب خێزی زیکری سەحەرێکم بوو
لوتفەن چ دەبێ جانا ئیمڕۆکە نەوازیم کەی
دوێنێکە لە باغی ڕووت حیسسەی سەمەرێکم بوو
نەقدی ڕوحەکەم بۆ نارد کالایی وەفاکەی بێ
توحفێکی جەفاکەی هات هەر لا زەرەرێکم بوو
ئەی کاشی شەوی هیجران بووبا بە سەباحولخەیر
چونکێکە لە ڕۆژی ڕووی مەیلی نەزەرێکم بوو
لەو پەرچەمی شێواوی داوی دڵی داناوە
بەو غەمزەیی دوو چاوی کون کون جیگەرێکم بوو
گوڵزارە لە گوڵزاری بۆ غونچە گوڵی زاری
گوڵ کەوتە شەکەر باری وا گوڵ شەکەرێکم بوو
نوقتەی دەمی مەوهومە ئەو حیکمەتە مەکتوومە
ئەغیار لەوە مەحرومە بەس من خەبەرێکم بوو
ڕووی شەمسی و شوهوودە خال نوقتێکی سوەیدایە
لەم دوو ئەسەرە (سافی) نووری بەسەرێکم بوو

لەم شیعرەدا سافی یادی چەند ئەندامێکی یار دەکاتەوە: خەت و خاڵی، باغی ڕوخساری، ڕۆژی ڕوومەتی، گوڵی زاری، نوقتەی دەمی مەوهوومی. وەسفی ئاسایی ئەم ئەندامانە ناکا، لە هەر یەکێکیاندا سیفەتێک دەدۆزێتەوە، حیکمەتێکی لێ وەردەگرێ.

٦

«بێ تۆیی» واتە دووری، دوودڵی و بێ ئۆقرەیی هەموو کات و سەردەمێکی سافییە، لە غەزەلێکیدا موناجات لەگەڵ یار دەکا:

حەبیبا دڵ گەڵێ بیماره بێ تۆ
لەبەر دووریت لە ڕووح بێزاره بێ تۆ
فەرامۆشی نییە بەو خەڵکە ئیستێ
لە لای نەقشێکی ڕووی دیواره بێ تۆ
هەمووده‌م وا لە گۆشەی بێکەسی دا
بەشێن و زاریی و هاواره بێ تۆ
ئەگەر فەرمووی چلۆن ماوە ئەمێستێ
لە ئەم سەگ مەرگییە بێعاره بێ تۆ
شەوی هیجران لە بەختی دڵ درێژه
کە ڕۆژی تالیعیشی تاره بێ تۆ
کە شادی دوژمن و غەم دۆستە قوربان
جەفا یار و وەفا ئەغیاره بێ تۆ
غەمی خۆی بەس بوو (سافی) وا ئەمیستێ
دڵی غەمباریشی سەرباره بێ تۆ

ئەم غەزەلەی سافی لە کێش و قافیەی غەزەلێکی نالی هۆنراوەتەوە «نەمردم من ئەگەر ئەم جارە بێ تۆ...». لەم شیعرەدا سافی لە ناو خەیاڵی نالی تواوەتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا دەستدرێژی نەکردۆتە سەری بەڵکو بووە بەسەرچاوە بۆ داهێنانێکی نوێ. بەم جۆرە لیریکێکی ناسکی مانا لەڕووی لێ دروست بووە، وەکو شیعرەکەی نالی.

## ٧

لە شیعری پێشوودا سافی باس لە بێ یاری نازدار دەکا چونکە لێی دووره، لە لیریکێکی دیکەیدا هاواری لێ هەڵساوە و بانگی دەکا:

شیفتەیی نووری جەمالم ماهی تابانم وەره
ئارەزووی شەهدی ویساڵم جانی جانانم وەره
ڕۆژی عیده چاوەڕێتم بێی بەقوربانیم بکەی
کوشتنیشت ڕەحمەته سەد جار بەقوربانم وەره
بێ دەوایی وەسڵەکەت دەردم عیلاجی ناکرێ
دەردی بێ دەرمان هەتا کەی دەرد و دەرمانم وەره



من غەریبی تۆمە ئومێدم بەهیچ دەرگا نییە
چاوەڕێی ئیحسانی تۆمە شای غەریبانم وەره
وا دڵ و دینم لە ڕێی عیشقی تۆ فەوتا چاوەکەم
خۆشی ڕووی تۆم کافییە بۆ نووری ئیمانم وەره
بۆ هەواڵ پرسی نەخۆشی خۆت چییە گەر یەک دەمێ
یا لەبەر خوا یا لەبەر ڕەغمی ڕەقیبانم وەره
کەوتمە نێو حاڵی هەلاکەت وا لە دەردی دووری تۆ
مەمکوژە بەو دەردە سەد جار دەست و دامانم وەره
ئاووری عیشقت وەها سووتاندووە کۆگای دەروون
من غەریقی مەوجی خوێنم سینە بریانم وەره
(سافی) تا ڕۆژی قیامەت هەر دەناڵێنێ و دەڵێ
تا نەفەس ماوە لە قەلبم یاری پەنهانم وەره

سافی بەجۆرێ شپرزە بووە، یار هەرچەندە دڵیشی ڕەق بێ پێویستە لێی بپرسێتەوە. لە جەژنا دوژمن لەگەڵ یەکتری ئاشت دەبنەوە، لە نەخۆشیدا نەیار لە نەخۆش دەپرسێ و سەری لێ دەدا. چۆن دەبێ ئاشقێک شێت و شەیدای یارێک بێ و لێی نەپرسێتەوە. لە دواییدا هاواری لێ هەڵدەستێ و لە یار دەپاڕێتەوە بێتە لای و لێی بپرسێ چونکە خەریکە ئەم گێتییە بەجێ دێڵێ. لەم لیریکەدا کێش و قافیە و هەندێ لە خەیاڵی سۆفییانەی مستەفا بەگی کوردی لە گوێی خوێنەر دەزرنگێنێتەوە.

## ٨

لە غەزەلێکیدا بەسەرهاتی دڵداریی خۆی لەگەڵ جوانی یووسف و عیشقی زولەیخا بەراوورد دەکا:

عەزیزێکم هەیە ئیسم و بە جیسما یووسفی سانی
هەزاری وەک زولەیخا حەبسی نێو چاهی زەنەخدانی
لە سەد فەرسەنگەوە بۆ چاوی نابینا زیان بەخشە
هەزارانی وەکو یەعقووب لە بۆنی عەتری زولفانی
لە نێو خاکی عەجەم تاکو عەرەب سەرحەددی ڕۆم و کورد
شەهی وا نابێ ئەسلا ساحیبی موهری سلێمانی

بەئینساف گەر تەماشاکەن سەراسەر عەیبی لێ نایێ
جەمالی یاری من بۆ ئەهلی دڵ گەنجێکە پەنهانی
لە بۆ فەرمانی یارم هەرچی گەردن کەچ نەبێ یاران
لە ژێر پێی جەهلەوە سەر دادەنێ وەک شێخی سەنعانی
مەتافی سالیکان و ڕەهنوما وو کەعبەیی عوششاق
دەربازی خودا کانی وەفا سوڵتانی گەیلانی
ئەگەر سوڵتانی دونیا بێ گەدای دەرگانەکەی تۆیە
بەنازی خۆت نیازی پێ کەرەم کە (سافی) هیرانی

لەم شیعرەدا سافی باس لە یارە عەزیزەکەی دەکا. وەک دیارە ئاماژەیە بۆ عەزیزی میسریش (بووتیفار). ئەم خۆشەویستەی لە پەیکەری یووسف بەرجەستە بووە و ناوی ناوە یووسفی دووەم، یەکەمەکەیان زولەیخای ژنی عەزیزی میسر گرفتاری بووە. لە لایێکی دیکەوە ئاوڕ لە پێوەندیی باوک و کوڕ، یەعقووب و یووسف دەداتەوە. ئەگەر لە جێگەیێکی یەکجار دوورەوە بۆنی یووسف بێ هەزاران کوێری وەکو یەعقووب چاویان دەکرێتەوە. یار هەموو لایێکی گێتیی گرتۆتەوە، لە هەموو جێگەیێکدا هەیە، هەموو کارێکی بۆ دەچێتە سەر ئەنگوستیلەی سلێمان لە ئەنگوستی دایە.

وێنەی دیکەش لەم لیریکەدا دەدۆزرێتەوە، وەکو یادکردنی سۆفییە گەورەکانی گێتیی سۆفیزم، شێخی سەنعان و شێخی گەیلانی بەشێخ عەبدولقادر دەڵێ: ئەگەر سافی ببی بەسوڵتانی هەموو گێتیش، هێشتا هەر گەدای تۆیە و مەقامی گەورەتر دەبێ.

**٩**

سافی سێ قەسیدەی چوارینی هەیە، هەریەکەیان لە حەوت بەند (کووپلە) پێکهاتووە، بەکێش و قافیە و پاش قافیەوە لە قەسیدە چوارینە بەناوبانگەکەی بێخود دەکەن «لەو ڕۆژەوە ڕۆیشتووە تۆراوە دڵی من...». – لە بەرگێکی دیکەی ئەم کتێبەدا باسی لێوە دەکرێ – بێ گومان ئەم دوو شاعیرە لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم ژیاون و ئاگایان لە یەکتری بووە و یەکتریشیان ناسیوە. لە بارەی کارلێکردنی یەکێکیان لە ئەوی دیکە، یا کامەیان قەسیدەکەی پێش ئەویتر وتووە، ئەمەیان ئاشکرا نییە. هەرچۆنێ بێ ئەم ڕێزە قەسیدە پڕ لە ئاهەنگ و سۆزی ونبوون و لێک دابڕان و دوورکەوتنەوە دیوانی شیعری کوردییان ڕەنگین کردووە:



جانا لە فیراقی تۆ پەشێواوە دڵی من
پەروانەیی شەمعی تووە سووتاوە دڵی من
سەر تا بە قەدەم غەرقەیی خوێناوە دڵی من
وەحشی سیفەتە بەستەیی نێو داوە دڵی من

دڵ ئەلبیسەیی خوێنی هەموودەم کە لەبەردا
دەیزانی فەلەک کینەیی وی ماوە لە سەردا
چەند عاشقی کوشتوونە وو خوێنی بەهەدەردا
لەم تالیعە بەرگەشتەیە چۆن ماوە دڵی من

دایم کە لە دەست جەوری زەمانە بە وەفایە
پەیوەستە بەجەور و ئەلەم و دەرد و بەڵایە
بۆ عاشقی بێچارەیە ئەو عادەتە وایە
بۆیێ کە لە گۆشەی غەمە داماوە دڵی من

تابووری بەڵا وا لە دوولا هاتووە یاران
بۆ قەتلی سەری عاشق و مسکێن و هەژاران
مەعلوومە کە دەرناچێ لەبەر تیری سواران
سەد دەفعە لە ئەم قازوخەیان داوە دڵی من

سەرقافیلەچی دەستی منت دامەنە قوربان
ماژۆ بەعەجەل مەحمەلی لەیلا بەهەموو ئان
مەجنوون سیفەتان ماوون و لەم ڕێگە پەرێشان
بێچارە لە یارانی بەجێ ماوە دڵی من

دایم لە هەوایی تۆ گەلێ حاڵی پەشێوە
هەردەم لە جەفایی تۆ ئەوا کەوتووە جێوە
ئەم قوڕ بەسەرە ڕووحی گەیشتە سەری لێوە
دەرمانی بکە تاکو نەفەوتاوە دڵی من

ئەی بادی سەبا قاسیدی جانانی ڕوح ئەفزا
نامەی غەم و دەرد و ئەلەمم بۆ بەرە بەغدا
تا چەند لە ئەم میحنەتەدا بێ سەگی دەرگا
مووِدێکە وەکو (سافی) کە شێواوە دڵی من

شاعیر دووەمین قەسیدە چوارینەکەی بەم بەندە دەست پێ دەکا:

جانا لە غەمت واله وو حەیرانە دڵی من
سەرگەشتە وەکو وەحشی لە کێوانە دڵی من
دایم لە دەرودەشت و بیابانە دڵی من
موشتاقی ویساڵی ڕوحی جانانە دڵی من

بەم بەندەش کۆتایی پێ دێنێ:

عەبدێکی وەفادار و جەفاکێشە لە هیجران
وا کەوتووە وەک (سافی) لە دەرگانەیی گەیلان
بەم دەردی سەرە کوشتنی لازم نییە قوربان
لەم جێژنەیی قوربانە کە قوربانە دڵی من

سافی سێیەمین قەسیدە چوارینەکەی بەم بەندە دەست پێ دەکا:

موودێکە لە هیجرانی تۆ شێوایە دڵی من
سەرگەشتە وو بێچارە وو ڕیسوایە دڵی من
پەیوەستە لە کێوان و لە سەحرایە دڵی من
مەجنوون سیفەتە مائیلی لەیلایە دڵی من

بەم بەندەش کۆتایی پێ دێنێ:

بێ ڕەحم و وەفایی بەسە ئەی یاری وەفادار
شەیدا بی هەوایی تووە ئەو (سافی)یی بیمار
پابەندی دوو سەد غەم بووە لەو لۆمەیی ئەغیار
جێی چارەسەری دەرگەیی بەغدایە دڵی من

سافی لەم قەسیدانەدا وێنەی فرمێسک و زاراوەی ماتەم و لێکسیکۆنی ماتەمنامەی کلاسیکی بەکار هێناوە، هەوڵیداوە بە بۆیاغێکی تەنکی زاراوەکانی سۆفیزم ڕەنگرێژی بکا. تا ئێستا نەزانراوە ئەو کەسەی سافی ئەم ڕێزە شیعرەی بۆ داناوە و شێوەنی بۆ دەکا کێیە! ڕەنگە هەر لە بنەڕەتدا هیچ ڕووی نەدابێ و بۆ کەسیش نەوترا بێ بەڵکو شاعیر بەخەیاڵ دروستی کردبێ و لاسایی بێخودی کردبێتەوە، کەچی قەسیدەکەی بێخود بۆ مردنی کەسێکی دیاریکراو وتراوە.



کاک مستەفای هیرانی (سافی) لەو شاعیرانەیە لەسەر یەک بابەت و شێواز ڕۆیشتووە لە شیعر داناندا. هەوڵیداوە بەشاعیری فەلسەفەی سۆفیزم بناسرێ، بەڵام بووە بەشاعیری وەسفی سۆفیزم. وشە و زاراوە و وێنەی شیعری زانیاریی سۆفیزمی بەکار هێناوە. لە بیروباوەڕی دەروێشیدا هەوڵیداوە «تەریقەتی دەروێشی» لەگەڵ ئایین (شەریعەتی ئیسلامی) بگونجێنێ، کەچی ئەم دیاردەیە لە شیعریدا نابینرێ. شاعیر سوورە لەسەر ئەوەی بەسۆفی بژمێررێ بۆیە لە شیعری ئیلاهییات و موناجات و نەعتی سەر بەشەریعەت و حوجرەی مەلای مزگەوت دوور کەتۆتەوە. خەیاڵ و چێژ و هونەری خۆی بۆ بابەتێکی دیاریکراو خەرج کردووە کە دڵدارییە. لە بەرهەمی شیعریدا عیشقی حەقیقی و مەجازی بەڕووکەش تێکەڵ بەیەکتری کردووە.

## بەشی چواردەم

### حەسەن (سەیفولقوزات)

### ١٨٧٧ - ١٩٤٤

قسەی خۆم دەکەم کورت و کرمانجی
(حەسەن) کرمانجە چی لە دیلمانجی

### ژیانی حەسەن

حەسەن کوڕی میرزا قاسمی قازیی سابلاغی لە ساڵی **١٨٧٧** لە شاری سابلاغ (مەهاباد) لە دایک بووە. باوکی مەلا و خوێندەوار و قازیی شار بووە. لە سەرەتادا پێویستییەکانی خوێندنی قورئان و فێربوونی نووسین و کتێبە وردەکانی بەرنامەی حوجرەی مزگەوتی تەواو کردووە. ئینجا زانستییەکانی ئایینی ئیسلام و زمانی عەرەبی لە مەلایانی وەک مەلا شەفیع لە ئاوایی عەبنار – گوندێکە لە نزیک بۆکان – و مەلا حەسەنی قزڵجیی بۆکانی و مەلا ساڵحی سەرداباتی و مەلا سلێمانی کەندی وەرگرتووە. پلەکانی خوێندنی حوجرەی مزگەوتی تەواو کردووە. کە گەیشتۆتە ئەوەی ژیانی خێزانی بۆ خۆی ساز بکا ماڵی گواستۆتەوە گوندی گوێگجەلی لەسەر ڕووباری چەختوو لە نزیک میاندواو. ئەم گوندە لە ئاقارێکی سروشتی جواندا بووە، دار و درەخت و دارستان و باغ و باغات خوڕەی ئاو جۆرە بەهەشتێکی سەر ڕووی زەوییان دروست کردووە. شاعیر بەهۆی دەوڵەمەندییەوە گوزەرانی باش بووە، ماڵداری کردووە و خاوەن زەوییوزار و مەڕوماڵات بووە، بایەخی بەکشتوکاڵ داوە.

ژیانی شاعیر ئاسان بووە، بەشادی و بەختیاری بردوویەتییە سەر، هەرچی ئارەزووی کردبێ بەبێ گیروگرفت دەستی کەوتووە. دیوەخانی جێی خوێندەوار و ڕۆشنبیر و شاعیران بووە. بەشەوان لە دیوەخانیدا باسی هەموو شتێک کراوە، هەواڵ و ئاگا و ڕووداو و سەر و سەربردەی کۆن و تازە بەتایبەتی شیعر و ئەدەب، خوێندنەوەی شیعر، شیعر شیعرێن، گێڕانەوەی بەسەرهاتی شاعیرانی کۆن و سەردەم شەوچەرە و ناوەڕۆکی ئەو قسانە بوون کە لە کۆڕەکانی ماڵی حەسەن باس دەکران.

لە ناو خێزانی شاعیر زمانی قسەکردن تەنیا زمانی کوردی نەبوو، زمانی تورکی جێی



دیاری هەبوو بەهۆی ئەوەی پێوەندییان لەگەڵ ئازربێجانییان بەهێز بوو. نابینی حەسەن خۆی ئاماژە بەو پێوەندییە دەکا کە بەتورکی دەڵێ «سزنکی و بزمکی» واتە (هی ئێوە و هی ئێمە) بەمانای ئەوەی لە ماڵیدا هەردوو زمانی کوردی و تورکی لە گۆڕێ بوون و بەکار دەهێنران.

حەسەن لە ژیانی تایبەتیدا ئارەزووی لەوە بووە بەشی خۆی لە خۆشی و بەختیاری وەربگرێ، چاوتێر و دڵسۆز بووە، برادەرایەتی لەگەڵیدا خۆش بووە، لەگەڵ هەندێکیان گەیشتۆتە پلەی خۆشەویستی و لە ئەڤینی سۆفیزمی نزیک بۆتەوە. یەکێک لەو برادەرانە عەزیز ئاغای عەباسی بووە. خۆشەویستییان سەرچاوەیێکی گرنگ بوو بۆ دانانی کۆمەڵێک شیعر وەک نامە هۆنراونەتەوە. ئەم بەرهەمانە بوون بەنموونەیێکی بەرز و جوان لە ئەدەبی نامە نووسین لە نێوان برادەرانی خۆشەویست لە ئەدەبی کوردیدا، هەروەها پێوەندی لەگەڵ عەلی بەگ سالارسەعیدی حەیدەری (برای عەبدوڵڵا بەگی ئەدەب) بەهێز بوو.

حەسەن هەوەسی لەگەڵ تەریقەتی دەروێشی هەبوو، خۆی بەسۆفیی شێخ شەمسەدین یووسفی بورهانی نەقشبەندی دەزانی. هەموو ساڵێک زیارەتی خانقای گوندی شەرەفکەندی دەکرد و ماوەیێک لەوێ دەمایەوە.

شاعیر گەشتوگوزاری پێ خۆش بووە، بەزۆری سەفەری تاران و تەورێز و ورمێ و ئاوەدانییەکانی دیکەی عەجەمستانی بووە. هەموو ژیانی لە گوندی گوێگجەلی بردۆتە سەر و ناوی تایبەتی خۆی «حەسەن»ی وەکو نازناو لە بەرهەمی شیعریدا بەکاری هێناوە. لە ساڵی ١٩٤٤ کۆچی دوایی کردووە و لە خانەقای شێخی بورهان بەخاک سپێرراوە.

### شیعری حەسەن

#### لە ڕووی ڕوخسارەوە

حەسەن هەردوو کێشی عەرووزی و سیلابی خۆماڵی بەکار هێناوە. زۆربەی شیعری لەسەر بەحری عەرووزن. لەمەشدا تەنیا سێ بەحری هەزەج و موزاریع و ڕەمەلی بەکار هێناوە. لەبەر کەمی بەرهەمی تەنیا دەنگەکانی «ا، ت، د، ر، ز، ش، ق، م، (ە – ـە)، و، ی، ێ»ی ئەلفوبێی کوردی و عەرەبی لە شیعریدا بەکارهاتوون.

بەپێی بابەت و هونەرەکانی شیعری کلاسیکی بەرهەمی حەسەن لە سێ بەشدا دەبینرێ:

١- غەزەل: ئەم جۆرە شیعرە لە بەرهەمیدا بەقەوارە لە پێنج دێڕەوە تا دوازدە دێڕ پێکهاتوون، یەکێتیی کێش و قافیەیان تێدایە.
٢- قەسیدە: بەشێکی دیکە لە بەرهەمی بەقەوارە لە دوازدە دێڕ زیاترن، ئەمانەش وەکو غەزەل یەکێتیی کێش و قافیەیان تێدایە.
٣- مەسنەوی (جووت قافیە): برێکی تر لە بەرهەمی لەسەر بنجی جووت قافیە دانراون (ا ا، ب ب، جـ جـ...).

بەگشتی قەسیدەکانی حەسەن لە هەردوو بابەت، یەکێتیی قافیە و جووت قافیە (مەسنەوی) بەژمارەی دێڕی شیعر درێژن. لە بیست دێڕی شیعرەوە تا نزیکەی نەوەد دێڕ شیعر بەرچاو دەکەون. ئەو شیعرانەی درێژن وەکو بەیت و بالۆرەی ئەدەبی میللی نەنووسراو لە ئەدەبی کلاسیکی نووسراو خۆیان دەنوێنن.

لە ئەدەبی کوردیدا بەگشتی ئەم جۆرە قەسیدە درێژانە لەسەر سیستێمی شیعری جووت قافیە (مەسنەوی) دادەمەزرێن، بەلام حەسەن شیعری زۆر درێژی هەیە لەسەر سیستێمی یەکێتیی قافیە رێکی خستووە و توانیویەتی وشەیێکی زۆر بدۆزێتەوە لەسەر یەک کێش و قافیە (رەوی) بەمەرجێ لە شیعرەکەدا دووبارە نەبنەوە. ئەگەر دووبارەبوونەوەش هەبێ هەر یەکێک لە وشەکان دەبێ مانای جیاواز بێ لەگەڵ ئەوی دیکە.

## لە رووی ناوەرۆکەوە

بەشێک لە مەبەسەکانی شیعری کلاسیکیی شاعیر لەگەڵ هەندێ ناوەرۆکی نوێ بەجووتە لە شیعریدا رەنگیان داوەتەوە، بەلام ئەو لەسەر رێگە و شوێنی کۆنەکان نەرۆیشتووە بەڵکو زۆربەی مەبەسەکانی تێکەڵ بەیەکتری کردووە، لەمەدا کارێکی باشی کردووە چونکە لەگەڵ رێبازی شیعری ئەو دەمە رێک کەوتووە بەوەی مەبەسی شیعری لە قاووغی تەسکی چوارچێوەی کلاسیکی دەربهێناوە و بەشێوەی لیریکی تازە بابەت خستوویەتییە روو.

مەبەسە کۆن و تازەکان لە شیعری حەسەندا وەکو لای خوارەوەیە:
١- شیعری ئایینی (نەعت و موناجات و ستایشی پێغەمبەران و ئەولیایان) لەگەڵ مەبەسی تازەی وەک سیاسەت و نیشتمانپەروەری و کوردایەتی تێکەڵ بەیەکتری کردووە.



٢- شیعری دڵداری و وەسف بەرۆخسار و ناوەرۆک وەکو خۆی لە بەرهەمی شاعیر ماوەتەوە، ئەوەندە هەیە داهێنانی تێدا دەست خستووە لە رووی وێنەی نوێ و زمانی کوردی پەتی و لێکسیکۆنی ناوچەیی دیالێکتی موکریانیی کرمانجیی باشوورەوە.
٣- لە شیعری هاوچەرخی بیری کوردایەتی حەسەندا هەست بەبۆرە گیانێکی شیعری میللیی سەرزار دەکرێ. شاعیر ناوەرۆکی دانایی و پەند و ئامۆژگاری بەشێوەییێکی ئاسان و زمانێکی سووک و پاراو دەردەبرێ. لەبەرئەوە ئەم جۆرە شیعرەی نزیک دەکەوێتەوە لە شیعری فێرکردن و پەروەردەیی (دیداکتیکی).
٤- لە شیعری نامەی دۆستایەتیدا حەسەن دەستێکی باڵای هەیە. لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا ئەم جۆرە شیعرە کەمە. شاعیر بەو کۆمەڵە شیعرەی ئەم ناوەرۆکەی گرتۆتە خۆ ئەدەبی کوردی دەوڵەمەند کردووە. پێویستە لێرەدا ئەوەش روون بکرێتەوە بەرهەمی حەسەن لەم لایەنەوە یەک لایییە، واتە تەنیا خۆی لەم جۆرە شیعرەی وتووە، ئەگەر هاورێکانی بەشیعر وەرامیان دابێتەوە بەرهەمی ئەوان لە بەردەستدا نییە.

## نموونەی شیعری حەسەن

### شیعری ئایینی

لە لیریکێکی ئایینیدا حەسەن موناجاتی خودا و نەعتی پێغەمبەر و بیری کوردایەتی کۆ دەکاتەوە. لە موناجاتیدا لەگەڵ خودا دەڵێ:

بۆ تۆبە هەر بۆ تۆبە دەتوانم بکەم سەنا
رۆژ و شەوێ تۆ دێنی دەبەی مەغریب و عیشا
گەورە و گران و بێکەس و بێ جێ و بێ مەکان
بۆ بێکەسان کەسی بۆ بێ جێیەکان پەنا
تەنیا و بەرقەراری هەر بووی و هەر دەبی
بێ ئارەزوو و نیازی بێ باب و بێ برا

لە نەعتی پێغەمبەردا دەڵێ:

بەخوسووس شەفیعی ئێمەیە ئەو خۆشەویستەکەت
شابازی دەشتی مەڕوەیە شەهی شارەکەی سەفا

هەردەم ســـەلاتی زۆر و ســـلاوێکی بێ ژمـــار
دیاری بێ بۆ ڕووحی پاکی تۆ ئەی فەخری ئەنبیا
مەقسوود لە خەلقی عالەمە هەر زاتی پاکی تۆ
خەلقی هەمووی توفەیلی هەر تۆی کە بانگ کرا

لە بارەی حاڵی نالەباری کوردیشەوە دەڵێ:

یانی نە مڵک و ماڵە لە بۆمە نە حاڵ و باڵ
بێ جاه و بێ جەلال و بێ حاڵ و بێ سەلا
لێمە نە شا و ئەمیرە نە سەردار و نە وەزیر
نە حاکم و نە نایب و سەرتیپ و نە سوپا
هەریەک غولام و نۆکەری بێگانە میللەتێک
زیز و کز و کەنفت و کەسیفین و بێ نەوا

ئەم جۆرە شیعرە تازەکردنەوەییێکە لە ئەدەبی کوردیدا بەتایبەتی ناوەرۆکی کۆنی شیعری ئایینی لەگەڵ مەبەسی تازەی مەسەلەی نیشتمانی کورد تێکەڵ بەیەکتری کراون.

## دڵداری و وەسف

لەم جۆرە شیعرەیدا حەسەن بەردەوام لەگەڵ بەرهەمە داهێنراوەکانی قوتابخانەی باشووری کوردستانە و قوتابییێکی هوشیار و زیرەکی نالییە.

١

لە پارچە لیریکێکیدا دەڵێ:

دڵ لە بۆ ئاوی بەقای تۆ کەوتە نێو زوڵماتەوە
دەستی من دامانی زولفت پێم بڵێ بۆ کوێ بچم
قووەتی قەلبم کە تۆییی و قووتی ڕووحم عیشقتە
بۆچ دەبێ باکم لە ماسیوا ببێ غەم بۆچ بخۆم
یووسفی میسری ویلایەت ئەی خەلیلی باغی قودس
ناری نەمروودوە دەروون بێ تۆ دوو چاوم بوونە چۆم
من بەسەر کەوتوومە بەرپێی زولفی وەک چەوگانی تۆ
هەر لە تیفلی من ئەسیری لوعبەتی چەوگان و گۆم



من لە گوڵزاری ئەزەل گیراوی داوی زولفی تۆم
بەس بدە چەرخم لەسەر بازم کە تەیری ڕستە بۆم
بۆ تەوافی کەعبەیی کۆی شەمسی دینە وا (حەسەن)
هەروەکو مەزرەق بەهەر مەرز و دیارێ خول دەخۆم

لەم شیعرەدا حەسەن بۆ دیاریکردنی سۆز و خۆشەویستی دەروونی بەرامبەر بەدلبەر پەنا دەباتە بەر ئەفسانە جوانەکانی ئایین ئەوانەی ناوەرۆکی دانایی و فەلسەفییان تێدایە وەک ئاوی ژیانی خدری زیندە و نەسووتانی ئیبراهیمی خەلیل لە ناو ئاگری نەمروود. لەم شیعرەدا حەسەن هەردوو شێوازی عیشقی حەقیقی و مەجازی گرتووە، ئەو دلبەرە لە لایێک شەمسەدین شێخی بورهانە لە ئاسمان و لە لایێکی دیکە کیژێکی خاوەن زولفی شێواوە لەسەر ڕووی زەوی.

٢

لە لیریکێکی دڵداریدا حەسەن پەچەیێکی داپۆشتنی ڕوو دروست دەکا:

غەمگینە دڵی مات و بەچاوت نییە هۆشی
تا ڕووت بەتەمای جەور و جەفا لێمە دەپۆشی
تا دیدە بەدیداری مونیرت نییە ڕەوشەن
وەک کانییەکەی قولقولەیە قولقول و جۆشی
هەر گوڵ شەکەری لێوە شیفای دەردی نەخۆشان
سەر بێ بەفیدای کوڵمی گەش و چاوی نەخۆشی
ئەی دڵ بەختەتا کەوتییە چینی سەری زولفی
لەم مارە عەجایب بەتەمای لەززەت و نۆشی
هەروەک مەهی دوو هەفتە لە ژێر هەوری سیادا
ئەو دلبەرە بۆ زینەتە وا چادری پۆشی
تا زولفی لەسەر ڕوو بەمەسەل هەوری بڵاوە
لەو ناوە دڵم ڕەعدە لەبەر بەرق و خرۆشی
زەحاکە بەبێ باکی لە تەخریبی دڵاندا
خوێنخۆری گەلێک کردووە ماری سەری دۆشی

لۆمەی (حەسەن)ی نەفعی نییە لابدە واعیز
عاشق هەموو گیانی دڵە ئەسڵەن نییە هۆشی

شاعیر لەم غەزەلەدا بەشوێن وێنەی ڕەوانبێژی سیمبۆلی دەگەڕێ، دەیەوێ چارشە و پەچە بکا بەهەوێنی ئەم شیعرە، لای شاعیر ئەو پارچە قوماشە ڕەشە نییە ڕوو و لەشی دلبەر دادەپۆشی، بەڵکو وێنەی دیکەیە شاعیر دروستی کردووە و کاری چارشە و پەچە دەبینێ. دەموچاوی سپی و ڕوون و جوانە وەک مانگی چواردە وایە. ئەو دلبەرە لە ڕووی ناز و نیاز و جوانییەوە دەموچاوی دادەپۆشێ نەک بەچارشە و پەچە بەڵکو بەزولف و کەزی و قژی سەری. لە دێڕی دوایی شیعرەکەیدا حەسەن دەکەوێتە وەسفی شەریعەت و تەریقەت. ئەم دوو دیاردەیە لە واعیز و سۆفی دەبینێ، یەکەمیان ئەقڵ و هوشیاری قانوونە؛ دووەمیان دڵ و بێ هۆشی و ئازادییە، دوو شتی پێچەوانەی یەکترین.

٣

لە لیریکێکیدا شاعیر قسە لەگەڵ دلبەردا دەکا:

عەنبەری زولفت بەدەم سەبادە
لەسەر مانگی ڕووت هەوری مووت لادە
تا ڕۆژ وەکو شێت ڕوو لە کێوان کا
تۆزی عوسسە و غەم هەستە بەبادە
لە عیشقت مردم وەسیەت بێ لە تۆ
بۆ خۆت بمنێژە تەلقینم دادە
تا بڵێن زەححاک مار لەسەر شانی
تایێک لە زولفی چین چینت بادە
بەجامی دیدەی جەمشیدی جەمە
بەتەختی سینەی وەک کەیقوبادە
گوتم کوشتوومت بەغەمزە فەرمووی
شێوەی شیرینە ڕەسمی فەرهادە
لە دووری بالات شەو هەتا سەحەر
کارم گریانە پیشەم فەریادە



تاکو پامالّ بێ خوێنی مەزڵوومان
پەنجە شمشاڵت ڕەنگ و خەنادە
بەهومێدی وەم بێیە سەر قەبرم
بۆیە وا (حەسەن) بەمردن شادە

ئەم شیعرەی حەسەن موناجاتێکە لەگەڵ دلبەر. بەنەرمی داوای هەندێ کرداری لێ دەکا بۆ ئەوەی زیاتر جوانییەکەی دەربکەوێ. وەک لە شیعرەکەدا دیارە موناجاتەکە لە پێشانا بەشێوەی مۆنۆلۆج دەکەوێتە بەرچاو، لە پاشانا لە ناوەڕاستی شیعرەکەدا دەبێتە دیالۆج لەو کاتەی دلبەر وەرامی پرسیارەکانی شاعیر دەداتەوە. لە پاشانا ئەگەر باوەڕمان بەشابەیت هەبێ لە شیعری کلاسیکیدا دەتوانین بڵێین دێڕی دوایی ئەم غەزەلە شابەیتە بەوەی کە شاعیر ئەوە بەدلبەر دەگەیێنێ حەز بەمردنی خۆی دەکا ئەو کاتە ڕەنگە سەری لێ بدا و بچێتە سەر گۆڕی، وا نەبێ حەسەن قەت چاوی بەو دلبەرە ناکەوێ. دیارە ئەمە نابێ چونکە یار ناچێتە لای.

**کوردایەتی**

لە شیعری سیاسی و نیشتمانیدا حەسەن هەست و نەست و ئارەزووی ناو دڵ و مێشکی هەڵدەڕێژێ لە بابەت دواکەوتوویی نەتەوەکەی لە کاروانی ژیانی میللەتاندا. کورد پێویستی بەخەبات و تێکۆشانە بۆ گەیشتن بەئامانج، جگە لەوە باس لە هەندێ لایەنی خۆشی و ترشی کۆمەڵی کوردەواری دەکا.

١

حەسەن قەسیدەیێکی هەیە بەناوی «کوردینە تاکەی...». ئەم شیعرە لە موکریان و ناوچەکانی دیکەی کوردستانی ئێران بەناوبانگە. بە لایانەوە یەکێکە لە شیعرە ڕەنگینەکانی زمانی کوردی. هەمیشە لەسەر زاری خەڵکی و خوێندەوارانی کورد بووە. پێشەوا قازی محەمەدی برازای حەسەن، ئەم شیعرەی زۆر بەدڵ بووە، لەسەر زاری نەکەوتووە، تا پلەیێک کاری لێ کردووە دوو ڕستەی لە دێڕی پێش دوایی شیعرەکەدا هاتوون یەکەمیان «کوڕی ڕەش»ی کردووە بەناوی دووەمی عەلیی کوڕی و «کچی دزێو»ی کردووە بەناوی دووەمی عیسمەتی کچی.

لە قەسیدەکەدا حەسەن لە پێشانا گلەیی لە کورد دەکا لە پاشانا ئامۆژگارییان دەکا:

کوردینە تاکەی ئێمە لە کێوان میسالی دێو
دێین و دەچین و بۆمە نەبێ قەت خودان و خێو
خەڵکی هەموو لە باغ و لە شارانا کەیف خۆش
ئێمە بلاو و بێ سەرە ماوین لە دەشت و کێو
بۆ عاسمان دەڕۆن و لە بەحران دەکەن سەفەر
هەر عەرزە نیشتگاهی مە سنعاتە وەرد و شێو
ڕێی وانە کەهکەشان و ڕێی ئێمە بەردەلان
جێی وانە تەخت و بەخت و جێی ئێمە بەرد و چێو

لەم دێڕانەدا شاعیر بەراوورد لە نێوان دواکەوتوویی کورد و پێشکەوتوویی خەڵکی دیکە دەکا لە هەموو لایەنێکی ژیانەوە، تا دەڵێ:

گوردانی کوردەکان بەخودا ڕۆژی غیرەتە
دەس دەینە خەنجەران و پیاوانە بێینە نێو
هەرکەس کە پڕ تەواوی حەققی بابی خۆی نەوێ
ئەو بێبەشە لە کوردی دەری کەن نەیاتە نێو
بۆچمانە ماڵ و سەر کە لەسەر سەروەری نەچێ
کوڕ نابێ بترسێ لە زیندان و دار و چێو

لەم دێڕانەدا دەکەوێتە ستایشی کوردان و هانیان دەدا هەڵسن و ئازایانە داوای مافی خۆیان بکەن. لە دواییدا بەم جۆرە کۆتایی بەقەسیدەکەی دێنێ:

کوان شێرە کوردەکان کە لە ترسیان دەلەرزی عەرز
کێ بوو لە شامێ شا بوو لە میسرێ ببوو بەخدێو
ئازادی سەربەخۆیی میری و گەورەیی
داوا بکەن بەزار و زمان و ددان و لێو
تاکەی لە باغی خەڵکی بەزیزی و بەملکەچی
خۆشە لە باغی عێلی چنینی هەنار و سێو
هەر میللەتێ لە لاوە حەققی خۆی بەدەستەوە
کوردێ کە سەر هەڵێنێ دەڵێن بۆتە سەربزێو



بۆ وانە هەرچی جوانە لە جێ دێ لە ژن و ماڵ
هەر شاخ و داخە بۆمە کوڕی ڕەش کچی دزێو
هەرچێ دەبێ بلا ببێ حەق هەر دەڵێ (حەسەن)
نیمە لە ڕێی وەتەن غەمی دەرکردن و جنێو

لێرەدا حەسەن لە پێشانا قارەمانیەتی گەورە کوردانی مێژوو دێنێتەوە یادی نەوەکانی سەردەمی خۆی. پەنجە بۆ سەلاحەدینی ئەیووبی درێژ دەکا، لە سەدەکانی ناوەڕاستدا سوڵتانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست بوو. ئینجا دەگەڕێتەوە سەر ئامۆژگارییەکانی، خەبات و کۆشش کردن لە پێناوی ڕزگاربوون، بۆ ئەوەی کەس بەچاوی سووک تەماشای کورد نەکا.

٢

حەسەن دوو قەسیدەی لەسەر یەک کێش و یەکێتیی قافیە هۆنیوەتەوە. یەکەمیان بەناوی «ڕۆژی شادی» و دووەمیان بەناوی «پەیامی دوعا و سلاو». لە هەموو ڕوویێکەوە دەتوانرێ بەقەسیدەیێکی درێژی دەوروبەری سەد دێڕ شیعری بژمێررێ. لە بابەت ناوەڕۆکەوە ستایشی دەسەلاتی سۆڤیەتی ڕووسیای ئەو سەردەمە دەکا لەو کاتەی لە جەنگی دووەمی گێتی سوپای سوور چووبووە ناو ئێرانەوە. شایلۆغان بوو، خەڵکی شادبوون بەوەی لە زەبروزەنگی محەممەد ڕەزا شای ئێران ڕزگارییان بوو.

لە قەسیدەکەدا هاتووە:

کوردینە ئەوڕۆ ڕۆژی گەپ و کەیف و شادیە
لەو نیعمەتە کە بۆمە ستالینە حامیە
دەستی وە ئێمە داوە کە چیدی زەلیل نەبین
بانگمان دەکا کە ئێرە کە جێی ئیتمینانیە
ئەو میللەتە ڕەشیدە کە یۆڵداشی وای هەبێ
بۆ قەمع و قەلعی هەرچی ئوروپایە کافیە
کوردینە موژدە لێوە کە چیدی زەلیل نەبن
میر جەعفەریش بەئەمری وی بۆ ئێمە هادیە
ئەو یەکێتی و مەحەبەتی نێو ئەفسەرانی وان
سوێندی دەخۆی کە پاکی برای داک و بابیە

بۆ شارەزایی ڕێگەیی حەق ڕەهبەری یەکن
بۆ دەفعی دوژمنی وەتەن هەریەک فیدائیە
هەر کامێکی دەبینی دەڵێی چاکیان ئەوە
دوور بن لە چاو و زاری ئەوەش بەختی کوردیە
هەرکەس دەپرسی کاکە چلۆنن لە جێگەتان
خۆش بەخت و شاد و دڵخۆش و مەمنوون و رازیە
چاکە لە بۆمە هەرچی بڵێن بەقسەیان بکەین
هەرکەس وەدووی ئەوان کەوێ بێ شک نەجاتیە
جەمهووری ساویەتی بەدەنیکە سەلیم و ساغ
مەسکەو سەری وییە باکۆ چاوییە
ئوستادی وا مەزن دەبێ شاگری وای هەبێ
تەئسیری دەرسی ئەوە هێندە چاکیە

شاعیر گەلێ شادە بەوەی ستالین ئازادی و سەربەستیی بۆ هێناون. بەفەرمانی ئەو میر جەعفەر باگیرۆڤ (باقیرۆڤ) هەموو کارێکیان بۆ جێبەجێ دەکا. کۆماری سۆڤیەتی پشت و پەنای کوردە. ئەو سۆڤیەتە بەلای شاعیرەوە شتێکە گیاندار و ساغ و سەلیمە، مۆسکۆ سەری ئەو شتەیە شاری باکۆش چاویەتی.

شاعیر لەم ستایشەیدا لە ڕاستی نەچۆتە دەرەوە لەو ڕۆژگارەدا بوونی ڕووس لەو ناوچانەی ئێراندا لە چاکە و بەرژەوەندی کورد و ئازەرییان بوو، کەچی لە دواییدا چوونە دەرەوەی ڕووس لە ئێران و ڕووخانی کۆماری کوردستان لە مەهاباد ئەمە مەسەلەیێکی دیکەیە، تەشقەلەیێکی سیاسی بوو پارتی کۆمۆنیستی ڕووسیا بێ شەرمانە بەکوردی کرد. دەمێنێتەوە میر جەعفەر باگیرۆڤ، ئەمە بەنەژاد ئازربێجانی بوو، یەکێک بوو لە ئەفسەرە گەورەکانی سوپای سووری ڕووسیا لە ئێران. لە پاشانا بوو بەکەسی یەکەم لە پارتی کۆمۆنیستی ئازربێجانی سۆڤیەت و نزیکترین کەسێک لە ستالین. کابرایێکی دڵ ڕەق و مێشک وشک و زەبر بەدەست ناویان نابوو «ستالینی قەفقاس». ڕقی زۆری لە کورد بوو، دەوری گرنگی هەبوو لە چەوساندنەوە و جینۆسیدی کوردی ئازربێجان لە ناوچەکانی کەلبەجاڕ و لاچین و قوبادلی و زەنگەلان. هەروەها دوژمنێکی بێ ئامانی کوردە بارزانییە پەنابەرەکانی کوردستانی عیراق بوو لە ساڵی ١٩٤٧. گەلێ بوختانی پێ



کردن و تاوانی بۆ دروستکردن و ناو و ناتۆرەی لێنان. ئەمە بووە هۆی ئەوەی بارزانییەکان پەراگەندە بکەن و لە وڵاتی ئاوارەیی جارێکی تر ئاوارەیان بکەنەوە، بەوەی دابەشی سەر چەند تیپێک کران نێردرانە ناوچەی جیاواز لە کۆمارەکانی ئاسیای ناوەڕاست بەتایبەتی ئۆزبەگستان. لە دوای مردنی ستالین باگیرۆڤ بەخیانەت و پێوەندی جاسووسی لەگەڵ بێگانە تاوانبار کرا و لە ئەنجامدا لە سێدارە درا.

حەسەن بەردەوامە لەسەر قەسیدەکەی:

مەئیووس و زیزە شاعیر و نەوزانی قەدری وی
وەک شێرێکی لە جەنگەڵی قەفقازێ یاغیە
بەیداغی سوورە ئەوڕۆکە چاوسوور و پشتیوان
کەرویشکە شێر و لە کنەمە باز وەک مراوییە
ڕوو سوورە هەر کەسێ کە قزڵ ئۆردوو وە پەنای
بۆمە ئەوە بەسە کە پەنای دیکەمان نییە
قوربانی پێشەوایەکی وا بۆ نەبێ (حەسەن)
ڕەفتاری چاکی وانە بەئەمر و قسەی وییە
تەبریکی فەتحی تازە دوعای خێری بۆ دەکەم
بۆ ئەو ڕەفیقە گەورە کەوا بۆمە حامیە
بۆچی زمانی دایکی لە ئێمە مەنع کرا
ئەو هێندە زوڵم و زەحمەت و فەرق و جودائیە
دەکرانە دیل و بوونە ئەسیری لە نێو عەجەم
هەورامی و سابڵاغی و عێلی جەلالیە
هێندێکی بۆ عیراق و بۆ سمنان و دافعان
دەستێکی بۆ شیرازێ کە جێی شێخی سەعدییە
یا دەرکراوی مەوتینە یا حەپسی بێ گوناه
کوردێکی مەزن و عاقڵ و مەردی حیسابیە
هەر ماڵە کوردێکی کە دەچووی دەتدی شیوەنە
ئەوڕۆکە هەر دێیەکی دەچی سەیر و شادییە

لەم دێڕانەدا باگیرۆڤ وەکو شێرێک دەکەوێتە بەرچاوی شاعیر، ئەو بەیداغە سوورەی هەڵیکردووە ڕەمزی ئازادییە. قزل ئۆردوو (بەتورکی سوپای سوور)ی سۆڤیەت پەنا و پەرژینە. ئەوجا چاو ڕوونی دەکا بۆ گرتنی بەرلین. ئەمە نوقلانەیە، بەرلین هێشتا نەگیرابوو لەگەڵ ئەوەی لە داگیرکردنەوە نزیک بوو، چونکە ئەڵمانیا لە هێز کەوتبوو. شاعیر هەوڵ دەدا ئەوە بگەیەنی هەرچی چاکەیێک بۆ ڕووس بکرێ هێشتا هەر کەمە چونکە کوردیان لە چەوساندنەوەی شای ئێران ڕزگار کردووە.

لە پاشانا هەستی خۆشیی ناو دەروونی دەردەبڕێ:

چەن خۆشە کوردەکان کە دەبینم بەجلکی خۆ
پشتێن و پێچ و پەستەک و چۆغە و سۆرانیە
خەڕ ببنەوە لە هەر جێ تفەنگی نەداوەتە
تەقڵە و جلیت و هەوهەو و سواری و گۆرانیە
ئەو جارەکەش نەمردم و دیتم بەپڕ چەکی
شیر و دەمانچە خەنجەر و بڕنۆی سەواریە
قوربانو بم وەرن ببنە دۆستی یەکتری
زۆر عەیبە ڕێگری و دزی کارێکی چا نییە
خەڵکی دی دڵخۆشن بەجێگە و مەوتینی خۆیان
بۆچی ئەمەش نەخۆینەوە لەم چۆم و کانیە

شاعیر دەیکاتە زەماوەند و هەڵپەڕکێ بەهۆی ئەم دەسکەوتە گرنگە. جەژن و شادییە خەڵکی بەجلی ئاڵ و والا و گۆرانی پێشوازی ڕووداوێک دەکەن دەمێک بوو چاوەنۆڕی بوون.

جارێکی دیکەش شاعیر دەگەڕێتەوە سەر پێداهەڵدان و ستایشی ڕووس بۆ ئەو چاکەیەی لەگەڵ کوردی کردووە و ئازادی و سەربەستی بۆ هێناوە.

بەم دێڕانە کۆتایی بەگوڵبژێری هەردوو قەسیدەکەی حەسەن دەهێنێ:

ئەو فەتحی وا کرا لە ستالینگرادی وان
دەرچوو بەجاڕێ دوژمن و تۆڤی زراویە
جێی حەملەیانە ئەورۆ ئەوروپا بەپانەوە
ژاپۆن لە ترسی وانە لە چین چاوە چاویە



کوردان کە هاتوچۆ دەکەن ئەورۆ بەپڕ چەکی
نیشتمان زمانی وانە بەئەمری دراویە
ڕۆژنامەکانی تورکی لە تەورێزێ دایرن
بۆچ هەر لە کوردی دەردی دڵ و تەنگ و تاویە
خۆ کورد و فارس هەردوو برای داک و بابێکن
وەک یەک نەبێ لەبەرچی بەش و نان و ئاویە

شاعیر باس لە بەرگری پاڵەوانانەی ڕووس دەکا لە کاتی ئابڵۆقەدانی شاری ستالینگراد لە لایەن سوپای تاوانباری هیتلەرەوە. هەروەها دەوری سەرکەوتنی سوپاییان دەخاتە ڕوو لە ئاسیادا دژی یابان و لە ئەورووپادا دژی ئەڵمانیا. ئینجا دێتە سەر کورد و دوو تێبینی ورد لەمەڕ پێوەندیی کورد و فارس و ئازەری دەردەبڕێ. یەکەمیان هەڵسوکەوتی سیاسی کورد لەو کاتەی ڕووس لەوێ بوون باش و هێمن بوو چونکە بەگشتی بەچاوی یەکسانی تەماشای کورد و ئازەرییان دەکرد، کەچی لە بابەت بەڕێوەبردنی کاروباری حوکوومەتییەوە بەو چاوە تەماشای هەردوو لایان نەدەکرد. کوردیان وەکو ئەفتۆنۆمییێک دابوو ئازەرییان و هەموو شتێک دەبوو بەفەرمانی ئەوان بێ. دووەمیان شاعیر باس لە هەڵوێستی دەسەڵاتی ئێران دەکا، لە کاتی خۆیدا پێش هاتنی سوپای سووری ڕووس بۆ ناو کوردستان و ئازربێجانی ئێران ڕێگەی دابوو ڕۆژنامەی تورکی لە تەورێز دەربچێ کەچی ئەمە لە کورد قەدەغە کرا بوو.

**نامەی شیعری**

کۆمەڵێک نامەی شیعری لە دیوانی حەسەندا بەرچاو دەکەوێ:

١

هاوڕێیەتی و برایەتی لەگەڵ عەزیز ئاغای عەباسی گەیشتبووە ڕادەی دڵداریی سۆفیزمی. شیعری زۆری لەم بابەتەوە هەیە. لە لیریکێکیدا دەڵێ:

عەزیز ئارەزووت زۆری بۆ هێنام
فرمێسکم سوور بوو زەردی ڕووی لێنام
دیسان بەئاوری دووریت کەوتمە گێڕ
دونیام لێ سارد بووبوو بەزەمهەریر

دونیا وا پڕ بوو لە بەفر و سیخوار
فرمێسکی سوورم بەسپی هاتنە خوار
تا ناهومێد بووم لە هاتنی زووت
جەرگم بۆ پۆڵۆ و هەناسەم بزووت
هەوا بەحاڵم وەک کێوان دەگری
بەتەرزە و بەفر و باران و هەوری
عەرزیش لە بۆ من هێندی قوڕ پێوا
بەهاری لەگەڵ زستان لێ شێوا
گیاوگوڵی مێرگان بۆم سیس و زەرد بوون
بۆ شینی کێوان کە وان هەمدەرد بوون
شینی بەهارە عاسمان هەر دەگری
هەوریش ناڵە ناڵ ڕووی خۆی دەپچڕی
با لە کێو و دەشت خۆڵ وەسەر دەکا
گریانی کێوان بەحران پڕ دەکا
داری مێشە و باغ بەفر داپۆشین
پاک دەڵێی مردوون کفنیان پۆشین
کەوی کوێستانان لە قاسپە کەوتن
بێهۆش بوون یاخۆ خەویان لێ کەوتن
چیڕە و جریوەی چوڕە و چۆلەکە
نایە و نەیان ما هێلانە و هێلکە

جوانی ئەم شیعرەی حەسەن لەوەدایە تەنیا خۆی دەردی دڵی هەڵناڕێژێ بۆ دووری هاوڕێکەی. سروشت بەم هەموو گەورەییەی دەکاتە هاوبەش و دەیهێنێتە جۆش و چاوەنۆڕی هاتنی عەزیز ئاغایە. شاعیر وێنەی وا دروست دەکا لەگەڵ ڕەوشت و کردەوەی هەموو دیاردەکانی سروشت ڕێک بکەوێ.



## ٢

عەلی بەگی حەیدەری کە بەسالاری سەعید بەگ ناوبانگی دەرکردووە شاعیرێک بوو لە هاوڕێ نزیکەکانی حەسەن. لە شیعرێکیدا بۆ عەلی بەگ دەڵێ:

لە مەیدانی سەعادەت بوو نەسیبی من سەعادەت بوو
بەعەینوانی مەدیحێ جاروبارە دێمە مەیدانت
ئەوا هات جێژنی قوربان شوکر لیللا خۆشی خۆشیمە
کە حەججی ئەکبەرە بۆ من کەوا خۆم کردە قوربانت
کەلامی من وەکو شیعری فلانی بێ سەر و پا نین
بکە تەقتیعی ئەوزانی یەقین ڕاست دێتە میزانت
عەلی مەشهووری شارە من کە سەیفی زولفەقاری تۆم
هەمیشە یا عەلیمە گەر قەبوولم کەی لە شیعانت
لە لام تەرکی ئەدەب کفرە ئەمن تەرکی ئەدەب ناکەم
لەبەرئەوەی بوو کە ڕاوەستام لە لای میسباحی دیوانت

لەم لیریکەدا حەسەن گفتوگۆ لەگەڵ عەلی بەگ دەکا، وەک نامەیێکی شیعری خۆی دەنوێنێ، هەستی پڕ لە سۆزی ناو دڵی بۆ هەڵدەڕێژێ و شانازی بەخۆیەوە دەکا وەک شاعیرێک و دەڵێ شیعری وەک شیعری فلانە شاعیر نییە. ئەو شاعیرە کێیە! مەگەر تەنیا حەسەن و عەلی بەگ بیناسن و بەلایانەوە شاعیر نییە و ماعیرە! ئەوجا دەڵێ هەموو کەس دەزانی من شمشێرێکم (سەیفێکم) لە دەستی تۆم وەکو چۆن زولفەقار شمشێری دەستی ئیمامی عەلی بوو. لێرەدا شاعیر کۆمەڵێک وێنەی ڕەوانبێژی شیعری کلاسیکی کۆنی کۆکردۆتەوە، لەوانەی پێوەندییان لەگەڵ یەکتریدا هەیە لە بابەت لەیەکچوونی وشەکان لە ڕووی ڕوخسار و ناوەرۆکەوە، وەکو عەلی بەگ، ئیمامی عەلی، سەیف (کە لەقەبی حەسەنی شاعیرە)، زولفەقار ناوی شمشێری ئیمامی عەلییە.

حەسەن وێنەیێکی دیکەی ڕەوانبێژی داهێناوە، وشەی «ئەدەب»ی دووبارە کردۆتەوە، لە یەکێکیاندا مەبەسی شیعر و نووسین یا خوو و ڕەوشت و ئەخلاقە، ئەوی دیکەیان نازناوی شیعری عەبدوڵڵا بەگی میسباح – ددیوانە کە برای عەلی بەگی حەیدەرییە، ئەمەی وەک بەڵگەیێک بۆ بەرزی شیعری ئەدەب هێناوەتەوە.

## ٣

لە شیعرێکی دیکەیدا پێوەندی بەعەلی بەگەوە هەیە حەسەن دەڵێ:

دەڵێن دەسبەندیانە ماهڕوویان
لە نێو مەمکان دەلەرزن زولف و بەرموور
وەکو پۆلی قورینگ و تاووس و کەو
کە دێن بۆ هەڵپەڕین خووبان بەجەمبوور
کە دەس دەگرن بەڕێز بۆ هەڵپەڕینێ
وەکو قاز و قورینگی سەر بەرەژوور
کچۆڵە و پیاو و ژن دەستیان لە دەس یەک
وەکو عیقدی سورەبیا وان جەم و جوور
لەسەر سمتانە پشتێندی شەدەی شل
لە بەرپێیانە لفکەی پوولەکە دوور
بەڕۆین کۆترن لەنجەی مراوی
بەبازی هەڵپەڕین ئاسکی کەفەڵ کووڕ
گوڵ و گەردەنلغ و گوارە و قەتارە
لە ئەستۆ و دەوری سەر نوورون عەلا نوور
بە ڕوو سوور و سپی چاوی گەش و ڕەش
بەبێ سووراو و سپیاو و کلی توور

ئەم وتانە وەسفێکی ڕووکەش و پڕ لە هەستی شاعیرانەن حەسەن بۆشاییێکی ڕەشبەڵەکی کوردانە بەکاری هێناوە. کچی جوان و کوڕی قۆز، جلوبەرگی ئاڵ و والای کیژان و شەرواڵ و مرادخانی کوڕان، خشڵی زیوین و زێڕینی کەناچان و خەنجەر لە پشتێندی لاوان، ئەمانە بەهەڵپەڕکێی خۆیان هەموو سروشتیان هێناوەتە سەما.

ئەم شیعرە لە قەسیدەیێک هاتووە حەسەن لە گوندی داشلووجەی ناوچەی سەقز وەک نامەیێکی پیرۆزبایی بۆ عەلی بەگی نووسیوە بەهۆی ئاهەنگی زەماوەندی ژنهێنانی کوڕییەوە.

***



حەسەنی میرزا قاسمی قازی (سەیفولقوزات) شاعیر و سۆفی و ڕۆشنبیرێکی ناوچەی موکریانە. شیعری نەکردووە بەپیشە، ئەوەی هەیەتی کەمە، بەڵام جوانە. شاعیر خاوەنی زمانی شیعری و شێوازی تایبەتیی خۆیەتی، وشەی فەرهەنگی و لێکسیکۆنی لە زمانی ستانداردی ناوچەی موکریان و شاری سابڵاغ وەرگرتووە و ڕەنگ و ڕوویێکی وای داوەتێ خوێنەری کورد یەکسەر هەست بەوە دەکا ئەم دیارییە بەنرخە لە سابڵاغەوە (مەهابادەوە) نێرراوە بۆ ئەوەی لاپەڕەی دیوانی شیعری کوردی ڕەنگین بکا.

لە شیعریدا توانیویەتی نوێ لەگەڵ کۆن بگونجێنێ. لە ناوەرۆکدا مەبەس و هونەرەکانی شیعری کلاسیکی کۆن و نوێی تێکەڵ بەیەکتری کردووە و لیریکێکی تازەی داهێناوە و بووە بەسەرچاوە و بەردەباز بۆ پەیدابوونی شیعری نوێ لە کوردستانی عیراقدا. ئەو کاتەی حەسەن لە موکریان بوو لە سلێمانی کۆمەڵێک لاو لە مەیدانی مەشقدا بوون لە پێناوی تازەکردنەوەی شیعری کوردی لە دواییدا ناونرا «شیعری نوێ یا تازە» درەنگتریش ناویان نا «شیعری ڕۆمانتیکی». ئەمە بووە زاراوەیێکی گرنگ لە مێژووی ئەدەبی کوردی و ڕەخنەی ئەدەبیدا.

## بەشی پازدەم

## مەلا محەمەدی کۆیی

### ١٨٧٦ - ١٩٤٣

### ژیانی مەلا محەمەد

محەمەد کوڕی مەلا عەبدوڵڵا کوڕی مەلا ئەسعەد لەقەبی خێزانی جەلی زادەیە. مەلا عەبدوڵڵای باوکی نازناوی شیعری «جەلی» بووە، لە شاعیرانی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەمی کۆیە بوو. لەم کتێبەدا باسی لێوە کراوە.

محەمەدی مەلا عەبدوڵڵا لە شاری کۆیە لە ساڵی ١٨٧٦ لە دایک بووە. وەکو قوتابییەکی خوێندنی ئایینی لە تەمەنی منداڵییەوە لە حوجرەی مزگەوت دەستی بەخوێندن کردووە. لە پێشانا بووە بەقوتابی لای موستەعیدەکانی باوکی، لە تەمەنی مێردمنداڵی وانەکانی قۆناغی پێشکەوتووی خوێندنی زانستییەکانی ئایینی ئیسلامی و زمانی عەرەبی لە باوکی وەرگرتووە. وا باوە لە تەمەنی هەژدە ساڵیدا هەر دوازدە زانستییەکەی تەواو کردووە و ئیجازەی مەلایەتی لە باوکی وەرگرتووە و بووە بەمەلا.

بەپێی نەریتی کوردەواری فەقێ هەرچەندە کوڕی مەلای زیرەکیش بووایە دەبوو لە لای مەلای دیکە بخوێنێ لەو جێیەی لێی دەژی، جگە لەوە پێویست بوو بۆ مەبەسی خوێندن سەردانی مەلا ناودارەکانیش بکا هەرچەندە لە مەڵبەندی ژیانی فەقێکە دووریش بووبن. جگە لەوە بەپێی نەریتی خوێندنی حوجرەی کوردەواری جوانتر بوو مەلا محەمەد لە مەلاییکی گەورەی ئەو سەردەمە ئیجازە وەربگرێ.

کە مەلا عەبدوڵڵای باوکی مەلا محەمەد لە ساڵی ١٩٠٨ کۆچی دوایی کردووە مەلا محەمەد لە جێی دانیشتووە و حوجرەی مزگەوتی بەڕێوە بردووە و بووە بەپێشنوێژ و خوتبەخوێنی نوێژی ڕۆژانی هەینی و وانە وتنەوەی زانستییە ئیسلامییەکان و زمانی عەرەبی. لە سەردەمی دەسەڵاتی عوسمانی لە ساڵی ١٩١٢ مەلا محەمەد بووە بەمفتی کۆیە. لە پاشانا لە ماوەی دەسەڵاتی ئینگلیزی داگیرکەر لە ساڵی ١٩١٩ لە دوای جەنگی یەکەمی گێتی بەقازیی شار لە کۆیە دانراوە. لە دواییدا لە ئەنجامی هەڵبژاردنی یەکەمی عیراق لە ساڵی ١٩٢٤ بووە بەنوێنەری کۆیە لە پەرلەمانی عیراق لە بەغدادا. لە



دوای تەواوبوونی خولی یەکەمی پەرلەمان جارێکی دیکە بۆتەوە قازیی شار تا ساڵی ١٩٢٨ ئیتر وازی لە مووچەخۆری هێناوە و خۆی خانەنشین کردووە و هەموو کاتێکی تەرخان کردووە بۆ مەبەسی بڵاوکردنەوەی زانستییەکانی ئایینی ئیسلام و ئامۆژگاریکردن و ڕێ پیشاندان و ئاراستەکردنی خەڵکی بۆ ڕەوشتی خێرخوازی و بەهێزکردنی گیانی کوردایەتی و ئەخلاقی بەرزی کۆمەڵایەتی.

مەلا محەمەد کاری مەلایەتی پێ خۆش بووە، بۆیە زۆربەی هەرە زۆری ژیانی لە مزگەوت بردۆتە سەر. گەشتوگوزاری کەم بووە، شانازی بەخۆی و باب و باپیرانی کردووە. حەزی کردووە خەڵکی بەچاوێکی بەرز تەماشای بکەن. هەمیشە ئارەزووی ئەوەی بووە خوێندەواری ئەو ڕۆژگارە لە مەلایان و خەڵکی تر بەجەمالەدینی ئەفغانی (١٨٣٨ - ١٨٩٧) یا شێخ محەمەد عەبدەی (١٨٤٩ - ١٩٠٥) کوردی دابنێن. لەو کاتەدا ویستوویەتی وەک ئەو دوو ڕۆشنبیرە نوێخوازە بیر بکاتەوە، واتە شەریعەت لەگەڵ مەدەنییەتی بەڕێوەبردنی دەوڵەتی قەومی بگونجێنێ، لەبەرئەوە لە دژی کردەوە پراکتیکییەکانی سۆفیزم بوو کە لە دەروێشیزم خۆی دەنوێنێ. ئەم دژایەتییەی لەگەڵ پراکتیکی دەروێشیزم بووە نەک شێخان و تەکیە و خانەقای هەردوو تەریقەتەکانی قادری و نەقشبەندی. مەلا محەمەد سەر بەتەریقەتی نەقشبەندی بوو، کەچی لە کردەوەیدا هەوڵی دەدا لەنگەری پێوەندیی بەشێخانی هەردوو لا لە یەک پلەدا بێ.

لە لایێکی دیکەوە بەئامۆژگارییە ئایینی و شیعرە میللییەکانی پڕ لە سۆزی کوردایەتی خۆی لە خەڵکی کۆیە نزیک کردبووەوە، بەڕێزەوە تەماشایان دەکرد. هەوڵی دەدا وەک مەلاییکی مەدەنی و هاوچەرخییانە خۆی پیشانی خەڵکی بدا.

مەلا محەمەد هەموو ژیانی لە مزگەوت بردە سەر تا ڕۆژی ١٢ی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٤٣ لە کۆیە ماڵئاوایی یەکجاری کرد و هەر لەوێش نێژرا.

### شیعری مەلا محەمەد

لە سەردەمی ژیانی مەلا محەمەد شاری کۆیە نێوەندێکی ئەدەبی گرنگ بوو. باوکی شاعیری نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم مەلا عەبدوڵڵا دۆستی حاجی قادر و هاوڕێی ماوەی خوێندنی حوجرەی مزگەوتی بوو. شیعری حاجی و زانست و زانیاریی ڕێبەرێک بوون بۆ مەلا محەمەد. وەک شاعیرێک لاسایی شیعرە میللییەکانی حاجی کردۆتەوە.

خوێنەر لە موتالاکردنی ئەو بەرهەمانە هەست بەوە دەکا مەلا محەمەد لەم لایەنەوە قوتابییێکی زیرەکی حاجییە. ئەو شیعرەی ئەو نەیووتووە مەلا محەمەد دایناوە، واتە بەردەوامی ئەوە. لەگەڵ ئەوەشدا ئەوە هەیە شیعری حاجی لە ڕووی ناوەڕۆکەوە دانایانە و ڕۆشنبیرانەیە، خاوەنی وەک خوێندەوار و سیاسی و ستراتیجێک خۆی پیشان دەدا و یەکێکە لەوانەی بەشوێن مەسەلەکانی مافی نەتەوەیی و ڕزگاری و سەربەستی کورد دەگەڕێ. هەرچی ئامۆژگارییەکانی مەلا محەمەدە بۆ نەخوێندەوار و خەڵکی بێ سەوادە، گیانی کوردایەتی لە ناو دڵیان هەڵدەقوڵێنێ و هەوڵ دەدا شەریعەت (ئایین) لەگەڵ مەسەلەی قەومی کورد بگونجێنێ.

مەلا محەمەد لە دژی کردەوەکانی تەریقەتی دەروێشی بووە. دواکەوتوویی و کردەوەی نابەجێیان دەخاتە ڕوو. بەگشتی بەرهەمە شیعرییە کەمەکەی دەچێتە ناو ئەدەبی میللی (فۆلکلۆر) بەڕوخسار و ناوەڕۆکەوە بۆ خەڵکی ساکار و نەخوێندەوار بێژراوە.

## شیعری مەلا محەمەد لە ڕووی ڕوخسارەوە

مەلا محەمەد هەردوو کێشی عەرووزی و سیلابی خۆماڵی بەکار هێناوە. زۆربەی شیعرە عەرووزییەکانی لەسەر بەحری هەزەج و خەفیف هۆنراونەتەوە، تاکە تاکە لەسەر بەحری موزاریع و ڕەمەلیشی هەیە، وەک ئاشکرایە ئەمانە لە کێشە سووکەکانی عەرووزین. جگە لەمە کێشی سیلابی خۆماڵیشی بەکار هێناوە. لە ڕووی قافیەوە زۆربەی شیعری جووت قافیەیە (مەسنەوی)، ئەم جۆرە قافیەی لە هەردوو بەشە عەرووزی و خۆماڵییەکەدا بەکار هێناوە. هەرچی دەنگی قافیەی شیعرە عەرووزییەکانیەتی ئەوەی لەسەر سیستیمی یەکێتیی قافیە دانراون، لەبەر کەمی شیعرەکان تەنیا ئەم دەنگانەی بەکار هێناوە: د، ن، و، (ە – ـە)، ی.

بەرهەمی شیعری مەلا محەمەد هەمووی دەچێتە ناو شیعری میللییەوە، لەسەر هەر کێش و قافیەیێک دانرابێ. لە ڕووی ڕوخسار و ناوەڕۆکەوە ئەدگار و شەقڵی شیعری میللیی حاجی قادریان پێوەیە. لە خوێندنەوەی شیعریدا ئەگەر کەسێک نەزانی شیعرەکە مەلا محەمەد دایناوە – بەتایبەتی نازناویشی نییە – بەشیعری میللی فۆلکلۆری بێ خاوەن حسێبی دەکا.

زمانی شیعری مەلا محەمەد ئاسان و ساکارە، وشەکانی لە زمانی قسەکردنی ناو



خەڵک وەرگیراون. ڕستە و تەعبیری زیاتر دەشکێتەوە سەر دیالێکتی ناوچەیی کۆیە، ئەمە سەر بەدیالێکتی سۆرانییە کە بەشێکە لە کرمانجیی باشوور. لە خوێندنەوەی شیعریدا خوێنەر هەست بەکۆییەتی مەلا محەمەد دەکا. بایەخی بەخەیاڵی شیعری و وێنەی ڕۆمانتیکی و داهێنانی ڕەوانبێژی نەداوە. مەبەسی تەنیا ئەوە بووە بیروباوەڕی کۆمەلایەتی و سیاسی بگەیەنێتە خوێنەر و ئامۆژگارییەکانی لە بارەی کوردایەتی و کۆمەلایەتی و بیروباوەڕی موسوڵمانیەتی پێشکێش بەخەڵکی بکا، لەبەرئەوە بەرهەمی شیعری شەقڵی هۆنراوەی پەروەردە و فێربوون (دیداکتیکی) وەرگرتووە و چۆتە ناو بازنەی بزووتنەوەی تەنویری لە ئەدەب و هونەردا.

## شیعری مەلا محەمەد لە ڕووی ناوەڕۆکەوە

شیعری مەلا محەمەد لە ڕووی ناوەڕۆکەوە لە دەوروبەری مەسەلەیێکی کۆمەلایەتی و سیاسی دەسووڕێتەوە، پێوەندیی بەچەسپاندنی بیروباوەڕی کوردایەتییەوە هەیە لە ناو دڵی خەڵکیدا. بەلای شاعیرەوە هۆی هەرە گرنگ بۆ دواکەوتوویی میللەتی کورد ئەو کەسانە نین کە دەیانەوێ مەسەلەی ئایین (موسوڵمانەتی) لەگەڵ قەومییەت (کوردایەتی) بەیەکترییەوە گرێ بدەن و لەگەڵ یەکتریدا بیانگونجێنن بەڵکو تەریقەتی دەروێشی بووە بەمایەی تەمەڵی و تەوەزەڵی و دواکەوتوویی. ئەم هەموو هۆیانە بوون بەگیروگرفت بەرامبەر پێشکەوتنی کورد. ئینجا دێتە سەر ئەوەی خوێندەواری دەرمانی دەردی کوردە بەتایبەتی خوێندنی کیژی کورد.

مەلا محەمەد لەم بیروڕایانەیدا چاوی لەوە پۆشیوە کە ئایین (شەریعەت) لە پێشانا دوژمنی بەڕاستی تیۆرییەکانی سۆفیزم بووە، لە دواییدا دەستی بەسەر داگرتووە و داگیری کردووە و لەگەڵ ئیدیۆلۆجییەتی خۆی گونجاندوویەتی، لەبەرئەوە شاعیر تەنیا دژی کردەوە پراکتیکییەکانی دەروێشیزم بووە و هەوڵیداوە بەڕێگەی ئایینەوە مافی نەتەوەیی کورد بەدەست بێنێ. دیارە ئەمەش بیروڕای خۆیەتی.

مەلا محەمەد وەکو شاعیرانی دیکە هەستی دڵداری و خۆشەویستی بووە، چێژی لە سروشتی ڕەنگین و جوان وەرگرتووە، بەتایبەتی شاری کۆیە و دەوروبەری لە شاخ و مێرگ و کانی و جۆبار و بەهاری ڕەنگاوڕەنگ سەرچاوەی ئیلهامی شیعری بووە لە هەموو سەردەمێکدا لەبەرئەوە نێوەندێکی ئەدەبی گرنگ بووە لە کۆمەڵی کوردەواریدا. کەچی بەڕاستی شیعری هونەری و داهێنانی ڕۆمانتیکی و سیمبۆلی ئەوەی بۆ خوێندەوار و

ڕۆشنبیر دەنووسرێتەوە بەرچاو ناکەوێ. لەگەڵ ئەوەشدا شیعری ئەو بۆ زۆربەی خەڵکی ناو میللەت دانراوە، بۆیە کەڵک و سوودی زۆرە.

## نموونەی شیعری

زۆربەی شیعری مەلا محەممەد بەژمارەی دێڕ درێژن، ئەگەر بەشیعری کلاسیکی نووسراو بژمێررێن پێوبستە قەسیدەیان پێ بووترێ، شیعرە کورتەکانیشی دەچنە ناو زاراوەی غەزەل لە ڕووی ڕوخسارەوە. بەپێچەوانە ئەگەر مامەڵەی شیعری میللیی سەرزاریان لەگەڵدا بکرێ پێویستە «بەیت»یان پێ بووترێ. لەبەرئەوە لە شیعرە درێژەکانیدا دەتوانرێ بۆ بەڵگە گوڵبژێر بکرێ.

### دژی دەروێشیزم و کۆلکە مەلایان

لە بەشێکی زۆر لە شیعریدا مەلا محەممەد کار و کردەوەی دەروێشی وشک و کۆلکە مەلا ڕیسوا دەکا.

١

لە یەکێ لە ئامۆژگارییەکانیدا دەڵێ:

قسێکت بۆ دەکەم چاکی بزانە
قوبوولی کە بەبێ عوزر و بەهانە
لەسەر زار و زمانان گەرچی سووکە
لە میزانی حەقیقەت زۆر گرانە
بەخێری خۆت بەخەڵکی ڕاگەیێنە
هەتا زاهیر بێ ئەو سیرری نیهانە
هەتاکو ئەهلی شار و دەشت و لادێ
خەبەردار بن لە ئەحواڵی ئەوانە
بۆ خۆت ئەحواڵی لادێ چاک دەزانی
یەکێ جووتیار یەکێکی بەرخەوانە
فلان ئاودێرە ئەویان عارد دەکێلی
شوانە ئەو ئەویتریان سەپانە



خەریکی کاروبار و جووت و شوانی
لە فێڵی فێڵکەران ناشارەزانە
مەلایێکیان هەیە سندانی لێدا
نەخوێندە و ئەحمەق و پووچ و نەزانە
وەکو کەر گڕ دەخوا دائیم لە دێدا
بەڕیشی پان دەڵێی مالمی جووانە
ئەویش بۆ شێخ وەکو کەلبی موعەللەم
بەدەم کەروێشکی بۆ دەگرێ لە لانە
دەڵێ تۆبە بکەن لای شێخ بەگورجی
قیامەت ڕادەبێ هەر بەم زووانە
دەزوو چێشتی لە بۆ شێخی دروست کەن
پراو ساوار و شلکێنە و کەلانە
بەمام کوێخا بڵێن ئەسبابی ڕێک بێ
لە بۆ شێخ شەو دەیێتە دیوەخانە
کە نێزیک ساعەتی دوو بوو هەتا دە
لە بۆ نێران بەسە نۆرەی ژنانە
ژنی کوێخا و ئەهالی دێنە جەزبە
ئیتر هاوار و گریان و فیغانە
لە پاش ئەو هایوو هوویو تێکوتانە
دەڵێ ئەی قەوم و گەڵ کۆکەن ئیعانە
مریشک و هێلکە وو چوشتیر و کاوڕ
کەرە و داندۆک و ساوار و هەمانە
گوریس و سێپەک و ناودۆک و مەشکە
جەواڵ و توورەکە و تیرۆک و خانە
هەمووی حازر بکەن بێ خۆ خوراندن
دەخێرا بن بەچوست و عاقڵانە

بەهەر نەوعێ کە شێخ تەشریفی ڕۆیی
یەکێ عاقڵ هەڵستێ لەو میانە
دەڵێ ئەی قەوم و گەڵ ئێوە بەلەد نین
لە کەید و فێڵ و نەیرەنگ و فەسانە
لە لام مەعلووم بووە بێ شکک و شوبهە
بەئاسار و بەئەتوار و نیشانە
ئەهەمی مەقسەدی شێخی زەمانە
لە دونیا ئالیکە و هەم نان و گانە

بەزمانێکی ئاسان و ئاسایی شاعیر لەگەڵ ڕەنجبەر و جووتیاری دەشت و خەڵکی کرێکار و هەژارانی شار قسە دەکا و بەسەرهاتی نالەباری خۆیانیان بۆ دەگێڕێتەوە. لە کار و کردەوەی کۆلکە مەلا دەدوێ و شەریعەت دەکا بەداردەست لە پێناوی چاکەی شێخی تەریقەتی دەروێشی. ئەفسانە دروست دەکا بۆ توانایی شێخ و نزیکی لە کردگار. لەبەرئەوە هەموو دەبێ لە خزمەت شێخ بن. ژن و پیاو هەڵقەی زیکر دەبەستن، حاڵ دەگرن و لە هۆش خۆیان دەچن. ئینجا دەست دەکرێ بەباربوو کۆکردنەوە. هەموو شتێک بۆ شێخ پێویستە. توێشکی مەبەسی شاعیر ئەوەیە شێخ بیر لە گێتیی دوایی ناکاتەوە، بەڵکو بۆ ئەوەی ئێستایەتی لە نان و ژنان دەگەڕێ.

٢

مەلا محەمەد بایەخی بەکێشەی شێخی تەریقەت داوە، لە بابەت ژنانەوە وەکو لە شیعرەکەی پێشوودا ڕوون و ئاشکرایە دەیەوێ خۆشی لە مێیینەییان وەربگرێ. هەر بۆ ئەم مەبەسە شیعرێکی دیکەی تەرخان کردووە:

شۆڕەژن من لە هەوەڵ پێم نەووتی
ئاخری حەزرەتی شێخ تێت دەکوتی
دێتە یادت کە بەشەو دەردەپەڕی
سەری قۆت سینەیی ڕووت پایی پەتی
وەکو ماین بەتەڵەب دادەوەشای
لات نەبوو سەبر و قەرار و ڕەحەتی



عاقیبەت کەوتییە ژێر حەملەیی شێخ
بەدوو سەد حیلە وو مەکر و دەووتی
کوو بەئەفسانەیی شێخ هەڵخەڵەتای
بەچ ڕوو دەچییەوە لای ئەلیەفەتی
شێخ ئومێدێکی وەها دابوو بەمن
من لە بۆیە سەری خۆم خستە پەتی
بۆ ڕەزامەندی خودا کەوتمە دوای
دەمپەرستی شەو ڕۆژ میسلی بوتی
ئەویدیم دی پەشیمانیش بووم
ئیستەکەش ماوە خودا و مەرحەمەتی

ئەم شیعرە دیالۆجێکە لە نێوان شاعیر و ئەو شۆڕە ژنە جوانەی شێخ هەڵیخەڵەتاندووە و کاری خۆی لەگەڵدا کردووە. لە لیریکەکەدا لە پێشانا شاعیر لە گفتوگۆیدا لەگەڵ ژنەکە ئامۆژگاریی دەکا لە شێخ نزیک نەبێتەوە چونکە نیازی خراپە. ئینجا کۆمیدییانە وەسفی هەڵپەی شێتانەی شێخ و بەباهاتنی ژنەکە دەکا. لە دواییدا شۆڕە ژن دێتە وەرام و ئەوە دەردەبڕێ، کارەکەی لە ڕێی خودا بووە، چونکە شێخی بەگەورە و لە خودا نزیکی زانیوە، ئێستا پەشیمانە و چاوەنۆڕی بەزەیی خودایە.

**لاواندنەوە و ئامۆژگاری**

مەلا محەمەد وەکو شاعیرانی دیکەی کورد لای ئاشکرا بووە هەژاری و نەخوێندەواری و دواکەوتوویی دەردی بێ دەرمانی کورد بووە لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا هیچی بۆ نەکراوە.

١

لە قەسیدە یا بەیتێکی درێژیدا دەڵێ:

هەتا دەمرم لە بۆ کوردان دەناڵم
عیلاجیان چۆن بکەم هاوار بەماڵم
فەقیر و جاهیل و نەخوێندەوارن
لە لای نەوعی بەشەر بێ قەدر و خوارن

کەسێ قەدری لە لای خزمان نەمێنێ
لە لای بێگانە قەدری چی ئەمێنێ
لەگەڵ یەک بەدڕەوشت و بەدنیهادن
لە بۆیە وا کەساد و بێ مرادن
لە عیلم و مەعریفەت ڕووتن بەکوللی
خەیاڵی خاوە لایان فیکری میللی
حەسوودن بۆیە بازاڕیان کەسادە
نەزانن بۆیە تاعەتیان فەسادە
لەسەر عەردی ئەوی کوردی زمان بێ
لە لای وایە دەبێ سووک و نەزان بێ
دەبێ حەممال و گاوان و شوان بێ
دەبێ زەببال و کەنناس و سەپان بێ
دەبێ هەر ڕیش درێژ و پان وو لوول بێ
دەبێ هەر عاجز و گرژ و مەلوول بێ
دەبێ هەر بەندەیی ڕۆم و عەجەم بێ
دەبێ بێ عیلم و بێ ئیملا و قەڵەم بێ
ئەوەندە بێهۆش و بێدین و نەزانە
لە لای وایە خودای وی ڕیشی پانە
مەلاکانیش لە حەقیان زۆر خەیانن
ئەوانیش هەر دەڵێی گەوج و نەزانن
لەباتی باسی دین و ڕوکنی ئیمان
مەلا بۆیان دەخوێنێ مەدحی شێخان
دەڵێ شێخی هەیە ساحیب کەرامەت
تکاتان بۆ دەکا ڕۆژی قیامەت
شەو و ڕۆژێ بەزیکری خودا خەریکە
دیارە زۆر لە خزمەت خوا نزیکە



گەلێ جاران دەچێتە فەوقی عەرشی
ئەگەر حەز کا لە لای خوا دادەنیشی
خولاسە چەند خورافاتێکی دیکە
مەلا نەقلی دەکا بەو فاک و فیکە
عەوامی قوڕ بەسەر وەک وا دەزانن
جەنابی شێخ بەخزمی خوا دەزانن
ئەوانە شێخیان لایان خودایە
حیسابی وان لەسەر تەوقی مەلایە
مەلا تۆ باسی خوایان بۆ بفەرموو
وەها باشە لە بۆ وان و لە بۆ توو

لە سەرەتادا شاعیر سۆزی خۆی دەخاتە ڕوو بەرامبەر بەنەتەوەی، ئینجا باس لە دواکەوتوویی دەکا. کورد ژێردەستە، دیل و بەندەی تورک و عەجەمە. شاعیر ناوی عەرەبی نەهێناوە ئەمەی لە ڕووی ئایینییەوەیە، ئەگەر نا ئەوە ڕاستە چەوساندنەوەی کورد لە لایەن تورک و عەجەمەوە بووە، چونکە عەرەب لەگەڵ ڕووخانی دەوڵەتی عەباسی دەسەڵاتی لە دەست دا. لە دوای جەنگی یەکەمی گیتی خۆی گرتەوە. لە عیراقدا چەوساندنەوەی کورد لە لایەن عەرەبەوە دەستی پێ کرد، بەتایبەتی لە دوای ساڵی ١٩٣٠ بەکۆتایی هاتنی هەڵسان و ڕاپەڕینەکانی کوردی عیراق زاراوەی «کوردستانی عیراق» پەیدا بوو و کورد کەوتە ژێر دەسەڵاتی عەرەب و ئەمپریالیستی بەریتانی.

مەلا محەمەد ئەوجا بەرگری لە ئایینی ئیسلام دەکا و پێی وایە مەلا و شێخ بەڕاستی فیکری شەریعەت ناخەنە خانەی پراکتیکەوە، بەڵکو دەیکەن بەئەفسانە بۆ چاکە و بەرژەوەندی خۆیان و خەڵکی ڕەشوڕووتی پێ هەڵدەخەڵەتێنن.

## ٢

لە شیعرێکی دیکەیدا مەلا محەمەد دەڵێ:

ئەم خاکە دایکی تۆیە کەوتە دەستی ئەجنەبی
ئەی کوردی ساحێب غیرەت تۆ چلۆن ڕازی دەبی
بۆ خۆت ئەوا دەبینی دوژمن ئەرزت دەکێڵی
پاشی چەند ساڵێکی دی هیچت بەدەست ناهێڵی

لەســـەر ئەم کـــوڕڕەی ئەرزی ئێـــوە ئەرزەلولناسن
ئەمـەش گـەلێ غـەریبـە ئێـسـتـاش خۆتان ناناسن
بەقـــــووەی زۆری بـازوو ڕەزا خـــــانـی پەهلـەوی
دانیشت بەعیززەت و جاه لەسەر تەختی خوسرەوی
مستەفا کەمال پاشاش ئالی عوسمانی تێک دا
سەید فەیسەڵی مەککی بووە مەلیک لە بەغدا
بەچەسەقاو چاو پێ کەوت چۆن بووە میری ئەفغان
لە ترسی وی هەڕای کرد مەلیک ئەمانوڵڵاخان
نادر خانی جەنەڕاڵ بەچەسەقای ئەسیر کرد
تاج و تەختی ئەفغانی چلۆن بۆ خۆی تەسخیر کرد
ئێوەش ئەگەر پیاو بان چشتێکو لە دەست دەهات
کەسێ غیرەت بنوێنێ خودا تۆفیقی دەدات
ئێوەن بێ قەدر و قیمەت بێ عەسکەر و بێ عەلەم
بێ تاج و تەخت و دەوڵەت ژێر دەستی کوللی عالەم

لەم شیعرەدا شاعیر مەسەلەیێکی گرنگ لە مێژووی تازەی کوردی سەردەمی خۆی دەووروژێنێ. بۆ جاری دووەم دابەشکردنی خاکی کوردستان لە دوای جەنگی یەکەمی گیتی دەیەوێ ئەوە دەربخا تورک و عەجەم و عەرەب لە کورد چاپووکتر بوون بۆ دروستکردن و پێشخستنی دەوڵەت. ڕەزا شای پەهلەوی لە ئێران و مستەفا کەمال دەوڵەتی عوسمانی ڕووخاند و دەسەڵاتی بۆ تورک دامەزراند و فەیسەڵیش بوو بەمەلیکی عیراق لە بەغدا. هەروەها بەچاوێکی سووک دەنوارێتە مەلیکی ئەفغان و بەچکەسەقا ناوی دەبا، ئەمە بوو بەمەلیک کەچی کورد نەبوو بەهیچ!

لێرەدا ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ ئەوەیە شاعیر لە ڕووی گەشبینییەوە باس لە ڕەزا شا و کەمال ئەتاتورک و فەیسەڵی یەکەم دەکا بەناوی ئەوەی خزمەتی گەلەکانی خۆیانیان کردووە. لە کاتێکدا دەبوو هیچ نەبێ بەڕەشبینیش لە ڕەزا شا و کەمال ئەتاتورک بدوێ چونکە دەستی درێژیان هەبوو لە کوشتن و برین و تالانی کورد.

شاعیر لە قەسیدەکەیدا ئەو ڕاستییە دەردەبڕێ، کورد ناگاتە ئامانجی بەدەست و بازووی خۆی نەبێ. ناتوانێ مافی قەومی و مرۆڤایەتی خۆی دەست بخا بەزانستی نەبێ:



سووری موو زەردی چاوشین نەکەی بەئومێدی بی
ئەووەل بەقووەتی خۆت دووەم بەعەونی ڕەببی
عیلم و عەمەل خۆیەتی جەهل و تەمبەڵی مەرگە
پۆست و زەرگان فرێ دەن وەعدەی تۆپ و تفەنگە
ببنە پۆلیس و عەسکەر بۆ خزمەتی مەفتەنی
سەعی و غیرەت بۆ وەتەن وەک ڕووحە بۆ بەدەنی

لێرەدا شاعیر لە بێگانەی ئەوروپایی دەدوێ، بەسووری موو زەرد و چاوشین ناویان دەبا، بێ گومان مەبەسی لەم بێگانەیە ئینگلیز بووە، نەیویستووە ناوی ببا.

لە پاشانا کۆتایی بەقەسیدەکەی دێنێ بەم دێڕانە:

خاکو هەموو مەعدەنە مەعدەنی زێڕ و زیوی
پڕ لە لەعل و یاقووتە ناو شاخ و داخ و کێوی
ئەمما ئێوە نازانن لەبەر گێژی و دەبەنگی
ئەم زمرووت و یاقووتە چلۆنتان دێتە چەنگی
حاسیلی عەرزو دەکەم بەئەمری خەیرولئەنام
دین و دونیا ڕێک بخەن نامە تەمام وەسسەلام

لەم دێڕانەدا شاعیر باس لە دەوڵەمەندی خاک دەکا ئەوەی لەگەڵ دواکەوتوویی کورد ڕێک ناکەوێ، چونکە کوردستان دەوڵەمەندە کەچی کورد دواکەوتووە. ئەگەر کورد پێش نەکەوێ نابێتە خاوەنی ئەم خاکە. لە پاشانا مەلا محەمەد ئەوەی لە بیر نەچۆتەوە کە مەسەلەی نیشتمانی کورد سەر ناگرێ ئەگەر بەڕێگەی ئایینی ئیسلامەوە خەبات نەکا، واتە پێویستە دنیا و قیامەتی هەبێ.

### ئەفسانەی ئایینی

مەلا محەمەد یەکێک بوو لەو مەلایانەی لە دژی پراکتیک کردنی ئەفسانەی ئایینی بوو. بۆ ئەم مەبەسە لە لیریکێکیدا دەڵێ:

عیسا لە ئاسمان مەهدی لە ناو بیر
ئیشمان شلۆقە یاران چ تەدبیر

نە ئەو دێتە خوار نە ئەم دێتە دەر

دەجالیش زۆرن گشتی سواری کەر

لە دێ و لە شاری سەربەست دەگەڕێن

بەناوی دینی باش دەلەوەڕێن

ڕیش پان و درێژ مل قەوی شان کۆم

دووربن لە دینی وەحایە و ناحۆم

دوویان دەکەون پیرێژن و منداڵ

بەغار سەما بەجەزبە و بەحاڵ

پیرێژنە کۆنی قوون قاڵب بەتاڵ

دوای دەجال دەچێ وەک ماینی بەفاڵ

لە لای مەسیحییان عیسا لە ئاسمانە، لە لای موسوڵمانی شیعە مەهدی لە ژێر زەوییە. خەڵکی سەر ڕووی زەوی چاوەنۆڕیانن بێن مرۆڤ لە چەوساندنەوە ڕزگار بکەن. ئەمانە هەردووکیان ونن و لە هیچ شوێنێکدا دیار نین. ژیانی سەر ڕووی زەوی بەهاتنی دەجال کۆتایی پێ دێ، ئەویش هێشتا نەهاتووە. خەڵکی وەکو ئەو دەجالە زۆرن، ئەمانە کۆلکە مەلا و وشکە سۆفین، هەموویان وەکو ئەون، چاوەنۆڕن پەیدا بێ بۆ ئەوەی بەدوای بکەون. وێنەکانی شاعیر هونەراوین، لەیەکچوواندنەکانی هەوایێکی کۆمیدییان داوەتە شیعرەکە.

### نەوتی کورد

مەلا محەمەد لە هەموو شیعرەکانیدا تەنیا خەریکی وێنەگرتنی دواکەوتوویی و بێکەسی میللەتی کوردە ئەم لیریکەشی بەوە دەست پێ کردووە:

یا ڕەببی بەلوتف و جوود و ئیحسان

لوتفێکی بکەی لە حەققی کوردان

قەومێکی فەقیر و نا تەوانا

بێ پەروەر و بێ پیاوی دانا

بێ مورشید و عالیمی سیاسی

بێ سەتوەت قاعیدەی ئەساسی

بێ ڕووح و حەیاتی ئیجتیماعی

بێ قودرەت و قووەتی دیفاعی



بێ دەفتەر و کاغەز و کیتابەت

بێ سەنعەت و حیرفەت و کەسابەت

خاکێکی هەیە وڵاتی کوردی

ئەکسیرە وەلێ لە چەنگی مردی

خاکێکی ئەوەندە پاک و ڕەنگین

قەومێکی ئەوەند فەقیر و بێ تین

ئەی کاکی نەفامی گەوجی ملهوڕ

بنوارە لە دەوری باباگوڕگوڕ

ئەو نەوتە چ بوو چلۆن بەدەرکەوت

چۆن هەڵدەقوڵێ مەنابیعی نەوت

ئەو نەوتە بوو ئاگری هەڵایساند

چەند دەوڵەت و تاج و تەختی فەوتاند

ئەو نەوتەیە بوو کە چاردە میلیۆن

عەسکەر لە فەڕەنگ و نەسلی مەیموون

بۆی هاتە نیزاع و حەرب و کوشتن

تاکو بەمەرامی خۆ گەیشتن

ئەو نەوتە چ بوو ژیانی تۆ بوو

وەی خۆڵ بەسەرت ئەویش ئەوا چوو

ئەی کوردی نەفامی خانەوێران

وەی عەبدی زەلیلی شێخ و پیران

ئێستێکە گەلێ مەعادینی دی

پەنهانە لە ناو دەروونی عەردی

وەک مەعدەنی زێڕ و زیو و سەردەف

تۆش لێدە لە تەپڵ و دمبەک و دەف

ئەو نەوتە لە خاک و موڵکی کوردی

کێ خستیە دەست و هات و بردی

لەم ئاخرە ئینگلیز و ئەفرەنج
پاش حەربێکی زۆر بەمیحنەت و ڕەنج
بۆ فیکری عەمیق و حەدس و حیسسە
گەر بێتە شەریکی نەفع و حیسسە
بیبات و لە نەفسی خۆی خەرج کات
ئەم کوردە فەقیرە چی بەسەرهات
ئەم میللەتە گەورە وو عەزیمە
سێ پارچە کراوە بوویتە قیمە

لە دوای موناجات لەگەڵ خودا و ئاماژەکردن بەدواکەوتوویی کورد مەلا محەمەد دێتە سەر باسی نەوتی باباگوڕگوڕی کەرکووک. ئەم نەوتە گەلێک گرنگە لە سیاسەتی نێودەوڵەتیدا. جەنگ هەڵدەگیرسێنێ، دەوڵەتی کۆن لەناودەبا، دەوڵەتی تازە دروست دەکا. شاعیر ئەوروپایی بەنەوەی مەیموون دەژمێرێ. لە پێناوی دەستخستنی ئەم نەوتە سیاسەتی زەبروزەنگ و کوشتن و برین بەکار دێنن. شاعیر لەگەڵ کورداندا قسە دەکا پێیان دەڵێ، وڵاتەکەیان ئەوەندە دەوڵەمەندە تەنیا نەوتی نییە، گەلێ شتی دیکەی نهێنین و شارراوەی ژێر زەوین. ئینگلیز و فرەنسی کەوتنە خۆ نەوتیان بۆ خۆیان مسۆگەر کرد و لە ئەنجامدا زیان لە کورد کەوت و بوو بەسێ پارچە، مەبەس کوردستانەکانی تورکیا و ئێران و عیراقە لە ئەنجامی جەنگی یەکەمی گێتی پەیدا بوون.

شاعیر واز لە ئامۆژگاری ناهێنێ و حیکایەتی دواکەوتوویی میللەتی کورد ویردی سەر زمانیەتی، قەسیدە درێژەکەی بەم دێڕانە کۆتایی پێ دێنێ:

قەومێ کە فەقیر و ناتەوان بێ
قەومێ کە زەلیل و بێ زمان بێ
ئەلبەتتە خراتری بەسەر دێ
جێی ناکەنەوە لە شار و لادێ
وەک بزنی گروو دەبێ دەریکەن
نابێ تخوونی بێر و مەڕی کەن
تا ئێوە لە حەققی یەک خراپن
بەد خواه و حەسوود و ناتەبا بن



تا ئێوە لە حەققی یەک بەکەیدن
هەر ژێر چەپەرۆکی عەمر و زەیدن

نویشکی بیروڕای مەلا محەمەد بەرامبەر بەنەتەوەی خۆی ئەوەیە بەزانین و زانستی و یەکێتی و فیکری ئایینی ئیسلام نەبێ مەسەلەی مافی نەتەوایەتی ناگاتە ئەنجام.

***

مەلا محەمەد کوڕی مەلا عەبدوڵڵای کۆیی لە خێزانی جەلی زادەی شاری کۆیە یەکێکە لە شاعیرە میللییە بەرچاوەکانی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم. لەبەر ڕووناکی بزووتنەوەی تەنویر کوردایەتی کردووە. هەوڵی داوە مەسەلەی نەتەوایەتی لەگەڵ ئایینی ئیسلام بگونجێنێ. دژی وشکە سۆفی و کۆلکە مەلا بووە، شیعری بۆ خەڵکی نەخوێندەوار وتووە، لەبەرئەوە ئاسان و مانا لە ڕوو و ئاشکرایە. کێش و مۆسیقای شیعری ڕەوان و میللییانەیە.

# بەشی شازدەم

## ئەمین زەکی

## ١٨٨٠ - ١٩٤٨

## ژیانی ئەمین زەکی

### ژیانی سلێمانی و بەغدای

محەمەدئەمین کوڕی حاجی عەبدولڕەحمان کوڕی مەحموودە. ناوی خۆی لێکدراوە محەمەدئەمین بەکوردی (حەمەمین)ە. گوزەران و ماڵداری باوکی لەسەر ئاڵوێری تووتن بووە. لە ساڵی ١٨٨٠ لە سلێمانی لە گەڕەکی گۆیژە لە دایک بووە. لەسەر دەستووری کۆمەڵی عوسمانی ناوی «زەکی» کردووە بەلەقەب و بەمحەمەدئەمین زەکی یا ئەمین زەکی ناسراوە. سەرەتا لە حوجرەی مەلا عەزیزی زەلزەلەیی خوێندوویەتی و خەتمی قورئانی کردووە و فێرە نووسین بووە. لە تەمەنی دوازدە ساڵی لە ١٨٩٢ لە پێشانا چۆتە قوتابخانەی ڕوشدییەی مولکی سەرەتایی، لە دوای ساڵێک گواستوویەتییەوە قوتابخانەی سوپایی سەرەتایی و لە پۆلی دووەم وەرگیراوە.

لە پاش تەواوکردنی قوتابخانەی سەرەتایی لە سلێمانی بۆ خوێندن دواتر ڕووی کردۆتە بەغدا و لە ساڵی ١٨٩٦ لە قوتابخانەی ئامادەیی سوپایی وەرگیراوە. لە دوای سێ ساڵ خوێندن بەرەو ئەستەمووڵ کەوتۆتە ڕێ بۆ تەواوکردنی خوێندنی بەرزتر.

### ژیانی وڵاتی عوسمانی

سەرەتا لە ئەستەمووڵ ئەمین زەکی قوتابخانەی جەنگی تەواو کردووە، ئینجا ڕووی کردۆتە خوێندنی باڵاتر و لە قوتابخانەی ئەرکان بەپلەی سەرۆکی مومتاز دەرچووە. لە دوای ئەمە لە ساڵی ١٩٠٢ لە لەشکری شەشەمینی عوسمانی لە بەغدا بووە بەئەفسەر. لە پاش ساڵێک گوێزراوەتەوە «بەڕێوەبەرایەتی ئەرز و ئەملاکی سەنییە» وەک ئەندازیارێک لەوێ دامەزراوە، تا جاڕدانی دەستووری عوسمانی لەو شوێنە ماوەتەوە، لە پاشانا گوێزراوەتەوە بۆ لەشکری دووەم لە ئەدرنە و لە دوای ئەوە ڕووی کردۆتەوە ئەستەمووڵ و بووە بەئەندامی «کۆمەڵەی نەخشەدانان» (خەریتە) و لەگەڵ ئەندازیاری دیکە خەریکی ئامادەکردنی نەخشەی شاری ئەستەمووڵ و دەوروبەر بوو. هەر لەو ماوەیەدا بەئەندامی لیجنەی



دیارکردنی سنووری دەوڵەتی عوسمانی و بولگاریا هەڵبژێرراوە. جگە لەمە لە ناوچەی قەفقاسیشدا بەشداری لە دیارکردنی سنووری عوسمانی و ڕووسیای کردووە.

لە ژیانی عەسکەریدا ئەمین زەکی جێگۆڕکێی زۆر بووە. لە ساڵی ١٩١٢ بەشداری لە جەنگی بەڵقاندا کردووە، ئەو کاتە لە لەشکری پێنجەمی عوسمانی گەیشتبووە پلەی دووەمین ئەرکانی جەنگ. لە ساڵی ١٩١٣ لەگەڵ هەندێ ئەفسەری دیکە بەکاروباری ڕەسمی چۆتە فرەنسا، ماوەی ساڵێک لەوێ ماوەتەوە. لە ساڵی ١٩١٤ جارێکی دیکە بەئەندامی لیجنەی دیارکردنی سنووری ڕووسیا هەڵدەبژێررێ. بۆ ئەم کارەی لە شاری بایەزیدەوە ڕوو دەکاتە تفلیس و لەوێوە بۆ ڕووسیا. لە ڕێگەی گەڕانەوەیدا بۆ وڵاتی عوسمانی بەڕێگەی باکۆ - ڕۆستۆف - مۆسکۆ پیترۆگراد (ناوی ئەو کاتەی سانت پیترسبورگ بوو) - فینلەندە - سوید گەڕاوەتەوە.

لە ماوەی جەنگی یەکەمی گێتیدا ئەمین زەکی گەیشتبووە پلەی مایۆری لەو کاتەی ئۆردووی سوپا لە سەلمان پاک بووە. ماوەیێک کارگێڕی بەشی ئیستیخبارات بووە، لە کاتی داگیرکردنی بەغدا لە لایەن ئینگلیزەوە ئەمین زەکی لەگەڵ لەشکرەکە چوونەتە مووسڵ، لە دواییدا ڕوو دەکەنەوە ئەستەمووڵ. لە تەمووزی ساڵی ١٩١٧ لەو سەردەمەی فەرماندەی لەشکری حەوتەم مستەفا کەمال بوو، ئەمین زەکی کرابووە یاریدەدەری سەرۆکی ئەرکانی لەشکرەکە. ئەمانە لە ئەستەمووڵەوە چوون بۆ حەڵەب. لەو کاتەدا مستەفا کەمال لە فەرماندەیی لابرا، فەوزی پاشا لە جێی دامەزرا، ئەمین زەکی لەگەڵ لەشکرەکە ڕووی کردە فەلەستین و تا ١٥ی ئەیلوولی ١٩١٨ لەوێ مایەوە. لە پاشانا نێررا بۆ لەشکری سێیەم لە قۆڵی قەفقاسدا. لە دوای جەنگی یەکەم گوێزرایەوە «بەشی مێژووی جەنگ» و لەم دەسگایەدا مایەوە تا مانگی حوزەیرانی ١٩٢٤.

### ژیانی دووەمی بەغدا و سلێمانی:

ئەمین زەکی لە دوای ڕووخانی دەوڵەتی عوسمانی و دابەشکردنی کوردستانەکەی و دروستبوونی عیراق لە ٢٤ی تەمووزی ١٩٢٤ گەڕایەوە عیراق و لە بەغدا بوو بەمامۆستای قوتابخانەی سوپایی. ئینجا بوو بەئامیر فەوجی شەشەم لە سوپای عیراقدا. لە تەمووزی ١٩٢٥ ڕێزی سوپایی بەجێهێشت و بەنوێنەری شاری سلێمانی هەڵبژێررا لە پەرلەماندا. ئەم کارەی ماوەیێکی کەمی خایاند، دیسانەوە بەپلەی کۆلۆنێلی گەڕایەوە سوپا تا لە ٢٤ی تشرینی دووەمی ١٩٢٥ بۆ یەکەم جار بوو بەوەزیری ڕێگەوبان و

هاتوچۆ، ئیتر ماوەیێک لە وەزارەتێکەوە دەگوێزرایەوە بۆ یەکێکی دیکە لەمانە وەزارەتی زانیاری (معارف) و جەنگ و ئابووری. لە ساڵی ١٩٣٣ وە تا ١٩٣٥ لە پۆستی کارگێڕی گشتی بوو لە هەندێ لە وەزارەتەکانی بەغدا، ئینجا چەند جاری دیکەش بووە بەوەزیر تا ساڵی ١٩٣٧ بەنوێنەری سلێمانی هەڵبژێرراوە لە پەرلەمانی عیراقدا. لە دوای ئەمە جارێکی دیکە گەڕاوەتەوە بۆ وەزارەتەکان تا لە ١٠ی شوباتی ١٩٤٢ وازی لە کاری میری هێناوە و بەفەرمانی مەلیک بووە بەئەندامی ئەنجومەنی سیناتی عیراق (مجلس الأعیان العراقی) لەم کارەیدا ماوەتەوە تا ساڵی ١٩٤٨ لە سلێمانی کۆچی دوایی کردووە و لە گردی سەیوان لەتەک مستەفا پاشای یا مولکی نێژراوە.

## ئەمین زەکیی ڕۆشنبیر

ئەمین زەکی سوپاییێکی زانا و ڕۆشنبیرێکی بەدیمەنی بەنەژاد کورد و بەڕوخسار عوسمانی بوو. ڕەفیق حیلمی بەعەسکەر و مێژوونووس و شاعیر و نووسەر بەخەڵکی ناساندووە. ئەم هەڵسەنگاندنە ڕاستیێکی زۆری تێدا هەیە، چونکە لە بواری ستراتیجییەتی سوپایی و زانستیی مێژوو و خەیاڵی شاعیری و ڕۆمانتیکییەتی نووسینی پەخشان لە ڕووی تیۆرییەوە بەرهەمی هەیە. لە پێشانا کۆمەڵێک کتێبی بەزمانی تورکی لە بارەی ستراتیجییەت و ئەندازیاری سوپایی بڵاوکردۆتەوە، هەروەها لەم لایەنەوە نووسینی لە ڕۆژنامە و کۆوارە تورکییەکاندا هەیە. ئینجا بەزمانی کوردی «موحاسەبەی نیابەت» لە بەغدا لە ساڵی ١٩٢٨ بڵاوکراوەتەوە. لە پاشانا «خولاسەییێکی تاریخی کورد و کوردستان» بەرگی یەکەمی لە ساڵی ١٩٣١ و بەرگی دووەمی لە ساڵی ١٩٣٧ لە بەغدا بڵاوکراوەتەوە، ئەوجا «دوو تەقەلای بێ سوود» لە بەغدا لە ساڵی ١٩٣٥ بڵاوکراوەتەوە. لە پاشانا «تاریخی سلێمانی و وڵاتی» لە بەغدا لە ساڵی ١٩٣٩ دەرچووە. ئەم بەرهەمانە نموونەی پەخشانی کوردی ئەمین زەکی دەخەنە ڕوو.

نووسەر لە بەرهەمە مێژووییەکانیدا لە ڕووی زانستییەوە گەیشتۆتە ئەو پلەیەی شایانی ئەوە بێ شەرەفێکی گەورەی پێشکێش بکرێ و بەمێژوونووسی دووەمی کورد بژمێررێ لە دوای شەرەفخانی بدلیسییەوە.

ئەمین زەکی لە منداڵییەوە چێژی لە شیعر وەرگرتووە، دۆستی بووە، هەندێ جار هەوڵیداوە شیعر دابنێ. یەکێ لە دەسنووسە گرنگەکانی دیوانی نالی ئەو دەسنووسەیە ئەمین زەکی لە دەفتەرێکی بچووکی گیرفان لە ساڵی ١٩٠٣ بەخەتی خۆی



نووسیویەتییەوە و هەمیشە لەگەڵیدا بووە و لە باغەڵیدا هەڵیگرتووە و بەشەوقەوە خوێندوویەتییەوە.

عەلائەدین سەجادی لە بارەی ئەمین زەکییەوە دەڵێ: ئەو لەسەر ئەو باوەڕە بوو کە لە عالەمی سیاسەتدا نابێ توندوتیژی بنوێنرێ لەبەرئەوە لە هەموو مەیدانێکی سیاسیدا بەهێمنی ئەهاتە پێشەوە، لە پایەی یەکەما خۆی بەکورد ئەزانی، لە هی دووەما بەعیراقی، هەر کاتێ بچوایەتە ناو ئیشەوە لەبەرئەوە کورد لە عیراقا هەبوو لە ڕێگەی گشتییەوە زۆرتر ئەیویست خزمەت بەکورد بکا.

بەم جۆرە ئەمین زەکی ڕۆشنبیرێکی کوردی سەردەمی خۆی بوو بەمانا ئینتیلیجێنتە ئەوروپییەکە، نەک لەبەرئەوەی مەیدانی بیری گەلێک فراوان بوو، سەری لە هەموو زانستییێک دەردەکرد و بایەخی بەئەدەب و هونەر دەدا، بەڵکو یەکێک بوو لەو کوردە عوسمانییانەی شەش حەوت زمانی ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاوایی دەزانی وەکو کوردی و تورکی و عەرەبی و فارسی و ئینگلیزی و فرەنسی و ئەڵمانی. لە کاتی خۆیدا لە ڕووسیا لە کوردناس و ڕۆژهەڵاتناسی ڕووسی (بەنەژاد ئەرمەنی) گوورگین ئاکووپۆڤم بیست وتی: لە ماوەی جەنگی دووەمی گێتیدا لە بەغدا چاوم بەئەمین کەوت، لە گفتوگۆکردندا بەزمانی ڕووسیش لە یەکتری دەگەیشتین.

## بەرهەمی ئەدەبی ئەمین زەکی

ئەمین زەکی هەوڵیداوە شیعر دابنێ، لە ژیانی ئەستەمووڵیدا هەندێ شیعری هۆنیوەتەوە بەڵام بڵاوی نەکردۆتەوە. جارێکیان شێخ سەلامی شاعیر بەنامەییێکی شیعری چەند پرسیارێکی مێژوویی لە ئەمین زەکی دەکا و لە ڕۆژنامەی «ژین»ی سلێمانی بڵاوی دەکاتەوە. ئەویش بەشیعر وەرامی دەداتەوە و لەسەر لاپەڕەکانی کۆواری «گەلاوێژ» بەشێخ سەلام و خوێندەوارانی دەگەیەنێ.

ئەمین زەکی لە شیعرەکەیدا دەڵێ:

لە ڕۆژنامەی ژین لە سێی ڕەمەزان
هەشت شیعرم بینی زۆر شیرین و جوان
پێنج شیعری ئەووەل شایستەی شوکرە
سێ شیعری دواییش پرسینی فیکرە

ئەڵێن هەیکەلی دەربەندی گەورە
نازانین چییە و هینی چ دەورە
عولەمای ئاسار بۆ ئەم تیمسالە
ئەڵێن پاشماوەی چەن هەزار ساڵە
قەراڵی ئاکاد نارام سین ناوێک
چل و حەوت عەسرە هەستا بەتاوێک
بەشەڕ هاتە سەر لۆلۆ وو گۆتوو
لە قەرەداغا داوا گەرم بوو
لە دوای شەڕ لۆلۆ گۆتوو ئەشکێنێ
مەلیک ساتوونی دەرئەپەڕێنێ
باسی ئەو شەڕە و ئەو بگرە و بەردە
نووسراوە یەک یەک لەسەر ئەو بەردە
چەکی ئەو حەلە تیر و کەوانە
لە لای هەیکەل دا دیارە نیشانە
وەک دار تاشییان ئەو شاخە گەورە
کردیان بەتیمسال لە دەربەند گەورە
لە دوای سی عەسر ساسانی هاتوون
زۆر تیمسالیان بوو بەدەسەڵات بوون

ئەم پارچە شیعرە لەسەر کێشی سیلابی دە کەرتی خۆماڵییە، وەستانی لە ناوەڕاست دایە (٥ + ٥)، لە ڕووی قافیەوە مەسنەوییە.

لە پەخشانیدا ئەمین زەکی کوردی زانێکی بەتوانا بوو، شێوازی کوردی عوسمانی لە نووسینیدا بەدی دەکرێ، وشەی عەرەبی و تورکی و فارسی ناو زمانی ئەدەبی ئەو نەتەوانە بەکار دێنێ. هەرچەندە نووسینەکانی پێوەندییان بەمێژووەوە هەیە، وەک ئاشکرایە مێژوو تەنیا دیاردەیێکی زانستی نییە بەڵکو تێکەڵ بەئەدەبە و ماکی جوانکاری تێدا هەیە. مێژوونووس دەتوانێ خاوەنی شێوازی پەخشانی هونەری خۆی بێ لە تێکستی نووسینی مێژوودا. بەم جۆرە لەبەر ڕۆشنایی ئەم بۆچوونانە هەست بەشنەبای شەماڵێکی ڕۆمانتیکییانە لە بەرهەمی ئەمین زەکیدا دەکرێ.



## نموونەی پەخشانی ئەمین زەکی

١

ئەمین زەکی لە پێشەکیی مێژووی کورد و کوردستاندا دەنووسێ:

«لە دوای ئەمە، کە لە جێگەی تەعبیری عوموومی (عوسمانی) لەفزی (تورک) و (تۆران)ی لە تورکیادا باوی سەند، بەتەبیعەت، وەکو ئەفرادی میللەتەکانی تر، منیش لە ناو ئەم کۆمەڵەدا غەیرییەتی خۆم چاکتر حیس پێ کرد؛ غورووری قەومی، مەجبووری کردم لە هەموو فرسەتێکدا ئەم حیسسەی خۆم ئیزهار بکەم. بەڵام دەرحەق بەئەسڵ و تاریخی قەومەکەم هیچم نەئەزانی، چونکە تا ئەو وەقتە نە لە مەکاتیبدا فیکرێکی وامان درابوویە و نە لە دواییشدا زەروورەتی تەدقیقی تاریخی کوردمان دیبوو، وە کەلیمەی جامیعەی (عوسمانی) ئەعسابی قەومییەی هەموومانی تا دەرەجەیێک خاو کردبووەوە. بارەها ئەم سوئالەم لە خۆم ئەکرد: قەومی کورد لە چ نەتەوەیێکە، چی بەسەرهاتووە؟ بەڵام نەمئەتوانی جوابێکی باشی بۆ بدۆزمەوە. بەناعیلاجی لە چەند گەورەیێکی کوردم پرسی، حەتتا لەوانە دووانیشیان لە مامۆستاکانی تاریخ بوون؛ یەکێکیان ئەسڵی کوردی بەڕیوایەتێکی موشەووەش بردەوە سەر کوردی کوڕی عەمری قەحتانی، وە ئەویتریشیان کردینی بەنەتەوەی دێوێک کە (حاساد)یان پێ گوتووە. بەڕاستی ئەم دوو جوابە بێ خێرە زۆری سەغڵەت دام و لەگەڵ ویجدانی خۆمدا قەول و بڕیم کرد کە خۆم تەدقیقی ئەم موعەمایە بکەم؛ زاتی بوونم لە ئەستەموولدا فرسەتێکی باش بوو. وەقتی بێ ئیشی خۆم بۆ ئەم تەدقیقانە دانا و لە ئیبتیدای ١٣٢٦ی ڕۆمییەوە (١٩١٠م) دەسم کرد بەزیارەتی کتێبخانەکانی ئەستەموولْ. فرسەتی ئەم خدمەتەم کەم بوو چونکە هەموو ساڵێک شەش حەوت مانگ لەگەڵ قومیسیۆنی حودوود لە دەرەوە خەریک ئەبووم. لەم فرسەتە کەمە زۆرم ئیستیفادە کرد و تا ئەواخیری ساڵی ١٣٢٨ ڕۆمی (١٩١٢م) چەند سەد ئەسەرێکم موتالا کرد و نۆتێکی زۆرم گرت. بەخت و تالع لە ١٣٢٩ (١٩١٣م)دا بەوەزیفەیێکی ڕەسمی گەیاندمیە ئەوروپا. لە ئەڵمانیا و فرەنسادا زۆر کتێبخانە و مۆزەم زیارەت کرد و زۆر ئاسار نادیرەم چاو پێ کەوت و نۆتێکی زۆرم کۆکردەوە و دەرحەق بەکوردایەتی سی چل کتێبێکی باشی موستەشریقینم کڕی، بەڵام لە دوای گەڕانەوەمان زۆری پێ نەچوو شەڕی گەورە دەسی پێ کرد؛ وە وەزیفە ئەم تەدقیقاتەی پێ دواخستم. لە دوای شەڕی گەورە، کە چوومەوە ئەستەموولْ، سەرلەنوێ دەستم پێ کرد، کتێبە تازەکانم باش موتالا

کرد، نۆتەکانم ڕێک خست و دەسم کرد بەنووسین و دوو سەد لاپەڕەییێکم حازر کرد، ئەوەندەی پێ نەچوو لە ساڵی ١٣٣٥ی ڕۆمی (١٩١٩م) و لە جەژنی قورباندا تووشی موسیبەتێکی گەورە بووم، لە وەقتێکدا کە لە ماڵەوە نەبووم گەڕەکەکەمان ئاگری تێبەر بوو و خانووەکەی منیش لەو ناوەدا سووتا و هیچمان بۆ دەرنەچوو. بەتەبیعەت ڕەنجی پێنج شەش ساڵم لە دەس چوو، نە نۆت ما و نە کتێب. ئەم موسیبەتە گەورەیە بەڕاستی زۆری مەئیووس کردم و چار ناچار وازم لێ هێنا.

لە دوای ئەم مەئیووسییەتە بە دە ساڵ، یەعنی لە ١٩٢٩ی میلادیدا، ڕۆژێک لە کتێبخانەی مەجلیسی نووابدا (ئەنسیقلۆپیدیای ئیسلام)م چاو پێ کەوت و بۆ موتالاکردن بەئەمانەت وەرمگرت. تەماشام کرد ئەم ئەسەرە نایاب و تازەیە، کە لە ١٩٠٥دا لە تەرەف هەیئەتێکی موتەخەسیسەوە دەسی پێ کراوە و هێشتا تەواو نەبووە، لە جلدی دووەمیدا بەحسێکی مەخسووسی کوردی تیایە و لە تەرەف موستەشریق و عالمێکی زۆر بەناوبانگەوە کە فۆن مینۆرسکییە نووسراوە. بەشەوقێکی زیادەوە دوو سێ جار خوێندمەوە، ئەم موتالایە مەیلی کۆنی تازە کردمەوە و سەرلەنوێ قەرارم دا کە لەسەر ئەو ئەساسە (خولاسەییێکی تاریخی کورد و کوردستان) بنووسم».

ئەم پارچە پەخشانە لە ڕاستییێک دەدوێ پێوەندیی بەزانستیی مێژووەوە هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا نووسەر هەوێنی لاوەکی هێناوەتە ناو نووسینەکەیەوە، وەکو گێڕانەوەی بەسەرهات و یادداشتکردنی ژیانی ڕۆژانە و دەربڕینی بیروباوەڕ و هەست و نەستی بەرامبەر بەکوردایەتی، ئەم شێوە نووسینە ئاسۆییێکی جوانی ڕۆمانتیکییانەی داوەتە پەخشانەکە.

وێنەییێکی دیکەی پەخشانی ئەمین زەکی لە پێشەکیی کتێبی «تاریخی سلێمانی و وڵاتی»دا بەناوی «سکالاییێک» دەڵێ:

«هیچ وڵاتێ نییە کە لە سەحنەی تاریخدا وەزیفەی خۆی بەجێ نەهێنا بێ. وڵاتی سلێمانیش یەکێ لەوانەیە. لە زۆر قەدیمەوە تا زەمانی ئیحتیلال زۆر حادیسات و مەسائیبی دیوە. شاخی پیرەمەگروون ئەگەر بهاتایە زمان و ئەوی دیویە بۆی بگێڕاینایەوە لە سەرگوزەشتی حەقیقیی ئەم وڵاتە زۆر باش حاڵی ئەبووین. بەڵام ئەمە تەمەنیی مەحاڵە. پێشینانیش لەم خوسووسەوە زۆر کەمتەرخەمییان نواندووە، وە لە حەق سەرگوزەشتی وڵاتەکە هیچ میراتێکی نووسراویان بۆ بەجێ نەهێشتووین، وە ئەم نەوعە ئەرکانەیان خستۆتە سەر شانی پاشینان؛ خۆش بێ و ترش بێ ئەبێ قوبوولی بکەین و



ئێمە هەوڵی بۆ بدەین. بەم فیکرە ئەمە چەند ساڵێکە خەریکم، ئەخوێنمەوە، وە لە هەر کتێبێکدا دەرحەق بەم وڵاتە شتێکم دیبێ لە پارچە کاغەزێکم نووسیوە. لە دواییدا ئەمانەم کۆکردەوە و بەگوێرەی زەمانی سەرگوزەشتێکی کورتی وڵاتەکەم لێ دروست کرد و گەیاندمە دەوری ئیحتیلال (١٩١٨م). مومکین بوو کە تا ئەمسالیشی بهێنم، وە ئەوی پێویست بێ هەیە بەڵام بەفیکرێکی ئیحتیات وازم لێ هێنا چونکە لام وایە نە سیاسەت و نە ئەشخاسی ئەم حادیساتە تەحەممولی بیستنی حەقایەقیان نییە، بەش بەخۆم منیش حەز بەدرۆ ناکەم.

بەغدا: محەمەدئەمین زەکی»

ئەم دوو پارچە پەخشانە نموونەییێکی جوان و ڕاستەقینەی تازەکردنەوەی پەخشانی کوردین لە دوای جەنگی یەکەمی گێتی. بێ گومان شەقڵی شێوازی نووسینی ئەمین زەکی تیایاندا بەدی دەکرێ، لەگەڵ ئەوەشدا بەگشتی ئەم شێوازە لەگەڵ شاعیر و نووسەرانی دیکەی کورد یەکتری دەگرنەوە. دەکرێ ئەدگار و شوێنەواری تازەی شیعر و پەخشانی عوسمانی لە ناویاندا بدۆزرێتەوە.

لەم نموونە ئەدەبییە کەمانەی ئەمین زەکی ئەوە دەردەکەوێ ئەگەر ئەم ڕۆشنبیرە لە منداڵییەوە خووی بدابایە ئەدەب، بەهۆی ئەم هەموو بار گرانییە لە زانست و زانیاری و زانینی ئەم هەموو زمانە ڕۆژهەڵاتی و ڕۆژئاواییانە بلیمەتێکی گەورەی لێ دەکەوتەوە لە گێتیی ئەدەبی کوردیدا.

***

ئەمین زەکی نموونەی خوێندەوار و ڕۆشنبیرێکی تازە بابەتی کۆمەڵی کوردەواری بوو. کوردی زانی باش بوو لەگەڵ ئەوەی درەنگ کەوتە پراکتیکی نووسینی کوردی، خاوەن شێواز بوو. نووسینی پەیکەری زمانی کوردی ڕۆشنبیرانی ئەو سەردەمە بوو. شێوازی نووسینی پەخشانی ئەمین زەکی لە هەموو بەرهەمە کوردییەکانیدا هەر ئەو شێوازەیە کە شاعیران خوێندەواران تا ناوەڕاستی سەدەی بیستەم لە کوردستانی ئێران و عیراق بەکاریان هێناوە.

## بەشی هەڤدەم

### سابیری

**١٨٨٢ - ١٩٤٤**

### ژیانی

نەجمەدین کوڕی شێخ عەبدولڕەحمان کوڕی شێخ مەحموودی قوتبی شۆڕیجەیە، لە نەوەی شێخ محیەدینی قوولەیە کە ئارامگای لە گۆڕستانی ئیمام قاسمە لە شاری کەرکوک. لە ساڵی ١٨٨٢ لە گوندی شۆڕیجەی ناوچەی قەرەحەسەن لە دایک بووە. خوێندنی سەرەتایی لە حوجرەی مزگەوت بووە، لەبەر هەر هۆیێک بووبێ تەواوی نەکردووە، بۆیە نەبووە بەمەلا. لە کۆمەڵی کوردەواریدا ناوی شێخ لە مەلا گەورەتر بووە، ئیتر بەمیرات شێخێتی بۆ ماوەتەوە و بووە بەجێنشینی باب و باپیرانی و تەکیەی تەریقەتی قادری بەڕێوە بردووە.

ئەوەی زیاتریش بووە بەهۆی ڕێز لێنانی لە ناو کۆمەڵدا ئەوەیە لە بنەماڵەی سەیدانی بەرزنجی بووە. بەشێخ نەجمەدین ناوی دەرکردووە، لە شیعردا نازناوی «سابیری» (صابری) بۆ خۆی هەڵبژاردووە. بەهۆی ئەوەی خوێندنی حوجرەی تەواو نەکردووە، زوو ژنی هێناوە و بووە بەخاوەن ماڵ لە گوندی شۆڕیجە. بەزۆری لە ژیانیدا خەریکی شێخایەتی و بەڕێوەبردنی تەکیە و دەروێش و مریدەکانی بووە، کەمتر پەرژاوەتە سەر ماڵداری و خۆ خەریک کردن بەکاروباری کشتوکاڵی. سابیری وەک شێخی تەریقەتی دەروێشی لە گوندەکەی خۆیدا ژیاوە و گەورە بووە، ئاگای لە خەڵکەکەی خۆی بووە و ئیشوکاریانی جێبەجێ کردووە.

تەکیە و دیوەخانی سابیری هەمیشە ئاوەدان بووە، بێ میوان نەبووە. پێوەندیی کۆمەڵایەتی بەهێز بووە لەگەڵ زانا و پیاوماقووڵانی ئەو سەردەمە. میوانداریبیانی کردووە، خۆشی بووە بەمیوانیان. لەوانە شێخ مەحموود، مەلا ئەحمەدی فورقانی ڕۆژبەیانی، سەید ئەحمەدی خانەقا، ڕەفیق ئەفەندی خادیمولسەججادە، سەید محەمەدی جەباری، شێخ عەبدولکەریمی قادر کەرەم، شێخ سەعید گۆیتەپە، شێخ قادری گوللە نەبڕ و هی دیکە.

لە ماوەی گرانی گەورە پێش کۆتایی جەنگی یەکەمی گێتی لە ساڵی ١٩١٧ لەبەر سەختیی ژیانی دارایی و کزی ئابووری ناچار بووە بار بکا بۆ گوندی دێلێژە، لەوێ خزم و کەسوکاری هەبووە، لە پاش ساڵێک بەهۆی کۆتایی جەنگەوە گەڕاوەتەوە شۆڕیجە و لەم ماوەیەدا هەوەسی شیعر زۆر کاری لێ کردووە لەبەرئەوە ژیانی خۆی بۆ ئەم مەبەسە تەرخان کردووە. لە بابەت ئەو دیاردە سایکۆلۆجییەی ناوەوەی خۆیدا دەڵێ:

شێواوم وێنەی قەیسی عامیری
ناوم نەجمەدین لەقەب سابیری
ئومێدم وایە سەتتارولعوبووب
بداتە سابیر سەبرەکەی ئەیووب
یا دڵی غەمگین بەوێنەی یەعقووب
عاقیبەت ڕۆژێ بگاتە مەتلووب

لە سەردەمی بەساڵاچوونی تەمەنیدا سابیری تووشی نەخۆشی لەرزۆکی بووە، هەر ئەو نەخۆشییەش کۆتایی بەژیانی هێناوە، لە ڕۆژی ٩ی کانوونی یەکەمی ١٩٤٤ کۆچی دوایی کردووە و لە گوندی شۆڕیجە نێژراوە.

### شیعری

#### شیعری سابیری لە ڕووی ڕوخسارەوە

سابیری لەو شاعیرە کلاسیکییانەیە بەشێکی زۆری لە بەحرە عەرووزییەکان بۆ کێشی شیعری خۆی بەکار هێناوە، ئەو بەحرانە بەپێی زۆری و کەمییان ئەمانەن: ڕەمەل، هەزەج، ڕەجەز، سەریع، موزاریع، موتەقاریب، موجتەس. لە بارەی قافیەوە سابیری یەکێکە لە شاعیرە هەرە دەگمەنەکانی کورد کە هەموو دەنگەکانی ئەلفوبێی عەرەبی کردووە بەقافیە تەنیا تیپی (ظ) نەبێ. لە دەنگەکانی ئەلفوبێی زمانی کوردیدا کە لە عەرەبی بەرچاو ناکەون تەنیا تیپی (ژ)یی بەکار هێناوە.

سابیری بایەخی بەوشەی پاش قافیە داوە، ئەگەرچی بەپێی قەوارەی شیعری زۆر نییە لەگەڵ ئەوەشدا پاش قافیەی جوان بەرچاو دەکەون، وەکو ئەمانە: دەکا، خودایا، نەما، ئەلغەیاس (الغیاث)، ڕووح، لەزیز (لذیذ)، نەخۆش، درێغ، فیراق، بم، نادەم، چبکەم، تۆ، ئەمشەو، ڕۆژ و شەو، نییە، کەی دەبێ، تاکەی، نەبێ.

بەچاوێکی ڕەخنەگرانە ئەگەر سەرنجی تەرکیبی ناوەوەی ڕوخساری شیعری سابیری

بدرێ، هەندێ تێبینی گەڵاڵە دەبێ وەکو ئەوەی زمانی ئاسانە، وشەی قورسی بێگانە کەم بەکار دێنێ، کەچی وشە و ڕستەی عەرەبی ساکاری ناو زمانی ستانداردی ڕۆژانە لە شیعریدا هەیە. شیعری بەگشتی لەگەڵ ئەوەی لە ڕووی کێشەوە ڕەوانن، لە بارەی ڕیتم و مۆسیقاوە گرێیان تێدا هەیە، بەگشتی شاعیر ئاگاداری قافیەی شیعرییەتی لەگەڵ ئەوەشدا هەندێ جار ساتمەی تێدا دەکا. دووبارەکردنەوەی وشەی قافیە لە شیعرێکدا بەرچاو دەکەوێ، ئەمە بەخەوش دادەنرێ و لە نرخی هونەری شیعرەکە کەم دەکاتەوە. بایەخی ئەوتۆی بەڕەوانبێژی کلاسیکی نەداوە.

## شیعری لە ڕووی بابەتەکانەوە (ژانرەکانەوە)

بەگشتی ئەگەر تەماشای بابەتەکانی (ژانرەکانی) شیعری سابیری بکرێ، ئەم جۆرە لیریکانە بەرچاو دەکەون:

١- بەشی هەرە زۆری شیعری لە جۆری پارچەیە، لە حەوت دێڕ کەمتر، هەروەها غەزەل، لە حەوت دێڕ زیاتر، ئینجا قەسیدە لە دوازدە دێڕ بەرەو ژوور، بەم پێیە دەکرێ هەموو شیعری دیوانی سابیری بەلیریک بژمێررێ.

٢- هەندێ پێنجین لە دیوانیدا بەرچاو دەکەون، هەموویان لە ڕووی قافیەوە ئاسایین (ا ا ا ا ب...).

٣- کۆمەڵێک چوارین لە دیوانیدا دەبینرێن، ئەمانە هەموویان لە ڕووی قافیەوە ئاسایین و لە هەردوو جۆری چوارینیان تێدایە (ا ا ا ا) و (ا ا ب ا).

٤- دیوانی شیعری سابیری تەنیا لیریکێک جووت قافیە (مەسنەوی) دەور دەکاتەوە (ا ا، ب ب، جـ جـ...) لە بابەت کێشەوە خۆماڵی سیلابی دە کەرتییە.

٥- سابیری وەک هاوولاتییێکی دانیشتووی ناوچەی کەرکووک یادی دیالێکتی گۆرانی زمانی کوردی کردۆتەوە، شیعرێکی لەم بابەتەوە هەیە. لە ڕووی کێشەوە خۆماڵی سیلابی دە کەرتییە، لە ڕووی قافیەشەوە جووت قافیە (مەسنەوی)یە.

٦- هەندێ شاعیری کورد شیعری سابیرییان کردووە بەپێنج خشتەکی، لەوانە جاهید شیعرێکی کردووە بەپێنج خشتەکی بریتییە لە پێنج بەند، شیعرێکی دیکەی لە دە بەند پێکهاتووە، هەروەها جەمیل ڕۆژبەیانی شیعرێکی دیکەی سابیری کردووە بەپێنج خشتەکی لە دە بەند پێکهاتووە.



## شیعری سابیری لە ڕووی ناوەرۆکەوە

هەرچەندە لایەنی ئایینی بەسەر زۆربەی بەرهەمی سابیریدا زاڵە، لەگەڵ ئەوەشدا هەموو شیعری بەگشتی دەچنە خانەی وەسف و دڵدارییەوە. ئەگەر هەر ئاماژەیێک بۆ ناوەرۆکی دیکەی وەکو ستایش و کۆمەڵایەتی و ئاوڕدانەوەی سۆفیزم لە شیعریدا دەبینرێ مەبەسی سەرەکی نەبووە. ئەگەر پێویست بێ سیفەتی پسپۆری بدرێ بەم شاعیرە دەبێ بەشاعیری وەسف و دڵداری دابنرێ. وێنە و مانای شیعری سابیری بەهێمنی و سادەیی و بێ زیادەڕۆیی لە دەوروبەری شیعری شاعیرانی نەوەی دووەم و سێیەمی قوتابخانەی نالی کوردستانی باشوور دەسووڕێنەوە.

## نموونەی شیعری

١

لە لیریکێکی وەسفیدا دەڵێ:

مەرحەبا ئارامی گیان ڕۆشنایی چاوەکەم
شۆخی کەو ڕەفتارەکەم عەییار و ئاهوو چاوەکەم
ئەی برۆ شمشێر و لێو مەرجان و پەرچەم خاوەکەم
قەد نەمامی عەرعەر و ڕووت ترێ کاژاوەکەم
دلبەری گوڵ ڕەنگەکەم تەن ناسک و دڵ سەنگەکەم
نازەنین و شەنگەکەم مەست و خودا پێداوەکەم
یاخودا زوو بێتەوە ڕووحی ڕەوان و نووری چاو
یەعنی کەو ڕەفتارەکەم دڵ ناسک و تۆراوەکەم
مەستەکەی مەی نۆشەکەم سەربەست و مەشرەب خۆشەکەم
جان و عەقڵ و هۆشەکەم مەستوور و ڕوو پۆشراوەکەم
گفتوگۆ شیرینەکەی مایەی حەیات و ژینەکەم
جوێن و بوغز و قینەکەی چای و جغارە و قاوەکەم
هاتن و دەرکەوتنی دەرمانی دەرد و زامەکەم
خاکی ڕێگەی سورمەیە بۆ نووری هەردوو چاوەکەم

تابەکەی چاوم بەسەر شار ڕێوە بێ هەیهات هات
ئاگری نەکوژایەوە کوورەی دڵی سووتاوەکەم
یووسفی میسری تەماشایە کە حاڵی (سابیری)
پیرە دڵسووتاوەکەی کەنعانم و بێ چاوەکەم

سابیری لەم شیعرەدا گفتوگۆ لەگەڵ دلبەردا دەکا، دەمێکە نەیدیوە، لە ناو دڵتەنگی و پەژارەی دووری دەتلێتەوە، لە هۆش خۆی چووە نازانێ چی دەوێ، لەگەڵ ئەوەشدا هوشیارە دەزانی چۆن وەسفی ئەندامە جوانەکانی دلبەر بکا. دیارە شاعیر دەیەوێ ئەوە دەربڕێ جوانی دلبەر لە پلەیێک دایە ئەوە دەهێنێ بۆی شێت ببێ و بەڕاستی بێ ئەگەر خۆی لەگەڵ یەعقووبی کوێری پیری کەنعان بەراوورد بکا و یارەکەشی وەکو یووسف وەک ڕەمزی جوانی و دڵداریی بەڕاستی.

۲

وەکو شیعرەکەی پێشوو دیسانەوە شاعیر خەریکی موناجاتە لەگەڵ دلبەر:

مووددەتێکە شەو ئەناڵێنم لە ژێر پاسارەکەت
خۆت نەکردە خاوەنی خەستەی لە گیان بێزارەکەت
وا لە چاوم جارییە فرمێسکی خوێن باوەڕ بکە
ڕێ نەما خێڵی خەیاڵت بێتە لای بیمارەکەت
تا خەیاڵت پادشاهی شاری دڵ بێ موشکیلە
قاسیدی خەو ڕوو بکاتە چاوی خزمەت کارەکەت
هاژە هاژی سەیلی چاوم پڕ بەعالەم مەوج ئەدا
قەترەیێ نایێتە بەرچاوت لە سەختی قارەکەت
تا نەهاتم بۆ نەهاتی تا تەبەییوون بێ بەهات
تازە هاتی هاتنت هەیهاتە بۆ غەمبارەکەت
حەسرەتا ڕۆژێ نەهاتیتە سەرینم پێم بڵێی
ئەی غەریبی شارەکەم چۆنی لەگەڵ ئازارەکەت
سەبرە چارەی دەردی دووری زیکرە دەرمانی گوناه
زوو دەگاتێ حاسیلاتی سەبر و ئیستیغفارەکەت



(سابیری) ووریا بە خۆ ئەو شۆخە وەعدەی دا بەتۆ
نەک هەمیسان ڕەنجەڕۆیی دەردی ساڵی پارەکەت

هەرچەندە شاعیر زیاتر بێ ئارام و دەردەدار بێ لەبەر دووری لە یار ئەو زیاتر گیرۆدەی دەبێ. سابیری ئاواتەخوازی هاتنی خۆشەویستە بۆ ئەوەی دڵی بداتەوە، ئەو ئازارەی لە دووری ئەودا دەیچێژێ ئەوەندە دژوارە هیچ شتێک چارەی ناکا هاتنی ئەو نەبێ. وشەکانی هات و نەهات و هاتە هات جۆرە وێنەیێکی ڕەوانبێژییان دروست کردووە لە لیریکەکەدا.

۳

لە وەسفێکی گشتیی یاری سابیری دەڵێ:

وا دیارە چاوی یارم مەیلی بیماری دەکا
دڵ کە بێ سەبر و قەرارە شێوەن و زاری دەکا
باقلم بادی سەبا ڕێی کەوتە نێو گوڵزاری ڕووی
وا کە ئیستیهزا بەعەتر و میسک و تاتاری دەکا
هەر کەسێ جارێ ببینێ سووڕەتی یارم لە خەو
تا بمێنێ زیکر و شوکری نیعمەتی باری دەکا
هەر کەسێ هوشیارە مەیلی یار و دڵداری دەکا
بینە سەیری چاوی یارم مەیلی بیماری دەکا
خۆشە شەو ناڵین و جەوری یار و زامی نادیار
خاسسە بۆ ئەو کەسانەی زیکری جەبباری دەکا
گفتوگۆیی سابیری بۆیە هەموو مەستانەیە
چاوی یاری کاروباری خەمری خەللاری دەکا
مووددەعی لۆمەم ئەکەن سەد کاشکی تۆیان ئەدی
تا بزانن (سابیری) هاواری ناچاری دەکا

لەم بڕە شیعرەدا شاعیر ئەوە دەردەبڕێ یاری ئەوەندە جوانە هەر کەسێ چاوی پێی بکەوێ گرفتاری دەبێ. ئەگەر لە ڕووی سایکۆلۆجییەوە لەمە بکۆڵرێتەوە پێویستە شاعیر پێی ناخۆش بێ ئەگەر یەکێکی دیکە یارەکەی خۆش بووێ، کەچی لەوانەیە ئەمەی بۆ شانازی خۆی بێ بەو مانایەی ئەوەندە جوانە هەموو کەس حەزی لێ کردووە.

٤

لە وەسفێکی دیکەیدا یار بەهاری هەمیشەییە:

نەسیمی سوبحدەم مۆژدەی بەهاری حوسنی یاری دا
نیشانەی جەژنی نەورۆزی لە شاری دڵ دیاری دا
کە داخیل بوو بەشاری دڵ سوپاهی حاکمی عادل
دز و جەردەی غەم و غوسسە لە ترسی ڕووحی غاری دا
بیحەمدیللا سەفینەی دڵ لە گێژاوی بەلا دەرچوو
ئیتر ئاسوودەیە بێ غەم لە بەحری لوتفی باری دا
ئەما ئاساری غەیری حەق لە نێو شاری دڵم موتلەق
کە هەر کەس لێم قوبوول ناکا خودا تەوفیق و یاری دا
ئەما دەرد و غەم و میحنەت لەولا شادییە و عیشرەت
لە نێو بازاڕ و شاری دڵ موبەششیر هات و جاڕی دا
وەرە (سابیر) دڵ و جانت نیساری پایی دلبەر کە
ئەوا بمرم بڵێن ئەو شێتە ئەیزانی خەساری دا

لەم پارچە شیعرەدا سابیری لە وەسفی جوانی یاریدا شنەباییێکی ناسک و تەنکی سۆفیزم دەپژێنێتە ناو دڵ و دەروونی خوێنەر کە باس لە هەستی ناو دڵی خۆی دەکا. جوانی یارە بەهاری هێناوە و مۆژدەی نەورۆزی بەخەڵکی گەیاندووە. هەرچی خراپە هەیە لەو ڕۆژە پیرۆزانەدا لە ناو دڵ دەچنە دەرەوە، چونکە دڵ لە ڕاستی (حەقیقەت) بەولاوە هیچ شتێکی دیکەی گەرەک نییە، بەم ڕێگەیە نەبێ ناگاتە «موتلەق».

٥

لە پارچە شیعرێکی دیکەیدا سابیری لە عیشق دەدوێ:

نیشانەی عاشقی وایە کە ساتێ یاری لێ وون بێ
دەبێ دەر لەحزە ئەحوالی بەسەد گۆنە مولەووەن بێ
دڵێ پڕ دەرد و ڕەنگی زەرد و لێوی ووشک و چاوی تەڕ
سیاپۆش و جەفانۆش و سەراپا غەرقی ناوخوون بێ



جەفا وو لوتف و هیجر و وەسڵی یار و شیوەن و شادی
لە لای یەک سان و دڵ وەک خانەیی زەنبوور کون کون بێ
کە دلبەر هات و ڕووحم چوو کە ڕۆیشت و دڵی بردم
ئیتر جان و دڵی بێچارە چۆن ئیسکان و ساکین بێ
ئەتیببا عاجزن بێ شک لە دەرمانی دڵی (سابیر)
ئەگەر لوقمان و جالینۆس ئەرەستۆ یا فلاتوون بێ

لەم شیعرەدا شاعیر هەندێ لە هەوای ناو ماڵی سۆفیزمی بێ پایان هەناسە دەکێشێ. بەونبوونی یار دڵدار شپرزە دەبێ، چونکە گیانی لەگەڵ خۆیدا دەبا. دەرمانی ئەم دەردە نەدۆزراوەتەوە، تەنانەت فەیلەسووفە گەورەکانی ڕۆژگاری وەکو لوقمان و جالینۆس و ئەریستۆ و ئەفلاتوونیش ڕێی پێ نابەن.

٦

لەم پارچەیەدا سابیری بەراوورد لە نێوان عاشق و عاقلدا دەکا:

عاشقان دڵیان بەدائیم پڕ خەیاڵ و پڕ مەلال
بۆیە ڕۆژ و شەو دەکەن بەحسی جەمال و زولف و خال
عاشق و عاقل ئەگەرچی ڕەنگ و سووڕەتیان یەکە
هەریەکێ تامێکی تێدایە تورنج و پورتەقال
عاشقان نالان و بێ سەبر و قەرار و گفتوگۆ
عاقلان دڵشاد و خوررەم نیکتەدان و خۆش مەقال
عاشقان مەجنوونی دووری لەیل و بیمار و زەعیف
عاقلان ساغ و سەلیم و شاد و مەستی خەتت و خال
عاشقان پەروانە ئاسا سەرف ئەکەن جان و ووجود
عاقلان (سابیر) گەلێ کۆشش ئەکەن بۆ جەمعی ماڵ

ئەم بۆچوونەی سابیری بەڕاستی بەراووردێکە لە نێوان «عاشق» و «عاقل» وەک زاراوەییێکی سۆفیزم، هەر لەو کاتەدا پێوەندیی نێوان «تەریقەت و شەریعەت» واتە «سۆفی و واعیز» دەخاتە ڕوو، ئەمە ڕوونکردنەوەی ئەو زۆرانبازی و دژایەتییەیە لە نێوان «بزووتنەوە و نەبزووتنەوە». بۆ ئەمە سابیری بەڵگەی جوان دێنێتەوە، بەلای ئەوەوە عاشق

هەمیشە بیر دەکاتەوە، دەناڵێنێ و ئۆقرەی نییە، لەڕ و لاوازە، شێتی لەیلایە، عاشقان پەروانەن ئەنجامیان سووتانە؛ کەچی عاقڵان دڵیان شادە، قسەیان خۆشە، لەش ساغ و جوانی ڕووکەشیان پێ باشە، پارە پەرستن. ئەمە ئاوڕدانەوەی ژیرانەیە لە وەسفی گیانیی گێتیی سۆفیزم.

## ٧

بەشێوازی شیعرەکەی پێشوو سابیری دەڵێ:

نەوبەهارە مەوسیمی پشکووتنی گوڵ هاتەوە
ئیعتیباری شیوەن و هاواری بولبول هاتەوە
خوێنی چاوی عاشقانە ڕووی زەوی نەخشاندووە
زەحمەتە سەیلی بەهاری نەقشەکەی بشواتەوە
حەزرەتی لوقمان فەرەزنا ئێستە زیندوو بێتەوە
باوەڕم نایە برینی عاشقان چاکاتەوە
کەی ئەبێ یارەب سبەینانی نەسیمی ئاه ئاه
سا لە باغی جەننەتی حوسنی گوڵی گەشکاتەوە
ئەو بەتیری غەمزەکەی جەرگی بریم و تیری من
هەر هەناسەی سەر دەهاوێتم ئەویش بۆم هاتەوە
ئەهلی دونیا بۆ پڵاوە جۆ بڵاوی لێ ئەکەن
دابنیشە نانە ڕەق بوو ناتە ناو شۆرباتەوە
ڕاحەتی ئینسان لە بێ دەنگی ئەبێ سابیر خەمۆش
تۆ کە عەبدی حەیفە ڕوو ناکەی بەلای مەولاتەوە
(سابیری) یەعقووب ئەگەرچی هیجری یووسف کوێری کرد
حەمد و سەبری کرد بەعادەت یووسفی بۆ هاتەوە

شاعیر دوو دیاردەی پێچەوانە کۆ دەکاتەوە، لە لاییێک بەهار و خۆشی پێشکێش بەئادەمزاد دەکا، لە لاییێکی دیکەوە شیوەن و ڕۆ ڕۆ بۆ بلبل دەبا. گوڵ و گوڵزاری بەهار خوێنی چاوی عاشقانە، سەیلی بەهار نایشواتەوە. یار بەتیری غەمزەی جەرگی عاشق کون دەکا، لە هەناسەی سارد و ئێش و ئازار بەولاوە عاشق چی پێ دەبڕڕێ! دانایی لەوە دایە پیاو ئارامی ببێ، ئەمە بووە هۆی ئەوەی یووسف بێتەوە و یەعقووب چاوی بکرێتەوە.



## ٨

کڵاوی سەر دڕاوی خۆم بەتاجی پادشا نادەم
کەلاوەی دووکەڵاوی خۆ بەقەسر و گەنجی شا نادەم
پڵاوی سەر بەکشمیشی فەقیری یەعنی ئاسایش
خودا بێدا لەمەولا ڕوو بەترشی شۆربا نادەم
کەلاوەی خۆم بەدەستی خۆی گوڵاوم لێ بپرژێنێ
ئیتر حاشا وەکەللا دەس لە داوێنی سەبا نادەم
بەخوێنی جیفە بەرگی زاهیدی ئالوودەکەم شێتم
بەتەوفیقی خودا دینم بەدوو نان و عەبا نادەم
کلیلی (سابیری) قاپی هەموو مەقسوودێ هەڵدەگرێ
بیحەمدیللا بەدەس گرتوومە ڕەنجی خۆم بەبا نادەم

ئەم شیعرە وەسفێکی داناییانەیە، شاعیر لە ڕەوشتی خۆی دەدوێ، ئامۆژگارییێکە پێویستە هەموو کەسێک گوێی لێ بگرێ و پێڕەوی بکا. هەموو ئادەمزادێک دەبێ سەری بۆ کەس شۆڕ نەکا و زەمینە نەخولقێنێ خەڵکی سەری بۆ شۆڕ بکەن. ئەم قسەیەی سابیری لە ڕووی جوانکارییەوە هەرچەندە شاعیرانەیە بەڵام لە ڕووی واقیعییەوە زمانی حاڵی خۆیەتی، واتە ئەوەی دەیڵێ تەنیا بەقسە نییە. وەکو لە مێژووی ژیانی دەردەکەوێ هەمیشە پێڕەوی کردووە و لەسەری ڕۆیشتووە.

***

نەجمەدین کوڕی شێخ عەبدولڕەحمانی بەرزنجیی ناسراو بەسابیری نموونەیێکی دیکەی شاعیرە کلاسیکییەکانی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمە. شیعری بەقەوارە کەم نییە، لە ڕووی هونەرییەوە بەرزە. لەو کاتەی بایەخی زۆری بەکێش و قافیە و زمانی شیعر و وێنەی هونەری داوە، لە بابەت ناوەرۆکەوە سنوور کێشراوە. لە هەموو بابەت و ژانرەکانی شیعری کلاسیکی نەوتووە، لەگەڵ ئەوەشدا ئەوەی وتوویەتی بەزۆری مەبەسەکانی تێکەڵ بەیەکتری کردووە. ئەگەر هەموو بەرهەمی شیعری یەکالا بکرێتەوە بێ گومان لە ناو مەبەسی وەسف و دڵداریدا کۆ دەبێتەوە. شوێنەواری جوانکاری کلاسیکی قوتابخانەی کوردستانی باشوور لە شیعری سابیریدا ڕوون و ئاشکرایە، ئەمە بەڵگەی ئەوەیە شاعیر وەک کەسێکی دیار لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا خۆی دەنوێنێ.

## بەشی هەژدەم

### شوکری فەزلی (هەممی)

### ١٨٨٢ - ١٩٢٦

«شا وەکو شایەکی شەترەنجە لە عالەم ئەمڕۆ
گەورە قانوونە قسەی کورت ئەوەیە درێژی نەکەی»

### ژیانی

شوکری کوڕی مەحموود ئاغا کوڕی ئەحمەد ئاغایە، لە بنجدا باپیرانی لە سنەوە هاتوونەتە سلێمانی تازە پایتەختی میرنشینی بابان. لە ساڵی ١٨٨٢ لە بەغدا لە دایک بووە. دایکی عائیشەی کچی ئیسماعیل ئەفەندییە، یەکێ بووە لە ئەفسەرانی سوپای عوسمانی لە بەغدا. عائیشە بەنەژاد لە عەشیرەتی کوڕوی عەرەبییە. ماڵی باوکی شوکری لە سلێمانی بووە، بەهۆی کاروباری بازرگانییەوە هاتوچۆی بەغدای کردووە، لەبەرئەوە لەوێش ماڵی داناوە، عائیشەی هێناوە و لە گەڕەکی فەزل دانیشتووە، ئیتر شوکری لەو ماڵە لە دایک بووە و لە دواییدا بەشوکری فەزلی ناوبانگی دەرکردووە، ناوی فەزلی لە گەڕەکی فەزل وەرگیراوە.

شوکری سەردەمی منداڵی لە بەغدا بردۆتە سەر. لە تەمەنی شەش حەوت ساڵیدا خالید سەید ساڵحی کوڕی ئیسماعیلی خاڵی مووچەخۆرێکی عوسمانی بووە لە بەغداوە گوێزراوەتەوە بۆ سلێمانی، شوکری لای ئەو بووە و لەو شارەدا لە ماڵی ئەو ژیاوە. سەرەتای خوێندنی لە قوتابخانەی میری بووە. لەو ماوەیەدا شێخ مەحموودی ناسیوە و لەو ساوە بەدرێژایی ژیانیان هاوڕێی نزیکی یەکتری بوون.

ژیانی بەرایی شوکری لە سلێمانی ئاسان و بێ گرێ بووە چونکە جگە لە خاڵی خزمانی لای باوکیشی ئاگاداری بوون و ئەوەی پێویست بووە بۆیان کردووە. زۆربەی ماوەی ژیانی لە منداڵییەوە تا دەوروبەری تەمەنی چل ساڵی لە سلێمانی بردوویەتییە سەر. ژیانی سلێمانی هۆی هەرە گرنگ بوو بۆ خەملاندنی خوێندەواری کوردی و ئەدگاری نەتەوەیی میللەتی کورد بەقووڵی لە مێشکی شوکریدا بچەسپێ، هەروەها زمان و مەدەنییەتەکانی عەرەب و تورکی عوسمانی و فارس بێ بەبنج و بناوان بۆ دروستبوونی کەسێکی



هوشیاری دڵسۆز و ڕۆشنبیرێکی گەورەی وەک ئەو.

قۆناغی ژیانی یەکەمی شوکری لە بەغدا کورت بووە، ئەگەر لە ساڵی ١٨٨٨ لەگەڵ خاڵی چووبێتە سلێمانی تەمەنی شەش حەوت ساڵ بووە، لە پێش دەستپێکردنی جەنگی یەکەمی گێتی لە سلێمانی گەڕاوەتەوە بەغدا و لەوێ جێنشین بووە تا دوایی ژیانی. ساڵانی ژیانی بەغدای شوکری بەپیت بووە، کارێکی زۆری ڕۆشنبیری گەیاندۆتە ئەنجام. پێوەندیی لەگەڵ ڕۆژنامەگەری کوردییەوە هەبووە، لە ڕۆژنامەی تێگەیشتنی ڕاستی (بەغدا ١٩١٨) بەزمانی کوردی دەوری سەرەکی بووە، لەگەڵ کوردناسی ناودار ئی. بی. سۆن لە نووسین و دەرهێنانی ڕۆژنامەکە بەشداری کردووە. جگە لەمە لە ڕۆژنامە عەرەبییەکانی ئەو سەردەمەی عیراق کاری کردووە و نووسینی بڵاو کردۆتەوە. لە نووسینە عەرەبی و کوردییەکانیدا بایەخی بەئەدەبی کوردی و ئایینەکانی ناو کۆمەڵی کوردەواری داوە، وەک ئێزدی، یارسان (ئەهلی حەق).

لە ڕۆژگارانی پراکتیک کردنی قانوونی زمانانی ناوچەیی لە عیراقدا شوکری وەک ئەندامێک هەڵبژێرراوە لەگەڵ تۆفیق وەهبی و عەبدولڕەحمان ساڵح و نووری بەرزنجی بۆ دانان و وەرگێڕانی کتێبی قوتابخانە کوردییەکان لە زمانی عەرەبییەوە بۆ زمانی کوردی.

لەگەڵ دامەزراندنی دەوڵەتی عیراق بەڕەسمی لە ساڵی ١٩٢١ شوکری بوو بەمووچەخۆر لە دیوانی ئەنجومەنی وەزیران، لەو کارەدا مایەوە تا دوایی ژیانی.

شوکری لە تەمەنێکی کورتی لاویەتیدا تووشی نەخۆشیی سیل بووە. بڕیاری داوە ژن نەهێنێ. ئەمە هەڵوێستێکی مرۆڤایەتییانە بووە بەرامبەر بەخۆی و کۆمەڵ. لە بابەت ئەم مەسەلەیەوە حەمە بۆر (هۆشەنگ) لە زمانی بەدیعەی خوشکی شوکری فەزلییەوە دەگێڕێتەوە گۆیا وتوویەتی: نامەوێ بەهۆی کردەوەی خۆمەوە لە دوای خۆم هیچ کەس تووشی تەنگوچەڵەمە و نەهاتی بێ، نامەوێ دوای خۆم، ژن و منداڵ سەرگەردان و هەتیو بن! لەبەرئەوە ژنی نەهێناوە. شاعیری بەناوبانگ و گەورە شوکری فەزلی لە ساڵی ١٩٢٦ لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە.

### شیعری

ئەگەر تەنیا بەرەو ڕووی شیعرە دڵدارییەکانی شوکری ببینەوە بەرامبەر بەشاعیرێکی گەورەی قوتابخانەی نالی کوردستانی باشوور دەوەستین. شاعیر بەشدارییێکی زۆری لە

دەوڵەمەندبوونی ئەم جۆرە شیعرە کردووە، ئەو شیعرانە خاوەنەکەیان کردووە بەشاعیرێکی لە ڕوو لە مێژووی ئەدەبی کوردیدا. ئەمەیان بابەتی یەکەمی مەبەسی شیعری شوکرییە. کەچی ئەو تەنیا لەم بابەتەی نەوتووە، ئەمەیان بەشێکە لە بەرهەمەکانی بەشەکەی دیکەیان شیعرە ڕەندەکەیەتی «ئیش کە ڕووی ئێستە...» بۆ شێخ مەحموودی وتووە. ئەم تاکە شیعرە شەش دێڕییە گێتیییێکی گەورەی بێ پایانە، ئەوەندە بەنرخ و بەبەهایە، ئەگەر شوکری تەنیا ئەم شیعرەی هەبووایە، بەم شەش دێڕە دەبوو بەشاعیرێکی مەزن. بەشی سێیەمی بەرهەمی ئەدەبی شیعرە داشۆرینەکانیەتی، لەو لیریکانەیدا بەگژ لەندە هووری شیعری کوردی شێخ ڕەزادا چووە. شوکری بەرهەڵستی نەکردووە تەنیا بۆ ئەوەی خەڵکی بڵێن سەیرە چۆن ئەم شاعیرە توانیویەتی بەگژ شێخ ڕەزادا بچێ، بەڵکو شوکری هەندێ جار شاعیری گەورەی بەزاندووە و پشتی لە ئەرز داوە، ئینجا بزانە شوکری چی شاعیرێکی داشۆرین بووە!

بەرهەمی ئەم دوو شاعیرەی شیعری داشۆرین و کراوە (ئیرۆتیک) لەوانەیە لە ناو کۆمەڵدا هەڵوێستی کۆمەڵایەتی و ڕەشبینی تایبەتی هەبێ بەرامبەریان، بەڵام ئەنجامە جوانکارییەکەی ئەوەیە شیعری هەردووکیان لەم لایەنەوە ئەدەبی کوردی ڕەنگین کردووە و بەچاوێکی گەشبینی تەماشا دەکرێ.

شوکری وەکو شاعیرانی دیکەی کلاسیکی نازناوی شیعری هەبووە، هەندێ لە شیعرەکانی بەو ناوە پاراستووە، لە شیعریدا نازناوی «هەممی» هاتووە، ئەمە لە وشەی «همّ»ی عەرەبییەوە بەمانای (غەم) وەرگیراوە.

### غەزەل

ئەم بەشە شیعرەی شوکری دەچێتە ناو خانەی شیعری کلاسیکی لاسایی ئەوەی غەزەلی پێ دەوترێ. لەم بابەتەوە بەرهەمی کەمە، هەرچۆنێ بێ بەژمارە دەکاتە دە شیعر، بەقەوارە شیعرەکان گەلێ کورتن، لەمانە بەشی زۆریان لە پێنج دێڕ پێکهاتوون. سێ دێڕی و چوار دێڕی و شەش دێڕیشیان تێدا هەیە. بەم ڕەنگە زۆربەی شیعری شوکری پارچەیە، چەند شیعرێکیش حەوت دێڕی و هەشت دێڕین، تاکە شیعرێکی یازدە دێڕیش بەرچاو دەکەوێ.

لە ڕووی ناوەرۆکەوە ئەم بەشە شیعرەی دەچێتە ناو خانەی دڵداری و وەسفی ڕووکەشی دلبەر و سروشت، بەزۆری هەردوو بابەتی تێکەڵ بەیەکتری کردووە. هەندێ جار هەست بەستایش و پێدا هەڵدان و شانازی و دووری لە یار و دژی ڕەقیب دەکرێ، بەشێوەییێکی



سەربەخۆ یا لە ناو شیعرە دڵدارییەکانیدا. لەم بەشە شیعرەدا لە شێوازی شاعیرانی پێش خۆی نەچۆتە دەرەوە، ئەگەر خاسییەتێکی هەبێ ئەوەیە ڕەوان و ساکار و بێ گرێیە، بەئاوازێکی نەرم لە گوێی خوێنەردا دەزرنگێتەوە.

١

لە غەزەلێکیدا شوکری وەسفی هەندێ لە ئەندامە جوانەکانی دلبەری دەکا:

بەقامەت سەروی بوستانە بەڕوخ وەک ماهی تابانە
عەقیقی لێوی عیسا دەم ئەمیری جەمعی خووبانە
بەگەردن ئاهوویی چینە بەکاکۆڵ خاڵی موشکینی
لە نەسلی ئادەمە ئەمما لە جوملەی حوور و غلیمانە
پەشێواوە لەسەر سەفحەی عوزاری حاشییەی پەرچەم
لە دەرکی مەعنییی خەتتی خیرەد داماو و حەیرانە
عەجایب موعجیزێکم دی لە باغی حوسنی جانانە
لەسەر بەرگی گوڵی ئەحمەر بنەفشە زار و ڕەیحانە
لە بۆ نەخچیری دڵ (هەممی) موهەییا نێرگسی مەستی
موژەی تیروکەمان ئەبرۆ بەغەمزە ئافەتی جانە

لەم شیعرەدا شوکری پارێزگاری یەکێتیی بابەتی کردووە، بریتییە لە وەسفکردنی هەندێ لە ئەندامانی دلبەر و لەگەڵ دیاردە و بزووتنەوەکانی سروشت بەراووردیان دەکا. دەسکاری و ئاڵوگۆڕی وێنە کلاسیکییەکانی بەجۆرێک کردووە شیعرەکە وەک داهێنانێکی نوێ دەکەوێتە بەرچاوی شیعر دۆستان.

٢

شاعیر لەسەر هەوای شیعری پێشوو دەڕوا:

وا کاکۆڵی ئەو شۆخە بەدەم بادی سەباوە
ئێستاکە لە هەر لاوە پەرێشان و بڵاوە
خاڵی سیەه و پەرچەمی پڕ چینی لەسەر ڕوو
بۆ سەیدی دڵی عاشقە ئەو دانە وو داوە

چون ماه لەگەڵ ڕوومەتی ئەو بەیتە موقابیل
نەعلی فەرەسی ڕشکی مەهـ و قورسی هەتاوە
مەنعم مەکەن ئەر وەحشی سیفەت بادییە تەی کەم
هۆشم کە لە سەردا بەقەدەر زەڕڕە نەماوە
زۆر (هەمی) بەشۆر و شەڕە ئەو شۆخە بەغەمزە
هەر خوێنی شەهیدانە لەسەر ڕێگە ڕژاوە

لەم شیعرەشدا شاعیر یەکێتیی بابەتی پاراستووە، باسی لە کاکۆڵ و پەرچەم و خاڵ و ڕوومەت دەکا. کێش و ئاواز و ڕیتم و قافیەی ئەم شیعرە گێتیی شیعری نالی دێنێتەوە یاد، ئەو شاعیرە گەورەیەی تەنیا کاری لە شوکری نەکردووە، بەڵکو هەموو شاعیرانی کلاسیکیی کوردستانی باشوور قەرزاری ئەون.

## ٣

شێوازی نالی لە شیعرێکی دیکەی ڕەسەنی شوکریدا ئاشکرایە:

بۆ کوشتنی شەیدایان هەر لەحزە موهەییایە
ئەی دڵ حەزەری لێکە بێ خەوف و موحابایە
وا مەستە ئەڵێن چاوی بیبینە چ هوشیارە
بۆ سەیدی دڵی عاشق تیری لە کەمان دایە
نەفعی چییە ئەم ڕووحە هەر لەحزە ئەگەر نەیکەم
قوربانی قەد و باڵای ئەو دلبەرە ڕەعنایە
باعیس بەفیراقی یار هەر تەعنەیی ئەغیارە
کوێر بن هەموو مەحرووم بن لەو بەزم و تەماشایە
نەزم و غەزەلی (هەمی) شایستەیی تەحسینە
مەوزوون و تەڕ و شیرین دڵ جۆ وو دڵارایە

لەم شیعرەدا شوکری دلبەری کردووە بەپاڵەوانێک خوا هاوار ئەگەر تووشی دڵداران ببێ بێ گومان ئامادەیە بۆ کوشتنیان. شاعیر ئەگەر گیانی خۆی بەقوربانی ئەو دلبەرە نەکا مانای ئەوەیە خۆشی ناوێ. ئەم هەڵوێستە ئەگەر لە گێتیی شیعر و هونەر نەبێ داهێنان نابێ، ئەگەر نا لە ڕووی مەتریالییەوە تەماشای شاعیری ڕۆژهەڵات بکرێ جیگەری کردووە بەکەباب بۆ مەزەی دلبەر دەبی دامودەسگای ژیان دابخرێ.



## ٤

ڕەنگدانەوەی خەیاڵی عەبدوڵڵا بەگی ئەدەب لە شیعری شوکریدا بەرچاو دەکەوێ:

وا دلبەری ئەم شارە هەموو ماه جەبینن
یەغماگەری هۆش و خیرەد و ڕەهزەنی دینن
سیمین زەقەن و گوڵ بەدەنن کەبکی خەرامن
هەم ڕاحەتی جان و دڵی عوششاقی حەزینن
فیلجوملە وەکو تازە نیهالی ئیرەمن هەم
وەک لالەیی خولد و گوڵی فیردەوسی بەرینن
ئاهوو ڕەووشن تاووسی زەڕڕین پەڕ و باڵن
ئەم دەستە مەلائیک سیفەت و شەهر نشینن
هەریەک کە بەدوو نێرگسی جادوو لەفسوون دا
باعیس بەهەوا و کەشمەکەشی ڕوویی زەمینن
ڕوو غونچەیی لالەن وەکو غیلمانی بەهەشتن
با ناز و گریشمە هەموو وەک حوور جەبینن
هەریەک کە بەبۆبی شکەنی پەرچەمی پڕ خەم
قیمەت شکەنی ساحە وو هەم نافەیی چینن
بۆ بورجی تەماشا قەمەر و شەمس و نوجوومن
بۆ وەجهی لە تافەت هەموو وەک دوڕی سەمینن
یەک یەک هەموو ناوک مژە وو ئەبرۆ کەمانن
هەر لەحزە لە بۆ کوشتنی عاشق لە کەمینن
فاریغ نییە هەر لەحزە لە چەند لاشەیی عاشق
هەر لەحزە دوو سەد خەستە لەبەر ئاه و ئەنینن
دەستیان هەموو (هەمی) کە لەسەر تیغی دەبانە
هەر لەحزە وەها حازر و ئامادە بەکینن

ئەم شیعرە لە ڕووی کێش و ڕیتم و وێنەی شیعرییەوە هەندێ لە شیعرەکانی ئەدەب دێنێتەوە یاد. کۆمەڵە جوانێکی شارن، ئەو شارە سلێمانی بێ یا بەغدا هیچ لە مەبەسەکە

ناگۆڕێ. دەمێنێتەوە ناوەرۆک بەزۆری ئەو جوانانەی وەسفیان دەکا هەر ئەو کیژۆڵە قەشەنگانەن کە ئەدەب لە وڵاتی موکریان بەشیعر وەسفی جوانییان دەکا. خۆ ئەگەر خەیاڵێکی دیکە هەبێ وابزانێ شوکری لەم کۆمەڵە دلبەرە مەبەسی سوپای شێخ مەحموود بێ و لاسایی «ئەم تاقمە مومتازە...»ی نالی کردبێتەوە کە بۆ سوپای ئەحمەد پاشای بابانی وتووە، ئەمەیان هەندێ لە ناوەرۆکی شیعرەکە دوور دەکەوێتەوە. هەرچەندە سنوورێکی دیاریکراو بەگشتی لە بەرهەمی ئەدەبیدا دانەنراوە کوڕ و کچ، غیلمان و حووری، پۆلی کچانی گەنج و کوڕانی لاو لە یەکتری جیا بکرێنەوە. ئەمەو لەم شیعرەدا شوکری زۆرتر ئەو سیفەتانەی بەکارهێناوە کە بۆ کوڕی جوان بەکار دێن، کەمتر وێنەی وەسفی کچانی تێدایە.

### ٥

لە غەزەلێکیدا بەجۆرێکی دیکە وەسفی پۆلێک لەو جوانانە دەکا:

ئەم ساوە بەچانە کە لە ئەوسافی نەمامن
دەردت ئەدەنێ تەفرە مەخۆ قەت مەلێ ڕامن
گا دۆستی وەفا یار گەهی دوژمنی خوونخوار
دڵ نەرمە بێ گاهێک و گەهێ سەختی کەلامن
غەمگین مەبە نە بۆ تۆ وەفایان نییە بۆ کەس
مەعلوومە کە ئەم تاقمە وەک تاسی حەمامن
دووڕوون وەکو کاغەز دووزمانن وەکو خامە
ڕەش عەینی مەرککەب لە دڵ خارج لە نیقامن
هەر ئەو کەسە دانایە کەوا سەرفی نەزەر کا
لەو بێبەروپشتانە کەوا مەشهووری تامن
لەم عەسرە سەرت سوڕ مەکە (هەمی) کە ئەمانە
هەروا لە وەفادا چەنە بێ عەهد و دەوامن

شاعیر هیچ جۆرە سنوورێک یا ئاماژەیێکی بەوە نەکردووە ئەم پۆلە جوانانە کوڕن یا کچ، پیاون یا ژن. بەگشتی لە شیعرەکەدا کاریگەری عەبدوڵڵا بەگی ئەدەب و شێخ ڕەزا بەدی دەکرێ. یەکەمیان لە ڕووی ڕوخسارەوە بەتایبەتی کێش و قافیە و ئاواز. دووەمیان



ناوەرۆک بەتایبەتی وێنە و تەعبیر. ئەوە ئاشکرایە پێوەندی کەسێتی لە نێوان شوکری و شێخ ڕەزادا بووە، ماوەیێکیش شەڕە شیعریان کردووە. هەرچۆنێ بێ کاریگەری ئەدەبییان بەسەر یەکترییەوە هەیە. مەرجیش نییە خۆیان هەستیان پێ کردبێ. ئەمە لە لایەن هەستی شیعرییەوە، ئەگەر لە لایەنی کۆمەڵایەتییەوە تەماشای هەڵوێستی شوکری بکرێ دوور نییە مەبەسی لەم کۆمەڵە کەسانە ئەو گێرەشێوێنە ڕێز تێکدەرانە بێ لە کۆمەڵدا دەوری ڕووخاندن و تێکدانی شیرازەی پێوەندی کۆمەڵایەتییان بووە. لەگەڵ ئەم هەموو بۆچوونانەش شیعرێکی وا دەچێتە خانەی دڵدارییەوە. ئەو جوانانە تەنیا کوڕ بن یا کچ یا لە هەردوو لا بن هیچ لە داهێنانە هونەرییەکە ناگۆڕێ، چونکە لە ئەدەبدا ئەو کارە نابەجێیەی ئەمانە دەیکەن بەلاساری کردن بۆیان دەژمێررێ و دەبێتە بەڵگەی کردەوەی چاک.

## ستایشی شێخ مەحموود

شوکری بۆ ستایش و پێدا هەڵدانی شێخ مەحموود شیعری زۆرە تا ئەو ڕادەیەی لە شیعرێکیدا وشەی «مەحموود»ی کردووە بەپاش قافیە:

بەغایی دڵم زارە لەبەر سەهمی نیگاهی
بەم کەوکەبەیی حوسنە بڵێ نادیرە مەحموود
عاشق کوژە غەددارە دڵ ئازارە جەفا جۆ
خوێنڕێژە شەڕەنگێزە موژەی خەنجەرە مەحموود
جەبرەن دڵی (هەمی) بەخەمی کاکۆڵی بەنگە
حوسنی کە ببێ زیب و زەڕ و زێوەرە مەحموود

ئەم پارچەیە لە سێ دێڕ پێکهاتووە شیعری تەواو نییە. ئەگەر دوو دێڕ بوایە دەکرا بەچوارین دانرایە، لە ڕووی ناوەرۆکیشەوە بەشیعرێکی تەواو دەکەوتە بەرچاو.

لەم بڕە شیعرەدا شوکری وێنەی دڵسۆزییێکی دڵداریی گەرم بەرامبەر بە شێخ مەحموود دەکێشێ، لەبەرئەوە ئەگەر لە شیعری دڵداریی ئاساییش نزیک ببێتەوە کارێکی بەجێیە، چونکە شێوازی دڵدارییێکی سۆفیزمی لە ناوەوەیە، بۆ نێر و مێ و هەموو جۆرە دڵدارییەکانی ئاسمانی و زەمینی دەست دەدا، وەکو لەم شیعرە و لە هەندێ شیعری دیکەی کوردی بەرچاو دەکەوێ.

شوکری شیعرێکی ڕەنگینی دیکەی هەیە ستایشی کەسێک دەکا لە هەموو کەس زیاتر لێیەوە نزیک بووە. شاعیر ناوی کەسی لە شیعرەکەدا نەبردووە. ناوەرۆکی ئەوە دەگەیەنێ بۆ شێخ مەحموودی وتبێ، چونکە کەس ئەوەندەی شوکری لە شێخەوە نزیک نەبووە، سەرەڕای ئەوەش ئەو سیفەتانەی شوکری داویەتییە ئەو کەسە بۆ شێخ مەحموود دەشێن لەو کەسانەی لە شوکرییەوە نزیک بوون:

کوا شاهم کوا ماهم کوا سەرداری خووبانم
کوا ئارامی گیان و دڵ کوانی میری میرانم
کوا ڕاحەت ڕەسانی خاتری مەحزوون و غەمگینم
کوانێ ڕۆشنایی بەخشی دیدەی ئەشک ڕێژانم
کوانێ شەهسواری عەرسەیی حوسن و مەلاحەتمان
کوانی شای سوپاهی دلبەرانی ماهڕوویانم
سەبا! لوتفێ بکە بێنە پەیامێ بۆ منی بێدل
کووانێ یووسفی سانی کووانێ جانی جانانم
منی دووچاری دەرد و هیجر کرد ئەو شۆخەیی ڕۆیی
بەغەیرەز ماچی لێوی ئەو نییە ئێستاکە دەرمانم
عەجەب ڕەحمی بەحاڵی من نییە ئەو لالە ڕوخسارە
کە ئێستا لالەزارێکە لە خوێنی ئەشک دامانم
بەناری فیرقەتی سووتا بەیەکسەر جەرگ و جان و دڵ
خودا ڕەحمێ بەحاڵی من نەکا مومکین نییە مانم
لە وەجهی مەرحەمەت ئەمشەو لە چەرخی هەفتەما (هەممی)
مەلائیک زار و ناڵین بوو لە بۆ حاڵی پەرێشانم

لەم شیعرەدا شوکری موناجات لەگەڵ خۆشەویستیدا دەکا. یاری لێ دوورە. لە بەرامبەر پەردەیێکی ڕەشی تاریک وەستاوە، یا لەودیوە و لێی دیار نییە. لەباتی ئەوەی بەرەو ڕوو گفتوگۆی لەگەڵدا بکا، دەپرسی و بەپەشووکاوی هەر دەڵێ کوا؟ ئەو سیفەتانەی شاعیر بۆ شێخ بەکاریان دێنێ لە زاراوەکانی شیعری سۆفیزمی کۆزمۆسی وەرگیراون بۆ ئەو شێخەی ڕەمز و بەڵگەی کردگارە لە لای شوکری. لە بەراوردەکانی شێخ بەیووسفی دووەم دەچوێنێ



و بەجانی جانان ناوی دەبا. لە دواییدا دەپاڕێتەوە، ئارەزوو دەکا ئەو یارە دوورە یا ون بووە لێی نزیک بکەوێتەوە. ئەوەندە پەرێشانە بۆ ئەو خۆشەویستە مەلایەکەت بۆی دەگرین و دەناڵێنن.

**دژی ڕەقیب**

شوکری لە پارچە شیعرێکیدا لە کردەوەی ڕەقیب دەدوێ:

ڕەقیبی بەد لیقا یا ڕەب ئەسیری دەردی میحنەت بێ
فتادەی بەحری غەم دووچاری گەردابی مەشەققەت بێ
بەئومێدی مورووەت بێ نەسیبی کەی عەبەس چونکە
لە دونیا هیچ کەسێ نەیدیوە بەد ساحیب مورووەت بێ
ئیلاهی کوێر بێ جوملە ڕەقیبان یەک بەیەک تاکەی
ئەسیری ناری فیرقەت بم دەمێ با وەقتی وەسلەت بێ
ڕەقیبی سەگ سیفەت چاری بەنان و دەرزییە (هەممی)
عیلاجی دوور کونەندەی هەر ئەوە با تووشی زەحمەت بێ

لە گێتیی ئەدەبی ڕۆژهەڵاتدا «ڕەقیب» قارەمانێکی گرنگی شیعری لیریکییە. ئەو گێرەشێوێنەیە دڵدار و دلبەر لە یەکتری دەکا. لەو شیعرەی شوکریدا خوێنەر هەر بۆ ئەو مانایە دەچێ و ئەو کەسە دەگەیێنی کە دوژمنی هەردوو خۆشەویستەکانە. لەم شیعرەدا جگە لەو مەبەسە لەوانەیە مانای دیکەی کۆمەڵایەتی هەڵگرتبێ، مەبەسی شاعیر ئەو پیاو خراپانە بێ تەنیا بۆ چاکە و بەرژەوەندی خۆیان کۆشش دەکەن و مافی خەڵکی بێچارە دەخۆن و ئاژاوە لە ناو کۆمەڵدا دەنێنەوە.

**پێنج خشتەکی**

بەرهەمی شوکری پێنج خشتەکییێک دەور دەکاتەوە، ئەویش لەسەر غەزەلێکی مستەفا بەگی کوردییە. ئەوەی جێی سەرنج دانە ئەوەیە شاعیرانی کلاسیکی نیوەی دووەمی سەدەی نۆزدەم و نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم لە دوای نالی بەزۆری بایەخیان بەمستەفا بەگی کوردی داوە. ئەوەتا شوکری یەک پێنج خشتەکی لە دیوانیدا هەیە ئەویش لەسەر غەزەلێکی کوردییە:

له چاوم دەم بەدەم دێ جۆ بەجۆ فرمێسکی خوێنینم
برینداری غەدەنگی عەشقم و مومکین نییە ژینم
له من ئێستاکە بێزارە بە کوللی جانی شیرینم
«ڕەفیقی کونجی میحنەت عاجزن هەر شەو لە ناڵینم
گوریزانن لەبەر لێشاوی مەوجی ئەشکی خوێنینم»
بەناری فیرقەتی تۆ جیسم و جان و دڵ کەوا سووتا
وەرە ڕەحمێ بەحاڵم کە فیدات بم ئەی مەلەک سیما
بەیادی پەرچەم و خاڵی سیاه و ڕوومەتت ئێستا
«ئەگەرچی ڕۆژ و شەو مەشغوولی نەغمەی موتریبم ئەمما
لە غەم خاڵی نییە ساتێ دڵەی مەحزوون و غەمگینم»
کە ئەووەل من ئەسیرت بووم بەتەحقیق ئەی سەنەم زانیم
بەهیجران دەمکوژی ئاخر نییە ڕەحمت بەشەیداییم
له سینەمدا ئەوا کەوتۆتە خوێن زامی دڵم دایم
«تەبیب دێن دەوای دەردم بکا خۆ من زەدەی دووریم
بەبێ دارووی وەسڵی ئەو نییە ئارام و تەسکینم»
لە فیرقەت قەت نییە عاشق ئەسیری دەرد و میحنەت بێ
لە ڕێی پێغەمبەرا مردم ئیتر با وەقتی وەسڵەت بێ
بەجانانم بڵێن تا کەی وەها تەرکی مورووەت بێ
«ئەگەر مومکین نییە وەسڵت لە پاش مردن وەسییەت بێ
لە باتی قەوم و خوێشانم لەسەر مەیتم بکا شینم»
لە بەردەرگای ئەوا کەوتم بەئاه و شێوەن و گریان
لە ڕووح ئێستاکە بێزارم منی بەرهەمزەدەی هیجران
ئەگەر ئەو شۆخە من بکوژێ بەشمشێری برۆ و موژگان
«شەهیدی عەشقم و مەمشۆن و کفنم بۆ مەکەن یاران
گەواهی حەشرە بۆ دەعوای شەهادەت بەرگی خوێنینم»
منی کوشت ئاخر ئەو یارە بەکەس مومکین نییە چارم
لە مانم یەک نەفەس ماوە نییە ڕەحمێ بەهاوارم



کە دەسپێرن بەخاکی لەحد یاران جیسمی بیمارم
«لە پەردەی تاهیری گەر بێ سەدای ئەو عاشقی یارم
ئیتر حاجەت نییە بێنن مەلا بۆ وەعز و تەلقینم»
مەکە بێ مەنفەعەت زاری مەڕێژ قەترەی ئەسرینت
کە سستە گەردنی (هەممی) نیگارت ڕوشتەیی ژینت
شەهیدی تیری موژگانت نیشانەی جیسمی خوێنینت
«عەبەس (کوردی) مەلائیک دێن دەپرسن مەزهەب و دینت
کە قادر خۆی ئەزانێ من لەسەر کام مەزهەب و دینم»

ئەم پێنج خشتەکییە لە کارە دەگمەنەکانی ئەدەبی کوردییە کە شاعیری دووەم گەیشتبێتە پلەی شاعیری یەکەم لە ڕووی داهێنانی شیعرییەوە. خوێنەر کە شیعرەکە دەخوێنێتەوە وا هەست دەکا پێنجینی لە بەردەست دایە و پێنج خشتەکی نییە. وا دەزانێ شیعرەکە لە دانانی مستەفا بەگی کوردی خۆیەتی.

پلەی شاعیریەتی شوکری گەیشتۆتە ئەوەی مستەفا بەگ لە ڕوخسار و ناوەرۆک و شێوازی ئەو نەچۆتە دەرەوە، شوکری لە چوارچێوەی وێنە و مانا و تەعبیری ئەو لانەکەوتووە، بەوەی دڵداریی مەجازی مێیینەی دوور خستۆتەوە. لە دێڕەکانی شوکریدا هەست بەئەندام و سیفەت و شێوەی تایبەتی بەژنان ناکرێ. لەبەرئەوە یەکێتییێکی تەواوی بێ کەموکووڕی لە نێوان دێڕەکانی هەردوو شاعیر دروست بووە و وەکو بەرهەمێکی جوان و ڕەنگین کەوتۆتە ناو ئەدەبی کوردییەوە.

## زۆرانبازیی نێوان شێخ ڕەزا و شوکری فەزلی

شوکری یەکێک بووە لەو شاعیرانەی بۆ داشۆرینەکانی شێخ ڕەزا چوونەتە مەیدانەوە و دەرەقەتی هاتووە. ئەمە بووە بەمایە بۆ پەیدابوونی کۆمەڵێک شیعری داشۆرین لە ئەدەبی کوردیدا. لە بنەڕەتدا لەو سەردەمە شێخ ڕەزا داهێنەری ئەم جۆرە شیعرە بوو لە هەموو ئەو شوێنانەی تیایاندا ژیا بوو وەکو کەرکووک و سلێمانی و کۆیە و ئەستەمووڵ و بەغدا، مەبەس لەو جێیانە شاعیرانیان جنێویان لە شێخ ڕەزا قوبوول نەکردووە، بەمە شەڕە شیعر خۆشتر بووە. لە شەڕە شیعری نێوان شێخ ڕەزا و شوکری ئەگەر داشۆرینەکانی ئەمەیان لە ئەوانەی شێخ ڕەزا لە ڕووی هونەرییەوە بەرزتر نەبووبن لەوان کەمتر نەبوون.

لە مێژووی ئەدەبدا ئەوە گرنگ نییە کامەیان دەسپێشخەری ئەم دیاردەیە بووە، هەر کامێکیان بووبێ ئەنجام یەکێکە. ڕاستییەکە ئەوەیە شێخ ڕەزا کۆمەڵێک شیعری داشۆرینی قانگدراو بەئیرۆتیکی هەتیوبازی و مێبازی لە دژی شوکری نووسیوە، هەندێ نموونەی شیعری ئەم بابەتەی شێخ ڕەزا لە بەشی ژیان و شیعری لە بەرگی چوارەمی ئەم کتێبە بڵاوکراوەتەوە.

لەم ماوەیەدا شیعری شوکری ئەوەی لە بەردەست دایە تۆمار دەکرێ و لەسەریان دەنووسرێ.

١

شێخ ڕەزا شیعرێکی بەم دێڕە دەست پێ دەکا:

شوکری لە داخی تۆ ئەمە ساڵێکە یا دووە
کێرم نەخۆشە حاڵی پەرێشانە کەوتووە

لە وەرامی ئەم شیعرەدا شوکری فەزلی دەڵێ:

ڕیشانی کێری خۆم کە لە ژنتا ڕەتاندووە
سەرسمی داوە کەوتووە جەرگی پساندووە
هێند سەختە قەحبەیە دەربەندی ناو کوزی
بێچارەیەی خشاندووە پەراسووی شکاندووە
یا شێخ ئەتۆش تەماتە سواری ئەمەش ببی
حاڵی خراپە سست و سەقەت ماوە ماندووە
کەڵبەت نەماوە حیزە کە بێ سوودە عەف عەفت
پیری دوو تای کردووی شانت خەفاندووە
هەجووت کە بەیتی کوردییە بۆ کێرمی ئەکەی
ئەم قۆڕە قۆڕە هیچە ڕەزا تۆم تڕاندووە
لێشاوی کێری مەتڵەبە گوڵچین وەگەرنە بۆ چ
وەک تاقی پردی خاسەسە کوزی داچەقاندووە
تا ماوە دێی زەبەللەحی تسعینی بێنە پاڵ
بێ گانی تاوی داوە کوزی داوەشاندووە



(شوکری)یە کوونی گانی کوڕی بێنە نەزمەوە
زۆری نەداوە سەد ملەکێری تەقاندووە

ئەگەر بەراووردێک لە نێوان ئەم شیعرە و شیعرەکەی شێخ ڕەزا بکرێ، گومان لەوەدا نامێنێ ئەمەیان لە ئەوەی شێخ ڕەزا کەمتر نییە لە ڕووی هونەرییەوە. لە هەردوو شیعردا ئەوەی پێویستی بەتێبینی هەیە لە شیعری شێخ ڕەزادا داشۆرینەکە بۆ شوکری خۆیەتی، چونکە ژنی نەبووە و شێخ ڕەزا خۆی وەکو هەتیوبازێک خستۆتە ڕوو، کەچی شوکری داشۆرینی بۆ ژنێک لە ژنەکانی شێخ ڕەزایە ناوی گوڵچین بووە، بەم جۆرە لێرەدا شوکری خۆی بەمێباز دەخاتە ڕوو.

٢

شێخ ڕەزا شیعرێکی دیکەی هەیە لە داشۆرینی شوکری:

پوورە شوکری بەسیە با نەتگێم و شەممەت لەق نەکەم
دایکە کێرخۆرت حەواڵەی سووری سەرئەبلەق نەکەم

لە وەرامی ئەم شیعرەدا شوکری فەزلی دەڵێ:

شێخ ڕەزا عەرزت دەگێم خۆت بۆچی ئەحمەق کردووە
قەوچە وەک ماکەر ئەکەیت و گوێت وەها لەق کردووە
حیزە ئێشی مێخی سابیق چاوتی زەق کردووە
قەحبە گوڵچین تۆی کەوا گەووادی موتلەق کردووە
من بەمەترەق بارەها کوزیم شەق و بەق کردووە
تۆم نەوەک ئەمجارە هەتک و پەتک و نەستەق کردووە
باوکی مەعلوومت نییە لەعنەت لە زاتت هەی تەرەس
گوو بەگوێی دایکت چوزانم دایە بەر کێ پێش و پەس
گوو مەخۆ یا شێخ ئیتر با شۆڕشێ بەرپا نەکەم
خۆت و کەرکووکت بەجارێ سەربەسەر ئیفنا نەکەم
با لە ناو لنگی ژنت پێچاڵی سەد جولا نەکەم
با کوزی وەک قەلعەیی خەیبەر بەمەترەق وا نەکەم

(مەستی) فیعلەن داگی گای ئەم سیررە با ئیفشا نەکەم
بۆچ ئەکەی هەجووم بەڵێ تۆ شێخی هەجووت با نەکەم
باوکی مەعلوومت نییە لەعنەت لە زاتت هەی تەرەس
گوو بەگوێی دایکت چوزانم دایە بەر کێ پێش و پەس

شوکری ئەم شیعرەی لەسەر بنچینەی تەرجیع بەند داناوە. بەندەکانی کەمە بریتییە لە دووان، لە شیعری کلاسیکیی کۆندا دەبوو ژمارەی بەندەکانی تەرجیع بەند لە هەشتەوە تا دوازدە بێ. دەتوانرێ ئەمەی شوکری بەجۆرە تازەکردنەوەییێک بژمێرری بۆ ئەو سەردەمەی کە تێیدا هۆنراوەتەوە.

شوکری لەم شیعرەشدا وەک لە ناوەرۆکی دەردەکەوێ واز لە خێزانی شێخ ڕەزا ناهێنێ، هەموو مەبەسی ئەوەیە خۆی وەک هەتیوباز نەخاتە ڕوو، لەبەرئەوەیە داخی دڵی خۆی بەو دەردێنێ لە باتی شێخ ڕەزا. لە لاییێکی دیکەوە لە سەرمەستی ئەفەندی دەکاتەوە، ئەو ڕۆشنبیرە کوردە یەکێ لەوانەی کەوتبوونە بەر داشۆرینی شێخ ڕەزا. لە پاشانا کەف و کوڵی شوکری بەشێوەییێک هەڵدەچێ و توورەیی دەگاتە پلەییێک نەک شێخ ڕەزا بەتەنیا بەڵکو هەموو کەرکووکیش لەگەڵ ئەودا لەناو دەبا.

٣

شوکری لە برە شیعرێکی دیکەیدا تاکە تاکە بۆی هاتبێ یا وەرامی شێخ ڕەزای دابێتەوە بەردەوامە لە داهێنانی وێنەی شیعری لە بابەتی داشۆرین.

لەوانە لە چوارینێکیدا دەڵێ:

لۆتیی و ڕەققاس من نیم نێرەگای پیرەبنە
ئەی لە گوڵچینی ژنت بەم (ئوندەر دیدن بنە)
بۆچی نازانی لە کوێیە لۆتییانی قۆرییە
هەموویان شێخ ژن ئەگێن شێخ ژن ئەڵێ تینم نەنە

لەم شیعرە و لە هەموو بەرهەمەکانی دیکەیدا شوکری واز لە خێزانی شێخ ڕەزا ناهێنێ، ئەمجارەیان وەک بڵێی زیادەڕۆیی ناکا و هەموو لۆتیانی کەرکووک ناخاتە سەر ئەم ژنە، بەڵکو تەنیا پیاوانی قۆرییە، واتە بەشی خوارەوەی کەرکووک و قەڵای لێ دەردێنێ. لەو شیعرەدا ڕستەییێک بەزمانی تورکی وتراوە بەمانای (لەوێ پێم وترا) هاتووە.



٤

لە پارچە شیعرێکیدا شوکری هەموو کەرکووک دەکاتە گژ شێخ ڕەزا و خێزانی:

من بۆ کەرکووک هاتووم دەعوام هەیە دەعوا دەکەم
کێری چل تابووری کوردان بای ئەدەم تێی ڕا ئەکەم
کورد و عارەب داودە فەحلن لە بۆ لێدان هەموو
فاڵی شێخ ژن گەرمە فاڵی عالەمی پێ چا ئەکەم
مەقسەدی چاکردنم بوو ئیسمی یا شێخ جێی هەیە
حاکمی دوو سێ ووجووهم حوکمی لێ ئیجرا ئەکەم
وەی بکەم کەرکووک بەجارێ ئافەرینتان پێ بکەم
بۆچی وا عاجز نەبێ وا چابوکی ڕیسوا ئەکەم
گاسنی هەجووم لە وەردی شێخ ڕەزا مەعتەل بووە
نایبری (شوکری) بەبیللا گاسنی پۆڵا ئەکەم

لەم شیعرەدا شوکری هەموو کەرکووکی وروژاندووە بەشار و ئاقارەکانی دەوروبەری، بەکورد و عەرەب و عەشرەتەکانی بەتایبەتی داودە چونکە شێخ ڕەزا لە شیعریدا دایشۆریوون هەموویان دەکا بەگژ خێزانی شێخ ڕەزا. ئەم زەعیفە بەستەزمانە چۆن بەرگەی ئەم هەموو پیاوانە دەگرێ! دیارە مەسەلە قسە و هونەر و داهێنانە، ئەگینا هەر نابێ.

٥

شێخ ڕەزا لە شیعرێکیدا بەشوکری دەڵێ:

تۆیش لە من بووگی بەشاعیر ئەی حەرامزادەی سنە
بۆچە شانێ ناخەفێنی مەسرەفی چەس ئەوتنە

لە شیعرەدا شێخ ڕەزا گاڵتە بەشوکری دەکا و بە حەرامزادەی شاری سنە ناوی دەبا. بۆ بەهێزکردنی شیعرەکەی هەندێ وشە و تەعبیری دیالێکتی ناوچەیی قسەکردنی خەڵکی ناو شاری سنە بەکار دێنێ. لە وەرامی ئەم شیعرە شوکری دەڵێ:

شاهم شیعری خۆت وەرگرە کەم دەماغ و سەرسەری
من ئەگەر زۆڵی سنەم تۆ پووشت و گەوواد و کەری

پێوەندی نێوان شێخ ڕەزا و شوکری فەزلی شیعری لەم بابەتەیان نابێ بەتەرازووی بیری کۆمەڵایەتی و ڕەوشتی نەتەوایەتی و بیروباوەڕی ئایینییەوە بکێشرێ، چونکە هەموو ئەو قسانەی بۆ یەکتریان هەڵبەستووە، نەبووە و نابێ. گریمان ئەم کردەوانە هەندێ سووکتر بکرێنەوە، لە ڕووی کۆمەڵایەتیشەوە ورد بکرێنەوە، لەوانەیە لە ناو کۆمەڵدا شتی وا هەبێ و ڕوو بدا، بەڵام ئەوەی ئەوان بەیەکتریان وتووە و ئەوەی لە شیعری کوردیدا هاتووە بەگشتی هەمووی ڕووی نەداوە و هەڵبەستراوە. لە بنەڕەتدا شیعر خۆی دروستکردن و خوڵقاندن و داهێنانە، جوانکاری و گیانی هونەری کردوویەتی بەبەرهەمێک چێژ و خەیاڵی ئادەمزاد دەبزوێنێ و بۆ هەموو جێگە و سەردەمێک دەست دەدا. لەبەرئەوە ئەو کەڵەشاعیرانەی شیعری داشۆرین و کراوەیان (ئیرۆتیکیان) نووسیوە، بەشدارییێکی باش و بەکەڵکیان لە دەوڵەمەندکردنی دیوانی شیعری کوردیدا کردووە.

**ئیش کە ڕووی ئێستە لە هەورازە سەرەوژێری نەکەی**

لەو ڕۆژەوە ئەو پارچە شیعرە شەش دێڕییە لە لایەن شوکری فەزلییەوە هۆنراوەتەوە لەسەر زاری هەموو کوردێکی خوێندەوار و نیمچە خوێندەوارە بووە. کەم کورد هەیە ئەم شیعرەی لە تێکستی چاپکراوەوە وەرگرتبێ. شیعرەکە لە پێشانا بەدەم بیستراوە و لەبەرکراوە ئەوجا لە چاپکراودا خوێندراوەتەوە.

ئەم شیعرە هەندێ تیۆری و تێبینی و بۆچوونی ناو خەڵکی گۆڕیوە. لە قسەی نەستەق و پەندی پێشینان وتوویانە «بەگوڵێک بەهار نایە» کەچی نووسەر و شاعیرانی کورد دەڵێن: «ئیش کە ڕووی ئێستە...» ئەگەر گوڵێک بێ تەنیا بەهارێکی نەهێناوە، بەڵکو هەزاران بەهاری هێناوە. شوکری فەزلی ئەگەر شیعری دیکەی نەبووایە و تەنیا ئەم شیعرە دیسانەوە هەر وەکو شاعیرێکی گەورە دەکەوتە بەرچاو.

جارێ شیعرەکە:

ئیش کە ڕووی ئێستە لە هەورازە سەرەولێژی نەکەی
فیکری ووردیشی ئەوێ هەر بەدوعا و نوێژی نەکەی
گێرەشێوێنێ کە کای کۆنی بەبا دا لە کنت
چاکە هەر لێی خوری سەیری دەم و کاوێژی نەکەی
سەرەتای ئیش هەموو یەکبوونە ئەویش نابێ هەتا
هەر برینێ کە لە دڵدا هەیە سارێژی کەی



حەیفە چاوێ کە جەفا کوڵەووژی تێدەشکان
تۆ بەکلچێوکی وەفا عەینی گەلاوێژی نەکەی
قەومی بێ سەر نییە ئەمڕۆ لە هەموو عالەمدا
ئەتەوێ تاجی سەری بێ بەهەوا گێژی نەکەی
شا وەکو شایێکی شەترەنجە لە عالەم ئەمڕۆ
گەورە قانوونە قسەی کورت ئەوەیە درێژی نەکەی

ئەم پارچە شیعرە لەو بەرهەمانەیە پاش قافیەی هەیە وشەی «نەکەی»یە. قافیەی بنچینەیی دەنگی «ژ»یە، دوا تیپی ئەو وشانەیە کە بوون بەقافیەی شیعرەکە و بە«ی»ی ئیزافە لەگەڵ وشەی پاش قافیە «نەکەی» کۆکراوەتەوە.

ئەو وشانەی لە شیعرەکەدا هاتوون دوا دەنگیان یا قافیەیان «ژ»یە دووبارە نەکراونەتەوە (لێژ، نوێژ، کاوێژ، سارێژ، گەلاوێژ، گێژ، درێژ) ئەمە بەڵگەی توانا و هێزی شاعیرییەتی شوکرییە. ئەم وشانە هەموویان کوردی پەتین، ئەگەرچی لە ڕووی دەربڕینەوە، واتە دەرهێنانیان بەدەنگ لە دەمەوە سووکن، کەچی بۆ بەکارهێنان لە شیعردا قورسن، لەگەڵ ئەوەشدا شوکری هەناسەیێکی وای تێ ئاخنیوون گەلێ ئاسان و ڕەوان دەکەونە بەرگوێی خوێنەر.

شوکری ئەم شیعرەی لە کاتێکدا بۆ شێخ مەحموود داناوە مەسەلەی نیشتمانی کورد بەفەرماندەی شێخ لە گەشەکردندا بووە. لەو دەمەدا لە بەغدا بووە، وا باوە شیعرەکەی لە بەغدا پێشکێش کردووە. شاعیر بەهەموو ڕێزێک و سۆزێکەوە ئەم شیعرەی هۆنیوەتەوە، چونکە شێخ هاوڕێی خۆشەویستی منداڵی شوکری بووە. لەو دەمەی شیعرەکەی داوەتە شێخ یا بۆی خوێندۆتەوە ئەگەر کەس لە مەجلیسەکەی نەبووبێ شوکری پێی وتووە: فەرموو بە وردی بیخوێنەوە! شێخ مەحموود ئەم ئامۆژگارییەی نەک تەنیا لە شوکری بەڵکو لە هەموو کەسێکی خۆشی بویستایە وەریدەگرت.

شوکری بۆی هەیە وەکو شاعیر و ڕۆشنبیرێک ئامۆژگاری هەموو سەرکردە و سوپاسالار و سیاسی و ستراتیجییێک بکا چونکە زانا و ژیر و تێگەیشتووە. ئەم شیعرەی لەسەر بنچینەی داناییێکی فەلسەفییانە هۆنیوەتەوە. سیاسەت و دیپلۆماسییەت هەرچەندە درۆ و پروپاگەندەی زۆری تێدایە هەر چۆنێ بێ پێویستە هەندێ ڕاستیی لەگەڵدا بێ ئەگینا سەر ناگرێ.

شوکری کە بەشێخ مەحموود دەڵێ «ئیش کە ڕووی ئێستە...» مەبەسی ئەوە نییە لەو دەمەدا کاروباری شێخ باش بووە و کورد لە سەرکەوتندا بووە، بەڵکو ئەم بیرەی گشتییە، مل بۆ هیچ جێگە و کاتێکی دیاریکراو شۆڕ ناکا، چونکە دەستخستنی «سەرکەوتن» بەبیرکردنەوەی ورد و قووڵ و دانایانە نەبێ لە دەست دەچێ.

ئامۆژگارییەکانی شوکری بۆ شێخ مەحموود لە ڕووی سیاسی و کۆمەڵایەتییەوە نوێ نەبوون، خەیاڵی شوکری ئاسۆیێکی تازەی شیعری داوەتە ئەو مانایانە، پیاو وا دەزانێ بۆ یەکەمین جار گوێی لەم قسانە دەبێ. ئەوە ڕاستە نابێ سەرۆک هەر لەگەڵ کۆن بژی، نابێ گوێ بدرێتە ڕووخێنەر و زمان لووس و ئەوانەی کڕنووش بۆ گەورە دەبەن لە پێناوی بەرژەوەندی خۆیان.

نەبوونی یەکێتی (یەکبوون) و پێوەندییە دژ بەیەکترییەکانی ناو خەڵک بوون بەهۆی ڕووخانی حوکوومەتەکانی شێخ مەحموود. هەموو کارێک سۆز و یەکبوونی تێدا نەبێ سەر ناگرێ. شوکری بەشێخ دەڵێ لە یەکسانی بگەڕێ، بەشوێن پیاوەتی بکەوە بزانە لە کوێ خۆی شاردۆتەوە. هەر کەسێکی زۆری لێ بکرێ، چاوی بیەشێنرێ پێویستە تۆ بەکلچیۆکی وەفا وەک ئەستێرەی گەلاوێژی لێ بکەی.

شوکری لەو شیعرەیدا گەورەترین دەردی میللەتی کورد دەستنیشان دەکا، نەبوونی سەرکردایەتییە. بەلای ئەوەوە هەموو گەلێک سەرداری هەیە، هەندێکیان نیانە، مەبەسی سەرداری ژیر و بەهۆش و دڵسۆزە. ئێمە دەبێ سەرداری ڕەسەنمان هەبێ، ڕەنگدانەوەی ئامانجی میللەت بێ. لای ئێمە تانج نییە بەسەرمانەوە بەڵکو بایە لە سەرمان و بەم بایە گێژ و وڕ بووین و وا دەزانین تانجە بەسەرمانەوە.

لە دوایی شاعیر دەڵێ دەوڵەت بەوە نییە شای هەبێ، ئەو شایە وەکو ئەوەی شەترەنج وایە، شا دەبێ نیشانە و ڕەمز بێ، قانوون دەبێ فەرمانڕەوا بێ.

بەخەیاڵ دەتوانرێ شانۆیێکی یەک پەردەیی (پیەس) دروست بکرێ. جێگە - ماڵی شێخ مەحموود بێ لە ئەعزەمییەی بەغدا. کات - کۆتایی هەڵسانەکانی شێخ مەحموود و پێش کۆچی دوایی شوکری بێ. لە دیوەخانی شێخ کە شیعرەکەی لە شوکری وەرگرتووە ئەگەر خۆی خوێندبێتییەوە یا خاوەنی، شێخ هەڵساوە هەردوو چاوی شوکری هاوڕێی منداڵی ماچ کردووە و دوو دڵۆپ فرمێسکیشی لە ناو چاویدا قەتیس ماون، چونکە ئەو کاتە لە لایەن شێخەوە مەسەلە کۆتایی هاتبوو و خۆی خانەنشین کردبوو. ئەم شیعرەی



شوکری فەزلی بۆ نەوەکانی تازەی کورد مایەوە و دەمێنێتەوە، وەک سامانێکی ئەدەبی بەرزی زمانی کوردی.

***

شوکری فەزلی کەسایەتییێکی گرنگ بوو لە مێژووی ئەدەب و خوێندەواری و ڕۆشنبیری کوردیدا. ئەم بلیمەتە لە باوکێکی خەڵکی سلێمانی بە بنەچە سنەیی و دایکێکی عەرەبی عەشیرەتی کوڕوی خەڵکی بەغدا لە دایک بووە. بەمنداڵی لە بەغدا ژیاوە، بەشێکی ئەم تەمەنە و سەردەمی مێردمنداڵی لە سلێمانی بووە، کە بەتەواوی وەک شاعیر و ڕۆشنبیرێک ڕسکاوە گەڕاوەتەوە بەغدا.

شاعیر چوار زمانی بەباشی زانیوە کوردی و عەرەبی و تورکی عوسمانی و فارسی، شیعری بەهەموویان وتووە، تەنیا لە کوردییەکەدا شاعیرێکی بەتوانا بووە. هەروەها لە ڕۆژنامەگەریدا کاری کردووە. هەر بەرهەمێکی بەزمانی ناکوردی بڵاو کردبێتەوە بۆ کورد بووە و لە بەرژەوەندی ئەودا بووە. ئەم شاعیرە لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم وەکو نموونەییێکی ڕەسەن لە ئەدەبی کوردیدا دەکەوێتە بەرچاو. لەگەڵ زۆربەی شاعیرانی هاوچەرخی قوتابخانەی کوردستانی باشووریان ئاوەدان کردەوە. نوێکردنەوەی شیعری کوردی لە لای شوکری لە پێشانا لەو بەرهەمانەدا بووە کە لە ئەنجامی شەڕە شیعری لەگەڵ شێخ ڕەزا کەوتوونەتە ناوەوە. لە دواییدا شاعیرییەتی شوکری لە لیریکی «ئیش کە ڕووی ئێستە...»دا گەیشتۆتە لووتکە.

# بەشی نۆزدەم

## فوئاد

## ١٨٩٢ - ١٩٢٥

### ژیانی شاعیر

تاهیر کوڕی شێخ عەبدوللەتیف بێدەری بەبنەچە دەچێتەوە سەر بنەماڵەی شێخانی بەرزنجی. لەو کاتەی خۆی بەشاعیر زانیوە وشەی «فوئاد»ی هەڵبژاردووە وەک نازناوێک بۆ شیعری.

فوئاد لە ساڵی ١٨٩٢ لە شاری کەرکووک لە دایک بووە، سەرەتای خوێندنی لە حوجرەی مزگەوت گەیاندۆتە سەر. لە پاشانا لای مەلا شێخ محەمەدی بێدەری و عەلی حیکمەت ئەفەندی سیامەنسووری هەندێ لە زانستییە ئیسلامییەکان و زمانی عەرەبی وەرگرتووە. پێش ئەوەی کۆتایی بەخوێندنی بێنێ و نزیک بووە لە قۆناغی دوایی بەهۆی جەنگی یەکەمی گێتییەوە دەستی لە خوێندن بەردەبێ و دەکەوێتە داوی عەسکەرییەوە، بەناوی جەنگەوە لە ڕەشبگیرییەکەدا دەگیرێ و ڕەوانەی هەرێمەکانی موکریانی کوردستان و ئازربێجانی ئێران دەکرێ. لە دوای ساڵێک ئاوارەیی و دەربەدەری لە ڕێزی سەربازیدا ڕادەکا و بەهەر دەردی سەرییێک بێ دەگەڕێتەوە کەرکووک و خۆی لە گوندەکانی دەوروبەری شار دەشارێتەوە تا کۆتایی جەنگ. لە ساڵی ١٩٢٢دا فوئاد ژنی هێناوە. ماڵی لە گەڕەکی بلاغی شاری کەرکووک بووە، ژیانی دارایی ماڵەوەی ئاسان نەبووە، هەندێ دەست کورت بووە. بەمووچەی خانەنشینی دایکی ژیاوە کە لە سەردەمی فەرمانڕەوایی عوسمانییان بۆ بنەماڵەیان بڕیبووەوە، لەگەڵ ئەوەشدا نامەخانەی لە ماڵەوە هەبووە، لە دیوەخانیدا پێشوازیی میوانانی کردووە، لە خوێندەوار و ڕۆشنبیر و ئەدەب دۆستانی ئەو سەردەمە نزیک بووە. فوئاد زۆر نەژیاوە، لە تەمەنی لاویەتیدا سەری ناوەتەوە. لە شێخ ڕەئووفی خانەقا بیستراوە لە ساڵی ١٩٢٥ کۆچی دوایی کردووە، هۆی مردنی ئاشکرا نییە.



### شیعری فوئاد

#### شیعری لە ڕووی ڕوخسارەوە

شیعری فوئاد سادە و ڕەوانە، لە بەکارهێنانی وشەی بێگانە هەندێ دوورە، بڕێکیش لە وشەی کوردی پەتییەوە نزیکە، یەکێکە لەو شاعیرانەی بەشدارییان لە بەپەتی کردنی زمانی کوردی کردووە لە شیعر و نووسیندا. هەموو شیعری فوئاد لەسەر بەحری عەرووزی کلاسیکییە، لە شیعریدا زۆرتر بەحری ڕەمەل و هەزەجی بەکار هێناوە، لەویش کەمتر بەحری موزاریع، ئینجا خەفیف و ڕەجەز.

زۆربەی هەرە زۆری شیعری سەر بەیەکێتیی قافیەیە. لە بەکارهێنانی دەنگەکانی ئەلفوبێی عەرەبی و کوردی دەوڵەمەند نییە، ئەو دەنگانەی بەکاری هێناون ئەمانەن: ا، ت، ر، ک، م، ن، (ە – ـە)، وو، ۆ، ی، ێ. پاش قافیەی کەمە. لە شیعریدا ئەم پاش قافیانە بەرچاو دەکەون: دەکا، کورد، نییە، تۆ. لە هەموو دیوانی شیعریدا یەک دوو شیعری جووت قافیە (مەسنەوی) هەیە.

#### شیعری لە ڕووی ناوەرۆکەوە

ناوەرۆکی شیعری فوئاد ڕەنگدانەوەی کۆمەڵی کوردەواری پڕ لە تەنگوچەڵەمەی سەرەتای سەدەی بیستەم و دەوروبەری جەنگی یەکەمی گێتییە. شاعیر جگە لە مەبەس و بابەتە کلاسیکییەکانی کۆنی شیعری کوردی دەستێکی باڵای هەبووە لە دیاریکردنی هەندێ کردار و ڕەوشت و نەریتی کۆمەڵایەتی سەردەمی خۆی. جگە لەمە لە وەسفدا داهێنانی هەیە، تەنیا وەسفی یار و نەورۆز و بەهار و سروشتی نەکردووە، بەڵکو وەسفی گەلێ دیاردەی مەتریالی و مەعنەویش لە شیعریدا بەرچاو دەکەون.

لە کوردایەتیدا هەناسەی شیعری سوارە، شارەزایی لە مێژووی شیعری کوردیدا هەیە. یادی نالی کردۆتەوە. بەهەڵوێست و بۆچوونی ڕای گشتیی کۆمەڵایەتی ناو کوردەواری بەرەنگاری هەتیوبازی بووە. دیارە لە شاعیرێکی کەرکووکی چاوەنۆڕی ئەوە دەکرێ بەرهەڵستی ئەم جۆرە کردەوەیە بکا لە وێنەی شیعری داشۆرین و کراوە (ئیرۆتیک)دا دیوانی شیعری کوردی پێ بەرز بکاتەوە.

## نموونەی شیعری فوئاد

### دڵداری

١

لە پارچە غەزەلێکی ئاساییدا فوئاد دەڵێ:

دڵ ئەگەر حەرفێ لە بەحسی دەردی خۆی ئیفشا دەکا
جـونبـوش و شـۆری سـەرپڕی عـالەمی شـەیدا دەکـا
کەس لە حاڵی غەیری خۆی نازانێ گەر ڕاستت دەوێ
ووشکە لافی خـەڵقی دەرمـانی برینت کـوا دەکـا
هەر لە تەعلیم خانەیی ئەتفال ئەچێ دونیـایی دوون
ئەو کـەسـەی بێ نادیمە ئاخـر لە جـەوری ڕا دەکـا
مـوقـتـەزای فـەقـرە دینداری لە دونیـادا بەڵێ
زاهیـدی مـسکین لەبەر ناچاری ڕوو لە خـوا دەکـا
حـوسنی ئەشعـارم لە حـوسنی تەبعـە ئەی (فـوئاد)
نۆکـەری شـایسـتـە کـەسبی سیـرەتی ئاغـا دەکـا

شاعیـر هەواییێکی دانایانە و پەند و ئامۆژگاری داوەتە ئەم لیریکە، زۆربەی وێنەکانی شیکردنەوەی داهێنانی شاعیرە کلاسیکییەکانی پێش خۆیەتی.

٢

لە چوارینێکیدا فوئاد دەڵێ:

سـەبا شـەرحی دڵی زارم بەرە بۆ حـەزرەتی یارم
کـە بێ فـیـردەوسی دیدارت لە ناری دووری دیدارم
لەگەڵ ڕۆژی جودایی تۆ دڵ و جان بوو جودا هەردوو
ئەگەر جەمعی نەبێ وا زوو ئیـتر کوژراوەکەی پارم

لەم شیعرەدا خوێنەر کە هەواڵی فوئادی کوژراوی پاری دەکەوێتە بەرگوێ، نالییەکەی کوژراوی پێراری دێتەوە یاد. نالی لە لیریکێکیدا دەڵێ:



هەمـوو ڕۆژێ لە تاو هیـجرانی ئەم ساڵ
تەمــەننای مــردنی پێــرارە بێ تۆ

فـوئاد بەخـەیاڵ زۆر لەگـەڵ نالیـدا ژیاوە. ئەگـەر ئیلهـامی «پاری» خـۆی بەشێـوەیێکی ناڕاستەوخۆ لە «پێرار»ەکەی نالی وەرگرتبێ لە شیعرێکی دیکەیدا ڕاستەوخۆ یادی نالی دەکاتەوە:

ئەو کـەسـەی وا بێکەسـە مـادام خـودا بۆ ئەو کـەسـە
بۆ دەڵێن بێکەس بەبێکەس خۆ هەر ئەو ساحیب کەسە
هەر زمـاندارن لە دەس ئەهلی زەمـان فـەریاد ئەکـەن
بێ هەرا و ئاسـوودە ڕاستی گـەر کـەسێ بێ ئەخرەسە
سەد هەزار پەند و نەسیـحەت بۆ نەزان سوودی نییـە
ئەو کەسەی ساحیب شوعوورە یەک ئیشارەی بۆ بەسە
حاڵی دڵ مەکشـوفی دەرکی کۆتە هی هەر کەس نییە
گەوهەری دەریا لە کوێ هەر مەشهـودی خار و خەسە
بێ ئەمــەل بێگانەیێکی تۆی دەوێ داینێ بەکــەس
گـەر برات بێگانە مـەشرەب بێ لەگـەڵتـا ناکـەسە
گـەر دەڕۆی ئەی با بەلای خـاکی مـەزاری (نالی)یا
دوای سـەلام ناوونیـشـانی من بڵێ بەم ئادرەسـە
وا (فـوئاد) ناوێ لە کـەرکـووکـا وەکـیـلی نەزمـتـە
دا نەڵێی مـوڵکی ئەدەب ئێسـتا لە کوردا بێ کـەسە

فوئاد لەم شیـعرەدا سـەرکەوتووانە لە ئاسمـانی گێـتیی خەیاڵی نالی باڵەفڕێ دەکا. دەڵێی وێنەی هەندێ لە شیعرەکانی دەکێشێ، یا برێ لە ماناکانی ئەو لێک دەداتەوە. لە دواییدا دڵسـۆزانە مووچڕکی خۆشی لە ناخی دەروونی خوێنەردا دێتـە جۆش کە فـوئاد با دەکا بەتەتەر و دەینێرێ بۆ لای نالی بۆ ئەستەموول تا پێی بڵێ فوئاد ناوێک لە کەرکووک وەکیلی شیعری تۆیە بۆ ئەوەی نەڵێ مەملەکەتی ئەدەبی کوردی ئێستە بێکەسە.

١

لە وەسفی نەورۆز و بەهار و سروشتی کوردستان و هەندێ دیاردەی مەتریالی کۆمەڵایەتی فوئاد سەرپشکە و توانیویەتی بەرهەمی بەرز دابهێنێ. لە قەسیدەی وەسفی نەورۆز و بەهاردا دەڵێ:

مووددەتێ بوو دوژمنی کافر وەکو فەسڵی شیتا
ئیستیلایی موڵکی شادی کردبوو هەروەک بەڵا
ڕەعد و بەرق و تەرزە تا بوون موتتەفیق وەک باڵقان
دەوڵەتی بەزم و سەفا مەغدوور بوو میسلی تورکیا
هات شوکور هەروەک عەرەب جەیشی دلێری ئیعتیدال
لەشکری سەرمای شکاند وەک عەسکەری ئیتالیا
قووەتی بوو هاتە ناو بەحری فەزا جەیشی بەهار
دای بەسەر کەشتی نم و هەروا (درید نۆت)ی سەبا
بۆ بەشارەت دانێ نەورۆزێ مورەخخەس بوو نەسیم
شاهی عوسمانی بەهار ئیعلانی شایی سوڵحی دا
میحنەتی زستان موبەددەل بوو بەسەیرانی ڕەبیع
فەرشی ڕەنگاوڕەنگ لە دەشت و کێو و سەحرا ڕاخرا
خەلعەتی دیبایی سەوزیان کردە بەر جوملەی درەخت
باغ بەسەد زینەت هەموو لایێکی ئارایش درا
حوللەیی ئەلوانیان پۆشی عەرووسانی چەمەن
عەندەلیبان دەستیان کردە تەغەننی و نەوا
پاڵی داوە شاهیدی گوڵ وا لەسەر تەختی تەرەب
زولفی دادێنێ بەشانەی نەشئە بەربووکی هەوا
هەر دەڵێ زاوایە ڕاوەستاوە عەرعەر مونتەزیر
شۆڕەبیش وەک بووکی عەییارە لەبەریا ناز ئەکا



هەر حەدیقەی مەجلیسی بەزمێکی جانانە مەگەر
بۆیە سیسەمبەر لە تەرفی جۆگە هاتۆتە سەما
نێرگس هەروەک بادەخۆرێ تازە هەڵسا بێ لە خەو
لالە ساقی جام بەدەستە وا مەیی بۆ تێدەکا
بۆنی ڕەیحان و گوڵ و میسک و عەبیر و زەعفەران
هۆش لە کەللەی هوشیار و دڵ لە ئەهلی دڵ دەبا
سەوتی قومری و زەمزەمەی ساز و سروودی عەندەلیب
هۆش بەمەست و خەو بەبێدار و بەنوستوو یەقز ئەدا
ڕۆژی نەورۆزە زەمانی ماتەم و ئەندۆهـ نییە
وەختی یاری و کەوشەکە ئەییامی سەیرانە و سەفا
فرسەتە گەشت و تەفەرووج مفتە عیشرەت بۆ کەسێ
یار و ئەحباب و ڕەفیقێکی هەبێ لەم ڕۆژەدا
چاوەڕێی تەشریفی یارانێتی دەشتی چوارباغ
حازرە بۆ بەزمی سەحرا تاقم و ئەربابی چا
با لە دەست خۆمان نەدەین ڕۆژێکی وا خۆش و عەزیز
وا موهەییاین ئێمە تۆش تەشریف بفەرموو میرزا

لە سەرەتای ئەم شیعرەدا ئاماژە هەیە بۆ شەڕی بەڵقان و دەوڵەتی عوسمانی. بێ گومان شاعیر لایەنگری عوسمانی بووە، ئەم کردەوەیە هەر چۆنێ بێ ئاسایی بووە و لە سۆزی ئایینییەوە هەڵقوڵاوە. هەروەها باس لە جەنگی ئیتالییەکان دەکا لە دژی عەرەبی لیبیا و دەوری کەشتییێکی سوپایی تورک بەناوی «درید نۆت»ەوە لەو جەنگەدا دەخاتە ڕوو. شاعیر هەوڵ دەدا هەورەتریشقە و تۆفی زستان بەتەق و هۆڕی چەکی ئەو جەنگە بچوێنێ. لە پاشانا هەموو ناخۆشیی زستان دەبێتە مایەی جوانی و ڕەنگینی بەهار. ئیتر شاعیر دەکەوێتە وەسفی گوڵ و گوڵاڵە و درەخت و دەوەن، ئاوازی پڕ نەوازی باڵندە، وێنەی لووتکەی خۆشی و بەزم و ڕەزم و سەیران لە ڕۆژی نەورۆزی پیرۆزدا دەکێشن.

لە لیریکێکیدا فوئاد دیمەنی زستان بەگرژ و ناشیرین لە قەڵەم دەدا:

ئۆف لە دەس فەسلی زەمستان و قوڕ و چڵپاوەکەی
ئۆف لە دەس هەور و بڵێسە و گرمە وو ناڵانەکەی
ئۆف لە دەس سەرما و ددان لێکدانەوە و لەرزینەوەی
ئۆف لە خۆهەڵکردن و پیس بوون و قوڕ شێلانەکەی
ئۆف لە دەس جەوری قوڕ و چڵپا وو جڵق و فڵقەکەی
ئۆف لە پڕشنگ لێ پەڕین و کەوتن و هەڵسانەکەی
ئۆف لە مل پێچان و کۆکین و هەڵامەت گرتنی
ئۆف لە پژمین و چڵم لووشین و لووت گێرانەکەی
تاڵیی سەرمایی ڕۆژێ ناهێڵێ بەزمی شەوێ
تف لە شەو دانیشتنی بێ عیشرەت و سەیرانەکەی

لەم لیریکەدا فوئاد هەموو نیوە دێڕەکانی جگە لە دێڕی دوایی (دوو نیوە دێڕی دوایی) بەوشەی «ئۆف» دەست پێ دەکا، ئەم دیاردەیە وەکو ئەوەیە یەکێتیی قافیەیێک، یا پاش قافیەیێک، لەم شیعرەدا هەبێ، نەک لە سەرەتای دێڕ بەڵکو لە کۆتایی. لە مێژووی ئەدەبی نەتەوەکانی گێتی ئەوە هاتووە گۆیا لە ئەدەبی یابانیدا جۆرە لیریکێک هەیە قافیەی لە سەرەتای دێڕی شیعر دایە. دیارە ئەم شیعرەی ئێمە هیچ پێوەندییەکی بەوەوە نییە.

لەم شیعرەدا فوئاد لە کەژی زستاندا دیمەنی سەخت و ناشیرین دەبینێ وەکو سەرما و قوڕ و چڵپاو و کۆکین و هەڵامەت و پژمین و دیاردەی دیکە، ئەمە ئاوڕدانەوەیێکی کۆمەڵایەتییە و لە جوانکاری بەدوور نییە، ئەگەر نا ئەدگارە سروشتییەکانی زستان سەرچاوەیێکی دیکەن بۆ وێنەکێشانی دیمەنی زستانی پڕ لە خۆشی و گەشبینی.





لە قەسیدەیێکیدا بەناوی «شایی حەمەشینی شەحەلی» وەسفی شایی و زەماوەندی ژنهێنانێک دەکا:

واز لە ئەوزاعی زەمان بێنە بەس ئەو دەردی سەرە
خۆڵی میحنەت ڕادە گەر مەردی بەگەسکی مەسخەرە
تیغی غەم جەرگی بڕیم ئەی تیری غەمزەی چاوی یار
بۆ خودا ساقی نەجاتم دە لە دەس ئەم کافرە
ئەی خەیاڵی هیچ و پووچ ئاخر دەمێ لێم دوورکەوە
تۆش بەرۆکم بەردە ئیتر ئەی غەمەی دڵ کونکەرە
سەر لە پەردە بێنە دەر ئەی دڵ بڕۆنە دێی شەحەل
ئارەزوویی جەننەت ئەمڕۆکە لە یادی خۆت بەرە
وەک بەهەشت هەر لا تەماشاکەی هەموو ژوور و دەری
جون بەجون غیلمانە سەف سەف حۆریی مەهپەیکەرە
هەڵپەڕینە و ڕەشبەڵەک تێکەڵ بەیەک بوون پیاو و ژن
عالەمی ئازادی ئیحیا کردووە ئەم مەنزەرە
ساحیبانی ئەمر و نەهیین ئەمڕۆ زوڕنا وو دەهۆڵ
ئەم دەڵێ ئەی غەم نەیەی ها ئەو دەڵێ شایی وەرە
تەرەف و بەزمێکە کوڕ و کچ دەس لە ناو دەستی یەکا
ئەم بەسیفەت هەر دەڵێی لاولاوە ئەو وەک عەرعەرە
سووڕەتی باغی سەفایە هەیئەتی ئەم شاییە
پەنجە بۆ دیواری قەسری عەیشی بۆتە پەنجەرە
هازی جەنناتون ئەگەر بێرە بووترێ لایقە
هەر کوڕە ئەم شان و ئەو شانی کچی تازە و تەڕە
کچ چ کچ هەر دیتنێکیان خەرجی سەد فەرخاری چین
بۆسەیێکیان قیمەتی وەسڵی بوتانی خاوەرە
قەترە قەترە لوئلوئە دەتکێ لە ڕوویی مەهوەشان
یا لە بۆ گەرمای عەرەق دەڕژێنێ وەردی ئەحمەرە

سمت و سینە قەدد و خەدد و جیسمی ساف و زولفیان
زیو و شیشە و سەر وو لالە و یاسەمینە و عەنبەرە
هۆش لە کەللە و دڵ لە سینە دین لە دڵ دێنێتە ڕەقس
هارەیی لوولە و خڕە خڕخاڵ و زرڕەی کەمبەرە
گەر خەزێمە کرمەکە گەر گوارە وو لاگیرەیە
بۆ برینی جەرگ و دڵ کامەی بڕۆنی خەنجەرە
خامەک و خارا وو ئەتلەس مەخمەر و تاقە و قەنەوز
هەر وەکو تاووس لەبەریانا ئەڵێی باڵ و پەڕە
گەرچی بێ میسلن هەموو ئەمما وەکو یارم (فوئاد)
کێ وەها چاو مامزە ئیمان دزە و غارەتگەرە
سینە بوستان غونچە پوستان نازەنینە و ناسکە
دڵ فریب و دڵ شکێن و دڵ نەواز و دلبەرە

فوئاد ئەم قەسیدەیەی لە ساڵی ١٩٢٢ نووسیوەتەوە. تێیدا وەسفی ئەو شایی و زەماوەندە دەکا بۆ کەسێکی گوندی شەحل لە دەشتی هەولێر گێڕاویانە بەهۆی ژنهێنانییەوە ناوی حەمەشین بووە. فوئاد سەرنجی ئەو کوڕ و کچانەی داوە دەستیان خستۆتە ناو دەستی یەکەوە لە ناو شایی ڕەشبەڵەکدا لە دەشتی هەولێر، ئەو حۆری و غیلمانانە مەستی هەوەسی دڵدارین و شاعیریش وێنەی جوانی ئەندامی لەشیان و ڕەوت و ناز و نووزی پڕ لە خۆشەویستییان دەکێشێ.

٤

سەماوەر خەیاڵی شیعری فوئادی بزواندووە:

ئەنیسی قەلبی غەمبارە سەماوەر
ڕەفیقی ساحیب ئەسرارە سەماوەر
نەدیمە چاپەز و مەی چایی گوڵڕەنگ
پیاڵە ساقییە یارە سەماوەر
وەزیرە چاپەز و عەسکەر پیاڵە
بەئەمری چا حوکمدارە سەماوەر



ئەو ئامێرەی بەناو و ناوەرۆک ڕووسە و لە ڕووسیاوە گەیشتۆتە لای ئێمە و بەدرێژایی ڕۆژگار بووە بەکورد، دەورێکی گرنگی بووە لە ژیانی کۆمەڵایەتی خێزان و بنەماڵەی کورد لە شار و گونددا. شاعیر هونەروەرانە چایچی دەکا بەنەدیم و پیاڵە دەکا بەمەیگێڕ و سەماوەریش دەبێ بەیاری نازدار، یا چایچی دەبێ بەوەزیر و سەرلەشکر و پیاڵەش بەسەرباز.

**شیعری کراوە (ئیرۆتیک)**

١

لە شیعرێکیدا فوئاد بەم جۆرە لە شەوی ناوپەردە و بەزاوابوون دەدوێ:

بەربووک لەسەری واجبە گەر باکیرە بێ بووک
بەو نەوعە بەگوێیدا کە وەکو قەل بقرێنێ
بەرخم شەوی وەسڵت مەدە ڕێگەی خەوی غەفلەت
ڕێوی مەبە زاوا کە وەکو شێر دەنەڕێنێ
ئەوساکە هەڵیدایەوە پەرد بکەوە خۆت
ووریا بە کە زوو پەردەیی عیفەت نەدڕێنی
ئەو سوورەیی یەک چاو کە حەمدان لەقەبیتی
مارێکە گەزەندە سەدی وەک تۆ ئەترێنێ
چاری بکە پێش دیتنی کون چونکە کە دیتی
سەد داوی لە ڕێ دابنرێ دەیپچڕێنێ
زوو جوڕڕەیی خۆتی مەخە بەردەست و بترسێ
لەو بازەکە بۆ گرتنی جوڕڕەی دەقرێنێ
ئەبرۆتە کەمان لنگە کەمین زولفە کەمەندت
جادوێکە چاوت کە دووسەد دڵ دەفڕێنێ
ئەو نێزە وو گورزەی هەیە تۆش شیر و خەدەنگت
ئازابە دەماری تۆ مەبادا کە دەڕێنێ
مەیدانی نەبەردە ئەمە بازی نییە زینهار
دۆستت ئەوەیە ڕۆڵە کەوا تۆ دەگریێنێ

شاعیر بەبۆنەی شایی و ئاهەنگی بووک گواستنەوەی شێخ عوبێدوڵڵای کوڕی سەید عومەری خانەقا ئەم شیعرەی وتووە. ڕووداوەکە لە گوندی شەحەل لە دەشتی هەولێر بووە. ئەو پەند و ئامۆژگارییەی شاعیر بەدەمی بەربووکەوە بەگوێی بووکدا دەچرپێنێ دیمەنێک دروست دەکا شەوی ناو پەردەی بووک و زاوا دەبێتە گۆڕەپانی شیربازی لە نێوان زاوا کە دەیکا بەیەکێک لە سوارچاک و چەکمە ڕەقەکانی سەدەکانی ناوەڕاست و بووک دەبێ بەیەکێ لە ئەمازۆنەکان، ژنە قارەمانەکانی ئەفسانەی ئەوروپاییەکان. بەلای شاعیرەوە زاوا لە بووک بەهێزترە، لەبەرئەوە ئامۆژگاریی بووک دەکا لەو زۆرانبازییەدا بەگوێی بەربووک بکا بۆ ئەوەی لەم جەنگەیدا سەربکەوێ. لە ڕووی جوانکاری شیعرییەوە فوئاد دیمەنێکی هونەراوی ڕەنگینی دروست کردووە. بەشێوازێکی کۆمیدییانە لە هەڵوێستێکی باوی ناو کۆمەڵی کوردەواری دەدوێ.

**٢**

لە لیریکێکیدا فوئاد هێرش دەباتە سەر هەتیوبازان و بەم جۆرە دایاندەشۆرێنێ:

چەند کەسێ هەن کە تالیبی لووسن
لووس و بێبەش لە عەرز و نامووسن
ڕەند و قەللاش و قەڵتەبان مەشرەب
حیز و نامەرد و پیس و چەپلووسن
جوملە بێ دین و فاسق و غەددار
خەرقە پۆشانی بەرگی سالووسن
گاهێ مەحزوونن بەخوێندنی قورئان
گاهێ مەفتوونی سەوقی ناقووسن
زەن سروشت و عەجووزە کردارن
پیشە دەللالن و زمان لووسن
دەرحەق ڕۆڵەیی موسوڵمانان
بێ ئیمانتر لە کافری ڕووسن
بۆ لوغاتی زمانی شەیتانی
هەریەکە یەک سیحاح و قامووسن



تف لە ئەتوار و خیلقەت و خوویان
لەو کەسانەش بەوان کە مەئنووسن
ئەی (فوئاد) ئەهلی غیرەت ئەم هەجوە
گەر ببینن دەم و دەس ئەینووسن

ئەم شیعرە لە هەندێ ڕووەوە شێخ ڕەزایانەیە. شێخ بۆ ئابڕووبردنی خەڵکی لە داشۆرینەکانیدا ناوی دەهێنان. شاعیری ئەم ماوەیە لە ڕووی ئایین و ڕەوشت و نەریتی کۆمەڵایەتییەوە تەماشای مەسەلەکە دەکا و هەتیوباز بەبێ شەرم و ئابڕوو دەژمێرێ.

**٣**

لە شیعرێکیدا فوئاد بەتەواوی شێوازی شێخ ڕەزا بەکار دێنێ:

ئەوی ڕۆمی بێ ئیسمی گەورە وو چووک
هەموو ژن حەقبەن و گەوواد و مەنیووک
لیواتە مەزهەب و دینیان لیواتە
ڕەسوولیان مێ کیتابیان قینگی بێ تووک

ئەو سیفەتەی فوئاد دەیداتە پاڵ ڕۆمییان (تورکان) جنێوێکی بازاڕییە، لە ناو کۆمەڵی کوردەواری و کۆمەڵانی دیکە باوە، وەکو پەندێکی پێشینان کەوتۆتە ناوەوە و بەهیچ جۆرێ کوردی پێ تاوانبار ناکرێ. وتەکە کۆمیدیانەیە وەکو قسەییێکی قۆشمە بۆ پێکەنین بەکار دەهێنرێ. ئەوەی شایانی باسە لەم ماوەیەدا ئەوەیە هەموو نەتەوەکانی هاوسێی کورد لە عەرەب و تورک و عەجەم و ئەرمەن و ئازەری ئەوانیش وتەی لەم بابەتانە و خراپتریشیان هەیە بەرامبەر بەیەکتری و بەرامبەر بەکوردیش.

## کوردایەتی

بیروباوەڕی کوردایەتی لە نێوان هەردوو جەنگی گێتیی سەدەی بیستەم لە دیوانی شیعری فوئاددا جێگەی دیاری هەیە.

١

بەهۆی سەرنەکەوتنی خەبات و ڕاپەڕینەکانی کورد بەسەرۆکایەتی شێخ مەحموود شاعیر دەڵێ:

خودا غەزەبتان لێ گرێ ئەی کوردەکان
جامی مەقسەد هاتە دەست و ڕشتتان
قفلی دەرگاهی ئومێدتان کردەوە
بۆچ بەدەستی کینە داتانخستەوە
لازمی دەوری تەجەددود بوو مەگەر
وەحشەتی کۆن تازەکەن بۆ یەک دیگەر
خاکی داگرتوون وەها دڕکی نیفاق
جێی نییە بڕوێ گوڵێکی ئیتتیفاق
ئێوە وا پەروەردەکەن بوغز و غەرەز
کێیە غەم خۆرتان ببێ غەیری مەرەز
وا پڕی دڵتانە میقرۆبی حەسەد
زەحمەتە بۆ ئێوە چاکی تا ئەبەد
گەرچی دەشزانم قسەم فایدەی نییە
کوردم و شین کردنم ناچارییە
گەر دەزانم قیسسە تەئسیری دەبێ
هەر بڵێم شەرت بێ وەکو ناڵەی حەبێ

فوئاد ئەم شیعرەی لەسەر بەحری ڕەمەلی عەرووزی داناوە، لەسەر بنچینەی جووت قافیە (مەسنەوی). لە لیریکەکەدا شاعیر هەڵسوکەوتی خراپی کورد خۆی دەکاتە هۆی سەرنەکەوتنی کۆششی شێخ مەحموود بۆ دامەزراندنی دەوڵەتی کوردی. ڕاستییەکەی ئەوە نییە، بەڵکو سیاسەتی ئەمپریالیستی بەریتانیا لە پێناوی بەرژەوەندی خۆی پاڵپشت بوو لەگەڵ بەرژەوەندی کاربەدەستانی عیراق و چینەکانی سەرەوەی سلێمانی لە دەوڵەمەندان و دەرەبەگەکان، ئەمانە هەموویان یەکیان گرتبوو، ئەوەی گرنگە ئەمانە لە کەموکووڕییەکانی بەڕێوەبەرایەتی شێخ مەحموود دەگەڕان دیارە ئەمانەش کەم نەبوون، ئیتر ئەم هەموو کردەوە



و کردارانە بەسەریەکەوە بوون بەهۆی ئەوەی کورد نەگاتە ئامانجی. ئەوەی لێرەدا پێویستە ئاماژەی بۆ بکرێ ئەم هەموو هۆیانە تەنیا بزووتنەوەی شێخ مەحموودیان نەگەیاندە قۆناغی بەزین، بەڵکو هەموو هەڵسانەکانی دیکەی کوردیش بەم دەردە لەناوچوون. لەگەڵ ئەوەشدا گازاندەی ئەم شاعیرە لە خەڵکی کورد لە دڵێکی پڕ لە سۆز و خۆشەویستییەوە هەڵقوڵاوە، هەر چۆنێ بێ دەبوو شاعیر هۆیێک بۆ سەرنەکەوتن بدۆزێتەوە، ئیتر میللەتی بەرکەوت، لە ناو ئەمانەشدا مەبەس دەوڵەمەند و دەرەبەگەکانە.

٢

لە شیعرێکیدا فوئاد بەهۆی دەرچوونی کۆواری «هەتاوی کورد» لە ئەستەمووڵ دەڵێ:

شەوی غەفلەت بەسەرچوو خوابی ئالۆز تابەکەی ئاخر
هەتاو هەڵهات و شوعلەی ئینتیباهی دایە چاوی کورد
لە شوومیی و کەسالەت گەرچی بەسرابوو شوکور وا بوو
بەمیفتاحی سەعی دەرگەی ئومێدی داخراوی کورد
لە سایەی حەزرەتی سوڵتان محەمەد خانەوە ئیمڕۆ
بیحەمدیللا لە ئەوجی ئیفتیخارایە کڵاوی کورد
ئەگەرچی مەزهەری ئیلتافی لا یوحسان ئەمێستاکەش
ڕجا وایە بەجارێ غەرقی میننەت بن تەواوی کورد
شەهەنشاها جیهاندارا ئەیا سوڵتانی بەحر و بەڕ
بەمۆمیاییێکی لوتفت بەستەیە قەلبی شکاوی کورد
مەتابیع وا لە دونیا عالەمی ئاساری ئیحیا کرد
نەما ئاساری خەتتی غەیری ئاساری نەماوی کورد
هەمم کاروانی ئەربابی قەڵەم گەر حەز کەن ئەینووسن
لە ناو ئەوراقی ئیقبالا وەکو ناوی سڕاوی کورد
لە مەیدانی سەحائیفدا ئەبەد ساحیب سەبق نابین
هەتا یەک مەتبەعە لێرە گوشاد نەکرێ بەناوی کورد

شاعیر زۆر گوشاد و خەندانە بەوەی چاپەمەنی بەناوی کوردەوە پەیدا بووە. باش دەزانێ کۆوار نیشانەی پێشکەوتنە. سوپاسی سوڵتانی عوسمانی دەکا کە ڕێگەی

بەبڵاوکردنەوەی ئەم کۆوارە داوە. بەلای شاعیرەوە دەرچوونی کۆوارەکە دان نانێکە بەمافی کورد. ئەم بۆچوونەی شاعیر تا پلەیێک ڕاستی تێدایە، چونکە کاربەدەستانی دەوڵەتی عوسمانی بیروڕایان لە بابەت کورد و هەموو خەڵکانی ناتورک لە دەوڵەتی عوسمانیدا وەکو بیروڕای کاربەدەستە شۆڤێنییەکانی تورک نەبووە بەسەرۆکایەتی مستەفا کەمال. نویشکی بیروڕای شاعیر لەم لیریکەدا ئەوەیە ئەگەر کورد کۆواری نەبێ پێش ناکەوێ.

***

تاهیر فوئاد شاعیرێکی ڕەند و خاوەن شیعری داهێنراوی نەوەی دووەم یا سێیەمی قوتابخانەی نالییە لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا. شیعری ڕەنگدانەوەی ژیان و هیوا و ئامانجی سەردەمی خۆی بووە، بابەتەکانی کەم نەبوون. لە زۆربەی مەبەس و هونەرەکانی شیعری کلاسیکی بەرهەمی هەبووە. ناوەرۆکە کۆن و تازەکانی هەیە، هەندێ جار تێکەڵی یەکتری کردوون. کێشی پڕ ئاواز و ڕیتمی ناسک و وشەی کوردی پەتی هارمۆنیاییێکی نەرم و ڕەنگینیان داوەتە شیعری. وێنەی ڕاستەقینەی کۆمەڵایەتی کورد و جەوهەری ڕەسەنی خەڵکی کەرکووک و هەموو گەرمیان بەگشتی لە دیوانی تاهیر فوئاد ڕەنگیان داوەتەوە.

## بەشی بیستەم

## حوزنی

**١٨٩٣ – ١٩٤٧**

ئەوەم پێ چاترە نەک سەر نەوی کەم
لە پێش گەورەی نەزان گەردەن کەچی کەم

### ژیانی حوزنی

حوسێن کوڕی سەید عەبدوللەتیف کوڕی شێخ ئیسماعیلی خەزایییە. لە گوندی نیچکە لە نزیک ئاوایی بوغدەکەندی سەر بە بۆکانی موکریان لە ساڵی ١٨٩٣ لە دایک بووە. شوێنەواری کاولبوونی گوندی نیچکە لە بەرچاوە و ئێستا کەسی تێدا ناژی. سەید عەبدوللەتیفی باوکی زۆر نەژیاوە، لە پاش مردنی سەلمای دایکی مێردی بەکابرایێکی هورمزیاری کردووە. لە سەردەمی لاویەتیدا هەندێ نازناوی بۆ خۆی داناوە و بەشێک لە نووسینەکانی بەو ناوانە بڵاوکردۆتەوە. ناوەکان: حوزنی، خدۆک، داماو، بیژەن بوون. لە ناو ئەمانەدا نازناوی «حوزنی» بەسەر ئەوانی دیکەدا زاڵ بوو. بەگشتی کەسێتی مێژوونووس و شاعیر و نووسەری ئەم ماوەیە بەحوسێن حوزنی موکریانی و حوزنی ناوی دەرکردووە. لە هەندێ شیعریدا نازناوی «داماو»ی بەکار هێناوە. حوزنی لە خێزانێکدا ژیاوە منداڵ بووە کە باوکی کۆچی دوایی کردووە. لە تەمەنی دوازدە ساڵیدا بێ کەس و بێ داڵدە ماوەتەوە، بەتایبەتی لە دوای شووکردنی دایکی ژیانی ئاسان نەبووە.

لە سەرەتای سەدەی بیستەم و ڕۆژگارانی جەنگی یەکەمی گێتی سنووری سیاسی نێوان ئێران و عوسمانی تەگەرەیێک نەبووە بۆ هاتوچۆی کورد لە هەموو ناوچە کوردنشینەکانی کوردستانی ئێران و عوسمانی. ئەمە ڕێگەی بۆ حوزنی خۆش کرد بەشوێن کاردا بگەڕێ لە ناو خاکی هەردوو دەوڵەتەکە. هێشتا لە تەمەنی لاویەتیدا بووە کە کەوتۆتە ئەستەمووڵ و لەوێ فێری مۆر هەڵکەندن بووە. لەو ماوەیەدا ناوچەکانی باکووری کوردستان گەڕاوە، تا دوای داگیرکردنی کوردستانی باشوور و دروستکردنی دەوڵەتی عیراق لە لایەن ئینگلیزەوە حوزنی بەهۆی سەید تەهای نەهرییەوە لە ڕواندز جێی کراوەتەوە و لەوێ نیشتەجێ بووە، لەو شارەدا زۆر نەماوەتەوە. لەو سەردەمەی ئەفسەری کوردی عیراقی فایق کاکەمین لە



ئۆردووی سوپایی ڕواندز بووە، ناخۆشی کەوتۆتە نێوانیانەوە، ناچار بووە ڕواندز بەجێ بێڵێ و ڕوو بکاتە حەڵەب. لەو شارەدا حوزنی خەریکی پیشەی مۆر هەڵکەنی و چاپخانە بووە تا ساڵی ١٩٢٥. ئەو چاپخانەیەی لە حەڵەب کاری تێدا کردووە لە دواییدا بۆتە هی خۆی بەکڕین یا بەهەر جۆرێک بووبێ.

لە ساڵی ١٩٢٦ حوزنی خۆی و چاپخانەکەی گەڕاوەتەوە ڕواندز و چاپخانەکەی لەوێ دامەزراندووە و ناوی ناوە «چاپخانەی زاری کرمانجی». هەروەها کۆوارێکیشی دەرکردووە بەناوی «زاری کرمانجی» هەر بەو ناوەوە بڵاوەخانەییێکیشی داناوە و کۆمەڵێک کتێبی ئەدەبی و مێژوویی و هی دیکەی بڵاوکردۆتەوە، تا ساڵی ١٩٣٤ خەریکی کۆواری «زاری کرمانجی» و بڵاوەخانەکەی بووە. لە حوزەیرانی ئەو ساڵەوە تا ناوەڕاستی مانگی تشرینی دووەم لە سلێمانی بووە لەگەڵ پیرەمێرد لە ڕۆژنامەی «ژیان»دا کاری کردووە. لە ساڵانی ١٩٣٥ – ١٩٣٦ لە هەولێر کۆواری «ڕووناکی» بڵاوکردۆتەوە. لە دوای ئەمە ماوەیێک بێ کاری بەخۆیەوە دیوە. لەگەڵ دەستپێکردنی جەنگی دووەمی گێتی کەوتۆتە بەغدا و لە ساڵی ١٩٤٣ وەک نووسەرێک لە کۆواری مانگانەی «دەنگی گێتیی تازە» دامەزراوە. لە دوای کۆتایی جەنگیش لە کۆوارەکە ماوەتەوە تا لە ٢٠ی ئەیلوولی ١٩٤٧ لە بەغدا کۆچی دوایی کردووە و تەرمەکەی گواستراوەتەوە هەولێر و لە گۆڕستانی ئیمام محەمەد نێژراوە.

### حوزنیی مێژوونووس

لە گۆڕەپانی ڕۆشنبیری کوردیدا لە سەرەتای ژیانی خوێندەواریدا حوزنی لایەنی زانستی مێژووی هەڵبژاردووە لە پێناوی خزمەتی ڕۆشنبیری کوردی. لەبەرئەوەی خوێندنێکی ڕێکوپێکی ئەکادیمی نەبووە لە مێژوودا لایەنی پراکتیکی یا مەیدانی وەرگرتووە، واتە زیاتر لە سەرچاوەی سەرزاری و گێڕانەوەی ڕووداوی پێشینان و سەر و سەربردە و بەسەرهاتی پیاوانی مێژوو کەڵکی وەرگرتووە، دیارە بەهەموو جۆرێک ئەمە ئەوە ناگەیەنێ سەرچاوەی نووسراوی نەبووبێ، گومان لەوەدا نییە ئەمەی بووە چونکە بێجگە لە زمانی کوردی و فارسی و تورکی و عەرەبی و فەرەنسی و ئینگلیزی زانیوە. ئەمە بووەتە هۆی ئەوەی ئاگاداری ئەو زانیارییانە بێ کە لە مێژووی ئەو میللەتانەی حوزنی زمانیانی زانیوە و بۆ نووسینی خۆی کەڵکی لێ وەرگرتوون. لە ئەنجامدا حوزنی بەزمانی کوردی کۆمەڵێک کتێبی مێژوویی نووسیوەتەوە، ئێستا بوو بەسەرچاوەییێکی گرنگ بۆ دانانی مێژووی کورد

و کوردستان، لەوانە: غونچەی بەهارستان (حەلەب ١٩٢٥)، ئاووریکی پاشەوە (بەرگی یەکەم ١٩٢٥؛ بەرگی دووەم ١٩٣٠؛ بەرگی سێیەم ١٩٣١)، تاریخی حوکمدارانی بابان (١٩٣١)، مێژووی ناودارانی کورد (١٩٣١)، کورد و نادر شا (١٩٣٤)، کوردی زەند (١٩٣٤)، مێژووی میرانی سۆران (١٩٣٥)، کوردستانی موکریان (ئاتروپاتین) (١٩٣٨)، ئەم کتێبانە هەموویان لە ڕواندز لە چاپخانەی زاری کرمانجی چاپ کراون.

جگە لەمانە حوزنی هەندێ باس و وتاری مێژوویی لە ڕۆژنامە و گۆوارە کوردییەکاندا بڵاوکردۆتەوە. لە ژیانی خوێندەواریدا حوزنی پێوەندی و نامەنووسینی لەگەڵ هەندێ کوردناسی ڕۆژهەڵاتناسانی ئەوروپا هەبوو، لەوانە ئەدمۆنسی ئینگلیز و مینۆرسکیی ڕووس و نیکیتینی پۆلۆنی (یا ڕووس) و کارل هەدەنگی ئەڵمان.

## حوزنیی هونەرمەند

حوزنی پیشەی مۆرهەڵکەنی و خۆشنووسی لە ئەستەموول فێر بووە. بەکۆشش و توانای خۆرسکی بۆی لواوە خۆی وەکو هونەروەرێکی دیار بخاتە ڕوو. ئەم پیشەیە وەک دیارە پێوەندییێکی بەهێز و ڕاستەوخۆی هەیە لەگەڵ چاپکردن (پولیگراف). بەهۆی ئەم دەست ڕەنگینییە حوزنی لەسەر مس و زەرد و شووشە و بەردی بەنرخ و داری کەوەت نووسین و نەخش و نیگاری هەڵدەکەند (گرافیک)، ئەوەی جێی ئافەرینە ئەم هونەروەرە ئەوەندە بەسەلیقە و ورد بوو کاری هەڵکەندنی زەنگوگرافی کە بەچەند چرکەیێک بەهۆی ماددەی کیمیاوییەوە وێنەیێک یا لاپەڕەیێکی نووسراو لەسەر مەعدەن (زەنگ) دروست دەبێ، کەچی حوزنی ئەو وێنەیە یا نووسینەی بەسومبە (قەڵەمی ئاسن) لەسەر داری کەوەت هەڵدەکەند و وەک زەنگوگراف کتێبەکانی بەوێنە و خەتی خۆشنووسی دەڕازاندەوە.

جگە لەمە حوزنی بایەخی زۆری بەوێنەگری (فۆتۆگراف) داوە. بێ گومان ئەم پیشەسازییە پێوەندی بەچاپەوە هەیە. بۆ ئەم مەبەسە کتێبێکی بەناوی «وێنەگری و کۆڵێن» (ڕواندز ١٩٣٤) داناوە. مەبەسی لەم کتێبەدا ئەوە بوو نهێنییەکانی پیشەی فۆتۆگراف و زەنگوگراف بۆ ڕۆشنبیری کورد ئاشکرا بکا. هەموو وێنە و خەتە خۆشنووسەکانی ناو ئەو کتێبەی لەسەر داری کەوەت هەڵکەندووە وەک لەوحەی زەنگوگراف و وێنەکانی ناو کتێبەکەی بەوان چاپ کردووە. بەم جۆرە حوزنی دەوری گرنگی بووە لە بڵاوکردنەوەی زانیاریی گشتی لە بارەی چاپ و چاپخانە و خۆشنووسی و هەڵکەندن و هەموو کار و کردەوەیێکی پێوەندی بەلیتوگراف و زەنگوگراف و گرافیکەوە



هەیە. کتێبی «وێنەگری و کۆڵێن» نرخێکی مۆزەیی هەیە لە مێژووی ڕۆشنبیری کوردیدا، چونکە ئەو ماوەیەی حوزنی بۆ دانانی ئەم کتێبە خەرجی کردووە بێ گومان بەساڵ دەژمێرێ کەچی تەکنیکی چاپی ئێستا بەچەند کاتژمێرێک دروستی دەکا.

## حوزنیی ڕۆژنامەنووس

ئەوەی جێی گومان نییە ئەوەیە جموجۆڵی حوزنی لە مەیدانی ڕۆشنبیری و ڕۆژنامەگەریدا لە ساڵی ١٩٢٥ لە حەڵەب دەست پێ دەکا. ئەو کاتە لە نزیکەوە بەتەواوی لەگەڵ چاپ و چاپخانە و بڵاوکردنەوە ئاشنا بووە. دیارە پێش ئەو ساڵە لە حەڵەب نیشتەجێ بووە و کتێبی مێژوویی «غونچەی بەهارستان»ی چاپ کردووە و بڵاوی کردۆتەوە، ئەمە وەکو کتێب یەکەمین بەرهەمی نووسینیەتی. لە پاشانا لە ساڵی ١٩٢٦ چاپخانەی لە حەڵەبەوە گواستۆتەوە ڕواندز و دەستی کردووە بەبڵاوکردنەوەی گۆواری «زاری کرمانجی». ئەم گۆوارە بەپچڕ پچڕی لە ماوەی ساڵانی ١٩٢٦ – ١٩٣٢دا بیست و چوار ژمارەی لێ بڵاوکرایەوە، گۆوارێکی کۆمەڵایەتی و مێژوویی و هونەری و ئەدەبی مانگانەیی بوو. زۆربەی نووسینی ناو گۆوارەکە حوزنی خۆی ئامادەی دەکرد. بایەخی بەهەموو ئەو لایەنە زانیارییانە دەدا کە لەو سەردەمەدا گرنگ بوون و پێویست بوو خەڵکی کورد ئاگاداری بن.

لە دوای وەستانی زاری کرمانجی لە ساڵی ١٩٣٢، لە ناوەڕاستی ساڵی ١٩٣٤ حوزنی ڕووی کردە شاری سلێمانی و لەگەڵ پیرەمێرد لە بەڕێوەبەرایەتی ڕۆژنامەی «ژیان» بەیەکتری گەیشتن و بوون بەهاوکار بۆ دەرهێنان و بڵاوکردنەوەی ئەو ڕۆژنامەیە. ئەو برادەرایەتییە زۆری نەخایاند و لە پاش چەند مانگێک نێوانیان تێکچوو و حوزنی لە ١٥ی تشرینی دووەمی ساڵی ١٩٣٤ سلێمانی بەجێهێشت.

حوزنی نەیدەتوانی بەبێ پیشەی ڕۆژنامەگەری بژی. لەبەرئەوە ئەمجارەیان بیری لەوە کردەوە گۆوارێکی هەفتەیی زانستی و کۆمەڵایەتی و ئەدەبی بەناوی «ڕووناکی» لە هەولێر بڵاو بکاتەوە. بۆ ئەم کارە پێویستیی بەخاوەن ئیمتیاز هەبوو. بەپێی قانوونی ئەو سەردەمەی عیراق و هەموو گێتی دەبوو ئەو کەسە باوەڕنامەی زانستگای هەبێ و مووچەخۆری میری نەبێ، لەو کاتەدا تەنیا ئەوقات (محامی) لە ناو کۆمەڵدا باوەڕنامەی زانستگایان هەبوو و مووچەخۆریش نەبوون. لەبەرئەوە کەسێکی هەولێری محەمەد شێت مستەفا بووە خاوەن ئیمتیازی ڕەسمی گۆواری ڕووناکی. بەڕاستی حوزنی خۆی هەموو کاروبارێکی گۆوارەکەی بەڕێوە دەبرد. زۆربەی وتارەکان خۆی دەینووسینەوە و ئامادەی

دەکردن. خاوەن ئیمتیاز لە ژمارە یەکەم و دووەم هەندێ وتاری بۆ بڵاوکراوەتەوە.

ژمارەی یەکەمی ڕووناکی لە ڕۆژی ٢٤ی تشرینی یەکەمی ساڵی **١٩٣٥** بڵاوکرایەوە. تەنیا یازدە ژمارەی لێ دەرچوو، دوا ژمارەی لە ڕۆژی ١٦ی مایسی **١٩٣٦** بڵاوکرایەوە، واتە دەوروبەری حەوت مانگێک بەردەوام بوو.

کۆواری ڕووناکی ڕووداوێکی ڕۆشنبیری گرنگ بوو لە شاری هەولێر، لەوە پێش ئەم شارە بزووتنەوەی ڕۆژنامەگەری بەخۆیەوە نەدیبوو. ڕووناکی بایەخی بەمێژوو و ئەدەب و ژیانی کۆمەڵایەتیی کوردی دەدا بەتایبەتی ئەوەی پێوەندی بەهەولێرەوە هەبوو. ئاگا و ڕووداوی ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و ئەدەبی ناو شار و دەرەوەی بڵاو دەکردەوە.

دوا قۆناغی حوزنی لە کاری ڕۆژنامەگەریدا وەک کارگەر و نووسەرێک لە کۆواری «دەنگی گێتیی تازە»دا بوو. ئەمە کۆوارێکی مانگانە بوو لە لایەن بەشی پێوەندیی گشتییەوە لە باڵیۆزخانەی بەریتانیا لە بەغدا دەردەهێنرا (١٩٤٣). کاروباری نووسین و هونەری و دەرهێنانی بەتۆفیق وەهبی سپێررا بوو. لە سەرەتادا دوو کەس یارمەتییان دەدا حوزنی و حەسەنی شێخ حەمە مارف. حوزنی کارگەرێکی بەکار بوو لەو کۆوارەدا. چیرۆک و وتاری ئەدەبی دەنووسی، تێکستی ئەدەبی میللیی سەرزاری (فۆلکلۆر) لە شیعر و پەخشان بڵاو دەکردەوە. لە وەرگێڕانا بەتوانا بوو، بەتایبەتی لە وەرگێڕانی هەموو جۆرە نووسینێکی عەرەبی و فارسی بۆ زمانی کوردی. ناوەرۆکی نووسینەکانی لە بابەت ژیانی ڕۆژهەڵاتناس و پیاوە سیاسییەکانی سەردەمی جەنگی دووەمی گێتی و شاعیرانی کلاسیکیی ئینگلیز و هی دیکە بوو.

نووسینی حوزنی لە دەنگی گێتیی تازە لە پلەیێکی بەرزی هونەریدا بوو، چونکە لە تەمەنێکدا بوو زانست و زانیارییێکی زۆری وەرگرتبوو بەهۆی کۆششی خۆی و تاقیکردنەوەکانی لە مەیدانی مێژوو و ڕۆژنامەنووسیدا. حوزنی لە سەرەتای دەرچوونی دەنگی گێتیی تازە لەگەڵیدا بوو تا ئاوابوونی. لە دوای ئەو حوزنیش ئەم گێتییەی بەجێهێشت. کردەوەکانی ماونەتەوە و لە مێژووی ڕۆشنبیری کوردی پارێزراون.



## حوزنیی نووسەر و شاعیر

حوزنی کوردی زانێکی چاک بوو، گۆڕەپانی نووسینی ئەدەبی فراوان بوو. دەتوانرێ لەم خاڵانەی خوارەوە بدۆزرێنەوە:

١- وتاری ئەدەبی: لەم هونەرەدا حوزنی وەک یەکێک لە دامەزرێنەرانی ئەم بابەتە بەرهەمە پەخشانییە حسێب دەکرێ. شێوازی جوانی لە تابلۆ ڕۆمانتیکییەکانیدا بەرچاو دەکەوێ، وەکو وتارەکانی «گوندێکی کاول بوو» و «بەختەوەری» و «جەنگی مرۆڤ لەگەڵ مەرگ» و «هەی خاک» و هی دیکە.

٢- چیرۆک: حوزنی لەم هونەرەدا یەکێکە لە داهێنەرانی لە ئەدەبی کوردی لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا. بەڕاستی ڕێبازێکی جوان و لەباری گرتووە لەم جۆرە هونەرەدا. تەنیا بەوە نەوەستاوە چیرۆکی ڕەسەن لە ژیانی کۆمەڵایەتی وەربگرێ بەڵکو حیکایەتی ئەدەبی میللی (فۆلکلۆر) گەلێ جار بووە بەسەرچاوە بۆ نووسینی چیرۆکی تازە لەسەر بنچینەی داڕشتنەوەی ناوەرۆکی بەشێوازێکی تازە و زمانێکی کوردی پەتیی سەردەم. بەگشتی چیرۆکە نایابەکانی حوزنی لەمانەدا دەبینرێن: «چاک و بەد» و «مام پیاو» و «سەپان و جووتیار» و «دز و ڕەبەن» و «خاوەن دارستان و پشیلە» و «پادشا و کراس» و هی دیکە.

ئەوەی لە بەرهەمی حوزنیدا سەرنج ڕادەکێشێ هەست بەچوونە مەیدانێک دەکرێ لە نێوان وتاری ئەدەبی و چیرۆکی کورتدا. هەندێ جار بەرهەمەکە بەناوی وتار بڵاو دەکرێتەوە کەچی لە چیرۆکەوە نزیکترە، دیارە پێچەوانەش دەبینرێ ئەم دیاردەیە تایبەتی نییە بەحوزنی بەڵکو لای هەموو پەخشاننووسانی ئەو ڕۆژگارە بەرچاو دەکەوێ.

٣- حوزنی بایەخی زۆری بەوەرگێڕان داوە لە هەموو بابەتەکانی ئەدەبی. وەرگێڕانەکانی لە عەرەبی و فارسییەوە بووە. ناوەرۆکیان ڕەنگاوڕەنگە لە سیاسەتی ڕۆژانەوە تا مەسەلەی ڕۆشنبیری و کۆمەڵایەتی و ئەدەبی و هونەری و لایەنی دیکەی ژیانەوە.

## نموونەی پەخشانی حوزنی

لە تابلۆ ڕۆمانتیکییەکەیدا لە وتاری «گوندێکی کاول بوو» حوزنی دەنووسێ:

«ئێوارەی گوندەکە لەسەرخۆ تێپەڕی، چرووسکەی ڕووناکی لە کەلی ئاسماندا ڕووی لە پووچبوونەوە بوو، ئێوارەکانی بەجێماوی، وە شەوەکانی بەبیرەوەری ڕۆیشتن. ئێوارە ڕەنگ و ڕوو زەرد هەڵگەڕاوەکەی لەسەر ملە و کەڵەشاخەکان بەسوورهەڵگەڕاوی چاوەڕوانی ئەو لاوانەی دەکرد کە گوندەکەیان بەبێ کەسی بەجێهێشتبوو، وە لە دەمی هاوارلێکردنیان وە دەنگی هۆ مەڕۆندا خۆیان پەنا دابوو هەرچەند نووزە و لالانەوەشیان بەدوودا بوو. بەنیوەی شەو و بەیانی نزیک سپێدەی گەزەنگی نادیار ئەو نووزانەوە و لالانەوەشیان هەر بەدوودا بوو، هەتا دەمێ کە شەو نزیک بەسەرچوونی، وە دەمی بەیانی سپێدە بەردان بوو. گوندی کاولبووی دیوارە بەسەریەک ڕوماوی داماو، لەبەر بێ کەسی و ماندووبوونی و زۆر قیژەکردن و نووزانی کفت کەوت و چاوی لەسەریەک دانا و بەئاخ و داخەوە لەبەر خۆیەوە لە نەتەوەکانی دەپرسی کە داخۆ ئەوانە لە کوێن! وە کەی دەگەڕێنەوە لای تاکو کاول بوو ئاوەدان بکەنەوە و پیرۆزمەندی بخەنەوە دەست خۆیان.

ئەو گوندە کاول بووە ڕێگاییێکی کە بۆی دەچوویە ژوورەوە، ڕێبوار لە دەنگی چوونە ژوورەوەیدا سۆزە و سریوەییێکی پڕ سۆز و دڵسۆزی گوێ لێ دەبوو، لە باریکی و نووزەی دەنگەکە وای دەنواند کە سروشتێکی هەستان و سروودێکی ئاوەدانبوونەوە و چرووسکەییێکی ڕووناکی پێوەیە، هەرچەند هەموو ناگزووریێکی لێ کۆ ببووەوە و گێتیی لێ ببوو بەچەرمەچۆلەکە. ئەو گوندە وەکو پیرێکی لێکەوتووی پەرێشان و پەرچە لە تۆپەنەکانی بەملا و ئەولای خۆیدا هەڵدابووەوە، ڕوو گرژ و نێوچەوان ترش و بێ دەنگ و ملکەچ هەڵترووشکا بوو، سامێکی داچڵەکێنەری لێوە دیار دەکرد، بەدیتنی مرۆڤ دڵتەنگ و خەفەتبار دەبوو. نائومێدی و بێ باوەڕی و ترس سوار شانی و چاولێکەری دەبوو.

لە کەنار کاولەکانەوە ئەسپێک بەسترا بووەوە، زۆر وێ دەچوو بەئەندام و پەیکەر جوان بوو، نەژادی ئەو ئەسپە لەو ئەسپە نەژاد پاکانە بوو کە لەو سەر زەوییەدا بەناوونیشانەوە هاتبوونە دی. ئەسپەکە بێ هەست دەلەوەڕا، وە لەسەرخۆ خرمەی دەهات، وەکو چاوەنۆڕی خاوەندی بکا کەی سواری دەبێ و ڕکێفی لێ دەدا و دەیبەزێنێت.



سوارەکەی لاوێکی نەوجەوانی بەتەن و مەنی شان و باهوو ئەستووری چوستی پووز و بازووڵە هەڵکراوێکی زرنگ لە تەنیشت ئەسپەکەوە بەگرژی و نێوچەوان ترشییەوە پاڵی دابووە سەر لا دیوارە ڕووخاوێکی کەلاوەی گوندەکە، تفەنگێکی نەچیرەوانی و تۆرێکی ڕاو و دێوجامەییێکی لە بەردەمی دانابوو، تۆرەکەی بەسوور و پشتی خۆی دابوو هەموو گێتی پێش چاوی داوێژت، بەڵام بەچاوێکی تیژ و زمانێکی لاڵ و بێ دەنگ، لە ژێر لێوەوە بەنەرمی سۆزەییێک، لەرینەوەییێک، ترینگەییێک، زەمزەمەییێک دەهات لەوەدا مزگێنی بەدانی بەیانی و ئەنگوتنی سپێدە و لاچوونی تاریکی شەوی لێ دەردەکەوت کە جریوەی مەل لەسەر مل و نەوالانیش دەهاتە گوێوە...».

## نموونەی شیعری حوزنی

حوزنی توانای ئەوەی بووە شیعر دابنێ، ئەو بەڵگە کەمانەی لە بەردەست دان ڕاستی لەم لایەنەوە دەخەنە بەرچاو. لەگەڵ ئەوەشدا دانانی شیعری نەکردووە بەپیشە و ناوی وەک شاعیر بڵاو نەبۆتەوە.

١

حوزنی لە شیعرێکیدا دەڵێ:

خراپێکی کە تۆ لە منی دەبینی
دوو پیتە پێت دەڵێم با دانەمێنی
یەکێ کوردم دووەم ڕاستە ووتارم
لەوەم زیاتر نییە سووچی نهێنی
لەوێ ڕۆژێوە بەدبەخت و کەنەفتم
کە هاتمە شارێکی وا مەرگە ژینی
گرفتاری غەم و دەردێکی وا بووم
نییە ڕزگاری تۆ مەرگم ببینی
لە دەست کوردان برا ژینم بەڵایە
خۆراکم تاڵە کارم دڵ برینی
غەم و دەرد و بەڵا و گێچەڵ و شەڕ
بەڕێژەن دێ بەسەرما دەمکەوێنی

وەها (داماو)ی دەستی جەهلی کوردم
کەنەفتی و ناهومێدیم کەس نەبینێ

لە ساڵی ١٩٢٦ کە حوزنی چاپخانەی لە ڕواندز دامەزراند، مایەی خۆشی و شادی بوو بۆ لاوان و نیشتمانپەروەرانی خەڵکی ڕواندز و هەموو کوردی کوردستانی باشوور. هەندێ لە مەلاکانی شار کەوتنە بەربەرەکانی حوزنی بەناوی ئەوەی چاپەمەنی خوو و ڕەوشتی خەڵکی دەشێوێنێ. لە دواییدا هەر ئەم هەڵوێستەش بوو نەیتوانی لە خەباتی خوێندەواری و ڕۆشنبیری بەردەوام بێ، ناچار شاری ڕواندزی بەجێهێشت.

ئەم لیریکەی حوزنی هەموو مەرجەکانی شیعری کلاسیکی تێدایە، دەکرێ لە شیعری ئامۆژگاری و دانایی و ڕەخنەگرتن لە کردەوەی ناهەمواری کۆمەڵایەتی بژمێررێ.

٢

لە شیعرێکی دیکەیدا حوزنی هەر بەو هەناسەیەی شیعری پێشوو دەڵێ:

ئەگەر ڕووت و نەدار و بێ کەوا بم
وە گەر برسی و گرفتاری هەوا بم
لە خوێش و نیشتمان ئاوارە مابم
لە دەس یار و نەیارا سەر شێوا بم
لە ژێر جەور و جەفا و توهمەت ڕزا بم
لە نێو تاریکی کونجی غەم خزا بم
وەکو مەم بەندی زنجیری بەلا بم
وەکو بێژەن لە چالاوی قولا بم
ئەسیری زوڵم و ئیستیبدادی وا بم
لە خاکی خۆم غەریب و بێ نەوا بم
لە نێو بێگانە داماوی قەزا بم
بەخزم و کەس و باب و برا بم
ئەوەم پێ چاترە نەک سەر نەوی کەم
لە پێش گەورەی نەزان گەردەنکەچی کەم

لەم شیعرەدا ئەستووری بیروباوەڕی حوزنی ئەوەیە هەرچی ڕۆژگار لە دژیدا بیکا، هەموو



کردەوەییێکی ئەوانەی خۆیان بەگەورە دەزانن زیانی پێ بگەیەنن سەریان بۆ شۆڕ ناکا و نابێتە پیاویان. مەبەسی ئەوەیە مرۆڤی سەربەست تەنیا دەبێتە پیاوی ژیری بەکاری سەربەستی وەکو خۆی.

ئەم شیعرە جۆرە تەرجیع بەندێکی یەک بەندییە. شەش دێڕی یەکەم یا هەر دوازدە نیوە دێر شیعرەکان لەسەر یەک قافیەن و دێڕی حەوتەم تەرجیعەکەیەتی (وەک «خەرجە»کەی مووەششەحی ئەندەلوسی). ئەم تەرجیع بەندە ئەگەر چەند بەندێک بوایە، دەبوو دێڕی دوایی لە هەموو بەندەکاندا دووبارە ببێتەوە.

***

حوسێن حوزنیی موکریانیی مێژوونووس و وەستای هونەری مۆرهەڵکەندن و لیتۆگراف و ڕۆژنامەنووس و شاعیر و نووسەر کەسایەتییێکی تایبەتییە لە مێژووی ئەدەب و ڕۆشنبیری کوردیدا. سامانێکی بەپیت و بەکەڵکی لە پاش خۆیدا بەجێ هێشتووە. دەوری گرنگی بووە لە پێشخستنی ئەدەبی کوردی و نوێکردنەوەی بەتایبەتی لە مەیدانی پەخشانی کوردیدا. نموونە جوان و گرنگەکانی لە وتاری ئەدەبی و کورتە چیرۆک و شیعر بەڵگەی خەیاڵ فراوانی و ئەندێشەی قووڵی حوزنی موکریانین.

# بەشی بیست و یەکەم

## ئەحمەد موختار

## ١٨٩٨ - ١٩٣٥

### ژیانی ئەحمەد موختار

عەلائەدین سەجادی بەم قسە جوانانە دەست دەکا بەگێڕانەوەی بەسەرهاتی ئەحمەد موختار «کۆترە باریکەی دەنگ پڕ لە یاهوو، گوڕەی ئەو دەنگە گوڕتر لە ئاهوو، گوڵاڵەی باغچەی عێلی جافەکان، گەڵاڵەی بوغچەی فیکری کوردەکان. هەڵکەوتووی سەربەخۆ لە مەیدانی شیعرا، سەرکەوتوویێکی خۆ بەخۆ لە بازاڕی خێرا. کەوتوو بەداوی چاوی مەستەوە، تا هۆشی کردەوە، تینوو بەرۆژی ڕوونی کوردەوە، تا پشتی کردەوە. شۆخ و شەنگ لاوچاک بووە، دەست بەتفەنگ و سوارچاک بووە».

ئەحمەد موختار کوڕی وەسمان پاشا کوڕی محەممەد پاشا کوڕی کەیخوسرەو بەگی جافە. لەساڵی ١٨٩٨ لە هەڵەبجە لە دایک بووە. ئەوەی پێویستە لێرەدا ڕوون بکرێتەوە ئەوەیە ناوی «ئەحمەد موختار» ناوێکی لێکدراوە لە کۆنەوە «موختار» بووە بەنازناو و سیفەت بۆ ناوی «ئەحمەد» کە یەکێکە لە ناوەکانی پێغەمبەر. ئیتر لە دوای ئەمە موختار بۆ هەموو «ئەحمەد»ێک بەکارهێنراوە بەتایبەتی لە کۆمەڵی عوسمانیدا. جگە لەوە ڕستەی «احمد مختار بک» - بەڕاست نووسینی عەرەبی - بەحسێبی ئەلفوبێی ئەبجەد دەکاتە ساڵی ١٣١٦ی هیجری بەرامبەر بەساڵی ١٨٩٨/١٨٩٩ی مەسیحی و ساڵی لە دایکبوونی ئەحمەد موختارە. لە بارەی نازناوی شیعرییەوە، شاعیر ناوی ڕاستەقینەی خۆی «ئەحمەد»ی کردووە بەنازناوی شیعری.

لە سەردەمی منداڵیدا دەستی بەخوێندن کردووە، لە قوتابخانەی میری یا حوجرەی مزگەوت فێری خوێندن و نووسین بووە. جگە لەوە مامۆستای تایبەتی بۆ گیراوە. دوور نییە زیاتر لە مامۆستاییێک وانەی زانستییەکانی ئەو سەردەمە و زمانەکانی هاوسێیانی کوردیان پێ وتبێ. لەبەرئەوەی ئەحمەد موختار هەوەسی خوێندنەوەی لە پلەیێکی بەرزدا بووە، لە ڕووی خوێندەوارییەوە خۆی پێ گەیاندووە. بەهۆی دەوڵەمەندیی بنەماڵەیەوە ئاتاجی کار و پیشەیێکی دیاریکراو نەبووە، ئەوە نەبێ مەگەر سەرپەرشتی زەویوزار و موڵکەکانی کردبێ.



ئەحمەد موختار لە دیوەخانێکی دەوڵەمەند و ئاوەدان گەورە بووە، لە منداڵییەوە مەشقی سوارچاکی و تفەنگچییەتی کردووە، لە دواییدا هەوەسی ڕاووشکار و سەیران و ڕابواردن و خواردنەوە و مەستی بووە، جار بەجاریش بۆ ڕابواردن یاری (قوماری) کردووە. لە سوارچاکی و چاوتێری هەندێ سیفەتی سوارچاکانی (کاڤالێرانی) ئەوروپای پێوە دیار بووە. لە تەمەنی بیست ساڵیدا ژنی هێناوە. وەک لە هەندێ لە شیعرەکانیدا دەردەکەوێ پێوەندیی سۆزی خۆشەویستی لە ناو خێزانیدا بەهێز بووە. منداڵەکانی خۆی زۆر خۆشویستووە.

شاعیر لە دوای مووچەخۆری میری و مەقامی دەوڵەتی نەگەڕاوە، ئەگەر هەندێ جار تووشی بووبێ بۆ ناوی بووە نەک بۆ قازانج و پارە. لە ساڵی ١٩٢٢ کراوە بەقائیمەقامی هەڵەبجە و لە ساڵی ١٩٢٣ لە لایەن شێخ مەحموودەوە خراوەتە بەندیخانەوە. لە دوای ئازادبوونی لە ساڵی ١٩٢٤ بەنوێنەری سلێمانی لە یەکەمین دەورەی پەرلەمانی عیراق هەڵبژێرراوە تا کۆچی دوایی لە ناو ئەم دەسگایەدا بووە.

ژیانی ئەحمەد موختار کورت بووە، کەم ژیاوە، بەکارەسات کۆتایی بەژیانی هاتووە. لە کاتێکدا لە سەرەتای مانگی شوباتی ١٩٣٥ لە زێی سیروان بەکەلەک پەڕیوەتەوە بەدەستی دوژمنێک کوژراوە، لە گۆڕستانی عەبابەیلێ ئەو گۆڕستانەی تاهیر بەگی برای لێ نێژراوە ئەویش بەخاک سپێرراوە. هۆی کوشتنی نەزانراوە، لەسەر بیروباوەڕ و هەڵوێستی سیاسی بووە یا ناکۆکیی عەشیرەتی لەسەر موڵک و ماڵ بووە؟!.

### شیعری ئەحمەد موختار

ئەحمەد موختار لە خێزانێکی دەوڵەمەند و بەسەواد پەروەردە بووە. برا گەورەی تاهیر بەگ یەکێکە لە شاعیرە ڕەندەکانی ئەدەبی کوردی. مەحموود پاشای مامی هەوەسی لەسەر شیعر و ئەدەبدا بووە. لە نێوەندی ڕۆشنبیری لە کوردستانی باشوور «کەشکۆڵەکەی مەحموود پاشا» بەناوبانگە. ئەم کەشکۆڵە سەرچاوەیێکی باش بوو، گوڵدەستەی دیوانی شیعری کوردی بوو. لەو دەسنووسەدا شیعرێکی زۆری دیالێکتی گۆرانی تۆمار کراوە، چونکە ئەو دیالێکتە زمانی ڕەسمی سەردەمەکانی پێشووی ناوچەکانی شارەزوور و ئەردەلان و هەورامان و گەرمیان و هەرێمی دیکە بوو. یەکێکی وەکو نالی و شێخ ڕەزا و تاهیر بەگ و ئەحمەد موختار دەبوو بەم دیالێکتە شیعر بڵێن، بەڵام نالی سیستێمەکەی تێکدا و بەزمانی پاشایانی بابان و ناوچەکانی شاربازێڕ کە دیالێکتی کرمانجیی باشوور

بوو و ئەو ئاوەی ڕشت بناغەی قوتابخانەی کوردستانی باشووری لێدا. لە دوای مەحموود پاشای جاف کەشکۆڵەکە کەوتە لای نەوەکانییەوە، لە ئەنجامدا لای حەسەن فەهمی جافی خوێندەوار و ڕۆشنبیر نیشتەوە.

ئەحمەد موختار لە هەردوو بابەتی شیعری سەردەمی خۆی نزیک بوو، شیعری عەرووزی کوردستانی باشوور و شیعری دیالێکتی گۆرانی. لەسەر ڕێ و شوێنی قوتابخانەی نالی و لاساییکردنەوەی شیعری تاهیر بەگی برای بوو بەقوتابی نالی و هاوڕێی ناری و کۆمەڵێک لە شاعیران و ڕۆشنبیرانی وەکو عەلی کەمالی باپیر و میرزا مارف و هی دیکە.

لە بابەت شیعری ئەحمەد موختارەوە لە ناوەڕاستی سەدەی بیستەم بەهۆی کۆششە ئەدەبییەکانی عەلی کەمالی باپیر و ڕەفیق حیلمی و عەلائەدین سەجادییەوە هەندێ شیعری ئەحمەد موختار کەوتە بەرگوێی خوێندەواری کورد. لە نیوەی دووەمی سەدەی بیستەم دیوانی شاعیر لە سلێمانی لە ساڵی ١٩٦٠ بەکۆششی عەلی کەمالی باپیر لە چاپ درا. لە دوای ئەو لە هەولێر لە ساڵی ١٩٦٩ بەهەندێ بەرهەمی تازە و بەکۆششی گیوی موکریانی بۆ جاری دووەم بڵاوکرایەوە. ئینجا چاپی سێیەمی دیوانی ئەحمەد موختار لەگەڵ هەندێ بەرهەمی دیکەی لە چاپەکانی پێشوو بڵاو نەکرابوونەوە بەکۆششی ئەفراسیابی کوڕی شاعیر لە بەغدا لە ساڵی ١٩٨٦ بڵاوکرایەوە.

## شیعری ئەحمەد موختار لە ڕووی ڕوخسارەوە

شیعری ئەحمەد موختار هەمووی لەسەر بەحرەکانی عەرووز دانراون. زۆربەیان لەسەر بەحری هەزەج و ڕەمەلن، چەند دانەیێکیان لەسەر بەحری موزاریعن، ئەمانە لە بەحرە سووکەکانن، لەبەرئەوەیە ئاواز و ڕیتمیان بەسووکی و ڕەوانی دەکەونە بەرگوێ. ئەوەی جێی سەرنجدانە ئەوەیە ئەحمەد موختار تەنیا غەزەلێکی هەیە لەسەر بەحری کامیلی هەشتی مەوقووس (متفاعلن متفاعلن متفاعلن مفاعلن) هۆنراوەتەوە. سەرەتاکەی ئەمەیە:

دڵی وەک هەزاری من شـــــەو و ڕۆژ بەئاه و ناڵـەیە
بەئومێدی چاوی مەستی تۆ بەتەمای مەیی و پیاڵەیە

لێرەدا بەئاشکرا دیارە قورسی بەحرەکە وای کردووە شیعرەکە بەگرانی بکەوێتە بەرگوێ،



بەڵام ئەوە هەیە قورسی کێشی ئەم شیعرە لەگەڵ سووکی کێشی هەموو دیوانی ئەحمەد موختار لەگەڵ یەکتریدا ناگونجێن، ئەمەش بەڵگەی وەستایی شاعیرە لە کێشدا چونکە زۆر بەدەگمەن لە ئەدەبی کلاسیکی کوردیدا شیعر لەسەر بەحری کامیل بەرچاو دەکەوێ.

## قافیە و پاش قافیە

شیعری ئەحمەد موختار لەسەر بنچی یەکێتیی قافیە دانراوە، شیعرێکی نەبێ لەسەر جووت قافیەیە (مەسنەوی) (ا ا، ب ب، جـ جـ..) لە قافیەدا بەشێکی کەم لە دەنگەکانی ئەلفوبێی عەرەبی و کوردی لە لایەن شاعیرەوە بەکارهێنراون. تەنیا ئەم دەنگانەی هەیە: ا، ب، ت، د، ر، گ، ل، م، ن، (ە – ـە)، ۆ، ی، ێ.

پاش قافیە لای شاعیر زۆر نییە. بریتییە لە وشە دەنگ سووکەکان، ئەوەی لە دیوانیدا دەبینرێ ئەمانەن: بکا، ئەکا، (ئەمەی زۆر بەکار هێناوە)، بۆت، کرد، ئەگرم، کەم، نەکەم، تۆم، ئەکەم، ناکەم، بم، من، وەتەن، ئەکەن، بکەن، مەشکێنە، بۆ چییە، کردووە، ئەو چاوە، هەیە، منە، تۆ، بێ، ئەکەی، چی، ئەبێ.

## بابەتەکانی شیعر

ڕەنگاوڕەنگی شیعری ئەحمەد موختار لە بارەی ڕوخسارەوە بەری تەسکە، هەموو بابەت و هونەرەکانی شیعری کلاسیکی دەور نەکردۆتەوە، ئەوەی لە دیوانیدا بەدی دەکرێ ئەمانەن:

١- بەرهەمی شیعری بەگشتی دەچێتە ناو «غەزەل»ەوە. لە پارچەوە دەست پێ دەکا، پێنج دێڕە شیعر تا دوازدە، لە دوازدە دێڕ زیاتر قەسیدەی زۆر کەمە. دیارە مەبەس لە غەزەل بابەتی لیریکە نەک بەناوەڕۆک و دڵداری.

٢- شیعرێکی جووت قافیە (مەسنەوی) لە دیوانیدا بەرچاو دەکەوێ، لە ڕووی کێشەوە لەسەر بەحری عەرووزییە.

٣- شیعری هەیە لەسەر بنچینەی بەند (کووپلە) دامەزراوە، هەر یەکێکی پێنج نیوە دێڕ شیعرە، دێڕی دوایی دووبارە و سێ بارە دەبێتەوە لە هەموو بەندەکاندا (ا ا ا ا م، ب ب ب ب م، جـ جـ جـ جـ م...).

٤- شیعری دیکەی هەیە کەوتۆتە ژێر کاریگەری شیعری لاسایی ڕۆمانتیکی عوسمانی لەسەر کێشی سیلابی خۆماڵی ڕێکخراوە، لەسەر قافیەی (ا ب ا ب).

## زمانی شیعر و ڕەوانبێژی

ئەحمەد موختار دەوری گرنگی بووە لە ئاسانکردنی فەرهەنگی شیعری کلاسیکی. لە کاتێکدا ڕەفیق حیلمی کە بەراوردی لە نێوان حەمدی و ئەحمەد موختاردا کردووە بەڕاستی بۆ مەسەلەکە چووە کە هەردووکیانی لە قالبی فەرهەنگی شیعری کلاسیکی دەرنەهێناوە، کەچی ئەوە هەیە حەمدی وشەی قورسی فەرهەنگی شیعری کلاسیکی ئیسلامەوی زیاتر بەکار هێناوە، لای ئەحمەد موختار کەمترە. هەروەها عەلائەدین سەجادیش لە بارەی فەرهەنگی شیعری شاعیرەوە بیروڕای خۆی دەربڕیوە و ناوی ئەحمەد موختاری خستۆتە ناو ڕێزی شاعیرە دیارەکانی نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم لە تازەکردنەوەی لیریکی کوردی لە ڕووی بەکارهێنانی وشەی فەرهەنگی نوێوە.

ئەحمەد موختار ئەوەندە بایەخی بەڕەوانبێژی شیعری ئیسلامەوی نەداوە لە شیعری کوردیدا. هەروەها وێنە دروست بوو و دروست نەبووەکانی ڕەوانبێژی خۆماڵیشی بەهەند هەڵنەگرتووە، لەگەڵ ئەوەشدا بەتەواوی پشتگوێی نەخستوون، ئەگەر شوێنەواری ئەم دوو ڕەوانبێژییە لە شیعریدا بەدی بکرێن لەنگەری هەردووکیانی وەکو یەک ڕاگرتووە.

### شیعری ئەحمەد موختار لە ڕووی ناوەڕۆکەوە

ئەحمەد موختار بەچێژی دڵ گرفتاری کچی جوان بووە، بەفیکری ئەقڵ گیرۆدەی میللەتی کورد و خاکی کوردستان بووە، هەموو بەرهەمی شیعری بۆ ئەم دوو دیاردەیە بەکار هێناوە. دلبەری شاعیر کچێکی جوانە، بەزۆری بە«نیگار» ناوی بردووە و کردوویەتی بەبووکێکی دیکەی شیعری کوردی. ئەو کچە خۆشەویستە جوانێکی زەمینییە، بەپەیکەر لەگەڵیدا دەژی. ئەگەر جیاوازییێک لە نێوان دلبەری ئەحمەد موختار و دلبەری شاعیرانی پێش خۆیدا هەبێ، ئەوەی ئەوان هەندێ جار نەبوون و بۆ مەبەسی شیعر دروست کرابوون کەچی ئەوەی ئەحمەد هەبوو. بەم جۆرە دلبەری ئەحمەد موختار زەمینییە و ئاسمانی نییە، دوورە لە گێتیی هەیوولای سۆفیزم.

ئەحمەد موختار نیشتمانپەروەرێک بووە، بەڕاستی کوردایەتی کردووە. ئەقڵی هێناوەتە ناو دڵ و دەروونی، بەشێکی زۆر لە شیعری تەرخان کراوە بۆ مەسەلەی ڕزگاریی کورد و کوردستان. سۆزی دەروونی ناوەوەی تێکەڵ بەهیوا و ئامانجی سیاسی و کۆمەڵایەتی کردووە. دلبەر و کوردستان تێکەڵ بەیەکتری کراون. هەموو جوانی سروشتی بۆ دلبەر بووە،



لەگەڵ نیشتمان لەیەک پلەدا بوون. بۆیە لە دیوانی ئەحمەد موختار بەتەنیا شیعری تایبەتی هەیە بۆ دلبەر و شیعری تایبەتی دیکەی بۆ کوردستان، شیعری سیمبۆلی بەرزیشی هەیە هەردووکیانی تێکەڵ بەیەکتری کردووە، بەمە بووە بەشاعیری غەزەلی نیشتمانی، یا غەزەلی سیاسی.

### نموونەی شیعری ئەحمەد موختار

#### دڵداری

١

لە پارچە شیعرێکیدا شاعیر دەڵێ:

بەبەردی فیرقەتت شیشەی دڵی بێچارە مەشکێنە
لە ناو زومرەی ڕەقیبان عاشقی ئاوارە مەشکێنە
ئەگەر ڕووح و دڵ و ئیمان تەڵەب کا بیدەرێ عاشق
کە تیفل و خوردە ساڵە قەت دڵی ئەو یارە مەشکێنە
دەخیلم ئەی نەسیمی سوبحگاهی مەسکەنی دڵمە
پەرێشانی مەکە تۆ زولفی ئەو نازدارە مەشکێنە
بەقەتڵ و کوشتنت موختارە عاشق شۆخی شیرینت
لەسەر ڕووح و دڵت فەرمانی ئەو سالارە مەشکێنە
کە من پەروانەیی شەمعی سەری دوو کوڵمی تۆم جانا
دڵی (ئەحمەد) بەفیتنەی ئەو سەگی پەتیارە مەشکێنە

شاعیر وەکو هەموو دڵدارانی دیکەی شیعری کلاسیکی خۆشەویستەکەی منداڵە، تەمەنی لە چواردە ساڵ تێپەڕی نەکردووە، هەڵە ناکاتە هەموو کردەوەیێکی ئێمە بەهەڵەی دەزانین ڕاستییە، لەبەرئەوە هەموو فەرمانێکی لەسەر سەرە.

٢

لە پارچە لیریکێکیدا بەراورد لە نێوان خۆی و مەجنوون،دەشتی شێروانە و دوجەیل دەکا:

وەختی ڕەحمە دلبەرا میوانی دەوڵەتخانەتم
تۆ ئەگەر لەیلای منیش مەجنوونە کە دێوانەتم

حەیفە سا تۆ خوا بەسە جەور و جەفاکەت تابەکەی
من لە دەوری شەمعی ڕوخسارت وەکو پەروانەتم
باعیسی ژین و حەیاتم یاری دڵ ڕەنجێنی خۆم
دەک بەلاّ گەردانی بالاّت و زڕەی پاوانەتم
گەر لە مولّکی حوسندا سولّتانی ئەی یاری عەزیز
خۆ منی بێچارە جانا خادیمی دەرگانەتم
قەیسی عامیر جێگەیی وادی دوجەیل بوو چاوەکەم
خۆ منیش ئێستاکە وێڵی دەشتەکەی شێروانەتم
یار بەخەندەی نازەوە ڕووی کردە من فەرمووی بەسە
بۆچی تۆ نازانی (ئەحمەد) دوژمنی بێگانەتم

لەم شیعرەدا ئەحمەد موختار موناجات لەگەڵ دلبەردا دەکا. شێوازی دارشتنی ڕستەکانی ڕەوان و ئاسانە، نزیکەی دەوروبەری هەشتا وشەی لەم پارچە شیعرەدا بەکار هێناوە. لەوانە تەنیا نزیکەی دە وشەی بێگانەیە، ئەمانەش لەو وشانەن کە کورد ئاشنایەتی لەگەڵیاندا هەیە و چوونەتە ناو لێکسیکۆنی زمانی ستانداردی قسەکردن و نووسینی کوردییەوە.

شاعیر ئاوڕدانەوەی جوانی هەیە کە خۆی بەمەجنوون دەچوێنێ و دلبەری بەلەیلا، ئەو لە دەشتی دوجەیل بۆی دەگەڕا، ئەمیش لە دەشتی شێروانە کە شانۆی کۆچی خەڵکی عەشرەتی جاف بوو بۆی دەگەڕێ.

### ٣

لە لیریکێکیدا باس لە تەریقەت و شەریعەت و دڵداریی مەجازی یا زەمینی دەکا:

لە شێخ و واعیز و سۆفی لەمەولا من کەنار ئەگرم
پیالەی بەیادی دیدەیی مەستی نیگار ئەگرم
لە شەوقی بەژن و بالاّی تۆیە ئەی شۆخی پەری پەیکەر
لە باغا جێ لە سایەی عەرعەر و سەروو و چنار ئەگرم
خەیاڵی مەمکەکانی گرد و نەرمت دێتە بیری من
کە وەختێ پڕ بەجەنگ لیمۆ و بەی و سێو و هەنار ئەگرم



خوڕەی فرمێسک و نەعرەی فیغانی خۆم لە بەرچاوە
کە شەو من گوێ لە دەنگی نەعرەیی هەوری بەهار ئەگرم
ووتم چاکت ئەسیری حەلقەیی ئەو پەرچەمەت کردم
ووتی شێتی بەتای ئەم زولفە من شێری شکار ئەگرم
بەقوللابی موژە و حەلقەی کەمەندی زولفی چین چینم
ئەگەر بێ ئارەزووم بێ ڕۆستەم و ئەسفەندیار ئەگرم
ئیشارەی کرد بڕۆی یەعنی کە بۆ قەتلی دڵی عاشق
لە پشتی چاوی یار و جێگەیی سەد زولفەقار ئەگرم

لە گێتیی شیعردا ئەحمەد موختار باوەڕی بەشێخ و مەلا (تەریقەت و شەریعەت) نییە، چونکە ڕێگە لە مەی و مەیخانە دەگرن. لە گێتیی ئەوان دوور دەکەوێتەوە و لە ناو کۆڕی دڵداریدا دەژی. ئینجا دەکەوێتە گفتوگۆ لەگەڵ دلبەر، باس لە کردەوەکانی دەکا ئەوانەی بەڵگەی هێزی بازوو و شەڕ و چەوساندنەوەن. شاعیر دەڵێ کردمت بەدیل و بەپەرچەمت بەند کراوم، دلبەر دەڵێ تۆ شێتی من نەک تۆ بەڵکو شێری بیشە بەکەمەندی پەرچەمم دەگرم، تەنیا ئەمە نا بەڵکو ڕۆستەم و ئەسفەندیاریشی بەدیل دەگرم. ئەگەر تیری برۆم بێتە مەیدان کاریگەری وەک زولفەقاری ئیمامی عەلی وایە.

## ماچومووچ و کۆمەڵایەتی

ئەحمەد موختار لیریکێکی کۆمیدی ئامێزی ئیرۆتیکی بۆ حەسەن فەهمی کوڕی عەلی بەگی مەحموود پاشای خوشکەزای هۆنیوەتەوە:

ئەی حەسەن ئەم کاغەزەم تەبریکی عەیش و شادییە
پڕ لە مەعنایە ئەگەرچی بۆ مووبارەک بادییە
کەیفە بەزمە دەنگی سازە ناڵەیی عوود و نەیە
جەژنە ئەمڕۆ ماچومووچە مەوسیمی ئازادییە
هەر کەسێ لەم ڕۆژەدا بێ دەنگ و عاجز دانیشێ
ئەحمەق و شێتە بەجیددی ئیشی ئەو گەوادییە
نووکی تیرت بۆچی کول بوو تیغی تیژت بۆ شکا
چی لە تۆ روویدا بڵێ پێم بۆچ سوپەر فوولادییە

ڕەنگ سپی بوون لەرزە لەرزی دەست و ئەژنۆ پێم بڵێ
قاعیدەی تۆیە وە یاخود شێوەیی دامادییە
سا حەسەن ئەمشەو وەکو پیاو دەس بەشیر و تیغی تیژ
ئیستیلا کە زوو بەزوو ئەو قەلعەیی شەددادییە
دوڕسمێن و مووشکافێ تۆ ئەگەر نازانی خۆت
(ئەحمەد)ی خاڵۆت هەمیشە پیشەیی ئوستادییە

ئەم شیعرە کۆمیدییەی قانگدراو بەوێنەی کراوەی سێکسی (ئیرۆتیک) بەهۆی ژنهێنانی حەسەن فەهمی جافەوە ئەحمەد موختار هۆنیویەتییەوە. ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ ئەوەیە ئەم شاعیرە ناسکە کە ئەحمەد موختاری ناوە لە نووسین و کردەوەی دڵداریدا هیچ جۆرە شانازی کردن بەهێز و زۆرداریی لێ نەبینراوە، کەچی داوا لە خوشکەزای دەکا وەک قارەمانی جەنگ بەتیر و شمشێرەوە هێرش بەرێتە ناو پەردەی بووک و ئەو قەڵا سەختە داگیر بکا بەهینەکەی کە حەمدانی پێ دەووترێ، دوڕەکە بسمێ و مووەکانی ببڕێ، ئینجا بەتەوسەوە پێی دەڵێ ئەگەر ئەم کارەت بۆ ناکرێ، خاڵۆت بۆ ئەم ئیشە وەستایە و بەئەوی بکە. بێ گومان ئەم قسانە وەک گاڵتەوگەپ بۆ پێکەنین و ڕابواردن کراون و وێنەیێکی شیعری جوان و ڕەنگین و بەرزیان لێ دروست بووە.

**یانەی سەرکەوتن**

لە شیعرێکیدا ئەحمەد موختار پیرۆزبایی لە دامەزراندنی «یانەی سەرکەوتنی کوردان» لە بەغدا دەکا:

باعیسی هێزی دڵ و پشت و پەنایی بێ کەسان
یانەیی سەرکەوتنی قەومی نەجیبی کوردەکان
واسیتەی ڕێگەی نەجاتی قەومی دڵسووتاوی کورد
ئەی نیساری مەقدەمی تۆ بن بەجارێ ڕووح و گیان
پێ و قودوومت خێر بێ یا ڕەببی بڵند بێ پایەکەت
شاد و مەمنوونن بەتەشریف هاتنی تۆ پیر و جوان
تۆ چرای بۆ ڕێگەیی تاریکی بەختی قەومەکەت
ئەی بناغەی عیلم و سەنعەت وەی سەبەب بۆ حوڕ ژیان



میللەت ئێستە چاوەڕوانە بۆ نەتیجەی هیممەتت
وەختی خۆدەرخستنە جێگەی هیوایی گشتمان

دامەزراندنی ئەم یانەیە لە بەغدا لە ساڵی ١٩٣٠ لە لایەن هەندێ لە دڵسۆزانی کوردەوە بەتایبەتی ئەو لاوانەی لە کۆلێجەکانی بەغدا دەیانخوێند مایەی گوشادی بوو بۆ هەموو کوردێک. مارف جیاووکی باڵەکی دەوری گرنگی هەبوو لە دامەزراندنی ئەم یانە ڕۆشنبیرییە. ئەحمەد موختار لەم لیریکە پیرۆزباییەیدا شادی ناو دڵی هەموو کوردێکی دڵسۆز دەخاتە ڕوو.

**ئەحمەد موختار لە بەندیخانە**

شیعرێک لە بەرهەمە جوانەکانی ئەحمەد موختارە بۆ شێخ مەحموود هۆنراوەتەوە:

سەبا عەرزی خولووسی و بەندەگیم و هەم دوعاخوانی
ببە بۆ خزمەتی شاهی موحیتی گشت سلێمانی
بڵێ قوربانی تۆ بم ئەی سەلاحەددینی ئەیووبی
بەزۆری پەنجە وەک حەیدەر بەسیما یووسفی سانی
ئەبێ ئەم قەومە ئەمڕۆ شاد و خەندان و سەناگۆ بن
کە چونکە تۆ شەهنشاه و ڕەئیسی جەمعی کوردانی
لە دەس کافر نەجاتمان بوو بیحەمدیللاهی وەلمیننە
لە سایەی دەست و تیغ و هیممەتی تۆ شێری یەزدانی
خوداوەندا بەلوتفی خۆت لە چاوی بەد بەدووری کە
بەجاهی سەییدی مورسەل بەڕووحی شاهی گەیلانی
لە پاش ئەم ئیحتیراماتە بڵێ بەو شاهی دەورانە
چ جورمێکی هەیە ئەحمەد کە کردووتە بەزیندانی
ئەگەر شایەد لە خزمەتتا خراپەی ئەو بووە سابیت
بەلوتفی خۆت عەفووی کە چونکە هەر خۆت ساحیب ئیحسانی
کە جورمێکی نییە تاکەی لە حەپسا دانیشێ قوربان
لە تەنهایی لە فیکری چۆتەوە ئادابی ئینسانی

ئەگەر داوای کەفیلی لێ ئەفەرمووی حازرە یاخود
موڵک تەئمین ئەکا سەد جار بەئایین و بەئیمانی
هەتا مردن وەکو بەندە لە خزمەت شاهی کوردستان
حەیاتی خۆی فیداکا بۆ هەموو ئەمرێک و فەرمانی
من ئەم حەبسەم لە لا فەخرە بەشەرتێ سەروەری کوردان
لە حەق ئەم بەندەیی خۆیە بمێنێ لوتفی جارانی
بەزاتی پاکی بێ هەمتا بەنووری ئەحمەدی مورسەل
جەنابت سوێند ئەدەم قوربان بەگشت ئایاتی قورئانی
بەلوتف و مەرحەمەت ئەم بەندەیەی خۆتە عەفوو فەرموو
ئەتۆ سەرفی نەزەر لە جورم و سەهوو و نیسیانی
لە لوتفی تۆ زیاتر هیچ پەناهێکی نییە (ئەحمەد)
بەکاری هیچ نەهاتن دۆستەکان و خزم و خوێشانی

ئەم شیعرە نامەیێکی کراوەیە ئەحمەد موختار بۆ شێخ مەحموودی نووسیوە. لە ڕۆژنامەی «ڕۆژی کوردستان» (ژمارە ١٤ی ساڵی یەکەم، ١٩٢٣) بەناوی «ئەوسا قایمەقام ئێستە مەحبووس / ئەحمەد موختار» بڵاوکراوەتەوە. لە ناوەرۆکی شیعرەکە ئەوە دەردەکەوێ شاعیر بەفەرمانی شێخ مەحموود خرابێتە بەندیخانەوە. ئەم گیرانەی شاعیر لەسەر چی بووە! ئایا هەڵوێستێکی سیاسی وا لە نێوان ئەو و شێخ بووە لە ڕووی بوەستێ ئەویش ناچار بێ بیخاتە بەندیخانەوە؟ لەوەدا گومان نییە کاری وا لە شێخ ڕوویداوە جێی ڕەخنەگرتن بێ لێی، دیارە گومانیش لە بیری کوردایەتی و نیشتمانپەروەری ئەحمەد موختاردا نەبووە، کەچی دوور نییە ئەحمەد موختار وەک یەکێک لە سەردارانی عەشیرەتی جاف هەڵوێستی خۆی هەبووبێ بەرامبەر شێخ مەحموود ئەویش خۆی بەگەورە زانیبێ. ئەمە و خۆ ئاگاداری ئەوەین هەندێ دەوڵەمەند و بازرگان و ئاغەلەری ناو شاری سلێمانی دژی شێخ مەحموود بوون، جگە لە دۆستانی ئینگلیز و جلخوارە تورکچییە تۆرانییەکان و هەندێ لە سۆفییانی تەریقەتی نەقشبەندی. لەم ماوەیەدا ئەم شیعرە جوانە، ئەم موناجاتە لە خوارەوە بۆ سەرەوەیە پڕ لە سۆزە وەک توحفەیێک تەماشا دەکرێ، موناجاتێکە ئەحمەد موختار لەگەڵ شێخ مەحموودی دەکا و داواکارە بەچاوی دڵسۆزییەوە تەماشای بکا و لێی ببوورێ. لە ئەنجامیشدا شیعرەکە کە دەگاتە دەستی شێخ و دەیخوێنێتەوە لە بەند ئازادی دەکا.



لەم شیعرەدا ئەحمەد موختار لەسەرخۆ و نەرمونیان و ئاشتیخوازە. هەر لەو بەندیخانەیەی ئەم شیعرەی لێ هۆنیوەتەوە لیریکێکی دیکەی داناوە.

گەر لە مەحبووسی خەلاس بم دوژمنانم پەت ئەکەم
سووری سەر ئەبڵەق لە فەرجی دایکیانا ڕەق ئەکەم
بۆ ئەمەی تەرکی خراپی و موفسیدی و بەدزاتی کەن
ڕەنگ و ڕوویان گشت بەڕەنگی خاسەڕەنگ خەت خەت ئەکەم
ڕوو بەشار و موڵکی ئامەد (مەن ئەشائـ) دادەنێم
عاقلانە تەرکی ڕێگای ناحەز و نەگبەت ئەکەم
دۆستانی خۆم بەپارە و ماڵی دونیا شاد ئەکەم
حاسید و موفسید هەموو نابووت و بێ سەروەت ئەکەم
خەڵقە ئەمڕۆ چونکە حەپسم ڕێگەیی دەستم نییە
ناتووانم هیچ بکەم مەجبوورم هەر غەیبەت ئەکەم

ئەم شیعرە پێچەوانەی شیعرەکەی پێشووە. شاعیر لە قاڵبی خۆی دەرچووە، لە ئاشتیخوازەوە بووە بەشەڕخواز. وەک چەکدارێک بەشمشێرەوە هێرش دەباتە سەر دوژمنانی. بەمەش ناوەستێ و دڵی ئاو ناخواتەوە سواری دایکیشیان دەبێ. ئەوەی دەیەوێ دەیکا. ڕوو دەکاتە وڵاتی ئامەد (دیاربەکر). بەربەرەکانێی پیاوی خراپ دەکا لە هەر کوێیێک بێ. دۆستانی بەپارە دەکڕێ. لە دواییدا ڕوو دەکاتە هەموو کەسێک و دەڵێ: خەڵکینە من لە بەندیخانە هیچ دەسەڵاتێکم نییە، لە بەندیخانە هیچم بۆ ناکرێ، غەیبەت نەبێ، واتە قسەی زل!.

## کوردایەتی و نیشتمانپەروەری

١

لیریکی «لە خەو هەڵسن» سروودی وریابوونەوە و هەڵمەتی ڕاپەڕینی کوردایەتی و بانگدانی خوێندەواری و ڕۆشنبیری بوو لە سییەکانی سەدەی بیستەم لە باشووری کوردستاندا:

لە خەو هەڵسن درەنگە میللەتی کورد خەو زەرەرتانە
هەموو تەئریخی عالەم شاهیدی فەزڵ و هونەرتانە

دەسا تێکۆشن ئەی قەومی نەجیب و بێکەس و مەزڵووم
بەگورجی بیبڕن ئەو ڕێگە دوورەی وا لەبەرتانە
بخوێنن چونکە خوێندن بۆ دیفاعی تیغی دوژمنتان
هەموو ئان و زەمانێ عەینی قەڵغان و سوپەرتانە
بەخۆڕایی لە دەستی بەرمەدەن ئەم خاکە مەحبووبە
کە تۆزی وەک جەواهیر سورمە وو کوحلی بەسەرتانە
بەسەر خاکا ئەگەر نازیش بکەن حەقتانە کوردینە
تەماشای سێبەری ئەو شاخ و کێوانەی لەسەرتانە
بەبێ قەدری بەسەریا ڕامەبوورن حورمەتی بگرن
گوڵاڵە سوورەکەی ئەم دەشتە خوێناوی جیگەرتانە
دەمێکە ئەم وڵاتە وا ئەسیری پەنجەیی جەهلە
لە سایەی عیلمەوە ئیمڕۆ ئیتر نۆبەی زەفەرتانە
زمانی حاڵی (ئەحمەد) هەر ئەڵێ ووریا بن ئەی میللەت
بزانن بەردی ئەم شاخانە ئەڵماس و گوهەرتانە

ئەم شیعرە لە ڕووی ناوەرۆکەوە ئەگەر ئەحمەد موختار بەپەخشان بینووسیایە کاریگەرییێکی ئەوتۆی نەدەبوو و کەس ئاوڕی لێی نەدەدایەوە. وتەکانی ئەم شیعرە لە سەردەمی دانانیدا وەک ئامۆژگارییێک بەرگوێی لاوان و قوتابیان دەکەوت، کەچی ئەحمەد موختار ئەو مانایانەی بەوشەی شیعری و ئاواز و ڕیتم و قافیەی سووک و جوانەوە کردووە بەبەرهەمێکی ئەدەبی سەرکەوتوو، گوێ هان دەدا کوردایەتی بکا لە پێناوی سەربەخۆیی ئەو وڵاتە ڕەنگین و جوانەی کوردستانی پێ دەڵێن.

٢

شاعیر لە لیریکێکیدا وەسفی ڕووکەشی کوردستان دەکا و موناجاتی لەگەڵدا دەکا، ئەم شیعرە وەک مۆنۆلۆجێک دەکەوێتە ڕوو:

ئەی وەتەن جەننەتی یا ڕەوزەیی ڕیزوانی تۆ
باعیسی کەیفی دڵە باغ و گوڵستانی تۆ
تۆزەکەت سورمەیە بۆ چاو و عەبیرە خاکت
ڕاستە گەر بێتو بڵێم قیبلەیی کوردانی تۆ



ئەم گوڵاڵانە کە لەم کێو و کەژە خەیمە ئەدەن
هەموو تەمسیلی ئەکەن خوێنی شەهیدانی تۆ
جێگەیی فەخری هەموو قەومی نەجیبی کوردی
ڕووح و دڵ پارە وو ماڵ گشتی بەقوربانی تۆ
بەچکەکانت هەموو جەنگاوەر و ساحێب فیکرن
هەر بژیت حەقمە بڵێم دایەیی شێرانی تۆ
دەستەیێک لەو بەچە شێرانە کە وون بووبوون لێت
سەد شوکور هاتنەوە ژێر سێبەری سەیوانی تۆ
لە گوڵستانی وەتەندا هەموو وەختێ (ئەحمەد)
نەغمەخوانە بۆ وەتەن بولبولی خۆشخوانی تۆ

لەم شیعرەدا ئەحمەد موختار بەدەم گفتوگۆوە وەسفی نیشتمان دەکا، لەوانەیە بەلای خۆیەوە بۆ ئەوەی بێ کوردستان لە لای خەڵکی کورد خۆشەویستتر بکا. شاعیر گەشبینە لەوەی لاوانی کورد زیرەکن، هیچ جۆرە کەموکوڕییێکی بیرییان نییە، بۆیە هیوا و ئومێدی میللەتەکەیانن.

٣

لە لیریکێکیدا ئەحمەد موختار لەسەرێکی دیکەوە تەماشای مەسەلەی ڕزگاریی نیشتمانی کورد دەکا:

سەیری کەن خەڵقینە تۆخوا حاڵەتی زاری وەتەن
چەند پەرێشانە لەبەر غەفلەت هەموو کاری وەتەن
وەختی تێکۆشانە ئەی قەومینە غەفلەت تابەکەی
وا خەزانی کردووە ئێستێکە گوڵزاری وەتەن
خۆ وەتەن ئەمڕۆ نەخۆشە ئەم تەبیبی حازیقە
چی ئەبێ بیکا موداوا قەلبی بیماری وەتەن
کوانێ خەڵقینە لە کوێن فیرقەی مونەووەر تینەتان
چونکە ئەو فیرقە ئەزانن دەرد و ئازاری وەتەن
من بەباغ گوڵستانی جەننەتی ناگۆڕمەوە
خاکی ئەو جێگەی کە کوردە نەشتەری خاری وەتەن

لەم لیریکەدا شاعیر لایەنی کەموکووڕی و ناکۆکی کوردەواری پیشان دەدا بۆ ئەوەی لاوانی کورد تێبکۆشن لە پێناوی لابردنی هەموو ناگزووریییێک. شاعیر ڕاست دەکا کورد بەنەخۆش لە قەڵەم دەدا، دیارە ئەو نەخۆشە پزیشکی گەرەکە، پزیشکی ئەو دەردە خوێندەواری و ڕۆشنبیرییە.

٤

لە ئانێکی ڕەشبینی و سەردەمێکی دڵشکاویدا ئەحمەد موختار هیچی بۆ نامێنێ ئەوە نەبێ خۆی بۆ خۆی بلاوێنێتەوە و لە دواییدا خۆی هەڵبخەڵەتێنێ بەوە خەونەکانی هاتوونەتە دی:

من کە کوردم حەز بەئیستیقلالی کوردستان ئەکەم
ئارەزووی دەوری تەرەققی حاکمی بابان ئەکەم
ناوەجاغە ئەو کەسەی خزمەت بکا بۆ غەیری خۆی
تا بەمردن شەرتە من هەر بەندەیی خۆمان ئەکەم
میللەتی من هەر وەکو شێری ژیانن بۆ نەبەرد
ئێستەکە من چۆن ئیتاعەی ووشتری عوربان ئەکەم
گەر لە غەیری میللەتی خۆم بێ و ئومێدی چاکە کەم
شێت و بێ عەقڵم لە شەیتان ئیددیعای ئیمان ئەکەم
گەر لە موژگان و برۆی دلبەر تەمای لوتفم ببێ
من لە نووکی شیر و خەنجەر ئارەزووی دەرمان ئەکەم
لابە توخوا نامەوێ دیجلە و فورات و نیلی تۆ
من بەفرمێسک ئێستەکە تەشکیلی سەد سیروان ئەکەم
جەژنی قوربانساڵی جارێ خەڵکی قوربانی ئەکەن
بۆ وەتەن من ڕۆژێ سەد جار ڕووحی خۆم قوربان ئەکەم
شێتی چاوی لەیلی کوردم بۆیە وا مەجنوون سیفەت
خۆم بەدایم ڕووت و قووت و سەرسەری و عوریان ئەکەم
سەیری کەن بەم مشتە قەومی کوردەوە مانەندی شێر
گاهێ حەملە ڕووبەڕووی ئێران گەهێ تورکان ئەکەم



داغی کوردی فەخرە ئێستە بۆ دڵی من کافییە
بۆچ مەگەر شێتم خەیاڵی ڕوتبە وو فەرمان ئەکەم
کوردم و بۆ کوردی (ئەحمەد) سەعی ئەکەم تا بەم زووە
ئیتتیحادی کوردی خۆمان و سنە و بۆکان ئەکەم

خاوەنی ئەم کتێبە بەمنداڵی پێش ئەوەی فێری خوێندن و نووسین بێ دێڕی یەکەمی ئەم شیعرەی بەم جۆرە لەبەر بووە:

کوردم و هەر حەز بە ئیستیقلالی کوردستان ئەکەم
وەحشەت و نەفرەت لە چارەی ووشتری پێ پان ئەکەم

لە ئەدەبی کوردیدا جگە لەم شیعرەی ئەحمەد موختار شیعری دیکەش هەیە بەم هەناسەیە نووسراوە، ئەو شاعیرانەی ئەم جۆرە شیعرەیان نووسیوە ڕق و کینیان بەرامبەر بە میللەتانی هاوسێی کورد نەبووە، چونکە بەگیانی شۆڤینیزم گەورە نەبوون، بەچاوێکی سووک تەماشای هۆز و تیرە و کەسانێکی ناکوردیان نەکردووە زەرد بووبێ یا سپی؛ سوور بووبێ یا ڕەش. دروستبوونی ئەم چەشنە شیعرانە کە لە ڕووی جوانکارییەوە بەرز و باڵان ئەنجامی ڕەنگدانەوەی هەستی خراپی کەسانێکی بێگانەن بەرامبەر بەکورد، شاعیری کورد ناچار بووە هەموو میللەتەکە بکا بەنوێنەری ئەو چەند کەسە خراپانە. ئەم شیعرەی ئەحمەد موختار دەوری گرنگی بووە لە بڵاوکردنەوەی هوشیاری نەتەوەیی لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا.

٥

لووتکەی سروودی نەتەوەیی کورد قەسیدەی «دێتە گوێم دەنگی...» بەناوونیشانی «هیوای پاشەڕۆژ» دیوانی ئەحمەد موختاری ڕووناک کردۆتەوە. بۆ یەکەم جار تەواوی ئەم شیعرە لە گۆڤاری کۆلێجی ئەدەبیات (بەغدا، ژمارە ١٥ ، ١٩٧٢) بڵاوکراوەتەوە. ئەو کاتە هێمنی شاعیری موکریان لە بەغدا دەژیا. لە دوای خوێندنەوەی قەسیدەکە لە نامەیێکی تایبەتیدا بیروڕای بۆ خاوەنی ئەم کتێبە لە بابەت قەسیدەکەوە بەم جۆرە دەربڕیبوو «من ئەو قەسیدەیە بەگوڵی سەرتۆپ و دوڕی سەر خەزێنەی هەموو شیعرە سیاسییەکانی کورد دەزانم. شیعری وا دەوڵەمەند، ڕەوان و فەسیح لە دیوانی کەم شاعیری کورد دەبینرێ، بە بڕوای من ئەحمەد موختار جاف ئەگەر تەنیا هەر ئەو قەسیدەی لە پاش بەجێمابا هێشتا دەبوو بەخاوەن قوتابخانەی حیساب بکەین، قوتابخانەی هیوا،

هیوا بەخەباتی گەل، هیوا بەپاشەڕۆژی کورد، ئەحمەد موختار هێنایە ناو ئەدەبی کوردییەوە...» .

لە قەسیدەی «هیوای پاشەڕۆژ»دا ئەحمەد موختار دەڵێ:

دێتە گوێم دەنگێ بەسۆز و شیوەن و گریانەوە
ناڵەیی دڵمە لە حەسرەت خاکی کوردستانەوە
لانەواز و بێکەس و مەزڵوومن ئێستە قەومی کورد
گا بەدەستی تورکەکان و گا بەدەست ئێرانەوە
ئیسمی ویجدان و عەدالەت بێ موسەممایە و درۆ
بۆ سیاسەت ئەم قسە کەوتۆتە سەر لێوانەوە
ڕاستە گەر ئیسمی عەدالەت بۆچی منداڵانی کورد
وێڵ و سەرگەردان بسوورێن و بەسەر کێوانەوە
هێندە حیزە بەختی کورد بۆ کوشتن و تاڵانییان
کۆمەڵێ هاتوون بەسواری ووشتری پێپانەوە
حاڵی کورد ئێستە لە بەینی تورک و ئێران و عەرەب
بێچووە تەیرێکە کە کەوتە داوی منداڵانەوە
ئەم قەراری عوسبەیە وا خەڵق ئەڵێن بۆ کورد ئەبێ
هەر قسەی ڕووتە قسە ناچێتە ناو گیرفانەوە
ئەمڕۆ با وابێ بەڵام ڕۆژێ ئەبێ ئەولادی کورد
دێنەوە مەیدان بەعیلم و سەنعەت و عیرفانەوە
نەوجەوانانی وەتەن تەوحید ئەکەن ئەم میللەتە
هەر لە کرماشان هەتا وورمێ و سنە و بۆکانەوە
ڕێک ئەخەن وەزعییەتی وان و جزیرە سەربەسەر
عەقرە وو زاخۆ ئەبەستن ڕێک بەقەد بۆتانەوە
خانەقین و مەندەلی خاکی لوڕستان سەربەسەر
وەک خەیات ئەبڕن بەبالای مەنتیقەی بابانەوە
لەشکرێکی مونتەزەم بۆ سەندنی هەق یەک ئەخەن
جوان و ڕازاوە بەتۆپ و لالەکی ئەڵمانەوە



بەچکە شێرانی عەشایەر بۆ قڕانی دوژمنان
هەر وەکو ڕۆستەم ئەکەونە هاتن و جەولانەوە
پاش قڕانی موددەعی خاکی وەتەن تەعمیر ئەکەن
ڕێگەیی ئاسن ئەچێتە خاکی هەورامانەوە
کێو و کەژ گشتی ئەبێتە باغ و قەسری گەوهەرین
بۆ تەماشا دەستە دەستە دێن لە ئینگلستانەوە
لادە (ئەحمەد) تۆ لە باسی میللەت و سا پێی بڵێ
تاکو ساقی زوو بدا بادە بەدەم مەستانەوە
پێی بڵێ بەو ساقییە بۆ حوسن و نازی دلبەری
داغی خۆی ناوە بەجەرگی یووسفی کەنعانەوە
بێتە جیلوە تا بەیادی پاشەڕۆژی قەومی کورد
زەمزەمە و شادی بخاتە مەجلیسی ڕەندانەوە
ئەم دڵەی زامارمە تاوێ لە غەم فاریغ ببێ
بسرەوێ یەک دەم لە ناڵە و شین و قوڕ پێوانەوە

لەم قەسیدە بەرزەدا هیوا و ئامانج و خەونی نیشتمانپەروەری کوردی سەردەمی شاعیر بووە بەسەرچاوە بۆ ناوەرۆکی شیعرەکە. هەندێ یادەوەری مێژوو دێتەوە بیری خوێنەر، لە دوای جەنگی یەکەمی گێتی بۆ جاری دووەم خاکی کوردستان دابەش کرایەوە، ئەوەی یەکەم (جەنگی چاڵدیران، ١٥١٤) کردی بەدوو کوردستان، ئەمەیان کردی بەچوار یا پێنج کوردستان. ئەحمەد موختار تەماشای یەکێتیی کوردستان دەکا (کوردستانی گەورە). ئەگەر ئەمە ببێ خەڵکی سنە و سلێمانی و دیاربەکر و قامیشلی ئەلەگەزی وڵاتی قەفقاسی ڕووسیا بەبێ پاسپۆرت ئاموشۆی یەکتری دەکەن.

ئەحمەد موختار بەخەیاڵ دەژی، ئەوەی بیری لێ دەکاتەوە ڕاستی نییە. دەیەوێ هەر لەو خەیاڵەدا بمێنێتەوە، فەرمان بۆ خۆی دەردەکا لابدا، هانا بۆ پیری موغان دەبا، بۆ کۆڕی سەرخۆشان بۆ ئەوەی مەست بێ و لە ناو ئەو خەیاڵەدا بژی. دیارە خەونەکە خۆشە و خەڵکی کورد چاوەنۆڕن ببێ بەڕاست، لەو کاتەشدا ئەم قەسیدەیە ژەنگ هەڵناهێنێ بەڵکو ڕەونەقدارتر دەبێ، چونکە هەوێنی جوانکاری تیایدا نەمرە.

## شیعری فرەنسی بەكوردی

ئەحمەد موختار لیریكێكی سیمبۆلییانە و پەرناسییانەی زمانی فرەنسی گۆڕیوەتە سەر زمانی كوردی بەناوی «گوڵی خوێنین» :

لەو دەما ئێمە كە خوێنمان ئەڕشت
ڕۆژیش بەهاری هێنابووە ووجود
لەو جێگا شەڕەی یەكتریمان ئەكوشت
گوڵان سەوز ئەبوون ئەیانكرد سوعوود

***

هەرچەندە لاشەكان وەک پەینی بەسام
كەوتبوون لە ژێر لقی گوڵاندا
كەچی گوڵانی بێهۆش و نەفام
تەڕ و تازە بوون لەسەر چڵاندا

***

زەوی ئەوەندە خوێنی خواردبێ
بۆچی وەنەوشە ڕەنگی هەر شین بێ
خوێناوی لاوان دەشتی پۆشی بێ
هێشتاكوو بەیبوون سپی جەبین بێ

***

بەخوێنی ئینسان گوڵ ئاودرا بێ
ئەبوا ڕەنگ و بۆی ئەوان بسێنێ
ئێستاكە پۆل پۆل خەیمەیان داوە
بۆچ بێ پەڵەی خوێن سەر دەرئەهێنێ

***

دێراوی گوڵان چۆن ڕووزەرد نابن
خوێنە خوێكانیان بەسەردا ئەڕوا



بۆچی ئاو تووشی داخ و دەرد نابن
بۆ ووڵاتیان عەیبە سەرتاپا

***

ئەبینن غەیرە ئەچنێ گوڵ غونچە
كەچی هیچ كامیان گرژ ناكەن ڕوویان
غالبیەتی بێ و بكات لەنجە
بۆ پێنەكەنین ناكەونە خەزان

***

یەكێكیان جارێ ناڵێ بەهەنگێ
یا بەو پەپوولەی هەڵیانئەستێنێ
ئێستا نەم ماوە من بۆن ڕەنگێ
ئیمرۆ دڵتەنگم بیخە سبحەینێ

***

لەم دەشتە شوومەی پڕ خەوف و خەتەر
كە لاشەی قەومی ئێمەی تێدایە
بۆ شەرمی حوزوور شەعشەعەی زەفەر
كەم ناكەنەوە تاقە گەڵایە

***

ماتەمی ئێمە ڕەنگ و بۆی پێدان
كەچی قەت ناكەن ئیزهاری كەدەر
چونكی بێ حیسن ئەسنافی گوڵان
لە حاڵی كۆن دان دایم تازە و تەڕ

***

لە داخا گەڵای خۆ بپێچنەوە
نەفامن چونكی هێشتا نازانن
بۆ ناو كەوای سەوز خۆ بكێشنەوە
ئەی گوڵان ئێوە بێوەی لاوانن

***

موقابیلی ئەم دەرد و بەڵایە
ئازاد ئەپشکوون گوڵانی وەتەن
چەند بێ ویجدانن ئێوە ئەبوایە
بۆ مردووەکانمان هەر بکەن شیوەن

لە کاتی خۆیدا مەحموود جەودەتی نووسەری کورد شیعرێکی شاعیری فرەنسی سوللی پرودۆم (١٨٣٩ - ١٩٠٧)ی بەپەخشان وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی. ئەحمەد موختار پەخشانەکەی مەحموود جەودەتی کردووە بەشیعر لەسەر بنچینەی بەند (کووپلە)، هەر بەندی چوار نیوە دێڕە شیعرە، قافیەی (ا ب ا ب)یە وەک لاساییکردنەوەییێکی شیعری تورکی عوسمانی دەکەوێتە بەرچاو.

ئەحمەد موختار لەم وەرگێڕانە جوانەیدا بە وشەی کوردی خەڵکی کوردی بردووە بۆ گێتیی شیعری نوێی ئەوروپای دوا ساڵانی سەدەی هەژدەم و سەرەتای سەدەی نۆزدەم لەو کاتەی هەندێ ڕێبازی ئەدەبی نوێ پەیدابوون یەکێ لەوان بزووتنەوە یا ڕێبازی قوتابخانەی پەرناسی بوو (هونەر بۆ هونەر)یشیان پێ دەوت. شاعیری فرەنسی سوللی پرودۆم لە گەورە شاعیرانی قوتابخانەی پەرناسی بوو لە ئەوروپا.

ئەم شیعرەی ئەحمەد موختار جێگەی دیاری هەیە لە ئەدەبی کوردیدا، لە لایێک واقیعی بەرهەمی قوتابخانەکانی سەدەی نۆزدەمی ئەوروپا بەخوێنەری کورد دەناسێنێ لە لایێکی دیکەوە توانای شاعیرییەتی بەرزی ئەحمەد موختار دەخاتە ڕوو.

## پەخشانی ئەحمەد موختار

شاعیرێکی کوردی وەک ئەحمەد موختار شاعیرانی پێش خۆی دەور کردۆتەوە، شیعری نوێی داناوە ڕەنگدانەوەی ڕۆژگاری سەردەمی خۆیەتی، ئینجا شیعری ئەوروپایی هێناوەتە ناو ئەدەبی کوردییەوە. بەمەش نەوەستاوە پەخشانی کردووە بەکەرەستەی بەرهەمی ئەدەبی. لەم حاڵەتەدا ئەحمەد موختار خۆی وەکو نووسەرەکانی ئەوروپا پیشان دەدا، بەو مانایەی بەرهەمی ئەدەبی تەنیا شیعر نییە بەڵکو پەخشانیشی هەیە بۆ نووسینەوەی ڕۆمان بەکاری هێناوە. بەشداربوونی ئەحمەد موختار لە ئەزموونی بەکارهێنانی پەخشان لە بەرهەمی ئەدەبیدا گەلێ گرنگە هەتا ئەگەر بەرهەمەکەی لە ڕووی هونەری و جوانکارییەوە لەو پلەیەدا نەبێ کە پێویستە، چونکە پەخشان لە سەردەمی ژیانی شاعیر خەریک بوو لەسەر پێ دەوەستا.



لە دەوروبەری ساڵانی ١٩٢٧ - ١٩٢٨ ئەحمەد موختار چیرۆکی «مەسەلەی ویژدان»ی نووسیوەتەوە. بڵاوبوونەوەی زۆر دواکەوت لە ساڵی ١٩٧٠ لە بەغدا بەکۆششی ئیحسان فوئاد لە چاپ درا. وەک دەردەکەوێ مەرگ ماوەی ئەحمەد موختاری نەداوە یا لەبەر هەر هۆیێکی دیکە بووبێ چیرۆکەکەی تەواو نەکردووە.

ئەحمەد موختار چیرۆکەکەی بەم جۆرە دەست پێ دەکا:

«ویلادەتم لە قەزای (هـ) بوو، لە بنەماڵەییێکی هەژار. باوکم لە شەڕی گەورەدا شەهید کرا بوو، ئیتر بێ کەس و بێ دەرەتان مابوومەوە بەدیار دایکێکی هەژارەوە کە بەهەزار مەشەققەت و کوڵەمەرگی، نانی هەرزن و بەرماوەی گەورە ماڵان و هێندێ دانەوێڵەی پەیدا ئەکرد هەر بۆ ئەوەی منی هەتیو پێ بگەیەنێ لە مەکتەبدا، کە تازە کرابووەوە لە مەرکەزی قەزادا. بەڵام مەعەلئەسەف ئەم ئاواتەی بەکورت و کوێریی هاتە بەر، هێندەی نەبرد، خوا ئەویشی بردەوە لای خۆی...»

بەم جۆرەش کۆتایی پێ دێنێ:

«بێ خەبەربوون کە خودا ئەوەندە سەبری هەیە هەزار شتی وەهای قوبووڵ کردووە و ئەیکات، وە ویژدانیش تەنها هەر ئیسمی هەیە و کەس بەچاو نەیدیوە! کوڕەکانی عەشیرەتی ئەولا لەگەڵ کچەکاندا بیستبوویان من لەو ڕۆژانەدا وام لەوێ، بەهەر نەوعێک بۆیان مومکین بووبوو، خۆیان نەجات دابوو و فیراریان کرد بۆ هاتنە لای من. ئەووەڵەن کچێکیان کە زۆر جوان و مەحبووبە بوو پێیی ووتم: «جەنابی ڕەئیس ئەمڕۆ ئێمە زۆر بەختیارین کە جەنابی عالیتان تەشریفی هاتووە بۆ ئەم ناوە، چونکە ئومێدمان وایە بەتەحقیق ئەزانین کە هەقی مەزڵووم لە زاڵم ئەسێنێ».

ئەم نموونە پەخشانییانە ئەو ڕاستییە دەردەخەن کە ئەحمەد موختار توانایی و خەیاڵ فراوانییێکی تایبەتی هەبووە لە زمانی کوردیدا، ئەو زمانە سادە و ڕەوان بووە، لە زمانی قسەکردنی خەڵکی دوور نەکەوتۆتەوە، ئەم دیاردەیە لە شیعریشیدا دەردەکەوێ. بەم جۆرە ئەحمەد موختار نموونەییێکی ڕەند و دیارە لە ناو نووسەران و شاعیرانی کورد لە نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا بەو بڕە بەرهەمە شیعری و پەخشانییەی بەمیرات بۆ نەتەوەی خۆی بەجێهێشتووە.

***

ئەحمەد موختار جاف شاعیرێک بوو کەم ژیا، بۆیە شیعری بەژمارە و قەوارە کەم بوو،

کەچی بەناوەرۆک بەرز بوو. لە لیریکدا هاوتای کەم بوو. بەکارهێنانی بەحرە سووکەکانی عەرووز و قافیەی دەنگە نەرمەکان ئاوازێکی دڵگیریان دابووە شیعری. مەبەسەکانی شیعری کلاسیکی کۆنی لە لیریکی سیاسی و نیشتمانپەروەری و کوردایەتی کۆ کردبووەوە. شیعر لە لای ئەو بەقەوارە وەک برووسکەییێکی سیاسی بوو، لەگەڵ ئەوەشدا مانای زۆری بەدەستەوە دەدا. هەرچەندە ئەحمەد موختار شۆڕشی لە ناو شیعری کلاسیکی کوردستانی باشوور نەکردووە، بەڵام نوێکردنەوەی شیعرەکە بەکەڵک بوو بۆ خوێندەواری کورد چونکە قۆناغی تاقیکردنەوەی گواستنەوە بوو بۆ شیعری کوردی نوێ کە لە دواییدا بەبەرهەمی شیعری نووری شێخساڵح و عەبدوڵڵا گۆران هاتە ناو ئەدەبی کوردییەوە.

# بەشی بیست و دووەم

## عەبدولواحید نووری

**١٩٠٤ - ١٩٤٤**

### ژیانی عەبدولواحید نووری

عەبدولواحید کوڕی مەجید کوڕی ئەسعەد لە ساڵی ١٩٠٤ لە چەمچەماڵ لە دایک بووە. لەو کاتەدا باوکی مووچەخۆری میریی دەوڵەتی عوسمانی بووە لەوێ. لە سەرەتای ژیانی خوێندەواری بەناوی خۆی عەبدولواحید مەجید نووسینی لە ڕۆژنامە و کۆوارەکاندا بڵاوکردۆتەوە، لە پاشانا ناوی هونەری وەک ڕۆشنبیرێک کردووە بەعەبدولواحیدی نووری. ئەم لەقەبەی لە ناوی خاڵی خۆی نووری عەلی ئەجزاچی وەرگرتووە، یا لەبەر هەر هۆیێکی دیکەی تا ئێستا ئاشکرا نییە. هەندێ جاریش بەناوی «ع. و. نووری» بەرهەمی ئەدەبی و ڕۆشنبیری بڵاوکردۆتەوە.

عەبدولواحید یەکێکە لەو نەوەیەی بەرێگەی خوێندنی نوێ بابەتی قوتابخانەی میرییەوە بووە بەخوێندەوار. سەرەتا لە قوتابخانەی ئەو سەردەمەی عوسمانی خوێندوویەتی، لە پاشانا ماوەییێکی دیکەی خوێندنی لە کەرکووک بردۆتە سەر، ئەوجا خانەی مامۆستایانی سەرەتایی لە ساڵی ١٩٢٧ لە بەغدا تەواو کردووە، لە پاشانا گەڕاوەتەوە سلێمانی بەمامۆستا لە قوتابخانەی فەیسەڵییەی سەرەتایی دامەزراوە. ژیانی مووچەخۆری میری بۆ عەبدولواحید ئاسان نەبووە، لەگەڵ کاربەدەستانی زانیاری (مەعاریفی) ئەوسا گیروگرفتی هەبووە، ناخۆشی کەوتۆتە ناوەوە لە ئەنجامی بیروباوەڕ، هەندێ جار بۆتە هۆی گوێزانەوەی بۆ قوتابخانەکانی دەرەوەی سلێمانی، وەکو هەڵەبجە، چوارتا (شارباژێر)، شەقڵاوە، لەیلان، ماوەییێکیش جێگری سەرۆکی شارەوانی سلێمانی بووە.

لە ناوەڕاستی بیستەکان و سەرەتای سییەکانی سەدەی بیستەم عەبدولواحید فریای ئەوە کەوت لەگەڵ مامۆستایانی پێش خۆی ببێتە یەکەمین مامۆستای قوتابخانە نوێکانی کە لە سەردەمی فەرمانڕەوایی ئینگلیز و شێخ مەحموود لە سلێمانی پەیدابوون، لەمانە عەبدوڵڵا زێوەر، ڕەفیق حیلمی، ساڵح قەفتان، مەلا سەعید سدقی، ئەحمەد بەهجەت قەرەداغی. لە ناوەڕاستی سییەکاندا مامۆستای دیکە هەڵکەوتن وەک مەجید عەلی، مستەفا خۆشناو (ئەفسەری شەهید)، حامید فەرەج، ئەحمەدی عەزیز ئاغا. کەسایەتی خوێندەواری نووسەری ئەم ماوەیەمان عەبدولواحید نووری کەوتە سەردەمی ئەم بەچکە شێرانەی زانست و زانیاری.

جموجۆڵیی ڕۆشنبیری عەبدولواحید تەنیا وانە وتنەوە و بەڕێوەبردنی ئەو قوتابخانانە نەبووە کە تیایاندا مووچەخۆر بووە، بەڵکو بایەخی بەلایەنەکانی دیکەی کۆمەڵی کوردی داوە لە ڕووی خوێندەوارییەوە. لەوانە ڕەنجی زۆری داوە بۆ پێشخستنی شانۆگەری لە قوتابخانەکاندا. لە سەرەتادا وەکو قوتابی و لە دواییدا وەک مامۆستا تا گەیشتۆتە ئەوەی لە ساڵانی ١٩٣٤ - ١٩٣٥دا بەشداری لە نواندنی شانۆی «سەربازی ئازا» (الجندي الباسل) بکا وەک ئەکتەر و دەرهێنەرێک.

جگە لەوە ئەو ڕۆژنامە و کۆوارانەی لە سەردەمی ژیانی ئەودا لە بەغدا و سلێمانی دەردەچوون وەک «گەلاوێژ» و «ژیانەوە» و «ژیان» و «ژین» لاپەڕەکانیان شایەتی دەدەن بۆ کۆشش و تەقەلای عەبدولواحید لە پێناوی پێشکەوتنی ڕۆژنامەگەرییەوە. هەروەها نووسەر لە هەندێ جموجۆڵی سیاسی کوردی لە ڕووی تیۆرییەوە دوور نەبوو. وەک دەردەکەوێ لە ڕێکخراوە سیاسی و قەومییەکانی کوردی وەکو «هیوا» و «ژ. ک.» ئەندام نەبووبێ زۆریش لێیانەوە نزیک نەبووبێ، لەگەڵ ئەوەشدا ئاگاداری جموجۆڵیی ڕۆشنبیری «ژ. ک.» بووە، کۆواری «نیشتمان»ی بەدەست گەیشتووە بەبێ ئەوەی هیچ پێوەندییێکی ڕێکخراوی لەگەڵیانا هەبووبێ.

عەبدولواحید بەرهەمی ئەدەبی «پەخشان و شیعر»ی کەم بوو، چونکە تەمەنی درێژ نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر قەوارەی بەرهەمی لەگەڵ تەمەنی کورتی بەراورد بکرێ ئەو بەرهەمە وەک شتێکی زۆر خۆی دەنوێنێ. هۆی هەرە گرنگ بۆ ئەم نەگبەتییەی ڕۆشنبیری کوردی ئەوەیە عەبدولواحید نەخۆش بوو. نەخۆشیی سیلی بێ ئامان کارەساتێک بوو لە کۆمەڵ بەتایبەتی لەو ڕۆژگارەدا کە زانستیی پزیشکی نەگەیشتبووە ئەو پلەیەی نەخۆش لە مردن ڕزگار بکا یا هیچ نەبێ هەندێ دوای بخا. ئەو نەخۆشییە کوشندەیە هێزی لە عەبدولواحید بڕی و داغی بەجیگەری قوتابی و خوێنەر و ڕۆشنبیری کوردەوە نا. وا بوو لە ڕۆژی ٥ی تەمووزی ١٩٤٤ لە سلێمانی کۆچی دوایی کرد و لە گۆڕستانی گردی سەیوان نێژرا.

وەک ڕووداوێکی گرنگ لە نێوەندی ڕۆشنبیری کوردی لە پاش کۆچی دوایی

عەبدولواحید نووری بەناوی چلەیەوە کۆبوونەوەیێکی ماتەمینی لە ڕۆژی ١٤ی ئاغستۆسی ١٩٤٤ لە قوتابخانەی گۆیژە کرا. لە کۆبوونەوەکەدا وەزیری ئابووری عیراق تۆفیق وەهبی و موتەسەریفی سلێمانیی ئەو سەردەمە مارف جیاووک بەشدارییان لە کۆبوونەوەکەدا کرد. هەندێ شیعر و وتاری ماتەمی لە لایەن مامۆستایان و دۆست و هاوڕێیانی عەبدولواحید لە قوتابی و نووسەر و شاعیر و کەسوکاری خوالێخۆشبوو خوێندرایەوە.

## عەبدولواحید نووری ڕۆشنبیر

عەبدولواحید ڕۆشنبیرێکی هوشیار بوو، خۆی دوور گرتبوو لە جموجوڵی سیاسی و ڕۆژانە و حیزبایەتی. لەسەر ئەو باوەڕە بوو دەتوانێ بەچاکی کاروباری ڕۆشنبیری بباتە سەر لەبەرئەوە بەلایەوە لە خەباتی سیاسیی سەرپێی ڕۆژانە گرنگتر بوو. لە سەردەمی ژیانی عەبدولواحید دوو بیروڕا و ئیدیۆلۆجی سەرەکی ڕۆژئاوایی لە ناوەوە بوو. نازیزمی ئەڵمانیا و ئەمپریالیزمی بەریتانیا. یەکەمیانی ڕەت کردبووەوە، لە دووەمیان بێ دەنگ بوو، چونکە بەزۆری خەڵکی خۆشیان نەدەویست. بیروباوەڕی سۆسیالیزمی هێشتا کز بوو. نووسەر ئەم بیروڕایەی بەوشکی و سیاسییانە و دیپلۆماسییانە وەرنەگرتبوو، بەڵکو تێکەڵی کردبوو بەدروشمەکانی شۆڕشی فەرەنسا و بیروڕای نوێخواز و پێشکەوتنخوازەکانی کە لە دوا ڕۆژانی دەسەڵاتی عوسمانی پەیدا بووبوون. بەمە کەوتبووە ژێر کاریگەری تیۆرییەکانی نیشتمانپەروەری و مرۆڤپەروەری نەک جموجۆڵی پراکتیکی ڕێکخراوی سیاسی و سوپایی و چەکداری. بەم جۆرە عەبدولواحید قەڵەمی بەدەستەوە بوو نەک چەک.

مەیدانی خەباتی ڕۆشنبیری عەبدولواحید فراوان بوو، دەتوانرێ لەم بەڵگانەدا سنووری بۆ بکێشرێ:

١- وەک مامۆستاییێکی قوتابخانە دەوری باڵای بووە لە پێگەیاندنی منداڵ و مێردمنداڵی کورد، پەروەردەکردنیان لەسەر بنچینەیێکی زانستی و چەسپاندنی گیانی نیشتمانپەروەری و کوردپەروەری و ئادەمزادپەروەری لە ناو دڵ و دەروونیاندا.

٢- نووسەر دەستێکی باڵای هەبوو لە فێرکردنی خەڵکی بەهۆی ئەو نامیلکانەی بڵاوی دەکردنەوە، لەوانە کتێبی «پیرۆزبی منداڵ» (سلێمانی ١٩٤٠)، «بەرەو ڕووناکی»



(بەغدا ١٩٤٢)، «لە ڕێگەی سەرکەوتنی ئینسانا» (بەغدا ١٩٤٣). ئەم کتێبانە لە بنجدا بریتین لە کۆمەڵە وتارێک لە بارەی ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری و ئەدەبی، بەشێوازێکی ئاسان بۆ قوتابیان و خوێنەرانی کورد ئامادەی کردووە، هانیان دەدا ڕوو لە زانست و زانیاریی سەردەم بکەن. هەوڵ دەدا لە چوارچێوەی بیری بنەماڵەیی و عەشیرەتگەری و ناوچەیی دەریانبێنێ بەرەو گێتییێکی ئاسۆ فراوانی ئەوتۆیان ببا کە هەموو ئادەمزادی سەر ڕووی زەوی تێیدا بەئاسوودەیی و برایەتی بژین.

٣- عەبدولواحید چەند کتێبێکی بۆ قوتابیانی خوێندنی سەرەتایی داناوە، هەندێکیانی لە زمانی عەرەبییەوە وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی.

٤- نووسەر لە زمانی بێگانەوە هەندێ کتێبی وەرگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی، لەوانە کتێبی «لە وولاتی ئادەمزادە سەربەستەکان»ی ئاغا ئۆغلوو ئەحمەد (بەغدا ١٩٣٩) و کتێبی «دوانێک لە بابەت پێڕەوی میللییەوە»ی عەبدولفەتاح ئیبراهیم (بەغدا ١٩٤٢).

کتێبی یەکەم لە زمانی ئازربێجانی یا تورکییەوە عەبدولواحید وەریگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی. ئەم کتێبە بریتییە لە کۆمەڵێک وتار لە بارەی ژیانی ئادەمزاد و فراوانکردنی ئاسۆی بیروباوەڕی. کتێبەکە بەهەناسەیێکی پێشکەوتنخوازی و مرۆڤپەروەری نووسراوەتەوە، بەڵام خاوەنەکەی هەرچەندە بەنەژاد ئازربێجانییە کەچی لە دواییدا بووە بە«پان تۆرانیست» و لە ئازربێجانی سۆڤیەتی کۆن ڕای کردووە و لە ئەستەموول نیشتۆتەوە.

کتێبی دووەم لە زمانی عەرەبییەوە عەبدولواحید وەریگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی. ئەمیش بریتییە لە باسێکی بەنرخ لە بابەت دواکەوتوویی ئەو سەردەمەی عیراق بەهەموو ئەو خەڵکانەی تێیدا دەژین. دانەر ڕێگەی چاکەیان پێ پیشان دەدا، چۆن کۆمەڵێکی پێشکەوتوو دروست بکەن بۆ ئەوەی هەموو دانیشتوانی وەک یەک بژین.

٥- عەبدولواحید زیرەکانە بەشداری لە ڕۆژنامەگەری سەردەمی خۆیدا کردووە لەگەڵ ئەوەی ڕاستەوخۆ وەک کارگەرێک لە ڕۆژنامەگەریدا کاری نەکردووە بەڵام نووسینی کەم نەبووە و گەیشتۆتە پلەیێک پیاو وا هەست دەکا کادیرێکی ڕۆژنامەگەری بووە.

نووسەر کوردی زانێکی باش بوو، قەوارەی زانینی زمانی کوردی لەگەڵ قەوارەی زانیاریی گشتی لە پلەیێکدا بوون. لەبەرئەوەیە هەمەوو ڕستەیێکی لە ماناد قوولە و لە زماندا ڕەوانە، بۆیە هەمەوو نووسینەکانی ئەدگارێکی هونەری و ئەدەبییان پێوەیە. جگە لەمە ئەو وتارانەی لە ڕۆژنامە و کۆوارەکانی ژیانەوە و ژیان و ژین و گەلاوێژ بڵاوی دەکردنەوە لە بیست وتار زیاترن. بەناوەرۆک ڕەنگاوڕەنگن، هەندێکیان خاوەنەکەیان وەک نووسەرێکی چاک دەخەنە ڕوو. لەوانە لە وتاری «چۆن پێشکەوین؟» ئازایانە داوا دەکا لە قەپێلکی ناوچەیی بچینە دەرەوە بۆ سەر هەمەوو ڕووی زەویی بێ پایان و بەرین. لە وتاری «فرمێسکی خوێناویم بۆ گیانی پاکی بەرزی مستەفا پاشا» عەبدولواحید بەفرمێسکێکی گەرم کۆمەڵێک وێنەی ڕۆمانتیکییانەی دروست کردووە. لە گیانێکی پڕ لە سۆزەوە بەپارچە پەخشان و شیعر و پەخشانەشیعر تابلۆیێکی دروست کردووە فرمێسک دەڕێژێتە سەر گۆڕی مستەفا پاشای یامولکی. لە وتاری «زەهاویش نەما» فرمێسکێکی دیکە بۆ شاعیری بەنەژاد کورد جەمیل سدقی زەهاوی دەڕێژێ. زەهاوی کورد بوو بەڵام بەعەرەبی دەینووسی. عەبدولواحید گلەیی لێ ناکا، چونکە نابێ کەس گلەیی لێ بکا. فرمێسکی عەبدولواحید گەرمە لە سەرانسەری ئەو پارچە پەخشانەدا. لە وتاری «دەوڵەمەند و هەژارەکانمان» هەر لە ناوونیشانیدا دیارە نووسەر لە چی دەدوێ، دەیەوێ یەکسانی هەبێ و هەژاری نەمێنێ. ئیتر دەچێتە ناو گیروگرفتەکەوە ئەوەی لە سەرەتای ژیانی ئادەمزادەوە دروست بووە و تا ئێستا بەردەوامە، خودا خۆی دەیزانێ کەی دوایی دێ، هەندێ لەسەر ئەو باوەڕەن دوایی نایە. نووسەر دڵسۆزانە لەم کێشەیە دەدوێ، لەوە دڵنیایە دەبێ وا نەبێ، لەگەڵ ئەوەشدا دەرمانی بۆ نەدۆزیوەتەوە، نەک تەنیا ئەو بەڵکو تا ئێستاکەش دەرمانی بۆ نەدۆزیوەتەوە، هەرچی هەیە هەر قسەیە. لە لایێکی دیکەوە گریمان ئەگەر دەرمانیش بدۆزرێتەوە دوور نییە وەکو ڕووەکەکەی گلگامیشی لێ بێ و لە گوێی کانییەکەدا مارەکە بێ و بیدزێ. ئەگەر عەبدولواحید تا ئێستا بمایە بەچاوی خۆی دەیدی! لە وتاری «ئەدەبیاتی تازە و ئینسانییەت» عەبدولواحید هاوار دەکا و دەڵێ: ئەدەب پێویستە بۆ مرۆڤایەتی بێ، ئامانجی ئەو ئەدەبە بەلایەوە ئەوەیە خەڵکی فێری کردەوەی چاک بکا، ئەو ئامانجە بەسێ جۆرە کردەوەی ئەدەبی دێتە دی یەکەمیان بڵاوکردنەوەی بیروباوەڕی دیمۆکراتی و دووەمیان هەست و سۆزی ئاشتیخوازی و سێیەمیان بۆ منداڵ و پەروەردەکردنیان.





١

لە نامەیێکیدا ئامۆژگاری نەسرینی کچی دەکا:

«کچم نەسرین<br>
تۆ و دەستەخوشکەکانت<br>
هەمەوو کوردێ، براکانت<br>
پێویستە بۆ بەرزی بڕوانن<br>
هەمیشە ڕوو لە بەرزی بن<br>
چونکە کورد بەهیچ نابێ<br>
ئەگەر چاو لە نزمی بکا<br>
هەمەوو میللەتانی گێتی<br>
بەنەفس بەرزی گەیشتوونەتە<br>
ئومێد».

٢

لە وتاری «بۆچی ئادەمیزاد ئەچن بەگژ یەکدا؟» دەڵێ:

«... سەرلەشکرەکان، خاوەن فابریقەکان، تەماعکارەکان، گەلێ جار بۆ ناوونیشانی خۆیان ماڵی ئینسانەکان ئەگرن بەقوڕ و هەزاران منداڵ بێ باوک و هەزاران ئافرەت بێوەژن و لە خوتوخۆڕایی نەدیو و نەناسیو ئینسان ئەدەن بەکوشت. کەوابوو بۆچی لە تەربییەی منداڵەکانمانا بەم ڕووحی سەلامەتی و ئاشتییە تۆو نەکەن؟ وە ئەو عەشقی سەلامەتییە نەکەین بەهەوێنی ژیانیان تا تووشی شەڕ نەبن».

٣

لە وتاری «شەکسپیر»دا عەبدولواحید دەنووسێ:

«ئەم زاتە وەجاغزادە و دەوڵەمەند بەچە نییە، کوڕی گۆشتفرۆش بووە، خوا جەوهەرێکی وای تیا خەڵق کردووە تەئلیفات و ئاساری لە ماڵی هەمەوو ئینگلیزێکدا هەیە، تەرجەمەی کردووە بەزمانی خۆی، چ فائیدە لە حاڵی زیندەگانیی خۆیدا ئەم قەدر و حورمەتەی

ئێستای خۆی نەدی لە کوێیە ببینێ کە لە هەموو گوزەرگاهێکی لۆندرەدا هەیکەلی دەبینرێ. ئاخ دنیا وایە ئینسانی بەقیمەت لە پاش مردن قەدری دەزانن».

٤

لە وتاری «زەهاویش نەما» نووسەر دەڵێ:

«دنیا عەنیتکەیە!

جەمیل ئەدزێ بەڵام زەهاو چۆن بەزەمیلەی خورماوە دەچێ. عەنتیکەیێکی وا کە ئەمەندە بەکەڵکە هەزاران گەوهەری وەکو تۆ کە لە خوێن و ئێسقانی ئێمە خوڵقاون لە تەئریخا لەسەر حیسابی ئەقوام وا قەید ئەکرێن.

زەهاوی باوکت لە مزگەوتی هەمزە ئاغاوە پەرەوازەی کرد بۆ بەغدا، هیچ دڵ تەنگ مەبە. خۆ تۆ لە باقی شاعیری کۆن و زیاگۆگ ئالپ زیاتر نیت. ئەی فەیلەسووفی وڵاتەکەمان نەمردوو! لە دڵمانا زیندووی، چونکی هێلانەی ئەسڵیت زەهاوە، ماوە و شیعرەکانت ئیسپاتی بەرزی تۆ دەکا».

چێژی هونەری و توانای ئەدەبی و بیری ڕووناک بەزمانێکی لووس و بێ گەردی کوردی لەم نموونە پەخشانانەی عەبدولواحید نووری خۆیان دەنوێنن.

## عەبدولواحید نووری شاعیر

عەبدولواحید نووری بابەتی شیعری نەکردووە بەپیشە لە نووسیندا. بەهۆی ئەوەی مامۆستای قوتابخانە بووە، پیشەکە هانیداوە سروود بۆ قوتابیان دابنێ. هەر چۆنێ بێ ئەو پێویستییە خەیاڵی شیعری لای عەبدولواحید دۆزیوەتەوە، ئیتر ئەو نموونانەی لەم بابەتەوە لە بەردەست دان لە ڕێزی ئەو هەموو سروودانە دەوەستن کە لە کوردستانی باشوور دانرابوون لە دوای دامەزراندنی دەوڵەتی عیراق و پراکتیک کردنی خوێندنی کوردی لە هەندێ لە قوتابخانەکانی شارانی کوردستانی عیراق وەکو سلێمانی و کەرکوک و هەولێر.



## نموونەی شیعری عەبدولواحید

هەموو شیعری عەبدولواحید بریتییە لەو لیریکانەی بەتایبەتی دایناون وەک سروودێکی قوتابخانەیی بەئاوازەوە دەبێژرێن.

١

سروودی یەکەم:

ئەی فەجری جوان
فەجری ئەمەلمان
ئاسمان ڕووناک کە
ڕەوشەن کە وڵاتمان
لابە تاریکی لابە تاریکی
لەسەر باغ و چیامان
بڵێ بەسیە نوستن
بەسیە سستی
بەسیە پەستی
ئیتر ئینتیباه

سروودی دووەم:

ڕاچڵەکین و ووریا بووین
ڕاپەڕین و هوشیار بووین
قەفەزی دیلیمان شکان
تا لە عالەمدا بژین
ئەژین ئەژین
ئێمەش وەک بەشەر ئەژین
ژیانێکی شێرانە
ئێرە ئەکەین بەلانە
ئەیپارێزین لە میکرۆب
لە میکرۆبی بێگانە

نەژی نەژی

دەوری خەرافات نەژی

سروودی سێیەم:

ئێمە کە لاوین تازە پێ ئەگەین

بۆ دوارۆژی کورد دایم هەوڵ ئەدەین

بەئەخلاقی جوان بەعیلم و عیرفان

تەجەددود نەشر ئەکەین لە ناو کوردستان

نوستبووین سەردەمێک بێ هۆش و بێ گۆش

لەززەتی ژیانمان کردبوو فەرامۆش

بەڵام سەد شوکور هاتینەوە هۆش

بژی ئەی قەومی کورد بژی هەزار جار

بەسیەتی لاوی کورد لە خەو ڕاپەڕین

وەختی تێکۆشینە و عیلم وەرگرین

سروودی چوارەم:

کوڕگەل وەرن زوو با بڕۆین بۆ لادێ

لادێکان پێش خەن تا بن بەشادێ

لادێیی هەژار برسی و بەسەزمان

ئەڵێ ڕزگارم کەن لە نەخۆشییەکان

لادێیی هەژار برسی و بێ تاوان

ئەڵێ ڕزگارم کەن لە زۆردارەکان

ئەم سروودانە لە ڕووی ڕوخساری شیعرییەوە بەتایبەتی لایەنی قافیە، شاعیر بەزۆری جووت قافیە (مەسنەوی) بەکار هێناوە، لەگەڵ ئەوەشدا هەموو مەرجەکانی پراکتیک نەکردووە، چونکە سروودەکانی بۆ مەبەسی چڕین هۆنیوەتەوە، واتە وتنیان بەو ئاوازەی بۆیان دانراوە، یا شاعیر خۆی شیعرەکەی بۆ ئاوازێکی دیاریکراو داناوە. لەم حاڵەتەدا ئەگەر کێش و قافیە کەموکووڕییان تێدا بێ ئاواز بەسەریان زاڵ دەبێ و گوێ هەست بەلەنگییەکان ناکا. لەبەرئەوەیە هەموو سروودێک ئەگەر ئاسایی بخوێنرێتەوە جۆرە



چێژێک بەخوێنەر دەگەیەنێ، بەڵام ئەگەر بەئاوازەوە وەک گۆرانی بۆی بوترێ لە ڕێگەی گوێوە پیاو جۆرە چێژێکی دیکەی لێ وەردەگرێ.

عەبدولواحید نووری یەکەمین نووسەری کورد نییە لە سەدەی بیستەمدا لە هەرەتی لاویەتیدا ماڵئاوایی کردبێ و زیانی بەئەدەب و ڕۆشنبیری کوردی گەیاندبێ. لەم جوانەمەرگانە شاعیر و نووسەری گەورەی دیکەشمان هەیە. لە بەشەکانی داهاتووی ئەم «مێژووی ئەدەبی کوردی»یەدا هەواڵیان دەکەوێتە بەرچاو.

***

عەبدولواحید نووری مامۆستای قوتابخانە و ڕۆشنبیر و نووسەر و شاعیر بوو، دەورێکی گرنگ و باڵای نواند بۆ پێگەیاندن و پەروەردەکردنی قوتابیان. کتێبی بۆ ئامادە دەکردن، شیعر و سروودی بۆ دەهۆنینەوە، ئەمە تەنیا بۆ لاوان نەبوو بەڵکو بۆ هەموو خوێنەر و خوێندەواری کورد بوو. قەڵەمە بەبڕشتەکەی گەلێ مەسەلەی کۆمەڵایەتی و سیاسی و ڕۆشنبیری لەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامە و کۆوار جێبەجێ دەکرد.

سۆزی کوردایەتی لە دەروونی عەبدولواحید نووریدا بەهێز بوو، نەتەوەپەرستێکی بێ خەوش بوو، هەرگیز سۆزی مرۆڤایەتی لە ناو دڵیدا بزر نەبووە. خەڵکی سلێمانی و هەموو کورد و میللەتانی هاوسێ و هەموو مرۆڤایەتی خۆشویستووە. داخی گران نەخۆشی دەرفەتی نەدا زۆر بژی. کردەوەی لەم ژیانە کورتەدا بەرهەمێکی بەنرخە لە مێژووی ئەدەب و ڕۆشنبیری کوردیدا.

# بەشی بیست و سێیەم

## بێکەس

## ۱۹۰۵ - ۱۹٤۸

### ژیانی شاعیر

فایەق کوڕی عەبدوڵڵا بەگ کوڕی کاکەحەمەی کوڕی ئەلیاسە قۆجەیە. خێزانی لە قەلاچۆلانەوە ڕوویان کردۆتە سلێمانی. فایەق لە ساڵی ۱۹۰۵ لە گوندی سیتەک لە دایک بووە. ئەم ئاوایییە بۆ ماوەی ۲۰کم کەوتۆتە باکووری ڕۆژهەڵاتی سلێمانییەوە. عەبدوڵڵا بەگی باوکی تابوور ئاغاسی بووە لە سوپای عوسمانیدا.

ساڵانی بەرایی تەمەنی لە سیتەک بردۆتە سەر، لە دواییداماڵیان گواستۆتەوە سلێمانی، هێشتا زۆر منداڵ بووە لە ئەنجامی نەخۆشی ئاوڵە ئەدگاری دەموچاوی تێکچووە. عەبدوڵڵا بەگی باوکی لە ساڵی ۱۹۱۱ بەکاروباری عەسکەری نێرراوە بۆ خانەقین و لە پاشانا بۆ بەغدا، لە دوای ماوەیێک منداڵەکانیشی گواستۆتەوە ئەوێ. لە پاش ساڵێک ڕووی کردۆتە وڵاتی تورکی عوسمانی و منداڵەکانی لە بەغدا بەجێ هێشتووە. باوکی فایەق لە وڵاتی عوسمانی ون بووە، ئیتر کەس نەیدیوەتەوە. بەم جۆرە نەگبەتی ڕووی کردۆتە فایەق، لەو کاتەدا حەمە سەعیدی برا گەورەی لە ڕووباری دیجلەی بەغدا خنکاوە، ئینجا دایکی کۆچی دوایی کردووە، ناچار پەنای بۆ خاڵی بردووە، ئەویش ئەوەندە نەژیاوە و لە دوای ماوەیێک سەری ناوەتەوە. بەم شێوەیە فایەق و برا بچووکی بێ کەسوکار دەمێننەوە.

لە سەردەمی جەنگی یەکەمی گێتی بەهۆی کاکە حەمەی مامیەوە کە لە سلێمانی بووە، فایەق و برای لە بەغدا بەحاجی عەلی ئاغا سپێرراون. ئەم ناسیاوەیان ماڵی لە بەغدا بووە، ژیانی بۆیان دابین کردووە، ڕێگەی خوێندنیانی بۆ خۆش کردووە، بەڵام پێش کۆتایی جەنگ کاروباری داراییان تێک چۆتەوە و ناچار لە ساڵی ۱۹۱۸ فایەق و برا بچووکی گەڕاونەتەوە سلێمانی بۆ لای حاجی ئەمینی مامیان.

فایەق تا ساڵی ۱۹۲۳ لە سلێمانی لە قوتابخانە دەخوێنی، ئەم خوێندنەی زۆر ناخایەنی ئەمجارەیان ڕوو دەکاتە کەرکووک و لەوێ لە قوتابخانەی عیلمییە دەست دەکا بەخوێندن. لێرەش کاروباری سەر ناگرێ ناچار ڕوو دەکاتە بەغدا لە ساڵانی ۱۹۲٤ -



۱۹۲۵ لە قوتابخانەی دارولعولووم دادەمەزرێ، پاش ماوەیێک لە ڕووی دەست کورتییەوە ناتوانی خوێندنی تەواو بکا، لە ساڵی ۱۹۲٦ دەگەڕێتەوە سلێمانی و دەبێتە قوتابیی پۆلی یەکەمی قوتابخانەی ناوەندی. لە ماوەی خوێندنی ئەمجارەی هیچ مایەیێکی نابێ پێی بژی، ناچار کاسبی دەکا، جیگەرە و شخاتە دەفرۆشی کەچی ئەمەش دەردی تیمار ناکا، لەبەرئەوە دەبێ بەکرێکار و لە ڕێگەی عەربەت پاڵەیی دەکا.

لە ساڵی ۱۹۲۸ ماوەیێک لە هەولێر بووە لە کردنەوەی ڕێگەی هەولێر - ڕواندز - ڕایات کرێکاری کردووە. لە پاشانا گەڕاوەتەوە سلێمانی بەمامۆستا لە قوتابخانەی زانستی دامەزراوە. لەو کاتەدا لە ساڵی ۱۹۲۹ هەواڵی مردنی باوکی پێ گەیشتووە لە شاری مەرعش لە وڵاتی تورکیا. لە ساڵی ۱۹۳۰ چووە بۆ تورکیا بەدوای میراتی باوکی کەوتووە، لەو گەشتەیدا هیچی دەست نەخستووە و بەنائومێدی گەڕاوەتەوە.

بێکەس لە ڕاپەڕینی بەردەرکی سەرای سلێمانی لە ٦ی ئەیلوولی ۱۹۳۰ گیراوە. لە گرتووخانە شیعری «ئەی وەتەن مەفتوونی تۆم...»ی نووسیوە، بەهۆی گیرانی لە کاریش دوور خرابووەوە. لە دوای ئازادبوونی لە گرتووخانە قوتابخانەیێکی تایبەتی کردۆتەوە بۆ فێرکردنی منداڵان تا ساڵی ۱۹۳۳ لەو سەردەمەدا لە گوندی مورتکەی بازیان بەمامۆستای قوتابخانە دامەزراوە، لە پاشانا گوێزراوەتەوە بۆ قوتابخانەی تەوێڵە. لە هاوینی ساڵی ۱۹۳۵ لەگەڵ عەبدوڵڵا گۆران و کۆمەڵە مامۆستایێک دەیاننێرن بۆ بەشداریکردن لە دەورەیێکی (سیمینارێکی) پەروەردەیی لە بەغدا بۆ مامۆستایان.

لە ساڵی ۱۹۳۷ لەبەر جموجۆڵی نیشتمانپەروەری و بیری کوردایەتی بێکەس لە سلێمانییەوە ئاوارەی شاری حیللە و لەوێوە بۆ عەمارە دەکرێ. لە دوای ماوەیێک ئەوێ بەجێ دێڵێ و دەگەڕێتەوە سلێمانی و قوتابخانەیێک بۆ خۆی دەکاتەوە و تا ساڵی ۱۹٤۱ وانەی تێدا دەڵێتەوە. لە پاش بەینێک دەبێتەوە مامۆستای قوتابخانەی میری لە سلێمانی و سورداش و هەڵەبجە مامۆستایی دەکا تا دوا قۆناغی ژیانی.

فایەق هەرچەندە بەبنەماڵە بێکەس نییە بەڵام ژیانی هەژاری و ناگزووری وای لێ کردووە بەتایبەتی پاش جیابوونەوەی باوکی لێیان خۆی بەبێکەس بزانێ. بەڕاستی فایەق کە نازناوی «بێکەس»ی هەڵبژاردووە بۆ خۆی ئەم کارەی بەداهێنانێکی شاعیرانە بۆی دەژمێررێ، واتە ناوەکەی لەگەڵ ژیانی نالەباری و بێ ئومێدی ڕێک دەکەوێ.

بێکەس لە ڕۆژی ۱۸ی شوباتی ۱۹٤۸ لە هەڵەبجە کۆچی دوایی کردووە، تەرمەکەی گوێزراوەتەوە سلێمانی و لە گۆڕستانی گردی سەیوان نێژراوە.

## شیعری شاعیر

بێکەس شاعیرێکی خۆڕسک بوو، لە شیعر نەدەگەڕا، شیعر دەهاتە لای و سەری لێ دەدا، گوێیێکی هوشیار و ناسکی هەبوو، هەرچەندە ژیانی ناڕێک و پڕ لە تەنگوچەڵەمە و ئاژاوە بوو کەچی شیعری ڕێکوپێک و بێ گرێ و نەرمونیان بوو. خوێنەر کە موتاڵای دەکا لەوە دەگا لە دەروونێکی پڕ لە خۆشی و بەختیاری ژیان هاتۆتە دەرەوە، ئەو ڕاستگۆییە لە شیعرە ڕەشبینییەکانیشیدا بەڕوونی دیارە. شیعری بێکەس بەقەوارە زۆر نییە، هۆی ئەمە دەگەڕێتەوە بۆ تەمەنی کورتی کە چل و سێ ساڵ ژیاوە، هەروەها بۆ سەختی ژیانی زۆر جار هەموو شتێکی لە بیر بردۆتەوە.

## شیعری بێکەس لە ڕووی ڕوخسارەوە

جەوهەرەکانی شیعری بێکەس لە ڕووی ڕوخسارەوە لەم خاڵانەی خوارەوە دەکەونە بەرچاو:

١- کێشی شیعر: بێکەس هەردوو جۆرە کێشی شیعری کوردی بەکار هێناوە. کێشی بەحری عەرووزی و کێشی سیلابی خۆماڵی. بەیەکسانی هەموو بەرهەمی شیعری بەسەر ئەم دوو جۆرە شیعرە دابەش بووە.

شاعیر لە کێشەکانی عەرووز دەست ڕۆیشتوو نییە. تەنیا دوو بەحری ڕەمەل و هەزەجی بەکار هێناوە، ئەم هەژارییە بەچاکە گەڕاوەتەوە بۆی چونکە ئەم دوو بەحرە لە کێشە سووک و ڕەوانەکانی عەرووزین، لەبەرئەوەیە شیعری بێکەس ئارامی گوێی خوێنەرە.

لە کێشی سیلابی خۆماڵیدا بێکەس دەوڵەمەندە، زۆربەی کێشە سووکەکانی بەکار هێناوە، وەکو دە کەرتی (وەستان لە ناوەڕاست ٥ + ٥) و (بێ وەستان لە ناوەڕاست)، زۆرترینی شیعری لەم بابەتەیە، هەروەها کێشی حەوت کەرتی و هەشت کەرتیش لە شیعریدا بەرچاو دەکەون، ئەمانە بەژمارە کەمترن. جگە لەمە بێکەس لە کێشدا داهێنانی هەیە، کێشی هەشت کەرتی بەکار هێناوە ئەمەیان لە شیعری کوردیدا کەم بەکار هاتووە، هەروەها نیوە دێڕی کێشی دە کەرتی دابەش کردووە و کردوویەتی بەدوو نیوە دێڕ، واتە نیوە دێڕی پێنج کەرتی دروست کردووە، بەم پێیە دێڕی شیعر بەهەردوو نیوە دێڕە پێنج کەرتییەکە دەبێ بەدێڕێکی دە کەرتی.

بێکەس بەزۆری کێشە سووکەکانی حەوت کەرتی و هەشت کەرتی بۆ شیعری منداڵان و هەندێ سروودی میللیی قوتابخانە بەکاری هێناوە.



٢- قافیەی شیعر: شاعیر بەزۆری لە شیعرە عەرووزییەکانیدا یەکێتیی قافیەی بەکار هێناوە، لەوەشدا ئەو دەنگانەی (تیپانەی) بەکار هێناون ژمارەیان کەمە، لەگەڵ ئەوەشدا دەنگە عەرەبییەکانی تێدا نییە. ئەوەی بەکاری هێناون ئەمانەن: ا، ت، د، ر، س، گ، م، ن، و، وو، (ە – ـە)، ی، ێ. لەمانەش زۆربەی شیعری لەم بابەتەوە لەسەر قافیەی «ە – ـە»ەن.

شیعری جووت قافیە (مەسنەوی) لە شیعرە خۆماڵییەکانیدا زۆر کەمن. لە دیوانی بێکەسدا شیعری تازە بابەتی وا بەرچاو دەکەون شاعیر چەند کێشێکی خۆماڵی لە تاکە شیعرێکدا بەکار هێناوە.

٣- زمانی شیعر: کاری بزووتنەوەی شیعری نوێ (ڕۆمانتیکی) بەسەر بێکەس بەهێز بوو. لە ڕۆژگارێکدا ژیاوە سەردەمی زۆرانبازی و قۆناغی گواستنەوە بووە لە نێوان شیعری کلاسیکیی کۆن و شیعری نوێی تازە لە دایک بوو. شاعیران لەم ماوەیەدا دوو بەش بوون، بەشێکیان زیاتر کاری کۆنیان پێوە دیار بوو، بەشەکەی دیکەیان زۆرتر ئەدگاری شیعری نوێ لە بەرهەمیاندا بەدی دەکرا. بێکەس لە ڕیزی ئەمانەدا بوو، لەبەرئەوە زمانی کوردی پەتی کەرەستەی بنچینەیی دروستبوونی بوو. وشە و تەعبیری زمانی قسەکردنی خەڵکی بەکار دەهێنا. ئەو وشە تازانەی بۆ بەهێزکردنی زمانی کوردی پەتی دەدۆزرانەوە یا دروست دەکران بێکەس بەکاری دەهێنان، بۆیە بەرهەمی شیعری بەگشتی سەرچاوەیێکی لەبار بوو بۆ سەرکەوتنی بزووتنەوەی شیعری تازە بەیەکجاری لە ئەدەبی کوردیدا.

## شیعری بێکەس لە ڕووی ناوەڕۆکەوە

بێکەس یەکێکە لەو شاعیرانەی پێویستە شاعیری ژیانی پێ بوترێ بەو مانایەی لە هەموو بابەتەکانی شیعری وتووە. بەرهەمی ئەدەبی وەک ئاوێنەیێکە ژیانی کوردەواری نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەم بەگشتی و ناوچەی سلێمانی بەتایبەتی تێیدا ڕەنگی داوەتەوە. لە هەندێ مەبەسە کۆنەکانی کلاسیکی دوور بووە وەک شیعری ئایینی و ستایشی کەسانی کاربەدەست و دەوڵەمەند و دەرەبەگ و دەست ڕۆیشتوو.

# گەشتی گێتیی شیعرایەتی بێکەس

## کوردایەتی و نیشتمانپەروەری

بێکەس لە بنیاد و بنەڕەتی دروستبوونی وەک ئادەمزاد فرچکی بەبیری کوردایەتی و نیشتمانپەروەری و خۆشویستنی کوردستان گرتووە. لە منداڵییەوە وەک هەموو دڵسۆزێکی کورد تووشی گرێ کوێرەی نەبوونی دەوڵەتی کوردی بووە، هەمیشە خەونی بەئەحمەدی خانی و حاجی قادری کۆییەوە دیوە. تەنیا بەتایبەتی شیعرێکی زۆری بۆ ئەم مەبەسە دانەناوە، بەڵکو لە زۆربەی بەرهەمی شیعریدا خۆی پێ نەگیراوە و ختووکەی کوردایەتی خەیاڵی هێناوەتە خەندە.

١

بێکەس بەهۆی ڕاپەڕینی بەردەرکی سەرای سلێمانی لە ٦ی ئەیلوولی ١٩٣٠ شیعری هۆنیوەتەوە:

ئەی وەتەن مەفتوونی تۆم و شێوەتم بیرکەوتەوە
وەختی بەندیی و ئەسارەت پێ بەتەوق کۆتەوە
من لە زیکر و فیکری تۆ غافڵ نەبووم وا تێ نەگەی
حەپس و تێهەڵدان و زیللەت تۆی لە بیر بردۆتەوە
بەو خودایەی بێ شەریک و لامەکان و واحیدە
عەشقی تۆ نەوعێ لە دڵما ئاگری کردۆتەوە
ئاگرێکی وا هەزار ساڵ ئاوی بڕژێنیتە سەر
قەت گڕ و گڵپە و بڵێسەی تا ئەبەد نەکوژێتەوە
باسی مەحزوونی و کەساسی خۆت نەکەی تۆخوا وەتەن
چونکە بەو باسە برین و زامەکەم ئەکولێتەوە
ماتەمینی تابەکەی دەی پێکەنە و سەرهەڵبڕە
موفتەخیر بەشوهرەتت وا عالەمی گرتۆتەوە
نەگبەتی لاچوو سەعادەت بۆتە پشتیوانی تۆ
کەوکەبی بەخت و فریشتەت بەرزە ئەدرەوشێتەوە



گەرچی بەینێکە زەلیل و دیلی دەستی زاڵمی
نۆبەتی شادیتە ئەمجا ناحەزت لێک بێتەوە
لافی میللییەت بەدەم لەم عەسرەدا کەڵکی نییە
ڕۆژی هەوڵە هەر بەهیممەت گۆی هونەر ئەبرێتەوە
بێ قوسوورە چەند جەسوورە سەد شوکور ئەولادەکەت
وا لە ڕێی تۆدا لە خوێنا سەیری چۆن ئەتلێتەوە
بەسیە تەعنەم لێ مەدە هەر ڕۆڵەکەی جارانتم
هێندە حیلمت بێ هەتاکو دەست و پێم ئەکرێتەوە
شەرتە شەرتی پیاوەتی بێ گەر خودا دەستم بدا
دوژمنت پەت کەم وەکو سەگ بیخەمە ژێر پێتەوە

لەم شیعرەدا بێکەس سۆزی بەکوڵی بەرامبەر بەمیللەتی خۆی لە دوو شێوەدا دەردەبڕێ. یەکەمیان ئەڤین و دڵداری و گیرۆدەیی بەرامبەر بەنیشتمان، دووەمیان لە ئازایەتی و جوامێری کورد دەدوێ بۆ گەیاندنی ئەو دڵدارییە بەئەنجام کە دەستخستنی ئازادی بۆ کوردستان و بەختیاری بۆ کوردە.

٢

لە بەرهەمێکی دیکەیدا دیسانەوە بێکەس دەگەڕێتەوە سەر یادی ڕاپەڕینەکەی بەردەرکی سەرا و هەندێ لە دێڕی شیعرە پڕ لە سۆزەکەی پیرەمێرد «وەفدی کوردستان» لە ساڵی ١٩٣١ دەکا بەپێنج خشتەکی:

قەدری میللەتتان بەجارێ شکان
نە حەیاتان ما نە ناوونیشان
باری تەعنەتان وا هاتە سەرشان
(وەفدی کوردستان میللەت فرۆشان
هەرزە وەکیلی شاری خامۆشان)
حاجی تووتنەکەت مادەم فرۆشرا
قیرووسیا لە سەد کوشتن و هەرا
دەخیلە هەستە ڕێکەوە خێرا

(دەسکێ لەو گوڵەی باغەکەی سەرا
کەوا بەخوێنی لاوان ئاودرا)
تاقمێ ڕێکخەن زۆر بە پەڕلاقی
بەبەزم و ڕەزم و ئاهەنگ و ساقی
بۆ ئەوەی بکەن دەفعی مەراقی
(بیبەنە بەردەم عەرشی عیراقی
بڵێن یار باقی و هەم سوحبەت باقی)
نە بارانتان دی نە با ئەی فەقیر
نە لاوان کوژران بەگولله و شەستیر
نە پێی نازداران خرایە زنجیر
(پەردە و تارای سوور بەرن بۆ ئەمیر
بڵێن دوای کوشتار هێشتا تۆ دڵگیر!)
هاوار بەماڵم چیمان پێ کرا
لە چارەکێکا سەدمان لێ خرا
هێشتا خەڵاتیان ئەکەن بە بەرا
(دەک خەجاڵەت بن لە ڕووی مەحشەرا
ئێمەیش خاکی غەم ئەکەین بەسەرا)
قەت وا تێ نەگەن چاومان شکاوە
کوشتن و بڕین دائیم بۆ پیاوە
لە ناو دۆشەکا کەی حەق سەنراوە
(خەیاڵتان خاوە کورد نەفەوتاوە
بەراتی نەجات بەخوێن نووسراوە)
میللەت مەتینە عەزمی نانەوێ
لە غایەی بەرزی خۆی هەر ناکەوێ
لەت و پەت کرێ حوقووقی ئەوێ
(من ڕەنگی سوورم بۆیە خۆش ئەوێ
موژدەی شەفەقی لێ دەرئەکەوێ)



بێکەس لەم شیعرەیدا ژیرانە و زیرەکانە لەو ڕاستییە گەیشتووە هەندێ لە چینەکانی سەرەوە لە دەرەبەگ و دەوڵەمەندانی شار بەگشتی لە دژی خەباتی ئەو سەردەمە بوون لە پێناوی سەربەخۆیی کورد، چونکە کاری دەکردە سەر بەرژەوەندی دارایی و ئابوورییان بەوەی سلێمانی لە بەغدا دەپچڕا و زیانیان لێ دەکەوت.

لە سێ نیوە دێڕەکانی پێنج خشتەکییەکە شاعیر هەوڵیداوە درێژە بەخەیاڵی پیرەمێرد بدا لە ڕیسواکردنی ئەو نوێنەرانەی چوونە خزمەت تاوانباری بەغدا کە خەڵکی سلێمانی کوشتووە و پوزشیان بۆ هێناوەتەوە و خەڵکی دڵسۆزی سلێمانیان بەتاوانبار لەقەڵەم داوە.

## ٣

بێکەس لە لیریکێکیدا موناجات لەگەڵ نیشتماندا دەکا:

من کە مەحرووم بووم لە وەسڵت تازە ژینم بۆ چییە
حورمەت و جاه و جەلال و ڕووح و دینم بۆ چییە
دڵ لەبەر دووری و فیراقت پڕ لە قەهر و میحنەتە
شیوەن و گریانە عەیشم پێکەنینم بۆ چییە
باعیسی ڕووناکی قەلب و نووری چاوم تۆی وەتەن
چی لە دونیا کەم بەبێ تۆ جێنشینم بۆ چییە
من کە خاکی پاکی کوردستانی نازدارم هەبێ
چی لە قەتعەی ئەورووپا کەم موڵکی چینم بۆ چییە
مەنزەرەی جوان و تەبیعی زۆرە لەم خاکەی منا
مەنزەرەی سونعی بەبۆیەی سەوز و شینم بۆ چییە
من کە خۆشاوی زەریف و شەربەتی مێوژم ببێ
نامەوێ شەمپانیا وو ئەشکەنجە بینم بۆ چییە
بۆیە خولقاوم کە خزمەت کەم نەوەک هەر دانیشم
بۆ وەتەن گەر تێنەکۆشم هێز و تینم بۆ چییە

بێکەس لەم شیعرەدا لەسەر شێوە و شێوازی موناجات لەگەڵ کردگار یا دلبەر، گفتوگۆ لەگەڵ نیشتمان دەکا. وەک عاشقانی شیعری کلاسیکی کۆن سۆزی دەروونی دەردەبڕێ، واوەیلا و گریان و شینیەتی لەبەر دووری لە نیشتمان واتە نەبوونی سەربەخۆیی. ئەگەر

ئەم لیریکە لە ئانێکی دیاریکراو ڕەنگدانەوەی هەستی ناوەوەی شاعیر بێ، بێکەس لە شیعرێکی دیکەی تەنیا بیر لە کورد دەکاتەوە.

٤

لەم لیریکەدا هیوا و ئامانجی کورد لە ئازادی و سەربەستی خەیالاتی شەو و ڕۆژی بێکەسی هەست ناسکە:

خەیالاتی شەو و ڕۆژم ژیانی میللەتی کوردە
تەمەننام لای خودا دائیم ژیانی میللەتی کوردە
بەدائیم دڵ پەشێواوی پەشێوی میللەتی کوردم
وەکو بولبول سەحەرخوانیم ژیانی میللەتی کوردە
نەخۆشە میللەت و فەوتا وەتەن بێ هۆشە ئەهلی ئەو
ئەوەی مەتڵەب بێ لامان هەر ژیانی میللەتی کوردە
بەڕاستی چاکترە مردن حەیاتی وا لە لام تاڵە
ئەوی ناوی نەبێ ئەمڕۆ ژیانی میللەتی کوردە
شەجاعەت پیشەیی کوردە مەعاریف ڕەسمی پێشوویە
کەرەم ئەلبەتتە باعیس بۆ ژیانی میللەتی کوردە
دڵم خوێنڕێژ و سەرگێژە دوو چاوم پڕ لە ئەسرینە
عیلاجی دەردی (بێکەس) هەر ژیانی میللەتی کوردە

بێکەس بیر لە هیچ شتێک ناکاتەوە تەنیا کورد نەبێ، لەو بەولاوە هیچ شتێکی دیکە لە ناو مێشکیدا نییە. سەری لەوە سوڕماوە وا دەزانێ هەموو هۆیێک لە ناوەوەیە کورد بێ بەخاوەنی خۆی کەچی هەر دیل و ژێردەستە. دەردی دڵی شاعیر تەنیا بەوە تیمار دەکرێ کورد بگاتە ئامانجی خۆی.

٥

لە دوای جەنگی دووەمی گێتی بێکەس قەسیدەیێک دادەنێ بەشێوەی بەندی (کووپلەی) حەوت نیوە دێڕی، دوو نیوە دێڕی دوایی لە هەموو بەندەکاندا دووبارە دەبنەوە. وەک دیارە شیعرەکە لە تەرجیع بەند دەکا و گەلێکیش لە بەیتی ئەدەبی میللییەوە (فۆلکلۆرییەوە) نزیکە. کێشی خۆماڵی دە بڕگەییە، لە ڕووی قافیەوە (ا ا ا ا ا م م، ب ب ب ب ب م م...)یە:



بیست و حەوت ساڵە من ڕەنجبەری تۆم
بەنان و ئاو و جلوبەرگی خۆم
خزمەتم کردی لە ئێران و ڕۆم
لە پێناوی تۆ شکاوە ئەستۆم
کەچی هێشتا هەر دیل و ڕەنجەڕۆم
گوناهم چی بوو بەم دەردەت بردم
بۆچی بەناهەق وا سووکت کردم
بیست و حەوت ساڵە من ئەڕەتێنی
بەفر و فیشاڵ ئەمخەڵەتێنی
ڕۆژی نەوعێکم هەڵئەپەڕێنی
بۆ مەرامی خۆت ملم ئەشکێنی
کە ئیشت نەما وازم لێ دێنی
گوناهم چی بوو بەم دەردەت بردم
بۆچی بەناهەق وا سووکت کردم
بیست و حەوت ساڵە من تووشی تۆ بووم
لە ڕێی ژیانا هیچ پێش نەکەوتووم
لات و پەژمردەم هەر وەکو مردووم
قسەی خۆمان بێ حەشرت پێ کردووم
هیوام نەماوە تازە لە دەست چووم
گوناهم چی بوو بەم دەردەت بردم
بۆچی بەناهەق وا سووکت کردم
بیست و حەوت ساڵە تاڵە ژیانم
لە ژێر دەستی تۆ زۆر پەرێشانم
لە ئینسان ناچم عەینی حەیوانم
کەی ڕزگار ئەبم ماڵی وێرانم
وا بەخۆت ئەڵێیت حامی گەلانم

گـــوناهـم چی بـوو بـەم دەردەت بـردم
بۆچـی بەنـاهەق وا ســـووکت کـــردم
بیـــست و حـــەوت ســـاڵە من بەتەمـــاتم
چاوەڕێـی نـەخـــتێ لـوتف و خـــەڵاتم
بـبـــووژێتـــەوە خـــاکـی وولاتم
هیـچ گـــوێ نـادەیتـــە دەرد و ئـاواتم
چـونـکە ئـەیـزانـی بێ دەســـەڵاتم
گـــوناهـم چی بـوو بـەم دەردەت بـردم
بۆچـی بەنـاهەق وا ســـووکت کـــردم
بیـــست و حـــەوت سـاڵە زووخـاو ئەنۆشم
لە زوڵـم و جــــەورت هەر چاو ئەپـۆشم
بۆ ڕەزامـــەندی تۆ تێـــئـــەکـــۆشم
لـەبـەر تـۆ زەربـەم داوە لـە خـــۆشم
وا تێگەیشـــتم کـــە چەند بێ هۆشم
گـــوناهـم چی بـوو بـەم دەردەت بـردم
بۆچـی بەنـاهەق وا ســـووکت کـــردم
بیـست و حەوت ساڵە تەفرەی خۆم داوە
وازم لە هەمـــوو کـــەســـێک هێناوە
تۆم گـرتووە و دونیـام خـسـتـۆتە لاوە
بـۆیـە پـێـم ئـەڵـێـن کـــەر و ڕیشـگـاوە
ئـــەوی تـــۆی نـاســـی مـلـــی شـکـــاوە
گـــوناهـم چی بـوو بـەم دەردەت بـردم
بۆچـی بەنـاهەق وا ســـووکت کـــردم
بیـــست و حـــەوت ســـاڵە دەم بەهاوارم
جـــارێ نـاپـرسی لـە حـــاڵی زارم
ســـووتام پڕووکـــام زۆر بێ قـــەرارم



ئـەزانـی لـە تـۆ بـۆچـی بـێـــزارم
شـــارەزای دەردمـی نـاکـــەی تیـــمـــارم
گـــوناهـم چی بـوو بـەم دەردەت بـردم
بۆچـی بەنـاهەق وا ســـووکت کـــردم
بیـست و حـەوت ساڵە بەبێ زیاد و کـەم
ئـەپـاڕێمـــەوە هـەر هـاوار ئـەکـــەم
یاخـوا کـافـریش نـەبێ بەجـەسـتـەم
وێڵ و ســەرگـەردان بێ تین و خـەسـتـەم
هیـچم پێ ناکـرێ دیـل و دەسبـەسـتـەم
گـــوناهـم چی بـوو بـەم دەردەت بـردم
بۆچـی بەنـاهەق وا ســـووکت کـــردم
بیـــست و حـــەوت ســـاڵە دڵم لێت پڕە
ئـەحـــواڵم بـەدەس تـۆوە زۆر شـــڕە
ســـەد بـەڵـێـن بـدەی لـە لای مـن تـڕە
بەســـیـــەتی ئـیـــتـــر ئەم ووڕە ووڕە
نـۆکـــەریت نـاکـــەم وورگم هەڵـدڕە
گـــوناهـم چی بـوو بـەم دەردەت بـردم
بۆچـی بەنـاهەق وا ســـووکت کـــردم
مـن ڕەنجـبـەرێکم پاک و بەسـەزمـان
هـەولـم بـۆ داوی بـەدڵ و بەگـــیـــان
بەســـیـــەتی ئـیـــتـــر درۆ و تەفـــرەدان
وا ئەبێ عـــەدل و ئـینـســـاف و ویـجـــدان
ئەمکـەی بەدیلی عـــەرەب و ئـێـــران
گـــوناهـم چی بـوو بـەم دەردەت بـردم
بۆچـی بەنـاهەق وا ســـووکت کـــردم

ئەم شیعرە لە ئەدەبی کوردیدا بەناوبانگە، دیالۆجێکە یاخود مۆنۆلۆجێکە شاعیر لەگەڵ ئەمپـریالیسـتی بەریتـانی دەکا بەبێ ئەوەی وەرامی بداتەوە. هەندێ لە کردەوە خراپ و

ناهەموارەکانی بەرامبەر بەمیللەتی کوردەوە دەخاتە ڕوو. ئەوەی بێکەسی هانداوە ئەم شیعرە دابنێ ئەوە بوو لە دوای جەنگی دووەمی گێتی کوردناسی ئینگلیز سی. جەی. ئەدمۆندس وەک ڕاوێژکاری وەزارەتی ناوەوەی عیراق کارەکەی لەوێ کۆتایی هات. بەهۆی گەڕانەوەی بەیەکجاری بۆ بەریتانیا ڕووی کردە سلێمانی بۆ ماڵئاوایی کردن لە ناسیاوانی، بەم هۆیەوە بێکەس ئەم شیعرەی هۆنییەوە. بەڕاستی ئەم شیعرە پێوەندیی ڕاستەوخۆی بەکەسێتی ئەدمۆندسەوە نییە، بەڵکو مەبەسی بنچینەیی شاعیر سیاسەتی ئەمپریالیستی بەریتانیایە کە بەخراپە کەوتەوە بۆ کورد. ئەدمۆندس وەک کوردناس و ڕۆژهەڵاتناسێک چەندان وتار و باس و کتێبی لە بابەت کوردەوە بەئینگلیزی بڵاوکردۆتەوە. کتێبی «کورد و تورک و عەرەب» سەرچاوەییێکی گرنگە لە مێژووی ڕۆشنبیری کوردیدا. جگە لەمە لەگەڵ تۆفیق وەهبی بەشداری کردووە لە دانانی فەرهەنگی «کوردی – ئینگلیزی». یارمەتیی قوتابییانی کوردی داوە لە قوتابخانە و زانستگاکانی بەریتانیا، لەبەرئەوە ئەدمۆندس جێگەی دیاری هەیە لە مێژووی زانستیی کوردناسیدا.

بێکەس ئەم شیعرەی لە ساڵی ١٩٤٦ داناوە، تێیدا ئەمپریالیستی بەریتانی تاوانبار دەکا بەوەی کوردی لە نێوان ئێران و عەرەب دابەش کردووە، کەچی لە دوای دوو ساڵ، واتە لە ساڵی ١٩٤٨ بەشان و باهووی برایەتی کورد و عەرەب هەڵدەڵێ وەکو لە شیعری داهاتوودا پێش چاو دەکەوێ. شاعیر لێرەدا نەکەوتۆتە داوی هیچ جۆرە گیروگرفت و موتەناقیزاتێکەوە. لەم شیعرەدا مەبەس دەسەڵاتی بۆرجوارییەتی عەرەبە لە عیراقدا، بەڵام لە شیعری داهاتوودا مەبەس خەڵکی باشی ناو میللەتی عەرەبی عیراقە. لەو کاتەدا دروشمی برایەتی کورد و عەرەب شتێکی ڕاست بوو، ئێستاش بەجۆرێکی دیکە ڕاستە و پێویستە ئەو برایەتییە بەردەوام بێ.

٦

بێکەس لیریکی «داری ئازادی» بۆ مەبەسی برایەتی کورد و عەرەب و یەکێتیی عیراق و دژی ئەمپریالیزمی بەریتانی و مافی نەتەوەی کوردی داناوە:

داری ئازادی بەخوێن ئاو نەدرێ قەت بەر ناگرێ
سەربەخۆیی بێ فیداکاری ئەبەد سەرناگرێ
پیاو ئەبێ بۆ سەندنی حەقی لە مردن سڵ نەکا
هەر بڕووخێ بەس نییە تاکو نەسەنرێ نادرێ



کورد ئەگەرچی موددەتێکە دیل و داماوە بەڵام
باوەڕت بێ ڕووحی میللی هەر ئەمێنێ نامرێ
تۆ ئەگەر ئیسلاحی قەوم و نیشتمانی خۆت ئەوێ
لێت موحەققەق بێ بەبێ شۆڕش مەحاڵە ناکرێ
بیری ئازادی جیهانی گرتەوە توخوا بەسە
ئەم نیزامە کۆنە تاکەی هیممەتێ کەن لابرێ
قەت مەڵێن دوژمن بەهێزە تۆپ و تەییارەی هەیە
ئیتتیفاقتان گەر هەبێ زۆر زەحمەتە خۆی ڕاگرێ
ئەم عیراقە خۆشەویستە خاکی گوڵگوون بوو بەخوێن
تا حەقی دەسگیر نەبێ لەو خوێنە دەس هەڵناگرێ
نێر و مێ هەردوو بەجووتە بۆ وەتەن هەوڵێ نەدەن
دوورە دەرچوونی لە دیلی مەل بەباڵێ نافڕێ
هەوڵی ڕاستی هەردوو لا ئامانجی میللەت سەرئەخا
چونکە مەعلوومە بەیەک دەس چەپڵە قەت لێ نادرێ
وا گلۆڵەی کەوتە لێژی باوی ئیستیعمار نەما
هیچ کەسێ ئیتر بەزوڕنا و تەپڵی ئەو هەڵناپەڕێ
دۆستیی کورد و عەرەب زۆر کۆنە تەئریخ شاهیدە
ناحەزی ڕووڕەش لە داخا با یەخەی خۆی دادڕێ

لە ساڵی ١٩٤٧ حوکوومەتی عیراق و بەریتانیا کەوتنە خۆ بۆ نوێکردنەوەی پەیمانی عیراقی – بەریتانیی ساڵی ١٩٣٠. بەم هۆیەوە لە پاییزی ئەو ساڵەوە لە هەموو لایێکی عیراق و بەتایبەتی لە بەغدا خۆ پیشاندانی بێزاری دەستی پێ کرد لە دژی ئەو پەیمانە. لە ڕۆژی ٢١ی کانوونی دووەمی ١٩٤٨ ڕاپەڕینی گەل گەیشتە لووتکە و لە بەغدا پۆلیس دەسڕێژی لە نیشتمانپەروەران کرد و کوشتار کەوتە ناوەوە. میری ناچار بوو مل شۆڕ بکا بۆ ئارەزووی گەل و پاشەکشێ بکا لە بەئەنجام گەیاندنی پەیمانە تازەکە. ئەم ڕاپەڕینە بەناوی «وەسبە» (وثبة) واتە بەکوردی (ڕاپەڕین) ناوبانگی دەرکرد.

ئەم شیعرەی بێکەس بۆ ئەو ڕووداوە هۆنراوەتەوە، لە ناوەرۆکی لیریکەکە دەردەکەوێ شاعیر وەک نیشتمانپەروەرێک لەو ڕۆژگارەدا وەکو زۆربەی خوێندەوار و ڕۆشنبیری کورد

لەسەر ئەو باوەڕە بووە مافی کورد بەیەکێتی و برایەتی کورد و عەرەب دەست دەکەوێ. لە ڕووی هونەرییەوە سەرکەوتووانە وێنەی شیعری داهێناوە، یەکێتیی کورد و عەرەب بەوە دەچوێنێ مەل بەباڵێ نافڕێ و چەپڵە بەدەستێک لێ نادرێ. شاعیر لەسەر ئەو باوەڕەیە دۆستایەتی کورد و عەرەب ڕاستییێکە، با ئەمپریالیستی بەریتانی لە داخانا یەخەی خۆی دادڕێ.

### کۆمەڵایەتی

بێکەس بایەخی زۆری بەژیانی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری داوە، چونکە بەگشتی بەرهەمی شیعری لە شێوەی شیعری کلاسیکی هەندێ لای داوە و لە یەک جۆرە ناوەڕۆک دوور کەوتۆتەوە بۆ گەلێ مەبەسی دیکە.

١

بێکەس پیرۆزبایی لە خەڵکی شاری هەولێر دەکا بەهۆی دامەزراندنی «یانەی فەرمانبەران» لە ساڵی ١٩٢٨دا:

بەنووری عەدل و ئاسایش مونەووەر بوو هەموو هەولێر
لە ژێر کابووسی غەم دەرچوو خەلایق شاد و خەندانە
تولووعی فەیز بەخشی تۆ شەوی دەیجووری والا کرد
لە هەر لایێک تەماشاکەی جولووس و بەزم و سەیرانە
لە سایەی هیممەت و لوتفی پیاوانی عەدالەت خوا
وەکو فیردەوسە ئەم شارە بەدایم ڕوو لە عیمرانە
چراغی فیکری ڕووناکی لە هەر شوێنێ کە داگیرسا
شەوی تاریکی وەک ڕۆژە خەراباتی گوڵستانە
بەتەئسیس و بناغەی ئەم بینا عەرزی تەبشیری
هەموو مەئموورەکەم ئیتر نەجاتی بوو لە چاخانە
مەحەللی ئیجتیماعی وا هەتا ئێستا نەبوو لێرە
زەمانی غەدر و وەحشەت بوو تفوو لەو ڕۆژ و دەورانە
لە سایەی خواوە خورشیدی سەعادەت وا لە کەل دەرکەوت
بوخار و هەوری میحنەت ڕۆی زیایی میهری تابانە



دەوامی بانگی یاری بۆ ئەهالی فەرز و پێویستە
کە یاری و خزمەتی ئێرە لەسەر شانی هەموومانە
ئومێدم لای خودا وایە کە ئەشرافی هەموو هەولێر
لە بەرزیدا بژین تا سەر لەگەڵ ئەم قەومی کوردانە

کردنەوەی یانەی فەرمانبەران ڕووداوێکی کۆمەڵایەتی - ڕۆشنبیری گەلێک گرنگ بوو لەو سەردەمەی بێکەس لە هەولێر بوو. پێویستە دەسخۆشی لە شاعیر بکرێ بۆ ئەو پیرۆزباییەی خستوویەتییە ناو پەیکەری ئەو لیریکە ڕەنگینەوە. دامەزراندنی ئەم یانەیە کۆکردنەوەی ڕۆشنبیر و خوێندەواری هەولێر بوو. بێ گومان لەو سەردەمەدا بەزۆری خوێندەواران مووچەخۆری میری بوون. یانەی فەرمانبەران تەنیا مەڵبەندی حەسانەوە و ڕابواردن نەبوو، بەڵکو دەوری گرنگی هەبوو لە هاندانی خوێندەواری بەهۆی ڕۆژنامە و کۆوار و ئەو کتێبە کوردی و عەرەبییانەی لەو سەردەمەدا بڵاو دەکرانەوە، جگە لە کۆڕی ڕۆشنبیری و ئاڵوگۆڕی زانیاری لە بارەی زانستی و ئەدەب و هونەر و هەموو کاروبارێکی پێوەندیی بەژیانی تاکی کۆمەڵ و هیوا و ئامانجی گەلەوە هەبووبێ.

٢

بێکەس یەکێکە لەو شاعیرانەی بەتەنگ مافی ژنەوە بوون، بەتایبەتی هاندان بۆ خوێندن. لەم لایەنەوە «نەسرین»ەکەی شاعیر لە ناو خەڵکی کورددا مەقامی بەرز و بڵندی هەیە:

نەسرین دەمێکە داخت لە دڵمە
گیرۆدەی بەندی ژیانت زوڵمە
وا من پێت ئەڵێم چونکە لەسەرمە
هەستە تێکۆشە تا خوێنت گەرمە
سەرپۆش فڕێ دە چ وادەی شەرمە

***

ئەمڕۆ زەمانی عیلم و عیرفانە
عالەم شەو و ڕۆژ وا لە فرمانە
فەرقی نێر و مێ نییە بیزانە

هەستە تێکۆشە تا خوێنت گەرمە
سەرپۆش فڕێ دە چ وادەی شەرمە

***

مەڵێ من کچم تۆش وەکو منی
موحتاجی عیلم و فەنن و خوێندنی
مەجبووری ئیش و خزمەتکردنی
هەستە تێکۆشە تا خوێنت گەرمە
سەرپۆش فڕێ دە چ وادەی شەرمە

***

هێندە دانیشتی پشتت چەماوە
زەرد و لاواز بوویت هێزت نەماوە
کچی بێگانەت خۆ لە بەرچاوە
هەستە تێکۆشە تا خوێنت گەرمە
سەرپۆش فڕێ دە چ وادەی شەرمە

***

خشڵ و جوانی تۆ حەیا و فێربوونە
پاشەڕۆژیشت هەر بەوان ڕوونە
کچی بێ عیلم و دیل و زەبوونە
هەستە تێکۆشە تا خوێنت گەرمە
سەرپۆش فڕێ دە چ وادەی شەرمە

***

وەک خوشک و برا ئەبێ هەردووکمان
قۆڵێ لێ هەڵکەین بچینە مەیدان
تا کورد بەرینە ڕێزی میللەتان
هەستە تێکۆشە تا خوێنت گەرمە
سەرپۆش فڕێ دە چ وادەی شەرمە



ئەم شیعرە ئەگەر لە سەردەمی ئێستاماندا، سەرەتای سەدەی بیست و یەکەم بوترایە، ڕەنگ هەبوو پێش هەموو کەسێک نەسرینەکان بەپێکەنینێکی قەشمەری ئامێز پێشوازییان بکردایە. ئەم لیریکە نیو سەدە پێش ئێستا لە ساڵی ١٩٤٤ لە لایەن بێکەسەوە هۆنراوەتەوە. ئەو کاتە ئەگەر نەسرینەکان – ژمارەیان کەم بووبێ لە ناو کۆمەڵی کوردەواریدا – ئەم جۆرە شیعرەیان پێ خۆش بووبێ، بڕێک لە کۆنەپەرستان پێیان ناخۆش بووە، ئێستاش نموونەی ئەم چەشنە کەسانە ماوە.

## ٣

بێکەس بەگشتی دووچاری ژیانی پڕ لە بەدبەختی و ئازار و ئەشکەنجەی ڕۆژگار بووە، بەزۆری ڕەشبینی چڕنووکی لە دڵ و دەروونیدا گیر کردووە، لەگەڵ ئەوەشدا ساتی خۆشی بەخۆیەوە دیوە، ئەگەر بۆ ماوەیێکی کەمیش بێ گەشبینی ناخی دەروونی ئاوەدان کردۆتەوە. لە شیعری «ئاواتی دڵ»دا دەڵێ:

دڵ کە زۆر مەسرووورە ئەمڕۆ ئارەزووی ئیزهار ئەکا
حەز لە فینجانی شەرابی دەست و پەنجەی یار ئەکا
دڵ گەشە وەک گوڵ دەرد و ئازاری نەما
تالیبی وێسکی و شەرابە حەز لە عوود و تار ئەکا
دڵ نەجاتی بوو لە تەنگی کەوتە بەزم و ڕەزمەوە
عاشقی سەیر و سەفایە مەیلی ناو گوڵزار ئەکا
دڵ ئەوەندە مەست و کەیلە شێتە هیچ هۆشی نییە
وا لە ڕەقسایە خەریکە عالەمێ بێزار ئەکا
دڵ بەنەشئە و بەزمی میللییەت شوکر بووژایەوە
شاییە سەیرانە بەزمە پڕ بەدەم هاوار ئەکا
دڵ بەئاواتی گەیشت و لاوی کوردی دی کەوا
یەک دڵ و یەک دەم خەریکە میللەتی هوشیار ئەکا
دڵ لە کینە خالییە بێ گەردە سافە وەک بلوور
سەد تف و لەعنەت لە چارەی خائینی سەگسار ئەکا
دڵ ئەڵێ (بێکەس) هەتا کەی لافی میللییەت بەدەم
هەوڵ و تێکۆشینە تەنها قەومی کورد ڕزگار ئەکا

گەر بەڕاستی بێنە پێشێ دەس لە دەس یەک کەن هەموو
کێیە ئەوسایە حوقووقی قەومی کورد ئینکار ئەکا
یەکتریتان خۆش بووێ تا نەگبەتی بەرتان بدا
دوودڵی ئەم قەومە دیل و سووک و بەدڕەفتار ئەکا

ئەو ساتە گوشادی و دڵخۆشییەی بێکەس لەوەوە هاتووە کە دڵنیا بووە لەوەی گەنجی کورد هوشیار بۆتەوە، دەتوانێ بەشداری لە خەباتی سیاسی و ڕۆشنبیری لە کۆمەڵی کوردەواریدا بکا. ئەمە کلیلی هێنانە دی هەموو هیوا و ئامانجەکانی شاعیرە.

٤

بێکەس لە شیعرێکیدا بەئاشکرا هاوار دەکا بەسەرخۆشی نەبێ ناتوانێ ئەرکی قورسی ژیان بۆ تاوێک لە بیر بکا:

داخی قەرزاری عەرەق خستوومیە فاک و فیکەوە
گا بەدەس جەرجیس و عەبدە و گا بەدەس ئۆفیکەوە
هەرکە ڕۆژ ئاوا ئەبێ من بۆ عەرەق سمکۆڵ ئەکەم
وەک وولاغێ بێتە وەختی کا وو جۆ و ئالیکەوە
چنگ لەسەر شان بۆی ئەڕۆین خۆم و لەگەڵ چەند نەگبەتێ
بۆ پەنا ئاشێ بەمەززە و قاپی مل باریکەوە
جا بەچوار مەشقی لەسەر ئەرز دائەنیشین کۆمەڵێ
بەزمە ئێواران بەدەوری عارەقی مەستیکەوە
خۆشە سەرخۆشی ئەگەر تووشی ڕەفیقی تووش نەبێ
ڕابوێری هەر بەگۆرانی و قسەی عەنتیکەوە
عارەق و پارە لە هەردوو گەر سەر و ڕوبعم هەبێ
چیمە ئیتر من بەسەر ئەڵمان و ڕووس و چیکەوە
هەقمە گەر ئارەق بخۆم توخوا ڕەفیق لۆمەم مەکەن
زەحمەتە بێ مەی ژیانم بەم دڵەی تاریکەوە

لەم لیریکەدا بێکەس وەسفێکی فۆتۆگرافی کۆڕی عەرەقخۆران دەکا. بەتەوسەوە هەرچی ڕەوشتی خراپی مەیخواردنەوە هەیە دەداتە پاڵ خۆی، ئەم کردەوەیەی زیانی بۆ خەڵکی



دیکە نییە. لە شیعرەکەدا یادی عەرەق فرۆشانی ئەو سەردەمەی سلێمانی دەکاتەوە کە زۆربەیان لە گاورانی خەڵکی شار بوون، لەوانە ناوی هەندێکیان دێنێ وەکو جەرجیس و عەبدە و ئۆفیک.

## دژی وەعز و دەروێشیزم

بێکەس بایەخی بەلایەنی پراکتیکی دەروێشیزم داوە، ڕەخنەی لە هەندێ مەلایانی شەریعەت گرتووە. ئەم جۆرە شیعرەی بێکەس لە لای شاعیرە هەرە گەورە و داهێنەرەکانی سۆفیزمی ئەدەبی کوردیش بەرچاو دەکەوێ.

لە لیریکێکیدا بێکەس دەڵێ:

لای مەلا وایە کە جەننەت تەکیە وو لاتخانەیە
جێی مورید و شێخ و سۆفی مەلجەئی دێوانەیە
غەیری ئەم قیسمانە باقی کافری بتخانەیە
موختەریع عالم مونەووەر پەشمە لای ئەفسانەیە

***

شێخ ئەگەر سەد کەس بەخەنجەر لەت بکا بەئسی نییە
گان بکا تاڵان بکا کوشتار بکا ترسی نییە
چونکە ئەولادی ڕەسووڵە قەتعییەن پرسی نییە
خائین و بێ دین لەکن ئەو عاشقی پەیمانەیە

***

مامە سۆفی وای تەمایە هەر بەڕیشی پانەوە
قەسری بۆ حازر کرا بێ پڕ بەحۆری جوانەوە
ئەو ئەڵێ جەننەت بەڕیشە چی بەسەر عیرفانەوە
سەد سەلاحەددین و دارا قیمەتی یەک ئانەیە

***

گەر بەهەشت هەر بێتە جێگەی جاهیل و شێت و کەران
دۆزەخیش مەخسووسی پیاوی فازیل و ساحێب نیشان

خوایە بمخەیتە جەهەننەم نەچمە ڕێزی وەحشییان
جەننەتی چی بێت و وا بێ عەینی تیمارخانەیە

***

چاوەکەم بەخوا خەیاڵتان خاوە چاکی تێبگەن
خوا یەکێکی خۆش ئەوێ دانا بێ ساحێب فیکر و فەن
ئیستیفادەی بۆ بەشەر بێ خادیمی مولک و وەتەن
هایوهوویی بێ سەمەر هەر کردەوەی شەیتانەیە

ئەستووری بیروڕای بێکەس لەم شیعرەدا ئەوەیە ئایین لەگەڵ ژیانی سەر ڕووی زەوی بگونجێنێ، ئۆباڵی دواکەوتوویی دەخاتە ئەستۆی کۆلکە مەلا و وشکەسۆفییان، ئەوانەی هەوڵ دەدەن زانستیی ئایین و بیری دەروێشیزم لە زانستییەکانی پراکتیکی جیا بکەنەوە، کەچی ڕاستییەکە ئەوەیە زانستیی پراکتیکی کەڵکی زۆرە بۆ چاککردنی باری ژیانی ئادەمزاد.

## هەستی دەروونیی ڕۆمانتیکییانە

جێ پەنجەی بێکەس لە ئەدەبی کوردیدا لە بابەت ڕێبازی ڕۆمانتیکی ئەوروپاییانە ئاشکرا و دیارە. هەندێ جار بەدەسکارییەوە ئیلهام لە شیعری شاعیرانی ئەوروپا وەردەگرێ و بەزمانی کوردی لە قاڵبی دەدا.

١

بێکەس لە لیریکێکی شاعیری ئینگلیز ئی - ویلکۆکس بەناوی «گوڕران» ئیلهامی وەرگرتووە و ئەم شیعرەی داناوە:

گۆڕاوم وێنەی جاران نەماوم          بینایی چاوم
عەشقت لە دڵما دامردۆتەوە          بێ تین و تاوم
دیسان هەر مەستی بادەی پێشینم          گیانی شیرینم
چەپگەرد ناتوانێ لە دڵمی دەرکا          یادی دێرینم
بەڵام خولیاکەی پێشووم نەماوە          هیوام بڕاوە
ژینم هەر وەکو درەختی بێ بەر          ووشک و بێ ئاوە



چبکەم داخەکەم ئەو خولیایەی زوو          لەسەرم دەرچوو
وێڵم بەدوویا نایدۆزمەوە          ڕۆیی لێم وون بوو
گیانە پێم بڵێ بۆچ وا ئەڕوانی          گۆیا نازانی
دڵیش ئەگۆڕێ وەک خۆی نامێنێ          تاسەی جارانی
تۆ نەختێ سەرنج بدەرە دنیا          هەرچی کەوا تیا
باڵدار و گوڵ و ئەستێرە و دەریا          درەخت و چیا
ئەمرێ ئەوەرێ کز و ووشک ئەبێ          لە گۆڕی جیا جیا
نازار تۆش سەیری ئاوێنە بکەی          ئەوسا تێئەگەی
خۆشت ئەگۆڕێی هەروا نامێنی          هەتاکو سبەی
منیش ئارەزووی ئەوسام نەماوە          عەشقم گۆڕاوە
دڵم هەر وەکو گوڵی بێ باران          سیس و ژاکاوە

بەئاشکرا دیارە گیانی ڕۆمانتیکی شیعری ئەوروپایی لەم لیریکەدا دەجووڵێتەوە. هەندێ وێنە و مانا شاعیر خۆی دروستی کردووە. داهێنانی گەورەی بێکەس لەوەدایە زمانی شیعری و داڕشتنی کێش و قافیە و هەڵبژاردنی موستەزاد بۆ بەرهەمەکە وەستایەتی و هوشیاری و شارەزایی شاعیر دەخاتە ڕوو.

شیعرەکە جۆرە موستەزادێکە. لە ڕووی کێشەوە نیوە دێڕە درێژەکان (-) لەسەر کێشی میللیی خۆماڵی دە کەرتین، وەستانیان لە ناوەڕاست دایە (٥ + ٥). نیوە دێڕە کورتەکان (-) لەسەر بنچینەی پێنج کەرتی (نیوەی نیوە دێڕە گەورەکان) دامەزراون. قافیەش لەسەر بنچینەی چوارین دامەزراوە، دوو نیوە دێڕی درێژ (-) و دوو نیوە دێڕی کورت (ــــ). هەرچی دەنگی قافیەشە وەکو چوارینی ئاساییە (ا ا ب ا) واتە (ا درێژ/ ا کورت/ ب درێژ/ ا کورت).

٢

لە لیریکێکی دیکەیدا بێکەس هەست و خەیاڵ و چێژ و بینینی ئەوروپاییان تێکەڵ بەهەستی ڕۆژهەڵاتی دەکا، بەشێوەیێک لەگەڵ یەکتریدا دەیانگونجێنێ خوێنەر وا هەست دەکا بەرهەمە کوردییەکە لە ئەوروپاییان وەرگیراوە:

ئەی مانگ من و تۆ هەردوو هاودەردین
هەردوو گرفتار یەک ئاهی سەردین

تۆ وێڵ و ڕەنگ زەرد بەئاسمانەوە
منیش دەربەدەر بەشارانەوە
دەخیلتم ئەی مانگ قیبلەی دڵداران
دەرمانی دەردی دڵەی بیماران
شەوێکە و ئەمشەو بگەرە فریام
بێ یار و هاودەم عاجز و تەنیام
دڵزار و بێزار پەست و غەمگینم
گیرۆدەی داوی یاری شیرینم
دڵبەندی عەشقی ئەو بەڵەک چاوەم
شێت و شەیدای ئەو ئەگریجە خاوەم
لەوساوە ئەوم کەوتۆتە خەیاڵ
گریانە پیشەم بوومە کۆی زوغاڵ
ئەی مانگ تۆ شوعلەی عەشقی پیرۆزی
تۆ نەشئە بەخشی دڵی بەسۆزی
من سوێندت ئەدەم بەعەشق و جوانی
بەنەسیمەکەی بەری بەیانی
بەسەرهاتی خۆت بۆ من بەیان کە
دەردی گرانم نەختێ ئاسان کە
دووچاری چی بووی وا پەشێواوی!
لەبەرچی پەست و مات و داماوی
پێم بڵێ تۆخوا چەن جوانت دی
چەن جووتە یاری دەس لە ملانت دی
چەن کۆڕی بەزمی عاشقانت دی
چەن تەخت و بەخت و خانومانت دی
چەن قارەمان و چەن سوڵتانت دی
چەن قەوم و میللەت چەن شارانت دی



چەن شەڕوشۆڕی بێ ئامانت دی
چەن بۆردومانی کوردستانت دی
چەن کفنی ئاڵی شەهیدانت دی
چەن بێکەسانی پەرێشانت دی
چەن دەربەدەر و ماڵوێرانت دی
چەن چاوی سووری پڕ گریانت دی
ئەی مانگ ئەوەندە سەیری دونیات کرد
سەیری نیفاق و زوڵم و ڕیات کرد
بۆیە بەم ڕەنگە کاری لێ کردی
ڕەنگ و شوعووری بەجارێ بردی

ئەم شیعرەی بێکەس دەبووە نموونەی شیعری بەرزی ڕۆمانتیکی ئەوروپایی ئەگەر باسی کورد و کوردستانی تێدا نەبووایە، لەبەرئەوە کوردییە و ئەوروپایی نییە. هەرچەندە شاعیر کەوتبێتە ژێر کاریگەری شیعری ئەوروپایی و تارمایی ڕۆمانتیکی ئەوێی تێدا بەدی بکرێ، لە لایێکی دیکەوە بێکەس ئاسۆیێکی کوردستانی داوەتێ و بووە بەبەرهەمێکی داهێنراوی جوانی شیعری ئەدەبی کوردی ناوەڕاستی سەدەی بیستەم.

### ٣

لە لایێکی دیکەوە بێکەس ئەم هەستە ڕۆمانتیکییە تەرکیبییە دەگۆڕێ بەهەستی میللی ناوچەیی، بەشێوازێکی سادە وەسفی سەیرانی بەهارێکی لای خۆمان دەکا:

چ خۆشە دەستەیێک دڵسۆز و یاران
ڕەفیقی یەکتری بێ عەرزکاران
بەتاقم پێکەوە فەسڵی بەهاران
بچینە بەزم و ڕەزم و کەیف و سەیران
لەسەر ئاوێ بەکۆمەڵ دابنیشین
بەنەشئەی بەستەوە بادە بنۆشین
بە یاری و پێکەنین و شەوق سوحبەت
بەسەیری مەنزەرە و سیحری تەبیعەت

بەزیکری سانیع و تەقدیسی خیلقەت
لە دڵ دەرکەین بوخاری دەرد و میحنەت
لە گوڵزار بەئاهەنگ دابنیشین
بەرامبەر دەشت و شاخی سەوز و ڕەنگین
لە بیرت غائیلەی دونیا بەدەر کە
لە باسی نیک و بەد توخوا گوزەر کە
بەسێتی چاوەکەم (بێکەس) حەزەر کە
لە خوار و ژووری خۆ ساتێ نەزەر کە
زەمینە پڕ گوڵ و ڕەیحان و نەسرین
سەمایە قوببەییێکی شین و نەخشین
ئەگەر تۆ خاوەنی ئیدراک و هۆشی
لە مازی و پاشەڕۆژ چاوت ئەپۆشی
سەعادەت لەحزەییێکە تۆ بەخۆشی
لە سەحرا ڕابوێری و مەی بنۆشی
دەساقی تێکە توخوا تاکو ئەمرین
مەعیشەت تەوقە بۆ ئینسانی غەمگین

ئەم شیعرە لەسەر بەحری عەرووزی هەزەج دانراوە، بێکەس هەوایێکی شیعری میللی و خۆماڵییانەی داوەتە بەرهەمەکە، هۆی ئەمە نزیکی تەفعیلەکانی بەحری هەزەجە لە کێشی یازدە بڕگەیی خۆماڵی. لیریکەکە لەسەر بنچینەی بەندی شەش نیوە دێڕ شیعری دامەزراوە، قافیەیەی (ا ا ا ا م م، ب ب ب ب م م...)ە. شاعیر لەم لیریکەدا وێنەییێکی ڕابواردنی لاو و هەرزەی کورد دەخاتە ڕوو، ئەدگاری ناوچەیی لە سروشت و ڕەوشت لە بەرهەمەکەدا بەدی دەکرێ.



## ٤

لیریکێکی دیکەی بێکەس بەپێچەوانەی شیعرەکەی پێشووە، بەهار و سەیران بەچاویلکەی ڕەشبینی دەبینێ:

بەهار نامەوێ جوانیت ببینم
ئەمڕۆ من بەدڵ پەست و غەمگینم
دوورم لە خۆشی خەریکی شینم
زار و بێزارم تاریکە ژینم
دوژمنی لالە و گوڵ و نەسرینم
بەهار نامەوێ جوانیت ببینم
بەهار بولبولت با هەر بخوێنێ
گوڵیش لە دەشتا با خۆی بنوێنێ
کانیت ئاوی ڕوون با هەڵقوڵێنێ
گژوگیات هەوا با بیشەکێنێ
ئەمانە دڵی من نابزوێنێ
بەهار نامەوێ جوانیت ببینم
بەهار و دەشت و ئاسمانی شینی
بولبول و قومری و گوڵ و نەسرینی
نەشئەی دیمەنی جوان و شیرینی
پەشمە لای کەسێ سەراپا ژینی
پڕ بێ لە دیلی و دەرد و غەمگینی
بەهار نامەوێ جوانیت ببینم

ئەم شیعرە لەسەر بەندی شەش نیوە دێڕ شیعری دامەزراوە، هەر بەندی لەسەر قافیەییێکە، نیوە دێڕی شەشەمین جیاوازە و لە هەموو بەندەکاندا دووبارە دەبێتەوە (ا ا ا ا ا م، ب ب ب ب ب م...).

شاعیر دان بەجوانی بەهار دێنێ، دیمەن و بزووتنەوەی ڕەنگینی مایەی بەختیاریی ئادەمزادە بەڵام بۆ کەسێکی وەکو بێکەس دیل و دەردەدار و غەمگین جوانی هەموو شتێک وەردەگەڕێتە سەر ناشیرینی.

## پێشوازی نەخوێندەواری

بێکەس لە نێوان هەردوو جەنگی یەکەم و دووەمی گێتیی سەدەی بیستەمدا ژیاوە، ئاگاداری کارەساتی جەنگەکان بووە. لە شیعرێکیدا بەتەوسەوە خراپەی زانستی دەخاتە بەرچاو، بەوەی بووە بەهۆی ئازار و ئەشکەنجە بۆ خۆی یا بۆ خەڵکی دیکە. ئەم شیعرە لە لیریکە بەناوبانگەکانی شاعیرە:

تووشی لافاوی عیلم بووم و بەڵام زوو دەرپەڕیم
سواری پاپۆڕی جەهل بووم و بەناویا تێپەڕیم
سەد شوکور ئۆخخەی نەجاتم بوو لە باسی عیلم و فەن
نامگرن جارێکی تر بۆیە لە کەیفا هەڵپەڕیم
گەرچی تا ئێستا ووتوومە تێبگەن زوو پێبگەن
بەو قسانەم قەتعییەن باوەڕ مەکەن سەگ بووم وەڕیم
خوێندەواری شێتییە هەر جەهلە ئینسان سەرئەخا
گەر لە مەولا ناوی عیلمم برد بزانن سەرسەریم
هێندە تەعقیبی هەقم کرد تاکو نانی خۆم بڕی
سووک و ریسوا بووم لە ناوا گیرەوەی ئاخر شەڕیم
من کە زانیم حاڵی زانا نەفیە حەپسە یا شەقە
هەر کتابێکم هەبوو دوێنێ لە داخانا دڕیم
پیاوی دانا عەقڵی دا نازانی بۆی ناچێتە سەر
بەرگی نادانی لەبەر کرد بوو بەخاوەن زێڕ و سیم
شەرتە کەر بم بارە گوێزم لێ بنێن خڕڕەی نەیێ
با دەمێ زۆر و کەمێ وەک بێ غەمێ بۆ خۆم بژیم

ئەم شیعرە زادەی ئەو ڕووداوەیە بێکەس لە کۆبوونەوە و ئاهەنگێکی «کۆمەڵەی زانستی» لە سلێمانی شیعرێک دەخوێنێتەوە بەشان و باهووی زانستییەوە هەڵدەڵێ. لە دواییدا لەسەر ئەم شیعرە دەگیرێ و دەخرێتە بەندیخانەوە و تووشی ئەشکەنجە و ئازار دەبێ. لە پاش ئازادبوونی ئەم شیعرە دادەنێ. گەلێ وێنەی بەرز و کرداری میللی لە شیعرەکەدا دەبینرێ. وەستایانە شاعیر توانیویەتی هەناسەیێکی کاریکاتێرییانە بداتە



لیریکەکە، بەوەی «زانستی» لە بەرچاوی ئادەمزاد نەکەوێ، چونکە بەبێ زانستی و گۆڕان و پەرەسەندنی کۆمەڵی مرۆڤایەتی لەناودەچێ.

## سروود بۆ قوتابیان

دیوانی بێکەس نزیکەی بیست پارچە شیعر دەور دەکاتەوە. ئەمانە وەک سروود و گۆرانی بۆ قوتابیانی قوتابخانەکانی سەرەتایی ڕێکخراون، جگە لەم مەبەسە هەندێکی دیکەیان بەگشتی بۆ منداڵ دانراون، مەرج نییە ئاوازی تایبەتییان هەبێ وەک ئەوانەی بەسروود دەژمێررێن و قوتابییان بەکۆمەڵ لە قوتابخانەکان بەئاوازی جیا جیا دەیانچڕن.

یەکێ لە شیعرە جوانەکانی بێکەس ئەو دیالۆجەیە لە نێوان دوو کەس، یەکەمیان هەر کەسێک بێ مامۆستا یا دایک و باوکی کەسەکە؛ دووەمیان قوتابی یا هەر منداڵێک بێ، بەناوی «تۆ چیت؟ من کوردم!» هۆنیویەتییەوە:

تۆ چیت من کوردم　　نەتەوەی کوردم
خۆ ترسنۆک نیت　　حاشا نەبەردم
چی تۆی لەناوبرد　　دوودڵی و نیفاق
چۆن ڕزگار ئەبی　　هەر بەئیتتیفاق
بلێ چیت ئەوێ　　بەرزی وەتەنم
بەخۆڕایی نا　　بەگیان و تەنم
چیت لە بارایە　　خۆ فیداکردن
بۆچی لە ڕێگای　　میللەتا مردن
کوا چەکت چییە　　سەودای وولاتم
ئەی پشتیوانت　　عەزم و سەباتم
ڕاستت پێ بلێم　　فەرموو گوێم لێتە
بەقسەم ئەکەی　　سەرم لە ڕێتە
بەڕاستی و پاکی　　هەوڵ و تێکۆشین
لە بوغز و کینە و　　درۆ و چاوپۆشین
ئەمانەت نەبێ　　کارت زۆر لەقە
بەشت هەمیشە　　نەگبەتی و شەقە

بێکەس ئەم شیعرەی لە ساڵی **١٩٣٥** لە هەڵەبجە نووسیوەتەوە، لەسەر کێشی سیلابی خۆماڵی دە بڕگەیی، لە ڕووی قافیەوە جووت قافیەیە (مەسنەوی). لە پاشانا شاعیر هەر نیوە دێڕێکی ئەم شیعرە دە بڕگەییەی کردووە بەدوو بەشەوە، یەکەمیان پێنج بڕگە بریتییە لە پرسیار، دووەمیان پێنج بڕگەکەی دیکە بریتییە لە وەرامی قوتابی یا منداڵەکە.

شاعیر لە ڕووی ڕوخسارەوە داهێنانی دەست خستووە لەم شیعرەدا بەوەی نیوەی دێڕی دە بڕگەیی کردووە بەدێڕی تەواو، لە پاشانا ئەمەی کورت کردووە و کردوویەتی بەدێڕە شیعری دە کەرتی، بەم جۆرە هەر نیوە دێڕێ دەبێ بەپێنج بڕگە. لە ڕووی ناوەرۆکیشەوە شیعرەکە بەگیانی کوردایەتی ئاو دراوە.

***

فایەق بێکەس کەم ژیا لەبەرئەوە بەرهەمی ئەدەبی زۆر نەبوو، کەچی لە ڕووی هونەرییەوە لەو پلە بەرزەدا بوو کە شیعری کوردی گەیشتبوویە. بێکەس یەکێکە لە شاعیرە دیار و گەورەکانی قۆناغی گواستەوە لە کۆنەوە بۆ نوێ. لە تازەکردنەوەی شیعری عەرووزی دەستێکی باڵای هەبوو، لە چەسپاندنی شیعری نوێ لەسەر بنچینەی کێشی خۆماڵی و ڕەنگاوڕەنگی قافیە بێ وێنە بوو.

شیعری بێکەس هەموو لایەنێکی ژیانی کوردەواری گرتبووەوە، ڕەنگدانەوەی هەست و نەستی هەموو توێژەکانی کۆمەڵ بوو، وێنەگری بیری کوردایەتی بوو، ئاوێنە و هیوا و ئامانجی مرۆڤایەتی بوو. ژیانی بێکەسی چەوساوە و هەژار ڕەنگڕێژی ژیانی پڕ لە ناسۆر و ستەم دیدەی میللەتی کورد بوو لە هەموو دەور و زەمانێکدا.

(دون گیجه بز نیر ده قالدق) پێت دەڵێن دەست پێ ئەکەیت
جا لە بەحری ووشکی فیکرت دەست ئەکەیتە پێ مەلە

***

قورِ بەسەر مەجنوون چ هەتکێکت بەلەیلا کردووە
قورِ بەسەر لەیلا کە قەیست سووک و ڕیسوا کردووە
قورِ بەسەر من تاکو ئێستا شاعیریت وا کردووە
تا (فضولی سویلیور کانی نەدر شو مهزلە)

***

(سن دخی آغا بزی بیر بویلە مدح ایت شاعری)
تۆ لە کوێ ئینشا لە کوێ هەی کۆنە سۆفی قادری
کۆنە دەروێشی ئەزانم تەقلەبازی ماعیری
(شمدیلک بستر افندم یوقسە چوق قالمش هەلە)

ئەوەی پێویستی بەڕوونکردنەوە هەبێ لەم شیعرەدا ئەوەیە: ئەنفیە بەمانای بڕنووتی هاتووە، هەرتەل ناوی گوندێکە لە ناوچەی ڕانیە داروبار و دارستانی زۆرە. شابازە شەل ناوی پاشملەی مەلا شابازی حەیدەری هەولێرییە ماوەیێک قازی بووە. دەرگەلە ناوی ئاواییە. جەبار ئاغای کانی ماوەییێک لە ڕواندز مووچەخۆر بووە لە پاشانا گواستراوەتەوە هەولێر. (آغا گلدی...) ڕستەیێکی تورکییە بەمانای «ئاغا هاتەوە عەیشۆکی بانگ کەن با هەلهەلە لێ بدا). ئەم عەیشێیە لە پێشانا کارەکەر بووە لە دواییدا بوو بەخێزانی ماڵ.

لە شیعرەکەدا هاتووە کانی لە دوای نوێژی عیشا چیرۆکی «لەیلا و مەجنوون»ی فوزوولی دەخاتە بن هەنگڵی و ڕوو دەکاتە مەجلیسی پاشا. مەبەسی لە پاشا عەلی پاشای دۆغرەمەچییە، ماڵیان لە قەڵا بوو، بەبیروباوەڕ خۆی بەتورک دەزانی، بەشەو دیوەخانی هەبوو، جاروبار کانی وەکو خزمێکی دەبووە میوانی دیوەخانی و بەتورکی شیعری «لەیلا و مەجنوون»ی فوزوولی بۆ دەخوێندنەوە. (ایشد جانم) ڕستەیێکی تورکییە بەمانای «گیانی من گوێ بگرن». هەروەها ڕستەی (دون گیجە بز نیر دە قالدق) مانای «دوێنێ شەو گەیشتینە کوێ لە گێڕانەوە». لە ڕستە تورکییەکانی دیکەی ئەم شیعرە (فضولی سویلیور کانی نەدر شو مهزلە) واتە «فوزوولی دەڵێ کانی ئەم گاڵتەبازارییە چییە!». ڕستە تورکییەکەی دیکە (سن دخی آغا بزی بیر بویلە مدح ایت شاعیری) واتە



«ئاغا تۆش وەکو ئەمە ستایشێکی شاعیرانەمان بکە». دوا ڕستەی تورکی لە شیعرەکەدا (شمدیلک بستر افندم یوقسە چوق قالمش هەلە) واتە «ئەفەندم جارێ تا ئێرە بەسە، ئەگینا هێشتا زۆری ماوە».

ئەم شیعرە بەهۆی شارەزایی هەردوو شاعیر دڵدار و جاهید بووە بەپارچەیێکی داهێنراو و ئەو ڕستە شیعرییانەی ناواخنی شیعرە کوردییەکە کراون چێژێکی دیکەی جوانکارییان داوەتە شیعرەکە، بەتایبەتی بۆ ئەو کوردەی زمانی تورکیش بزانێ.

## پەخشانی دڵدار

دڵدار کۆمەڵێک نووسینی ئەدەبی و کۆمەڵایەتی لە پاش بەجێماوە، ڕەنگە لەو سەردەمەدا دەرچوونی کۆواری «گەلاوێژ» هاندەرێکی بەهێز بووبێ بۆ ئەو نووسینانە، هەر لەبەرئەوەشە هەموو نووسینی لەسەر لاپەڕەکانی ئەو کۆوارەدا بڵاوکراوەتەوە. ئەوەی بڵاو نەکرابێتەوە و ئێمە ئاگادارییان بەسەرا هەبێ ئەو وتارەیەتی کە لە بابەت زمانی کوردی و ئەدەبیاتی کوردییەوە نووسراوەتەوە. ئەمە هەوڵ و تەقەلاییێکە بۆ خستنە ڕووی ئەو بیروڕایە کلاسیکییانەی لە بابەت زمان و ئەدەبەوە کە بریتین لە تەعریفێکی ئەکادیمی بۆ ئەدەب، وە ئەدەب وەکو لقێک لە هونەر و پێوەندیی بەلقەکانی تری وەکو مۆسیقا و وێنە و نیگارکێشان و پەیکەرتاشی.

بەڵام وتارە بڵاوکراوەکانی بریتین لە:

١- نامەیێک

ئەمە نامەیێکی کۆمەڵایەتی و پەند و ئامۆژگارییە بۆ نەسرین، نەسرین ڕەمزی کچە کوردی تازە نەونەمامی پێگەیشتووە، دڵدار دەیەوێ ئەمە بەڕاستی ببێتە دایکێکی ڕاستەقینەی دوارۆژ.

٢- عومەر خەیام

ئەمە وتارێکە بەهۆی بڵاوکردنەوەی هەندێ لە چوارینەکانی خەیام کە شێخ سەلام گۆڕیبوویە سەر کوردی و لەسەر لاپەڕەکانی گەلاوێژدا بەزنجیرە بڵاوی دەکردەوە، لەم وتارەدا دڵدار لەسەر خەیام دەکاتەوە و گفتوگۆ لەگەڵ هەموو ئەو کەسانە دەکا کە لە دژی خەیامیان نووسیوە و بەرپەرچی قسەکانیان دەکاتەوە.

٣- ناگزووری گەلایەتیمان

وتارێکی کۆمەڵایەتییە، وەکو دەردەکەوێ و دڵدار خۆشی دانی پێ دادەنێ، مەبەسی دەربڕینی بیروباوەڕ بووە نەوەکو شێواز و شێوەی داڕشتن و نووسینی کوردیی پەتی.

٤- نیشتمانپەروەری ڕاست

وێنەییێکی ڕۆمانتیکییە بۆ پیشاندانی گیانی ڕاستەقینەی نیشتمانپەروەری، لە پارچەییێکی نووسینەکەیدا، دەڵێ: (موهەندیسێکی نیشتمانپەروەر پێویستە کە ئیبتیکار لە فەننی ئەو کارە بکاتەوە کە پێی دەسپێرێ بۆ ئەوەی نا کە قازانجی لێ بکات، بەڵکو بۆ ئەوەی چونکە کوردە. هەروەها شاعیرێکی کورد، کاتبێکی کورد پێویستە کە ئیبتیکار لە شیعر و نووسینیان بکەن بۆ ئەوەی نا کە ناوبانگ وەربگرن، بەڵکو بۆ ئەوەی کە ئەدەبی کورد لە پێش چاوی بێگانەدا بەرزی کەنەوە و بێگانە باوەڕ و ئیمانێک بێنێ کە کورد لە ئەدەبیاتدا پێشکەوتوون).

٥- موزەککەراتی یوونس ڕەئووف دڵدار

ئەم یادداشتە لە دەفتەرێکی گەورەی قەوارە فولسکاب نووسراوەتەوە (٤٢) لاپەڕەی دەفتەرەکەی داگیر کردووە. شاعیر باس لە ژیانی خۆی و مێژووی بنەماڵەی خادیمولسەججادە دەکا لە سەرەتاوە تا ساڵی ١٩٣٦. تا ئێستاکە ئەم یادداشتە بڵاو نەکراوەتەوە.

بێ گومان یادداشتی دڵدار کارێکی بەکەڵکە نەوەکو لە ڕووی زمان و شێوازەوە، بەڵکو لە ڕووی ڕووداویشەوە، بەڵام ڕەنگە بەبێ دەستکاری و لێ لادان و سڕینەوە و بژارکردن و چاککردنەوە ڕۆژێ لە ڕۆژان ڕووناکی نەبینێ.

ئێمە لەم ماوەیەدا هەندێ تێبینی لە بابەت یادداشتەکەوە تۆمار دەکەین:

(١) دڵدار لە دەوری منداڵی ئەگەر شانازی بەوەوە کردبێ کە لە نەوەی عوسمانی کوڕی عەففانە چونکە خادیمولسەججادە لە نەوەی ئەون و بەم پێیە دەبێ عەرەبیش بێ، بەڵام لە دواییدا بیروباوەڕی پێچەوانەی ئەمە بووە.

(٢) بەربەرەکانێی چاوچنۆکی دەرەبەگ و جادووگەری دەروێشی لە سەرانسەری یادداشتەکەی ئاشکرایە.



(٣) لاپەڕەییێکی گەشی خەباتی قوتابییان لە پێناوی کوردایەتی لە قوتابخانەی ناوەندیی هەولێر لە ساڵانی ١٩٣٥ - ١٩٣٦ ڕوون دەکاتەوە.

٦- «الطلاسم»ی ئیلیا ئەبوو مازی

دڵدار (١٨) بەندی لە شیعرە بەناوبانگەکەی ئیلیا ئەبوو مازی (الطلاسم) بەپەخشان گۆڕیوەتە سەر زمانی کوردی، بەڵام بێ تام و بۆیە و هەر لە ئوسلووبی دڵدار ناکا و تا ئێستاش بڵاو نەکراوەتەوە.

هەروەها دڵدار وردە وتار و گۆڕینی شیعر و وەرامدانەوەی ڕەخنە و شتی تریشی هەیە هەر لە «گەلاوێژ»دا بڵاوکراونەتەوە.

جگە لەم نووسینە کوردییانە دڵدار دوو نامەی تریشی هەیە بەزمانی عەرەبی. یەکەمیان بەناوی: (في طريقي الى معرفة الحقائق، انتقادات الى قلب البهائيين) ئەمە باسێکی ئایینی لاهووتییە وەرامی فەلسەفەی بەهائییەکانە کە سەردەمێک شاعیر خۆی بەم باسەوە خەریک کردبوو. دووەمیان بەناوی: (اقتصادنا الوطني) باسێکی ئابوورییە لە تووتن دەدوێ. ئەم دوو نامەیە هەردووکیان لە ڕووی ناوەرۆکەوە ئەگەر لە سەردەمی خۆیاندا بڵاو بکرانایەوە بێ گومان کەڵکیان دەبوو، بەڵام بۆ سەردەمی ئێستا بەم شێوەیە دەست نادەن وەکو هەموو بڵاوکراوەییێکی ئەو کاتە و لەو باسانەدا بۆ ئێستا دەبێ بەچاوی ڕۆژگاری خۆی تەماشا بکرێن. بەڵام لە ڕووی ڕوخسارەوە دیسانەوە دەبێ دەستکاری و بژارێکی باش بکرێن.

دڵدار و دوو جوانەمەرگەکەی تر، وەزیری نادری و مارف بەرزنجی ئەگەرچی لە ئەدەبی کوردیدا لاپەڕەی پیرۆز و پڕشنگداریان داگیر کردووە ئەگەر بە نەونەمامی هەڵنەوەری نایە ئەو لاپەڕانە بەقەوارە فراوانتر و بەڕوخسار جوانتر دەبوون.

***

یوونسی مەلا ڕەئووفی (دڵدار) شاعیرێکی نوێخواز بوو، لە پێشانا قوتابخانەی شیعری نالی دەور کردەوە، ئینجا بەقۆناغەکانی ڕێبازی نوێکردنەوەی شیعری کوردی تێپەڕی. لە شیعری کلاسیکی بەحری عەرووزیدا شارەزا بوو، لە کێشی سیلابی خۆماڵی سەرکەوتوو بوو. تاقیکردنەوەی لاسایی شیعری عوسمانی هەبوو کە قۆناغێکی پێویست بوو لە کوردستانی باشوور لە نێوان ڕێبازی کلاسیکی کۆن و ڕێبازی ڕۆمانتیکی تازە.

بەرهەمی شیعری جوانی هەبوو لە هەموو ئەم ڕێبازانەدا، لە هەموویان گرنگتر بەشداریکردنی بەهێز بوو لە نوێکردنەوەی شیعری کوردی لە دوای جەنگی یەکەمی گێتی لە سەدەی بیستەمدا. دڵدار خەباتی دەکرد لە پێناوی ئەوەی گێتیی کۆن تازە بکاتەوە، لە یەکەمین هەنگاویدا بوو بەڵام مەرگ ماوەی نەدا.



## لیستی ناوی کەسان

## لیستی ناوی جوگرافی

## ڕ



## ز



## س







## ش



## ع



## غ



## ف



## ڤ



## ق



## ک

## گ



## ل



## م



## ن







## و



## هـ



## ی

## بیبلیۆگرافیا

ئەو سەرچاوانەی ناویان لە بەرگەکانی پێشوودا بڵاوکراونەتەوە بۆ ئەم بەرگەش کەڵکیان بووە. لێرەدا بەپێی توانا هەوڵ دەدرێ ناوی ئەوانە بڵاو نەکرێتەوە کە لە بەرگەکانی دیکەدا بڵاوکراوەتەوە. دیارە بەهەمموو جۆرێک لە پاشانا ناوی سەرچاوەی هەموو بەرگەکان لێک دەدرێن و دەبن بەسەرچاوە و بیبلیۆگرافیای سەرجەمی «مێژووی ئەدەبی کوردی» بەهەموو بەرگەکانییەوە.


- ئاغا ئۆغلوو ئەحمەد، لە وڵاتی ئادەمزادە سەربەستەکاندا، وەرگێڕانی لە زمانی تورکییەوە عەبدولواحید نووری، **١٩٣٩**.
- بەرهەمی کۆکراوەی عەبدولواحید نووری، ئامادەکردن و کۆکردنەوەی مەحموود تۆفیق خەزنەدار، بەغدا، **١٩٩١**.
- پیرەمێرد، دوازدە سوارەی مەریوان، سلێمانی، **١٩٣١**.
- پیرەمێرد، مەحموود ئاغای شێوەکەل، سلێمانی، **١٩٣٢**.
- پیرەمێرد، مەم و زین، سلێمانی، **١٩٣٥**.
- پیرەمێرد، دیوانی مەولەوی (ئەسڵ و ڕووح)، سلێمانی، بەرگی یەکەم **١٩٣٥**؛ بەرگی دووەم **١٩٤٠**.
- پیرەمێرد، ئاوە ڕەشەی ڕووسی سوور، سلێمانی، **١٩٤٠**.
- پیرەمێردی نەمر، ئامادەکردنی محەمەد ڕەسووڵ هاوار، بەغدا، **١٩٧٠**.
- پیرەمێرد و پێداچوونەوەیێکی نوێ بەژیان و بەرهەمەکانی، ئامادەکردنی ئومێد ئاشنا، بەرگی یەکەم و دووەم، هەولێر، **٢٠٠١**.
- حوسێن حوزنی موکریانی، غونچەی بەهارستان، حەڵەب، **١٩٢٥**.
- حوسێن حوزنی موکریانی، ئاوڕێکی پاشەوە، بەرگی یەکەم **١٩٢٥**؛ بەرگی دووەم **١٩٣٠**؛ بەرگی سێیەم **١٩٣١**.
- حوسێن حوزنی موکریانی، تاریخی حوکمدارانی بابان، ڕواندز، **١٩٣١**.
- حوسێن حوزنی موکریانی، مێژووی ناودارانی کورد، ڕواندز، **١٩٣١**.
- حوسێن حوزنی موکریانی، وێنەگری و کۆڵین، ڕواندز، **١٩٣٤**.





- حوسێن حوزنی موکریانی، کورد و نادر شا، ڕواندز، **١٩٣٤**.
- حوسێن حوزنی موکریانی، کوردی زەند، ڕواندز، **١٩٣٤**.
- حوسێن حوزنی موکریانی، مێژووی میرانی سۆران، ڕواندز، **١٩٣٥**.
- حوسێن حوزنی موکریانی، کوردستانی موکریان (ئاترۆپاتین)، ڕواندز، **١٩٣٨**.
- حوسێن عارف، چیرۆکی هونەری کوردی (١٩٢٥ - ١٩٦٠)، بەغدا، **١٩٧٧**.
- دیاریی مەلا محەمەدی کۆیە، بەکۆششی گیوی موکریانی، هەولێر، **١٩٦٩**.
- دیوانی ئەحمەد موختار جاف، بەکۆششی عەلی کەمالی باپیر ئاغا، سلێمانی، **١٩٦٠**.
- دیوانی ئەحمەد موختار جاف، بەکۆششی چاپخانەی کوردستان، هەولێر، **١٩٦٩**.
- دیوانی ئەحمەد موختار جاف، بەکۆششی ئەفراسیاب ئەحمەد موختار، بەغدا، **١٩٨٦**.
- دیوانی ئەدیب، بەکۆششی گیوی موکریانی، هەولێر، چاپی یەکەم **١٩٦٤**؛ چاپی دووەم **١٩٧٦**.
- دیوانی بێکەس، بەکۆششی محەمەدی مەلا کەریم، بەغدا، چاپی یەکەم **١٩٧٠**؛ چاپی دووەم **١٩٨٠**.
- دیوانی پیرەمێرد، کۆکردنەوە و ساغکردنەوەی لیجنەیێک، بەغدا، بەرگی یەکەم و دووەم **١٩٩٠**.
- دیوانی تاهیر فوئاد، هەولێر. **١٩٧٠**.
- دیوانی حەمدی، چاپی یەکەم بڵاوکراوەی نامەخانەی گەلاوێژی سلێمانی، بەغدا، **١٩٥٧**؛ چاپی دووەم بەکۆششی جەمال محەمەدئەمین، سلێمانی، **١٩٨٤**.
- دیوانی دڵدار، لەسەر ئەرکی چاپخانەی کوردستان، هەولێر، چاپی یەکەم **١٩٦١**؛ چاپی دووەم **١٩٧١**.
- دیوانی زێوەر، لەسەر ئەرکی نامەخانەی زێوەر، بەغدا، **١٩٥٧**.
- دیوانی زێوەر، ئامادەکردنی مەحموود زێوەر، هەولێر، **٢٠٠٣**.
- دیوانی سابیری، بەکۆششی سەید سەتار شێخ عەبدوڵڵای بەرزنجی، کەرکووک، **١٩٦٩**.
- دیوانی سافی، لەسەر ئەرکی موحسین دزەیی، بەغدا، **١٩٥٣**.

- دیوانی سافی، لەسەر ئەرکی چاپخانەی کوردستان، هەولێر، ١٩٦٥.
- دیوانی سافی، لێکۆڵینەوە و ساغکردنەوەی محەمەدی مەلا مستەفای هیرانی، هەولێر، ٢٠٠٤.
- دیوانی (سیف القضات)، بەکۆششی قازی ئەحمەد، چاپی ئێران، ١٩٨٣.
- دیوانی میرزا غەفوور، کۆکردنەوە و لێکۆڵینەوەی عەبدوڵڵا ئاگرین، بەغدا، ١٩٩١.
- دیوانی میهری، بژاردن و ئامادەکردنی عەزیز گەردی، سلێمانی، ١٩٧٧.
- دیوانی ناری، بەکۆششی کاکەی فەللاح، سلێمانی، ١٩٨٤.
- زێوەر، ژیانی پێغەمبەران، وەرگێڕانی کوردی (قصص الانبیاء)، سلێمانی، ١٩٢٠.
- زێوەر، دەستەگوڵی لاوان، سلێمانی، ١٩٣٩.
- زێوەر، خێوی ناو مزگەوت، سلێمانی، ١٩٤٦.
- زێوەر، گەنجینەی مەردان، لە لایەن محەمەدی مەلا کەریمەوە کۆکراوەتەوە، بەغدا، ١٩٨٥.
- زێوەر، چیرۆکی حوکوومەتێکی خەیاڵی و بەشێک لە کتێبی عەلی سیدۆ گەورانی «لە عەممانەوە بۆ ئامێدی» لە عەرەبییەوە کراوە بەکوردی، سلێمانی، ١٩٩٩.
- شوکری فەزلی، بەکۆششی عەبدوڵڵا ئاگرین، بەغدا، ١٩٨٨.
- شێرزاد عەبدولڕەحمان، دڵدار - شیعر و هەڵوێست، بەغدا، ١٩٨٦.
- عەبدولخالیق عەلائەدین، دڵدار شاعیری شۆڕشگێڕی کورد، بەغدا، ١٩٨٥.
- عەبدولخالیق عەلائەدین، بەسەرهات و ژیانی مەلا محەمەدی کۆیی، نەجەف، ١٩٧٤.
- عەبدولفەتاح ئیبراهیم، دوانێک لە بابەت پێڕەوی میللییەوە، وەرگێڕانی لە زمانی عەرەبییەوە عەبدولواحید نووری، بەغدا، ١٩٤٢.
- عەبدوڵڵا حەداد، ژیاننامە و شیعری میهری، هەولێر، ١٩٩٧.
- عەبدوڵڵا خدر مەولوود، لێکۆڵینەوەیێک لە شیعری حەمدی، هەولێر، ٢٠٠٤.
- عەبدولواحید نووری، پیرۆزیی مناڵ، سلێمانی، ١٩٤٠.
- عەبدولواحید نووری، بەرەو ڕووناکی، بەغدا، ١٩٤٢.





- عەبدولواحید نووری، لە ڕێگەی سەرکەوتنی ئینسانا، بەغدا، ١٩٤٣.
- عەزیز گەردی، ڕابەری کێشی شیعری کلاسیکی کوردی، سلێمانی، ٢٠٠٣.
- عومەر مەعرووف بەرزنجی، لێکۆڵینەوە و بیبلیۆگرافیای چیرۆکی کوردی، بەغدا، ١٩٧٨.
- فەرەیدوون عەلی ئەمین، چەند سەرنجێک لە پیرەمێردی شاعیر، بەغدا، ١٩٧١.
- محەمەد بەکر، پەخشانە شیعری کوردی، هەولێر، ٢٠٠٤.
- محەمەد بەکر، کێش و ڕیتمی فۆلکلۆری کوردی، هەولێر، ٢٠٠٤.
- محەمەدئەمین زەکی، موحاسەبەی نیابەت، بەغدا، ١٩٢٨.
- محەمەدئەمین زەکی، دوو تەقەلای بێ سوود، بەغدا، ١٩٣٥.
- محەمەدئەمین زەکی، خولاسەیێکی تاریخی کورد و کوردستان، بەغدا، بەرگی یەکەم ١٩٣١؛ بەرگی دووەم ١٩٣٧.
- محەمەدئەمین زەکی، تاریخی سلێمانی و وڵاتی، بەغدا، ١٩٣٩.
- مەلا محەمەدی کۆیی، بەکۆششی مومتاز حەیدەری، هەولێر، ١٩٧٥.
- مەسەلەی ویژدان، چیرۆکی ئەحمەد موختار جاف، بەکۆششی د. ئیحسان فوئاد، بەغدا، ١٩٧٠.
- هانس ئەندرسن، کەمانجەژەن، وەرگێڕانی لە تورکییەوە پیرەمێرد، سلێمانی، ١٩٤٢.
- یادی ئەمین زەکی، بەکۆششی عەلائەدین سەجادی، بەغدا، ١٩٤٨.
- یادی پیرەمێرد، لە ژێر چاودێری عەلائەدین سەجادی، بەغدا، ١٩٥١.

# ناوەرۆک

**بەشی یازدەم**



**بەشی دوازدەم**



**بەشی سێزدەم**



**بەشی چواردەم**



**بەشی پازدەم**





**بەشی شازدەم**



**بەشی هەڤدەم**



**بەشی هەژدەم**



**بەشی نۆزدەم**



**بەشی بیستەم**

**بەشی بیست و یەکەم**



**بەشی بیست و دووەم**



**بەشی بیست و سێیەم**



**بەشی بیست و چوارەم**



**بەشی بیست و پێنجەم**

# تاريخ الادب الكردي

## بين الحربين العالميتين
## في القرن العشرين
## (١٩١٤ - ١٩٤٥)

يتناول هذا الجزء من الكتاب مسيرة الادب الكردي في الفترة الواقعة بين بداية الحرب العالمية الأولى ونهاية الحرب العالمية الثانية في القرن العشرين (١٩١٤ - ١٩٤٥) ومن أهم مميزات هذه الحقبة تطور النثر وظهور فنون ومضامين جديدة ومتنوعة من المقالة الادبية والقصة القصيرة. وأما في الشعر فقد كان «الشعر الحديث» انقلاباً عظيماً أحدث تغيراً عميقاً في شكل ومحتوى الشعر الكلاسيكي. وقد تناول هذا الجزء عشرين شاعراً وكاتباً منهم: پيرەميرد، ناری، زيوەر، حمدي، شكري فضلي، احمد مختار، بيكەس، دلدار، وغيرهم.

الجزء الخامس

**الدكتور معروف خزنەدار**

أربيل - ٢٠٠٥



# The History of Kurdish Literature

**Between the two great Wars**

in the 20th Century
1914 - 1945

Vol. V

*By*
**Prof. Dr. Marouf Khaznadar**

Arbil - 2005